# پەنجەکە یەکتری نەشکێنین

## دیوی ناوەوەی ڕووداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩-١٩٨٣

نەوشیروان مستەفا ئەمین

تووتە، برای تووتە، بالابەرزە، دزشاوەژە، ئەسپێکوژە، پێنج برا بوون.

تووتە وتی: بابچین بۆ دزی !

برای تووتە: ئەکوێ؟

بالا بەرزە وتی: لە ماڵی خوا!

دزشاوەژە: حەرامە.

ئەسپێکوژە وتی: لە دینی ئێمەدا هیچ شتێ حەرام نیە.

لە ناو خۆیان دا بوو بە شەڕیان، چواریان یەک گرتن بۆ ڕاونانی پێنجەم

١٩٩٧

# ناوەڕۆک

١ . نیوەی یەکەمی ٧٩ (ل ٧ - ٣٤)
پێنگەی ناوزەنگ. کۆمەڵە و کاری فیکری. کۆمەڵە و کاروباری ڕێکخراوەیی. کۆبوونەوەی کومیتەی سەرکردایەتی. تێهران لە دوا قۆناغی ئینقیلاب دا. گەڕانەوەی حدکا. گەڕانەوەی ئیمام خومەینی. یادگاتی مەهاباد. نەورۆزی سنە. شەڕی نەغەدە. حشع: ناردی تاو دەرک. جیابوونەوەی بزووتنەوە. سیروان و زێرینجۆ.

٢. بە بۆنەی مردنی مەلا مستەفاوە: مەلایی و جەلالی لە تەرازوودا.(ل ٣٥ - ١١٦)

٣. نیوەی دووەمی ٧٩ (ل ١١٧ - ١٤٥)
خۆدزینەوە. کۆچەی عەرەب. تەلەویزی تیهرانی. بۆردومان. ڕێگای حەشیشە. سەفەری مامجەلال بۆ تاران. هاتنی سەددام. «وەحدە» ی سووریا و عیراق. کەلکی هاریکی. شەڕی ٢ مانگەی کوردستان. دادگاکانی خاڵخاڵی. ئاوڕی مامجەلال. هەیئەتی نومایندەگی خەڵکی کورد. خواستەکانی کورد. پێکهێنانی حسک. گفتوگۆی حسک - پەعس. شەفیق و قورەمەڕازە. کێشەی سیمجن. کۆنگرەی نۆزەمی پارتی. دەهێشید هەرست لە ناوزەنگ. کاری پەروەیی.

٤. سالی ٨٠ (ل ١٤٧ - ١٨٠)
لە ئێرمەنالی فێرکەرە بۆ چاپەری ستوور. کۆنگرەی چوارەمی حدکا. کۆبوونەوەی سەرکردایەتی یەکێتی و حدکا. سەفەری مامجەلال بۆ دەرەوە. «علاقاتی امی». دامەزراندنی ڕادیۆ. نەخۆشخانە. بۆردومان. زیندان. دروستکردنی خانوی تازە. گرتنی بێگانە. گروپی حەوت نەفەر. جەنگی عێراق - ئێران. شەڕی ڕاگەیاندن. هاتنی لەشکری پارتی بۆ دولەتو. جوقد و جوە. جەمیل ڕەنجبەر و پیرانە ڕەش. ستاری سەعید خەلەف. پەرەپوونەوە لە چلهەمین فڕین دا.

٥. سالی ٨١ (ل ١٨١ - ٢٣٢)

بۆچی چوم و توشی چی بوم. کاروباری کۆمەڵە. یەکەمین کۆنفرەنسی کۆمەڵە. حدک و پدک. لاک. گەلە. تێکچونی یەکیەتی و ئێران. پەشیوانی هەلومەرجی کوردستان. یەکەمین شەڕی جوت - یەکیەتی. پاسۆک و یەکیەتی. حسک و یەکیەتی. حشع و یەکیەتی. لەشکرکێشیەکەی سەید کاکە. گەلە کۆمەکێ ی چوار قۆڵی جوت. ئاکۆیەتی. هەندێ وشەی جوگرافی. وەرتێ.

٦. سالی ٨٢ ( ل ٢٣٣ - ٢٧٧)

شێرکۆ و چلورەفرۆشەکان. دەرمن بە ئاش. میتۆدۆلۆجی. هەولی ئاشتبونەوە. ئەنوەر حەسەن و قازان. یەکیەتیی نوسەرانی کوردستان. هەولێکی سەرنەکەوتو لە گەڵ حسک. مەیدانی ئازاد. خۆپیشاندانی شارەکان. قاسملو و ناوێژی. خواستەکانی یەکیەتی. شۆڕشی بێ مۆسیقا. ڕێککەوتنی ینک - پدک. دوەمین کۆنفرەنسی کۆمەڵە. پێکهێنانی یەکیەتی شۆڕشگێران. هێزی پشتیوان. پێکهێنانی مەلبەندەکان. یەکیەتی و حکومەت. سۆشیال دیموکرات. تۆڕی پەیوەندی بیتەڵ. تەفسیری قورئان.

٧. سالی ٨٣ ( ل ٢٧٩ - ٣٣٥)

ڕێککەوتنی ١٩ قۆڵی. سەید صادق و بالاتەیران. کەمینێکی کوێر. دارەکەی حسک. شەمال و باداوان. شەڕ لە شارباژێر. شەڕی یەکەمی جوت. تەفسیری جوت بۆ ڕوداوەکان. ئیتیهامەکانی حشع. خۆشناوەتی. سماقولیەکان. حەسەن مارگر. ڕۆلی ئالوەت. ئاژاوەی ناو ئەدیبان. شێرکۆ بێکەس. حەسۆ لە جاسوسان. هاتنی مامجەلال بۆ خۆشناوەتی. جەمال تایەر. شەڕی دوەمی جوت. هەنگەوانی. شەڕە جنێو بە هۆکی تۆکی. حەسۆ لە کونەکۆتر. گیرانی بارزانیەکان. بەرەو ئاسۆس. بەری مەرگە. مەلبەندی یەک لە ناو شەڕی عێراق و ئێران دا. شەڕ لە ٣ مەیدان دا. ئازادکردنی بێتراتە. مفاوەضە لە گەڵ بەعس.

٨. پەلکە (ل ٣٣٧ - )

# کورتکراوەکان

پاسوک: پارتی سوسیالیستی کورد
پدک: پارتی دیموکراتی کوردستان
توع: التجمع الوطنی العراقی
جود: الجبهە الوطنیە الدیمقراطیە
جوقد: الجبهە الوطنیە والقومیە الدیمقراطیە
حاع: الحرکە الاشتراکیە العربیە
حدکا: حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران
حسک: حیزبی سوسیالیستی کوردستان، سەرەتا ناوی:
حیزبی سوسیالیستی یەکگرتوی کوردستان بو.
حشع: حیزبی شیوعی عیراق
کاژیک: کۆمەڵەی ئازادی و ژیانەوە و یەکگرتنی کوردستان
سازکا: سازمان انقلابی زحمتکشان کردستان ایران، بە کوردی:
کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران
قم: قیادە موقتە (سەرەدەمی پارتی بەم ناوە ناسرا بو)
کۆوەک: کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان
لاک: لەشکری ئیسلامی کورد
م: مەلبەند
م س: مەکتەبی سیاسی
م ع: مەکتەبی عەسکەری
م ق ث: مجلس قیادە الثورە
هـ: هەریم
یەنک: یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

# نیوەی یەکەمی ١٩٧٩

## بنکەی ناوزەنگ

ناوزەنگ تا ئەحات ئاوەدانتر و قەرەباڵغتر ئەبوو. زەلی و قولەعەرەبی بارەگایان تێ دا دانرا.

لە ناوزەنگ، جگە لە مامجەلال لە ئەندامانی سەرکردایەتی: سالار، مەلابەختیار، عومەری حاجی عەبدوللا، فاضیل کەریم، هەروەها د. محەمەد عەلی عوسمان و قادر جەباری و، ژمارەیەک لە کادرەکانی کۆمەلە وەکو سەید کەریم، ئیبراهیم جەلال، ریباز کۆ بوونەوە. رەسوڵ مامەندیش هات بوو زەلی. بەلام بەشداری کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی نەئەکرد. ویستمان کارەکان ریک بخەینەوە. من کاروباری کۆمەلەم هەلئەسوراند. سالار و جەعفەر لە گەل مامجەلال کاروباری مەکتەبی سیاسییان ئەکرد. د. محەمەدیش لە زۆری کۆبوونەوەکان دا بەشداری ئەکرد. لە مێژ بوو مەکتەبی سیاسی نوێنەری بزووتنەوەی تێ دا نەمابوو. قادر عەزیزیان دانا بوو بە نوێنەری بزووتنەوە لای م س. بەلام قادر نە ئەندامی سەرکردایەتی بزووتنەوە بوو، نە هی سەرکردایەتی یەکێتی. لە زۆری کۆبوونەوەکان دا بەشداری ئەکرد، بەلام لە هەمویان دا وەکو پێ یان وت بوو کێشەی دروست ئەکرد و، زۆرجار لە گەل مامجەلال قسەیان لە یەک ئەگیرا.

کاروباری پێشمەرگە بە ملازم عومەر و راگەیاندن بە فاضیل سپێردرا.

ناوزەنگ ئاوەدانی تێ دا نەبوو. هەمومان لە خێوەت دا بووین. خێوەتەکان زۆر قەرەباڵغ بوون. لە بەر ئەوە هەم مشووری خێوەتی زۆرترمان ئەخوارد و، هەم هی خانوو دروست کردن. پێشمەرگە لادێیەکان شارەزاتر و گورجوگۆلتر بوون لە خانوو دروست کردن دا. هەر زوو ئەوان هەندێ نوایان بۆ خۆیان ساز کرد.

من و، ملازم عومەر، حەمەسەعید، هاوری جەبار.. خێوەتێکی گەورەمان هەلدا و، لە تاپلۆغان گرت. تاپلۆیەکی ئەستوورمان راخست بوو لە سەری ئەنوستین یەکی یەک بەتانیمان هەبوو. چرای غازمان لە ئێرانەوە بۆ ئەهات. خێوەتەکەمان لە پاڵ شاخەکەدا هەلدا بوو، زۆری پێ نەچوو زێرەکەی بوو بە ئاوەزێ، کانییەکی تێ دا تەقی بوو، بە جۆگا ئاوەڕۆیەکمان بۆ دەرەوە بۆ کرد.

لە ناوزەنگ چەند جێگایەکمان دیاری کرد خانووەکانیان تێ دا بکرێ. سالار و فاضیل مان راسپارد بوو خەریکی دروستکردنی خانوو بن. خانووەکان ئەگەرچی لە هەمان ناوچەدا بوون، بەلام لە ٣ لای جیاوازدا دروست ئەکران. دەستەیەکیان فاضیل بۆ خۆی و مامجەلال و د. محەمەد و، دەستەیەک سالار، بۆ خۆی و عومەر و من و، دەستەیەک عەلی نامەخان بۆ پێشمەرگەکان. هەندێ لە فەرماندەی کەرتەکانی هەرێمی پارێزگاریش لە نزیک ئەو بارەگایانەوە خەریک بوون. شوێنەکان بە ناوی سەرپەرشتیکەرەکانەوە ناو نرا بوون: سالارئاوا، جەعفەرئاوا، عەلیئاوا... ئەم ناوانەمان بۆ خۆشیی لێ نابوون، بەلام سالار و جەعفەر (فاضیل) پێیان ناخۆش بوو، لە بەر ئەوە وازمان لێ هێنا. خانووەکان، لە گەل

خانوی تەنگ و تاریک و دواکەوتوی جوتیارەکان دا هیچ جیاوازیەکیان نەبو، بە هەمان کەرەستە و هەندەسە دروستکرا بون.

*

من ئەو ماوەیە کارم زۆر بو: نوسین و سەرپەرشتی چاپ و بڵاو کردنەوەی بڵاوکراوەکان، بە تایبەتی وەرزنامەی «کۆمەڵە». وەڵامدانەوەی زۆری ئەو نامانەی لە ڕێکخراوە نهێنیەکان و، لە هەریم و لقەکانەوە ئەگەیشتن. بینین و گفتوگۆ لە گەڵ ئەو کادر و پێشمەرگە و هاوڕێ ئاوەڵاکیانەی بۆ ئیشوکار ئەهاتن. تایپ و ڕۆنیۆکەیشی حەمە سەعید و هاوڕێ جبار ئەیان کرد.

بە لامەوە گرنگ نەبو لە کوێ بم، گرنگ ئەوە بو نوانیەکم هەبی سەعاتی تێ دا بگرم و نیشەکانی تێ دا بکەم. لە بەر ئەوە ئەوەندە گرێم نەئەدایە شوێنی ژیان و ئەوەندەیش کاتم نەبو خەریکی دروستکردنی خانو و، گەورەگرتنی ڕۆڵانەی پێویستیەکانی بارەگا و، پێشمەرگەکانی بم. ڕاستیەکەی ئەرکی بارەگا لەو شاخە چۆڵە زۆر بو: دابینکردنی نان و خواردەمەنی، سوتەمەنی، ڕاییخ و پێخەف، بەڕێ کردنی میوان. من حەزم ئەکرد، بۆ ئەوەی لەو دەردەسەریانە دور بم، خانوی بە کۆمەڵمان هەبی پێکەوە بژین. بەڵام سەیر ئەوە بو زۆری برادەرەکان، تەنانەت هەندی لە لێپرسراوەکانیش، خوێندنەوە و نوسین و چاپیان بە کاری ماندوکەر دائەنا، لایان وابو ئەمیش سەرگەرمیەکە بۆ خۆخەڵاکاندن وەکو دامە و ئەزنیف و تاوڵە!

کە خانوەکەمان: ژوریکی درێژ و دالانیک، سەری گیرا، هێشتا تەر بو چوینە ناوییەوە. شوینەکەمان تەنگ و میوانمان زۆر بو. ئەو زستانە بەفر زۆر باری، من لە بەر دەرگای دالانەکەدا ئەنوستم.

*

ساواک لە ئێران دەسەڵاتی نەما بو، خەریک بو هەڵئەوەشا. بە ئاسانی بە ئێران دا هاتوچۆ ئەکرا. ئیمە ئەدرەسی هەندی لە دۆستەکانی ناو ئێرانمان نارد بو بۆ هەڤاڵانی دەرەوە بۆ ئەوەی بە ڕێگای ئەوان دا، بۆ بەشداری لە کۆبونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی دا، بگەڕێنەوە کوردستان. سالار بە هەمان ڕێگەدا گەڕا بووەوە. زستانی ٧٨ - ٧٩ عومەر شێخموس، عومەر مستەفا، د. فوئاد مەعصوم، د. کەمال خۆشناو، عادل موراد گەیشتنە ناوزەنگ. کەمال و عادل هاتنە لای ئیمە. ئەوانی تریش چونە لای مامجەلال.

*

## کۆمەڵە و کاری فیکری

ئەو ماوەیەی لە لەندیل بوین چەند وتاریکم نوسی بە ناوی کۆمەڵەوە چاپ و بڵاومان کردنەوە لەوانە:

- دەربارەی پێویستی بونی ڕێکخراوی تایبەتی چینی کرێکار و ڕەنجدەرانی کوردستان (١٢ ل)
- مەسەلەی ئەندامەتی (٩ ل)
- ڕیکخستنی پتەو بەهێز بکەن!

ڕێکخستنی کۆمەڵ بەهێز بکەن و، یەکیتی بیروڕا، ویست، ڕێکخستن و کردەوە لە ڕیزەکانی دا، بە دی بهێنن!

- فرمانەکانی قۆناغی ئێستای خەباتمان

ئەم زنجیرە وتارە، کە هەر یەکەیان ئامێلکەیەک بوو، لە ماوەیەکی کورت دا بە دوای یەک دا بڵاو کرانەوە، کارێکی باشی لە کادرەکان و، تێکڕای ڕێکخستن کرد. بوژانەوەیەکی لێ دا بە دی هێنان و، ڕیزەکانی یەک و یەکگرتر کردن. بەڵام ئەمانە بەس نەبوون ئەبوو بڵاوکراوەیەکی دەوری دەربکەین. بۆ ئەوەی «کۆمەڵە» باشتر بناسرێ لە ناو خەڵک دا بڕیارمان دا بڵاوکراوەکەیشمان وەکو ڕێکخراوەکەمان ناوی «کۆمەڵە» بێ و، هەر وەرزە ژمارەیەکی لێ دەربکەین.

«هەواڵنامە»، کە بۆ دەنگوباس تەرخان کرا بوو، من وتارەکانیم ئامادە ئەکرد و، سەرپەرشتی لە چاپدانیم ئەکرد، بۆ ئەوەی دەستم بۆ کۆمەڵە بەتاڵ بێ، ئیتر دەستم لەو هەڵگرت و، خۆم بۆ دەرکردنی کۆمەڵە تەرخان کرد.

●

ژمارەی یەکەمی کۆمەڵە لە وەرزی پاییزی ١٩٧٨ دا دەرچوو. باس و بابەتەکانی بریتی بوو لە:

سەروتار: بە بۆنەی وەرزنامەی کۆمەڵەوە (ل ١ - ٢) فاشیستەکان سوپاکەیان بۆ کوێ ئەنێرن: بۆ (جبهەی شیمالی و باتی جولان) یاخود بۆ چیاکانی کوردستان؟(ل ٣ - ٥) خەباتی گەلان: ئێران: جزیرەی ئارام یا گۆمی خوێن؟(ل ٦ - ١٢) بابەتی جۆراوجۆر: بە سەر ئاوی حەمامیشەوە پیاوەتی وەها ناکرێ. خومەینی دەرئەکەن و پێشوازی لە شاپانو ئەکەن. ڕژێمی عیراق چەند مرۆڤ دۆستە. دەزگاکانی ئۆتۆنۆمیە درۆزنەکە ئەو دەسەڵاتانەی دراوەتی کە نیین.(ل ١٤ - ١٥) لە دەفتەری سەروەری دا: جەمالە ڕەش، بەڵگەی قارەمانەتی(ل ١٦ - ٢٣) باسێکی تیوری: چۆن مارکسیزم - لینینیزم فێر بین؟ (ل ٢٤ - ٢٩) ئازادی بۆ تێکۆشەرانی کوردستان. بۆینباخی ستەرلینی، بۆینباخی بەعسی (ل ٣٠).

●

بۆ شارەزا بوون لە ڕێبازی گۆڤارەکە و، مەبەست لە دەرکردنی لێرەدا سەروتاری یەکەمین ژمارەی وەکو خۆی ئەنوسمەوە:

بە بۆنەی وەرزنامەی کۆمەڵەوە

لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا نەتەوەیەک ئەژی کە نیشتمانەکەی لە دوای یەکەم جەنگی جیهانییەوە بە پێ ی قازانجی ستراتیجی، سیاسی، ئابوری و پەترۆلییەکانی ئیمپریالیزمی جیهانی و کۆنەپەرستی تورک، عەرەب، فارس و کورد، بێ گوێ دانە ئارەزووی دانیشتوانی ناوچەکە، بە سەر دەوڵەتەکانی تورکیا، ئێران، عیراق و سوریا دابەش کراوە.

ئەگەرچی ئەم نەتەوەیە هەمیشە بە سەر یەکەوە، بە ژمارە، لە هەندێک میللەت و نەتەوەی تری ڕۆژهەڵات زۆرترە و نیشتمانەکەی لە کۆن دا مەڵبەندی شارستانیەتی بووە و، خاکێکی بە پیت و لەوەڕی هەیە و خەڵکیشی لە زۆر کۆنەوە لە پێناوی ڕزگاری دا لە خەباتێکی بێ وچانی خوێناوی دایە بە جۆرێکی ئەوتۆ کە بەشێکی گەورەی مێژووی جەنگی ناوچەکە پێک دێت لە پێکدادانی ئەم و میللەتانی دراوسێ و لەشکرەکانی بێگانە و داگیرکەر، بێ ئەوەی سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بە دەس هێنا بێت و گەیشتبێتە یەکێک لە

ئامانجە نەتەوەییەکانی.

بەڵام سەرەڕای چەوساندنەوەی سەختی نەتەوایەتی و دابەشکردن و پچڕپچڕ کردنی سیاسی و ئابوری و زمان و فەرهەنگ، سەرەڕای سیاسەتی فەرامۆش کردنی ئابوری و کۆمەڵایەتی، سیاسەتی ڕاگواستن و جێ بێ کردن و دەربەدەر کردن و جینۆساید لێ سەندنەوە، پرسی کردن و هەژار خستن و ملک و ماڵ زەوت کردن، بە نیازی لە ناو بردن و تەفروتوناکردن و تواندنەوەی... هێشتا:

- لە سەر زەوییەکی پێکەوە بەستراودا ئەژی کە مەڵبەندی کۆنینەی و بە درێژایی مێژو تیا جێگیر بوە و گەشەی کردوە و پێ گەیشتوە.

- جگە لە جیاوازییەکی کەمی نێوان لە هجەکانی، بنچینەی زمانێکی یەکگرتوی ئاخافتن و لە یەک گەیشتنی هەیە، کە ئەشی ببێتە زمانی نەتەوەیی نوسین و ئاخافتن.

- مێژوییەکی شارستانی و جەنگی و سیاسی ناوکۆیی هەیە.

- خاوەنی خووڕەوشتی کۆمەڵایەتی، نەریت و داب لە یەکچوی شێوەی ژیان، فۆلکلۆر و بیروڕا... کە خۆی لە پێکهاتنی سایکۆلۆجی لە یەکچودا ئەنوێنێتەوە.

- سەرەڕای سنوری سیاسی و لە یەک دابڕینی ئابوری و بەستراندنەوەی بە چەند ڕژێمی جیا جیاوە بنچینەی ئابورییەکی یەکگرتوی هەیە کە تا ئێستاش خۆی لە بازرگانی قاچاخی سەر سنورەکان و هاتوچۆی خێڵ و هۆزە ڕەوەندەکان و هاتوچۆی کرێکارانی لادێ دا ئەنوێنێت.

ئەم میللەتەی کە ڕەنگە لە دنیای ئەمڕودا، تەنیا نەتەوەی گەورە بێت کە هێشتا نەک بە مافی سەربەستی چارەی خۆنوسین و ڕزگاری نەتەوەیی نەگەیشتوە، بەڵکو لە نیشتمانەکەی خۆیشی دا بە بێگانە و ناحەز ئەژمێردرێت و مافی مان و خەملاندن و گەشەکردنی نیە. میللەتە بەش بەش و دیلەکەی ئێمەیە کە ناوی: کوردە.

گەلی کورد لە خاکەکەی خۆی دا بێگانەیە، بێ بەشە لە هەمو مافێکی نەتەوەیی و دیموکراتی، بگرە لە هەمو مافێکی مرۆڤی ئەم سەردەمە، وڵاتێکی بە پیت و جوان و دەوڵەمەندی هەیە کە شوێنێکی جوگرافی گرنگی هەیە و دابەشکراوە و لە چەند سەرەوە ئەچەوسێنرێتەوە:

- چەوسێنەرەکانی ناوەنەوە: دەرەبەگ، بورجوازی کۆسمۆپۆلیت و کۆمپرادۆری کورد.

- چینە کۆنەپەرست و چەوسێنەرەوەکانی نەتەوە دەسەڵاتدارەکان، بە تایبەتی بورجوازی بیروکراتی.

- ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزمی نوێ.

لە بەر ئەوەی گەل و نیشتمانەکەمان هەروەکو لە ڕیزی وڵاتە هەرە دواکەوتوەکانی دنیادایە، هەروەها لە ناو هەر یەکێک لەو دەوڵەتانەی بە سەریشیان دا دابەش کراوە لە ڕیزی ناوچە هەرە دواکەوتوەکانی ئەو وڵاتەش دایە.

ئێمە گەرەکمانە و خەبات ئەکەین بۆ گۆڕینی ئەم دۆخە نالەبارە. خەبات ئەکەین بۆ نەهێشتنی چەوسانەوە بە هەمو شێوەکانیەوە: چ ڕەگەزی، نەتەوایەتی، چینایەتی، دینی، مەزهەبی..

خەبات ئەکەین بۆ گۆڕین و نەهێشتنی پەیوەندی زاڵمانەی نێوان کورد و کورد، چ

نێوان کورد و حکومەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، هی نێوان کورد و ئیمپریالیزمی جیهانی.

ئێمە ئەمانەوێ بە خۆشی و تێری وەکو مرۆڤ، بە سەربەستی و ئازادی دوور لە چەوسانەوە و ئازار و زۆرلێکران لە سەر خاکی باوباپیرانمان بە ئاشتی بژین.

خەباتی کۆمەڵەمان لە پێناوی ئەم ئامانجە رەوا و پیرۆزانەدایە، کە ئامانجی گەلەکەمانە..

خەباتی وەرزنامەی «کۆمەڵە» پێش کە کۆبونەوەی فراوانی کادرانی کومەڵە لە تشرینی دومی ۱۹۷۸ دا بڕیاری دەرکردنی داوە، بەشێکە لەم خەباتە رەوا و پیرۆزەی کۆمەڵەمان و گەلەکەمان.

وەرزنامەی کۆمەڵە لە قۆناغێکا دێتە کۆڕی خەباتەوە کە خەباتی گەلەکەمان گەیشتۆتە بەرزترین و باڵاترین پلەی، واتە پلەی خەباتی چەکدارانە، واتە لایەلا کردنی ناکۆکی سروشت دوژمنانە و سەرەکی نێوان بورجوازی بیروکراتی رەگەزپەرست و شۆڤێنی عەرەبی عێراق و نەتەوەی کورد لە ڕێگای بەکار هێنانی زەبروزەنگی شۆڕشگێرانەوە چەکەوە.

کۆمەڵەمان، لەم قۆناغە گرنگ و بایەخدارەی مێژوی کوردستانی عێراق دا کە ڕووبەڕوی فرمانە مێژوییەکانی سەرشانی بوە، لە مەیدانە جیاجیاکانی خەبات و تێکۆشانی سیاسی، ئایدیۆلۆجی، پێشمەرگەیی، رێکخراوەیی.. دا هەوڵ ئەدات بۆ تەواوکردنی ئەم ئەرکانە لە ڕێگەی دەرکردنی وەرزنامەی کۆمەڵەوە کە ئەبێت نوێنەرەوەی ڕیبازی سیاسی، فیکری، پێشمەرگەیی کۆمەڵە و هەڵگری مەشخەلی بیروڕاکانی ئەو بێت و هەوڵ ئەدات لە بەر تیشکی چرای مارکسیزم لینینیزم دا ڕێگەی سەرکەوتنی خەباتی گەلەکەمان ڕۆشن بکاتەوە و بەشدار بێت لە گەیاندنی مەرجەکانی سەرکەوتنی دا.

دەرکردنی وەرزنامەی کۆمەڵە سێهەمین تەقەللای کۆمەڵەیە بۆ دەرکردنی بڵاوکراوەیەکی دەوری ڕێکوپێک، کە ببێتە زمانی حالی کۆمەڵ و بیروڕا و هەڵوێستەکانی ئەو دەربڕێت لە ڕوداوەکانی کوردستان و عێراق و دنیادا.-

تەقەللای یەکەم - دەرکردنی ئالای سور بو لە ساڵی ۱۹۷۳ دا کە شەهیدی نەمر هاوڕێ شەهاب شێخ نوری دەوری سەرەکی گێڕا و لە دوایی دا بە هۆی هەلومەرجی ئەو کاتەوە هەر ۳ ژمارەی لێ بڵاو کرایەوە.

تەقەللای دوەم - دەرکردنی ئالای شۆڕش بو کە لە ئەیلولی ۱۹۷۷ دا ژمارەی یەکەمی بە دەس پێشکەری و رەنجی شەهیدی نەمر هاوڕێ شاسوار جەلال (ئارام) چاپ و بڵاوکرایەوە، بەڵام شەهید بونی هاوڕێ ئارام پەکی دەرچونی بڵاوکراوەکەیشی خست.

تەقەللای سێهەم - دەرکردنی وەرزنامەی کۆمەڵەیە کە ئەمە ژمارەی یەکەمە و، ئومێدمان وایە بە هەوڵ و خەباتی هەمو لایەکمان بتوانین هیچ نەبێ هەر وەرزێ ژمارەیەکی لێ دەربکەین.

•

ژمارەی دومی کۆمەڵە لە وەرزی زستانی ۱۹۷۹ دا دەرچو. باس و بابەتەکانی بریتی بو لە:

سەروتار: لە یادی قارەمانێکی نەمردا (ل ۳۱) چەند ڕوالەتێکی نوێ ی پیلانەکانی

ڕەهەندی بەگژاچوونی شۆڕشی کوردستانی عێراق (ل ٣٢ - ٤٠) بۆچی وەرزنامەکەمان ناوی نراوە «کۆمەڵە» (ل ٤١ - ٤٤) ڕەگەزپەرستەکانی عێراق پێشکەوتن و ئاوەدانی دێننە کوردستانەوە (ل ٤٤) گرتنی هێڵی ڕاست و دروستی سیاسی و ئایدیۆلۆجی سەرکەوتن ئەهێنێتە دی (ل ٤٥ - ٤٦) ڕۆڵە قارەمانەکانی کوردستان بە خوێنی گەش مێژووی نوێ ی گەلەکەیان ئەنووسنەوە (ل ٤٦) لە دەفتەری سەروەری دا: ئەبوبەکر شێخ نوری، لوتکەی بڵندی بڕوباوەڕ (ل ٤٧ - ٥٣) فاشیستەکانی عێراق چۆن ڕەفتار لە گەڵ هاوپەیمانەکانیان ئەکەن؟ (ل ٥٣) ئەمێ کێ لە کێ بپرسێت؟ (ل ٥٤ - ٥٥) کاربەدەستە فاشیستەکانی عێراق حورمەتی پەیمان و ڕێککەوتنە جیهانیەکان ناگرن (ل ٥٥) وەڕن بە دەنگ ئازادیخوازانی عێراق و کوردستانەوە (ل ٥٦ - ٥٩) بانگە و دو هەوا (ل ٥٩) خەباتی گەلان: ئێران - چارەنوسی شۆڕش (ل ٦٠ - ٦٤)

*

ژمارەی سێیەمی کۆمەڵە لە وەرزی زستانی ١٩٧٩ دا دەرچو. باس و بابەتەکانی بریتی بو لە:

سەروتار: گەلانی قارەمانی ئێران! یەکەمین سەرکەوتنتان پیرۆز و هەمو ڕۆژێکتان هەر سەرکەوتن بێ (ل ٦٥) بەرەو پێکهێنانی حیزبی پێشڕەوی کرێکاران و ڕەنجدەرانی کوردستان (ل ٦٦ - ١١٧) بابەتی جۆراوجۆر: ئازار و بەهار (شیعر). ئەی ئازادیخوازانی دنیا وەرن بە دەنگ ئازادیخوازانی کوردستانەوە. ڕۆڵە قارەمانەکانی کوردستان بە خوێنی خۆیان مێژووی نوێ ی گەلەکەیان ئەنوسنەوە. سەروەری بۆ هاوڕێ د. بەختیار خالید. خوێنی شەهیدان خانەی مرعەشی و محەممەد حسین کەریمی بە فیڕۆ ناچێت (ل ١١٧ - ١١٨)

*

ژمارەی چوارەمی کۆمەڵە لە وەرزی بەهاری ١٩٧٩ دا دەرچو. باس و بابەتەکانی بریتی بو لە:

سەروتار: ئاشبەتالی ١٩٧٥ - بیرەوەرییەکی تاڵ بەڵام پڕ لە تەجرووبەی هێژا (ل ١١٩ - ١٣١) لە ساڵڕۆژی شەهید بونی هاوڕێ محەممەد ئەمین پۆڵا (ل ١٣٢ - ١٣٤) فرۆنیلەکانی شۆڕشی چەواشە شارەزا بن (ل ١٣٥ - ١٤٠) هەندێ لە گیروگرفتەکانی ئێستای جەنگی پارتیزانی (ل ١٤١ - ١٤٦) لە دەفتەری سەروەری دا: هێزی بیروباوەڕ لە بەرامبەر باروت و فۆرفۆرشم و پۆڵادا (ل ١٤٧ - ١٥٤) شەهید بونی مامۆستا عەزیز مەحمودی قارەمان (ل ١٥٤)

*

بەشی زۆری بابەتەکانی ئەم چوار ژمارەیە (بە ناوی جۆراوجۆر یان بە بێ ناو) من نوسیومە یا من ئامادەم کردوە. د. جەعفەری شەفیعی (بە ناوی پۆشو) لە ژمارەی یەکەمی و دوەمی دا دو وتاری درێژی لە سەر ڕاپەڕینەکەی ئێران و، مامجەلال (بە ناوی توانا) هەندێ باسی تیۆری و، د. مەحمود (بە ناوی هیوا) هەندێ کورتە تەحلیلی نوسی. ئیتر کۆمەڵە بەردەوام دەرئەچو. هەندێ لە هاوڕێکانی تریش، لەوانە: فاضیل کەریم (بە ناوی ج. صادق)، مەلا بەختیار (بە ناوی باوکی ئاوارە)، دوابیتر فەرەیدون عەبدولقادریش بەشداری نوسین بون.

بە کارهێنانی وشەی «وەرزنامە» شتێکی تازە بو. ئەمانویست هەندێ وشە و

تیگەیشتنی دیاریکراو وەکو: «ڕۆژنامە» بۆ بڵاوکراوەی ڕۆژانە، «هەفتەنامە» بۆ بڵاوکراوەی هەفتانە. «مانگنامە» بۆ بڵاوکراوەی مانگانە، «وەرزنامە» بۆ بڵاوکراوەی ٣ مانگە و. «ساڵنامە» بۆ بڵاوکراوەی ساڵانە لە ڕۆژنامەوانی کوردی دا بچەسپێنین. ئەمارەکان وەرزنامەکەیان ناو نابوین: وەرسنامە.

## کۆمەڵە و کاروباری ڕێکخراوەیی

دوای ئەوەی ئارام هات بوە شاخ هەمو ڕێکخستنیان یەک خست بو لە ژێر ناوی «کومیتەی هەلمەت» دا. چەند خەتی تر و کەسی کەش بە جیا لەمان هەبون. جەمال تایەر (سەرکەوت) دەینەسوزی کومیتەی هەلمەت بو. پاش ماوەیەک ئەم کومیتەیەمان کرد بە «کومیتەی سەرکردایەتی ڕێکخستنی ناوخۆ».

جگە لەم کومیتەیە دو ڕێکخستنی گەورەی ترمان هەبو یەکێکیان «کومیتەی ڕاپەڕین» بو کە حەسەن کوێستانی لێپرسراویان و. ئەوی تریان خەتێک بو د. خەسرەو خاڵ (زۆراب) لێپرسراویان بو.

کومیتەی ڕاپەڕین تۆڕێکی فراوانی ڕێکخستنی لە چوارتا، قەسری، گەڵالە، ڕەواندز، شەقلاوە، هەولێر.. هەبو.

کومیتەکەی زۆرابیش تۆڕێکی ڕێکخستنی فراوانی لە ئەندازیار و پزیشک و مامۆستا و ئەفسەر و مرچەخۆری گەورە لە سلێمانی و هەولێر و بەغداد دامەزراند بو.

ڕێگەمان دابو بە هەمو کادرە سیاسی و پێشمەرگەییەکانی یەکێتی هەر کەسە لە لای خۆیەوە، چەندی لە توانای دا بێ، کەسانی دڵسۆز ڕێک بخا و. بەرەو ڕوی ناوەند یا دەزگا ڕێکخراوەییەکانی بکاتەوە. ئەو ڕێکخستنە تازانە ماوەیەک لە ژێر سەرپەرشتی خۆمان دا ئەمایەوە، ئەگەر بە تەواوی دڵنیا بوینایە لە خاوێنی ڕیزەکانی ئینجا بەرەو ڕوی یەکی لە ڕێکخراوەکانی شار ئەکرانەوە.

ساڵانی ٧٦ - ٧٩ هەزاران تێکۆشەری تازە هاتنە ڕیزی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵەوە بە دەیان شانە، شانەی سەرەکی و ڕێکخراوی تازەیان لە سەرانسەری کوردستان دا دامەزران. سەرکردایەتی بزوتنەوە و. لقەکانی یەکێتی پش هەر یەکەیان لە لای خۆیەوە چەندین تۆڕی ڕێکخستنیان پێکەوە نا بو. یەکێتی ڕێکخراوێکی سیاسی بو زیاتر لەوەی پێشمەرگەیی بێ و. خەباتەکەیشی ئامانجی سیاسی هەبو نەک عەسکەری. هەر لە سەرەتاوە باوەڕمان وابو کە ئەبێ خەباتی چەکدار بو پشتیوانی بێ لە خەباتی سیاسی، چونکە خەباتی سیاسی ئەگەر پشتیوانێکی چەکداری نەبێ بەعس بە ئاسانی ورد و خاشی ئەکات. هەر لە بەر ئەوە ترسی داوودەزگا سەرکوتکەرەکانی بەعس لە ڕێکخراوە نهێنییەکانی شار زۆرتر بو وەک لە ڕێکخراوە ئاشکراکانی پێشمەرگە. بەو پەڕی دڕندایەتیەوە سزراخی ئەکردن و. لە هەرجێیەک سوسەی بکردایە بە گرتن و ئەشکەنجە و کوشتن هەوڵی ئەدا لە ڕەگوڕیشەوە دەریان بهێنێ.

•

ساڵی ٧٦ ڕێکخراوێک لە سلێمانی گیرا ١٢ کەسیان لێ ئیعدام کردن لەوانە: یاسین محەمەد حەسەن، ئیسماعیل قاسم عەلی، محەمەد قاسم عەلی، خەسرەو عەبدوڵلا، نەسرەدین نەجمەدین، مستەفا قادر، سەلاح مەجید، فەرەیدون عەبدولقادر.. ئەمانە

پەیوەندییان لە گەڵ فەرهادی مەلا رەزا کرد بو. فەرهاد زمانی لی دابون.
سەرەتای ۷۷ عەبدوللا حەسەن گیرا و بە ئەشکەنجە کوژرا.
ساڵی ۷۷ ڕیکخراویک لە هەولیر گیرا چەند کەسیکیان لی ئیعدام کردن لەوانە: عوسمان گچکە کە بە ئەشکەنجە کوژرا. پەیوەندییان لە گەڵ موختاری یەکی لە گروەکانی هەولیر کرد بو. موختار زمانی لی دابون.
ساڵی ۷۸ ڕیکخراوی «هەلۆی سور» لە بەغدا گیرا و چەند کەسیکیان لی ئیعدام کردن لەوانە: جوامیر سپامیر، سلطان داود، عەبدولسەلام عەبدولرەزاق، سەلام، شیرزاد. پەیوەندییان لە گەڵ کاوە فاتیح کرد بو. کاوە زمانی لی دابون.
ساڵی ۸۰ ڕیکخراویک لە هەولیر گیرا لەوانە: کەریم رەسول، طەها لەطیف یوسف، ئیسماعیل حەسەن. کەریمیان بە ئەشکەنجە کوشت و ئەوانی تریان ئیعدام کرد. ئەمانە پەیوەندییان کرد بو بە جەلال کاکو. جەلال زمانی لی دابون.
جگە لە مانەی کە بە کۆمەڵە تەگیران، بە سەدان کەسی تر بە بیانوی هاوکاری لە گەڵ ڕیکخستن و هاوکاری لە گەڵ پیشمەرگە تەگیران و زۆر جار لە سیدارە ئەدران.

*

دوای لیکۆلینەوەی هەمو ئەو رووداوانە بۆمان دەرکەوت کە هۆی ئەم ئاشکرابونانە چەند شتیکە:

١. پەیوەندی کردن بە نۆکەرانی داوودەزگا سەرکوتکەرەکانی بەعس.
٢. تیکەڵاوکردنی کاری ڕیکخراوەیی و کاری پیشمەرگەیی.
٣. شیوەی هەرەمیی ڕیکخستن.

بۆ ئەوەی ئیتر ڕیکخراوەکان لە لیدانی دوژمن و قوربانی دانی بی هودە بپاریزین، ریوشوینی نویمان دانا بۆ کارکردن.

*

جیاکردنەوەی کاری پیشمەرگەیی لە کاری ڕیکخراوەیی

ڕیکخراوەکانی کۆمەڵە بو کاری سیاسی تەرخان کرا بون. ئەرکی سەرەکییان بلاوکردنەوەی بیروباوەری کۆمەڵە و پروپاگاندە بو بۆ یەکیتی و جولانەوەکە و، راکیشانی کەسانی تازە بۆ ریزی تیکۆشان. بۆ ئەوەی تووشی لیدان نەبن، ئەمانە تیکەڵاو نەئەکران بە پیشمەرگەی ناو شار.
ڕیکخراوەکانی ناوشار سەرچاوەیەکی گرنگی پیگەیاندنی کادر و پیشمەرگە بون.
هەروەها سەرچاوەیەکی گرنگی ئاگاداری جۆراوجۆر و زانیاری بە نرخ بون لە سەر هەلومەرجی سیاسی، ئابوری، کۆمەلایەتی، سپایی عیراق.
پیشمەرگەی ناوشار لە مەلبەندی تایبەتی دا ڕیکخرا بون. راستەوخۆ بەسترا بون بە لیپرسراوی سەرکردایەتی ناوخۆ یان بە ناوەندی کۆمەڵەوە.

*

گۆرینی شیوەی هەرەمی بە تەزبیع و هیشو

ڕیکخستنی کۆمەڵەش وەکو ڕیکخستنی حیزبی شیوعی لە سەر بنچینەی دابەشبونی ئیداری و ڕیکخستنی هەرەمی لە سەرەوە بو خوارەوە دامەزرا بو. ئەم جۆرە ڕیکخستنە کە بەر لیدانی داوودەزگا سەرکوتکەرەکانی بەعس ئەکەوتن، ئازاری زۆریان پی

ئەگینیشت بە تایبەتی ئەگەر یەکێ لە گیراوەکان یا زیاتر خۆی لە بەر ئەشکەنجەدا پێ نەگیرابە و قسەی بکردایە. لە سۆنگەی ئەمەوە زۆر لە ڕێکخراوە تازەکانی کۆمەڵە، بە تایبەتی لە هەولێر، بەر لێدان کەوت.

ڕێکخستنی «ئەفقی»، مان گۆڕی بە ڕێکخستنی «هێشوویی» و «ئەنیمی»

لە ڕێکخستنی هێشوویی دا بۆ نموونە؛

أ لە سلێمانی دانیشتی چەند کەسێکی ڕێک خست بۆ یەکێکیان ب بوو.

ب لە هەولێر چەند کەسێکی ڕێکخست بۆ یەکێکیان ج بوو.

ج لە ئۆردوگاکانی کەرمیان چەند شانەیەکیان دامەزراند بوو.

لەمجۆرە ڕێکخستنە چەند هێشووی جیاوازی لێ ئەکەوتەوە بێ ئەوەی هیچیان ئەوانی تر بناسێ. لەم ڕێکخستنەدا وەکو گوێ نەئەدرابە شوێن و شار، گوێ نەئەدرابە کار و پیشە و، ژن و پیاو. تێکەڵاو بوو لە پیشەی جیاواز و تەمەنی جیاواز و دانیشتوانی ناوچەی جیاواز.

لە ڕێکخستنی ئەنیمی دا چۆن دەنکەکانی ئەنیمەکە یەک بە یەکەوە بەستراون، لەمیش دا شانە و کۆمیتە نیە و، زەلامی تەنیا لە گەڵ دوو کەس پەیوەندی هەیە یەکێک لە سەرو خۆی و یەکێ لە خواروی خۆی.

هەندێ جار لە ناو هێشووەکانی ڕێکخستن دا بۆ سەلامەتی زیاتر پەیڕەوی ڕێکخستنی ئەنیمیش ئەکرا و، هەردووکیان تێکەڵاو ئەکران.

هەرچەندە پەیوەندی کردن دژوار و زۆری ئەخایاند بەڵام لە چاو هەمو شێوە ڕێکخراوەییەکانی ترا سەلامەت تر بوو. کەمتر دوژمن زەفەری پێ ئەبرد.

*

## کۆبوونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی

دوای کارەساتی هەکاری سەرکردایەتی تووشی جۆری لە هەڵوەشان بوبوو، پێویستی بە ڕێکخستنەوە هەبوو. لە سەرێ بۆ کۆبوونەوەی سەرکردایەتی یەکێتی ئەکرا بوو. داوا لە ئەندامەکانی دەرەوە کرا بە تەهران دا بگەڕێنەوە بۆ کۆبوونەوە. تەهران بێ سەرو بەری تێ کەوت بوو بە ئاسانی هاتوچوی پێ دا ئەکرا. دەستەکانمان لە تەهران هەندێ ئادرێسیان بۆ نارد بوون بۆ ئەو جۆرە هاتوچۆیانە بەکاریان بهێنن. بەو ڕێگایەدا عومەر مستەفا، عومەر شێخموس، کەماڵ خۆشناو، عادل موراد، فوئاد مەعصوم.. گەیشتنە ناوزەنگ.

بار و دۆخی یەکێتی پێداچوونەوەیەکی هەمە لایەنە و قوڵی گەرەک بوو. کاروبارەکانی یەکێتی لەلایەنی زۆریان لێ کەوت بوەوە و، ئەرکەکان زۆر و جۆراوجۆر بوون. دەزگا سەرکردایەتییەکان پێویستیان بە پڕ کردنەوە و بەهێزکردن هەبوو.

لە ناو سەرکردایەتی یەکێتی دا دوو فەیلی بەغدایی: عەبدولرەزاق میرزا عەزیز، عادل مورادی.. تێ دابوو. عەبدولرەزاق ئەجات بوەوە، عادلیش لەم کۆبوونەوانەدا زۆر بوو ڕووشتە تاران.

*

## گەڕەکەی بەکر پیرۆت

شا وەکو دوا چارە، حکومەتەکەی جەنەراڵ ئەزهاری لێ خست. لە ٩ ی کانونی دوومی ٧٩ دا شاپووری بەختیاری کرد بە سەرۆکی وەزیران.

شاپور، تەمەنی ٦٣ ساڵ و، سەرۆکی حیزبی ئیران بو، کە یەکێ لە حیزبەکانی «جبهەی میللی» بو. لە وەزارەتەکەی موسەددیق دا جێگری وەزیری کار و، بە تۆمەتی سوکایەتی بە «مەقامی سەلتەنەت» ٣ ساڵ زیندانی کرا بو. شاپور بەڵێنی گۆڕینی زۆر شتی دا. چونکە لە لایەن شاوە دانرا بو خومەینی دژی وەستا و، داوای کرد درێژە بە قیام بدری. حیزبی ئیران و جبهەی میللی حاشایان لێ کرد. «قیام» تا ئەحات زیاتر تەشەنەی ئەکرد و، گەیشت بوە ئەو کەرتانەی خەڵک کە لە ژیانی کۆمەڵ دا کاریگەر بون، وەکو مانگرتنی کرێکارانی نەوت و، لە ئەنجامی ئەوەش دا کەمبونەوەی دەرهێنانی نەوت و دەرامەتی دارایی ئێران. مانگرتنی کارمەندانی بانکەکان. مانگرتنی رۆژنامەوانەکانی تاران و، راوەستانی هەمو رۆژنامەکان. مانگرتنی کارکەرانی رادیو و تەلەفزیون. سەرەرای مانگرتنی بازار.

لەو سەردەمەدا وڵاخ بۆ راپەراندنی کار و پێویستی بارەگاکانی پێشمەرگە و رەبیە و سەنگەرەکانی هێزەکانی حکومەت هۆیەکی بەنرخی گوێزانەوەی کەلوپەل بو. بارەگاکەی بەکر پیرۆت لە نزیک گۆزەشێر بو. بەرزاییەکانی گۆزەشێر هێزی ئێرانی لێ بو. کەرەکەی بەکر پیرۆت بەڵەسە بوبو هەڵی تیزان بو بۆ گۆزەشێر. سەربازە ئێرانیەکان کەرەکەیان وەکو دەسکەوتێکی بە نرخ، گل دابوەوە بۆ خۆیان. بەکر جوابی بۆ نارد بۆی کەرەکەی بدەنەوە. گوێیان نەدابویە. لە سەر ئەوە چوە سەریان سەربازەکانی گرت و کەرەکەی لێ سەندنەوە. پاش چەند سەعاتێ سەربازەکانیان ئازاد کرد بو.

بەختیار بەیانێکی دەرکرد سامجەلالی ئاوالیار کرد بە دەسەرمردانە کاروباری ناوخۆی ئێران. حکومەتی عێراق جوڵانەوەکەمانی لە «تعتیم اعلامی» یەعنی‌دا خنکاند بو. لە مێژ بو دەزگاکانی راگەیاندن هیچ باسێکی جوڵانەوەی کوردیان نەکرد بو. هەرچۆنێ باسیان بکردبایە هەر پێیان خۆش بو تەنانەت ئەگەر بە هۆی رێکەوتێکی رەهایشەوە بوایە. لە بۆنەیەکی وەها دا شێخ رەزا وتویەتی:

بۆ کەرێ ئیملاتی حەربی کرد لە سەرمان شێخ حەسەن
سەیری کەن یاران! چ گوێڕەندێکی گێڕا ئەم کەرە؟

# ئێران لە دوا قۆناغی ئینقیلاب دا *

لە کاتی قیام دا، شار و ناوچەکانی کوردستان، هەندێکیان ئارام و هەندێکیان جموجوڵێکی کەمی تێ دا بو. لە کاتێک دا لە سەرانسەری ئێران دا ساواک کرا بونە کونەوە و، لە هەندێ جێ داوودەزگاکانیان پێ پێچرا بونەوە، کەچی لە زۆر شوێنی کوردستان ساواک هەروەکو جاران حوکمرانی ئەکرد.

کوردستانی ئێران بۆشایی سیاسی و رێکخراوەیی تێ دا بو. کادرەکانی حدکا هێشتا لە عێراق و وڵاتانی تری ئەوروپا بون. کۆمەڵەی شۆرشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران (سازمان انقلابی زحمتکشان کردستان ایران: سازکا) ژمارەیەکی کەم کادری هەبو، نەیئەویست خۆی ئاشکرا بکات و هەندێ بیروڕای سەیریان هەبو دەربارەی کاری جەماوەری و سیاسی و رێکخراوەیی. رێکخراوە ئێرانیەکانی وەکو حیزبی تودە، جبهەی میللی، چریکی فیدایی و موجاهیدینی خەڵک لە کوردستان نەبون. چەند

مەلایەک لە مەیدانی سیاسی دا چالاک بوون و، خەلک لەوان کۆ دەبوونەوە، وەکو شێخ عیزەدینی حوسەینی لە مەهاباد، مەلا شێخ جەلالی برای لە بانە، ئەحمەدی موفتی زادە لە سنە... کاتی غەنی بلوریان و هەندێ لە گیراوە سیاسییەکان، دوای بەردرانیان، گەڕانەوە مەهاباد، مەلا شێخ عیزەدین ڕێبەری کۆبوونەوەی پێشوازیی کەرەکانی کرد.

بە هەلوەشاندنی ساواک و ڕۆیشتنی شا و، دانانی شاپووری بەختیار بە سەرەوەزیران و، گەڕانەوەی خومەینی و تێکچوونی وەزارەتەکەی بەختیار، بە کردەوە لە کوردستانی ئێران دا دەسەلاتی حکومەت نەما بوو. لە زۆری شارەکانی کوردستانی ئێران دا «شورا» یان لە پیاوە ناسراوەکانی شارەکە پێک ئەهێنا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری شارەکەیان.

*

گەڕانەوەی حدکا

کادرەکانی حدکا دەستیان کرد بە گەڕانەوە بۆ کوردستان. د. ئەورەحمانی قاسملو، سکرتێری حیزب، گەڕایەوە. زۆریان لە قەلادزەوە ئەهاتن و، بە نزیک ئێمەدا تێ ئەپەڕین. بێ ئەوەی خۆیان لە ئێمە بگەیەنن.

تەنیا کەسیان کە لە گەڕانەوەدا لە ناوزەنگ سەردانێکی کورتی کردین «هێمن» بوو. ئەوە یەکەمین جار و دواجار بوو من هێمن ببینم. لە گەڵ مامجەلالْ و هاوڕێکانی تر پێشوازییەکی گەرمان کرد. هێمن لەو سەردانە کورتەدا لە گەڵ من لوتفی نواند، لە ناو قسەکانی دوشتێ باس کرد: یەکێکیان باسی ئەو وتارەی کرد کە لە ۱۹۷۲ دا دەربارەی زاراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد لە لیبنانەوە بۆ حەفتەنامەی هاوکاریم نارد بوو. وای پیشان دا کە بۆچوونەکانی بە دڵ بوون. هێمن ئەو کاتە لە کۆڕی زانیاری کاری ئەکرد. بێگومان ئەمە نیشانەی زیرەکی بوو ئەو هەموو ساڵە ئەمەی لە بیر مابوو. دوەمیان وتی: «شیعرێکم بۆ شەهاب و، شیعرێکیشم بۆ لەیلا قاسم نوسیوە» شیعرەکەی بۆ شەهابی دانا بوو بەیتێکیان تێهەلکێش بوو لە گەڵ ئەوە بەیتێکی نالی کە ئەلێ: «ئەستێرەکانی رادەکێشن وەک شەهابی نور» ئەوەی بۆ لەیلایشی دانا بوو، چوارینەیەک بوو. نازانم بۆ مەجموعەی ئێستە «ئێرتیجالی» دای نابوون، یان پێشتر دای نابوون و لە بەر هەلومەرجی سیاسی عێراق بلاوی نەکرد بوونەوە، چونکە لە هیچ بەرهەمێکی تری دا بلاوی نەکرد بوونەوە.

لەو وتارەدا کە لە سەر «زاراوەکانی کۆڕ» نوسی بووم، پێشنیارم کرد بوو بەر لە داتاشینی وشەی تازە کورد و، بەر لە وەرگرتنی وشەی بێگانە، وشە خۆماڵییەکان کۆبکرێنەوە و ریز بکرێن و بەراورد بکرێن لە گەڵ زاراوە زانستییەکانی زمانەکانی کەدا. ئەوەی هەبوو لە جێ ی دابنرێ و، ئەوەی نەبوو ئینجا وشەی بۆ داتاشرێ یا بخوازرێ. وەکو نمونەیەک لە جێبەجێ کردنی ئەم میتودە بۆ کۆکردنەوەی وشەی کوردی لێرەدا بە یادی مامۆستا هێمن هەندێ زاراوەی جوتیاری کە ئەچێتە خانەی زانستی کشتوکاڵەوە تۆمار ئەکەم.

## گەنم لە داچاندنەوە تا هاڕین

گەنم، بە مادەیەکی ستراتیجی دائەنرێ بۆ ژیانی مرۆڤ و، هەبوونی لە وڵات دا بە ئەندازەی کاڵی ژیانی دانیشتوان، یەکێکە لە مەرجە سەرەکییەکانی دابینکردنی «ئاسایشی خۆراک» کە ئەویش کۆڵەکەیەکی بنەڕەتیی «ئاسایشی نەتەوەیی» ە.

پێش ئەوەی مەکینەی جوت و دروێنە و ئاشی ئاگر دابێ، بەرهەم هێنانی گەنم

کارێکی سەخت بو.
زەوی بۆ ئامادە ئەکرا. ئەرز ئەگەر چەند ساڵێ بێ ئەکێڵرا بێ پێی ئەڵێن: «بەیار»
خالصی بە شێخ محمود ئەڵێ:

بەیار کێڵان و گای لەڕ، پیر و کچ خواستن، ژن و تەدبیر،
سەگ و جۆ، ئەسپ و ئیسقان، جرج و ناو کانی

ئەگەر یەک ساڵ بێ ئەکێڵرا بێ: «بور» ە، ئەگەر یەکجار کێڵرا بێ «شێف»
پێشینان وتویانە: «شەڕ لە شێف و ئاشتی لە خەرمان»
ئەگەر دو جار کێڵرا بێ: «وەرد» ە.
ئەرز بە دو گاجوت یان بە دو ئێستر ئەکێڵرا. دەزگای جوت پێک هات بو لە «گاسن» کە لە ئاسن دروست ئەکرا بۆ کێلان و، بە «هەوجار» ئەبەسترا بە «مژان» و مژانیش بە «ویژانیەر» ئەبەسترا بە «نیر» ەوە. نیر (:نیل، نێڵە) «کەڵسە» ی ملی گاکانی بە یەکەوە ئەبەست. جوتیار بە «ئەقیزە» گاجوتەکانی لێ ئەخوڕی و بۆ هاتندانیان هێز هێزی لێ ئەکردن. پێشینان وتویانە: «هێز هێز حساب نیە، کێز کێز حسابە»
داچاندنی گەنم پشت بە باران ئەبەستێ. پێشینان وتویانە: «چی بچێنی، ئەوە ئەدرویتەوە». دوای «وەشاندنی تۆو» چاوەڕوانی بارانی پەڵە ئەبون. ئینجا گەنم «چەکەرە» ئەکا و سەر دەر ئەهێنێ. پێش ئەوەی گوڵ بکا پێ ی ئەڵێن: «لەرسیل». هەندێ جار کارژۆڵە و بەرخۆڵەی بۆ لەوەڕ تێ ئەکەن. گەنم «پنج» ی لە خاک دایە و «سەروت» لاسکەکەیەتی و «گوڵ» ئەگرێ. پێشینان وتویانە: «بە هێزی گوڵە گەنمێکەوە چەندەها گوڵە مرۆر ئاو ئەخواتەوە». سەری هەمو دەنکێکی «داسو» یەکی پێوەیە.
ئەگەر باران بە ئەندازەی پێویست بباری و خاکەکەی «ریژن» و بە «پیت» بێ، ئەوساڵە «هات» ئەبێ و گەنم بە «بەرشت» ئەبێ. بەرشت لە بەهێن داتاشراوە. گەنم یەکودە یا زیاتری بەرەوە. ئەگەر باران لە ئەندازەی پێویست زیاتر بباری «ژەنگ» لە پنجەکەی ئەدا. ئەگەر لە ئەندازەی پێویست کەمتر بباری، یا ئافەتی بۆ بێ وەکو سوێن و کیسەڵە «شیرە» کەی ئەمژێ ئەبێ بە «کوێرو» و یان گوڵلە کە هەمەی ئەخوا، ئەوساڵە «نەهات» ئەبێ.
ئەگەر زو داچێنرا بێ و، زو گەورە بوبێ «هەراش» ە و، ئەگەر درەنگ داچێنرا بێ و، درەنگ گەورە بوبێ «کێزیە» یە.
بۆ ئەوەی لە چاوەزار بە دور و، لە زەرەری ناحەز و نەیار پارێزراو بێ قورئان لە ناو پەڵەی گەنمەکەدا هەڵئەواسرا و، بۆ ئەوەی چۆلەکە و مەلی زیانەخەرلێ لێ دور بخەنەوە «داهۆڵ» یان دائەنا. داهۆڵ زەلامێکە لە پەڕو دروست ئەکرێ.
کە پێ ئەگەیی دروێنە ئەکرا. بۆ درۆینە خاوەنی گەنم هەندێ کەسی بە کرێ ئەگرت پێیان ئەوت: «پالە» یان «مزور». پێشینان وتویانە: «لە بێ کەسی دا رەجەب سەرپالەیەما». یان لە گەڵ یەکیکا ڕێک ئەکەوت تا لە هەڵگرتنی خەرمان ئەینەوە کاری تێ دا بکا بەرامبەر بە بەشێکی بەرهەمەکەی پێیان ئەوت: «سەپان». پێشینان وتویانە: «شا بە سەپانی خۆی راناگری»، هەروەها: «داس لە سەپان ئەشارێتەوە»، هەروەها: «خزمی خەزووری سەپانی لەتکە هەرمێ ی مالی شێخە»
گوڵە گەنم کە تازە پێ ئەگات و هێشتا لەرییکە، هەندێکی لێ ئەدرون و بە ئاگر هەڵی ئەبرژێنن، ئەبێ بە «گڕنێپرۆزە» (لەرمەغەرمان).

«دروێنە» بە کۆمەڵ «گەلە درەو» یان بە تەنیا ئەکرا. «درەو» بە دەس و بە «داس» ئەکرا. دروێنەکەر بۆ ئەوەی دەستی بریندار نەبێ «قەمخان» ی لە دەس ئەکرد و، بۆ ئەوەی خۆر کاری تێ نەکا «کلاوقوزی» لە سەر ئەکرد. قەمخان لە ئاسن و کلاوقوزی لە لباد دروست ئەکران. لە کاتی دروێنەدا سەپان هەر قولی گەنم کە بە داس ئەبری لە شوێنی خۆیا لە سەر ئەرز دائەنا، پەیان ئەوت: «گزلم» یان «سراڵە». دوای ئەوەی چەند گزلێکی ئەبری کۆی ئەکردنەوە ئەبو بە «مەڵۆ» و چەند مەڵۆیەکی کۆ ئەکردەوە ئەبو بە «شارا». گزلم چەپکێکە بە دەس و مەڵۆ بە باوەش و شارا بە کۆڵ هەڵئەگیرێ. لە شاراکانەوە بە کۆڵ «کێشە» ئەکرێ بۆ سەر «خەرمان». لە هەندێ ناوچە بە خەرمان ئەڵێن: «جۆخین».

جێگای خەرمان لە سەر ئەرزێکی رەق ئامادە ئەکرا و خاوێن ئەکرایەوە «کرشە» ەکان بە خۆی هەڵئەچنران.

«گێرە» بە گا یان بە ئێستر یان بە جەنجەڕ ئەکرا. جەنجەڕ بە ئێستر رائەکێشرا. ئەگەر گێرە بە گا بکرایە سێ تا چوار گایان بە تەنیشتی یەکەوە ئەبەستەوە و «گێرەوڵن» بە ئەڵقەبزە لێ ی ئەخورین. ئەو گایە لە ناوەراستی خەرمانەکەدایە بە کۆڵەکەیەکەوە بەسترلوەتەوە، پێ ی ئەڵێن: «گای بنە».

حاجی قادر لە باسی سوڵتان عەبدولحەمیدا ئەڵێ:

حاکمی رێگری مەعموورەیە، قازی دزی رۆژ،
وزەرا و وکەلا گورگن رەعیەت گەلەیە
بۆ رەعیەت ئەمە، ئەم گێرە و دەرەکەی داناوە
زەجر و تەوبیخی مەکە، چونکی خەتای «گای بنە» یە!

گای بنە ئەگەر راهاتو بێ باش گێرە ئەکا و، ئەگەر خراپ بێ گێرەکە ئەشێوێنێ. «گێرە شێوێن» لەمەوە داکەوتوە.

شوکری فەزلی بە شێخ مەحموود ئەڵێ:

گێرەشێوێنێ کە کای کۆنی بە بادا لە کنت
چاکە هەر لێ ی خۆری، سەیری دەم و کلۆزی ئەکەی!

بە زەلامی زۆرخۆر و بەهێز، بەلام بێ بەرهەم ئەڵێن: «ئەڵێ ی گای گێرەنەکەرە!»

کێشە و گێرە دو کاری سەخت و ئاڵۆز و ماندوکەرن. بۆیە ئەگەر کارێ دژوار بێ ئەڵێن: «گێرە و کێشەی زۆرە!»

دوای ئەوەی خەرمان کوترا و، دان و پوشەکەی لە یەک جیا بوەوە، ئەکرێ بە «تارم» ئێواران بە فێنکی کە «بای شەماڵ» هەڵی کرد «شەن» ئەکرا. پێشینان بۆ پیاوی هەلپەرست وتویانە: «لە هەر لایەکەوە با بێ، ئەو شەن ئەکا». شەن وەکو پەنجەکانی دەس لە شولی دار یان لە ئاسن دروست ئەکرا و، دەسکێکی درێژی هەبو. کوتراوەکە ئەدرایە بەر با. دانەکەی قورسە لە شوێنی خۆی دا بەرئەبوەوە و خەرمانەکە «سور» ئەبو و، «کا» یەکەی سوکە با ئەیبرد و دور ئەکەوتەوە. پێشینان وتویانە: «لە سوری دزراندوە، ئەیەوێ لە لاپای تێ هەڵبهێنێتەوە». «لاپا» ئەو گەلەیە کە با بە تێکەڵەوە بردوێتی.

گەنم بە جیا و کا بە جیا خەرمان ئەکرا. گەلەکە بۆ ئەوەی ئەگەر دزی لێ بکرێ دیار بێ تا ئەگوێزرایەوە بە تەختەیەکی لوسی یان «شەڵڵ» ئەکرا.

هەر لە سەر خەرمانەکە لە پێش دا بە «کەو» (=کڵکێر، سەرەن) گیواویانە گەلەکە

و ئەگوتراوەکەی لێ جیا ئەکرایەوە، ئینجا جارێکی تریش بە «بێژنگ» (: ئەلەیبەر) ئەبێژرایەوە بۆ ئەوەی «سەرکوزەرە»کەی بگرن. پێشینان وتویانە: «لە بیگێژە، بیبێژە، ئینجا بیپێوا». گڵگیر فاشترە لە بێژنگ. پێشینان وتویانە: «بەری ڕۆژ بە بێژنگ ناگیرێت»

حەریق لە ستایشی شێخی بورهان دا ئەڵێ:

بۆ کەناری سەوزەیی دەوری گوڵی ڕوت شین دەکەم

خاکی کۆی عیشقت بە بێژنگی سەرم بێژاوە

دوای پاککردنی ئەپێورا. گەنم بە «ڕبە» و «تغار» ئەپێورا. بۆ ئەوەی بە چاوەوە ئەبێ لە کاتی پێوان دا ژمارەکانیان لە گەڵ ناوێکی پیرۆزدا لێک ئەدا. بۆ نمونە لە ڕبەی یەکەم دا ئەیانوت: «یەک هەر خوایە» و، لە ڕبەی چوارەم دا ئەیانوت: «چوار یاری پێغەمبەر» ئیتر بە مجۆرە.

گەنم بە «تێر» و «هەور» و «جەواڵ» ئەگوێزرایە بۆ ماڵ و، کا بە «ڕەشکە» ئەگوێزرایەوە بۆ «کادان» و تەرخان ئەکرا بۆ ئالیکی ئاژەڵ و ولاخ. پێشینان وتویانە: «ئەوی لە مشک بی جەواڵ ئەدرێ». بۆ زۆرخۆری هەوانتەچی ئەڵێن: «ئەگەر کاکە هی خۆت نیە کادانەکە هی خۆتەدا». بۆ کاری بێ هودە ئەڵێن: «کا لە پوش ئەبژێرێ». بۆ هەڵگەڕسێنەری شەڕ و فیتنە ئەڵێن: «ئاگری بن کا» یە. بۆ یەکێ شتی خەڵکی کە بە خۆرایی ببەخشێ ئەڵێن: «خەڵەبەر لە کا ئەدا»

گەنم هەندێکی هەڵئەگیرا بۆ «بنەتۆو» ی وەرزی داهاتو و، هەندێکی ئەکرا بە «ساوەر» و هەندێکی بۆ خواردنی خۆیان ئەکرایە «کەندو» یا «چاڵ» و هەندێکیشی ئەفرۆشرا.

بۆ هاڕین ئەبرا بۆ ئاش. ئاش بە ئاو ئەگەڕا. ئاشەوان لە نرخی هاڕینی دا پارەی نەئەسەند، بەڵکو «مزە» ی وەرئەگرت. مزە بەشێکی دیاریکراوی «هاراش» ەکە بو گلی نەدرایەوە. پێشینان وتویانە: «ئاش لە خەیاڵێک و ئاشەوان لە خەیاڵێ»، هەروەها: «ئاشی نەزان خوا ئەیگێڕێ»، هەروەها: «ئاش بە نۆرە ئەگەڕێنا».

ئارد بە «هێڵەک» ئەبێژرایەوە و «کەپەک» (: سۆس) ی لێ ئەگیرا.

نالی ئەڵێ:

«دەورانیە، وەک هێڵەکی سەودا، سەری گێژم

بۆیە بە دەقیقی مەشغەلە هەرچی دەبێژم»

ئارد بۆ نان و کەپەک تەرخان ئەکرا بۆ ولاخ. لە ئاردی «بە پیز» نانی باش و لە ئاردی «بێ پیز» نانی خراپ دروست ئەکرا.

## * گەڕانەوەی ئیمام خومەینی

خومەینی لە پاریسەوە تارانی هەژاند بو، گرنگی دەزگای ڕاگەیاندنی ئەزانی. وەکو هەیکەل ئەڵێ: ئەو کاتەی لە نۆفل لۆشاتۆ بو، زۆری کاتی لە بەر عەدەسەی تەلەفزیۆن دا بە سەر ئەبرد، ڕۆژی ٤ تا پێنج گفتوگۆی ڕۆژنامەوانی ئەکرد و، لەو ٣ مانگەدا تا گەڕایەوە تاران زیاتر لە چوار سەد گفتوگۆی ڕۆژنامەوانی لە گەڵ هۆکانی ڕاگەیاندن: ڕادیۆ، تەلەفزیۆن، ڕۆژنامە.. کرد بو. بی بی سی، یەکێ بو لە گرنگترینی ئەو دەزگایانەی

رای گشتی ئێرانی دژی شا و، بە قازانجی شۆڕش ئەرووژان.

ئەو تاکتیکەی خومەینی بۆ یەکخستنی هەموو خەلک دژی شا و، بۆ پیلاپەنکردنی ئەرتەش بە کاری هێنا، تا ئەندازەیەکی زۆر سەرکەوتوو بوو. دەسەلاتی شا و داوودەزگاکانی بەرەو هەلوەشان ئەچوون. خومەینی خۆی ئامادە کرد بۆ گەڕانەوە.

کە وەختی گەڕانەوەی هات، خومەینی لە گەڵ چەند کەسی لە دەسوپەیوەندەکانی لەوانە: ئەبولحەسەنی بەنی صەدر، ئیبراهیم یەزدی، قوطبزادە.. و نزیکەی ۱۰۰ ڕۆژنامەوان بە فرۆکەیەکی «ئێیر فرانس» بەرەو تاران بە ڕێ کەوتن. کەس نەیئەزانی چیهان لی بە سەر دێ: فرۆکەکەیان پەر ئەدرێتەوە، یان بە سەلامەتی لە تاران ئەنیشێتەوە؟ خومەینی لە نهۆمی سەرەوەی فرۆکەکە دوای ئەوەی نوێژی کرد، دۆشەکیان بۆ ڕاخست، ئیتر نوست و، تا گەیشتنە ئاسمانی تاران هەلنەستا. چەند ملیۆن کەس چوو بوون بۆ پیشوازی.

هەندێ شتی سەیر لەم سەفەرە ئەگێڕنەوە، وەکو:

- لەو کاتەدا کە لە فرۆکە دابەزی و پێ ی نایەوە سەر ئەرزی ئێران یەکی لە ڕۆژنامەوانەکان لی ی پرسی: «دوای ئەو هەموو سالە دوورییە کە ئێستا هاتیتەوە بۆ نیشتمانەکەی خۆت و بەمجۆرە پیشوازیت لی ئەکەن، هەستت چییە؟» لە وەلام دا وت بووی: «هیچ!»

- موحسینی ڕەفیقدوست، کە دوایی بوو بە وەزیری پاسداران، ئوتومبیلەکەی ئیمام خومەینی لی ئەخوڕیوە بۆ ئەوەی لە فرۆکەخانەوە بیبا بۆ شوێنی خۆی. لە ڕێگا زەمبەللاحێک قولی خۆی هەلکردوە و، بە خال و میل ئەخشاندوویەتی، دیتە بەردەمیان چەند جاری دەست ئەمالی بە جامی پیشەوەی ئوتومبیلەکەی خومەینی دا و، بە خێر هاتنەوەی ئیمام ئەکا و جنێو بە دایک و ژن و کچی شا ئەدا. چەند جاری ئەمە دووبارە ئەکاتەوە. ڕەفیقدوست جامەکەی لای خۆی دائەداتەوە و، بۆ ئەوەی دووری بخاتەوە بە توڕەییەوە پالی بە کابرارە ئەنێ. ئیمام ئەلی: «بۆ وای لی ئەکەی؟». ڕەفیقدوست ئەلی: «بێ ئەدەبی ئەکا». ئیمام ئەلی: «لی ی گەڕێ با قسەی خۆی بکا، هەر کەسی بە زمانی خۆی عیبادەت ئەکا!»

*

لە بەر قەرەبالغی ڕێگا نەیانتوانی بە ئۆتۆمۆبیل درێژە بە ڕۆیشتن بدەن. بە هالیکۆپتەر چوو بۆ «بەهەشتی زەهرا» و، دوای ئەویش بۆ «حوسەینییە» یەکی تاران. لەویوە کاروباری شۆرشەکەی بەڕێوە ئەبرد. بە گەڕانەوەی پیشەوای شۆرش حکومەتەکەی بەختیار هەرەسی هێنا و، مەهدی بازرگان وەزارەتێکی تازەی لە سەر داوای ئەو دامەزراند.

سەردانی وەفدی یەکێتی لە خومەینی

دوای سەرکەوتنی شۆرش بە چەند ڕۆژێ، لە کۆتایی شوباتی ۷۹ دا دەستەی نوێنەرایەتی یەکێتی کە پێک هات بوو لە: عومەر مستەفا، د. فوئاد مەعصوم، فاضل کەریم لە ناوزەنگەوە چوون بۆ تاران بۆ سەردانی ئیمام خومەینی، د. جەعفەری شەفیعی بەش بۆ تەرجومە لە گەلیان چوو.

پێشتریش لە پاریس وەفدێکی یەکێتی کە پێک هات بوو لە: د. فوئاد مەعصوم، عادل موراد، ئەحمەد بامەرنی لە تشرینی دوومی ۷۸ دا سەردانیان کرد بوو. ئەمجارەیان عادل نەنێرا بوو ئەم وەفدەوە، لەمە نارەحەت بوو.

وەفدەکە، لە دیدارەکەدا پشتیوانی یەکێتی نیشتمانی لە شۆرشی ئێران دەربڕی،

دیدارەکانی پاریسی بە بیر ئەهێننەوە، داوای لێ ئەکەن کە پشتیوانی بکا لە خەباتی گەلی عیراق بە گشتی و خەباتی گەلی کورد بە تایبەتی و، پەیوەستیەکانی جولانەوەکەی ئەخەنە پێش چاو.

خومەینی ئەلێ: «من کابرایەکی روحانیم پاش چەند رۆژێکی تر ئەچمەوە بۆ قوم، ئەو شعانەش ئێوە داوای ئەکەن کاری دەولەتە!»

ئەوانیش تکای لێ ئەکەن دەستور بە دەولەت بدا کارەکانیان بۆ جێبەجێ بکا.

حوسێن ئەوەی خومەینی، ئەو زەمانە زۆر نزیکی باپیری بو، ئەویش لە دانیشتنەکەدا ئەبێ، ئیمام بە حسێن ئەلێ: ئاگاداری دەفتەری بازرگان بکا کارەکانیان جێبەجێ بکەن. لەو کاتەدا موهەندیس مەهدی بازرگان سەرۆکوەزیری ئێران بو.

رۆژی دوایی ئاگاداریان ئەکەن، کە دەفتەری بازرگان کارەکانی بەرەو رووی داریوشی فرووهەر کردوەتەوە سەردانی ئەو بکەن. فرووهەر وەزیری کار و سەرۆکی حیزبی میللەتی ئێران بو. وەفدەکە سەردانی فرووهەریان کرد. پەیوەندی لە نێوان حکومەتی ئێران و یەکێتی دا دروست بو.

قسەکانی خومەینی وەکو «فتوا» حساب ئەکران، لە بەر ئەوە نەئەبو قسە لە قسەکانی دا بکرێ و، مرتالعشەی قسەکانی بکرێ. بۆیە ئەوەی ئێمە بو لای و، پێویستایە باسێکی لە باری سەرنجی خۆیەوە بۆ روون بکاتەوە، ئەبو دەس پێشکەری بکردایە لە قسە کردن دا، بیرووراکانی و خواستەکانی باس بکردایە، دوای ئەو کە خومەینی قسەی ئەکرد، باسەکە کۆتایی پێ ئەهات و دائەخرا. زۆر کەس ئەمەیان نەئەزانی.

*

جولانەوەی کورد لە عیراق دا لەو کاتەدا دابەش ببو. لایەکی بنەماڵەی بارزانی و، لایەکەی تری یەکێتی بو. بنەماڵەی بارزانی و، سەرانی پارتی، تاوانبار بون بەوەی دۆستی شا و هاوکاری ساواک بون، لە ناو ئێران دا بەدناو بون. مەلا مستەفا لە ئەمریکاوە بروسکەیەکی پیرۆزبایی و پشتیوانی بۆ خومەینی نارد، بەلام هیچ رۆژنامەیەکی ئێرانی بلاوی نەکردەوە، ناچار خۆیان بە پارە وەکو «ئیعلان» لە هەندی رۆژنامەی تاران دا بلاویان کردەوە. زۆری نەخایاند بنەماڵەی بارزانی لە گەڵ سەرانی شۆرش و، کاربەدەستانی تازەی ئێران دۆستایەتییان تازە کردەوە.

تازە کارەساتی هەکاری قەوما بو، یەکێتی و پارتی بە خوێنی سەری یەکتری تینو بون. هەردولایان لە لای کاربەدەستانی ئێران هەولیان ئەدا، ئێران بە لای خۆی دا رابکێشێ و لایەکەی تر لە لای ئێران بەدناو بکا. زۆری نەخایاند لایەنی سێهەمیش، کە حسک بو، پەیدا بو. ئەوانیش، بە هۆی محەمەد رەحیم (خاڵە حاجی) وە، گەیشتنە لای سەرانی شۆرش و، دریخییان نەکرد لە هەولدان بۆ بەدناو کردنی هەردولای ناکۆک. بە دوای ئەوان دا هەندێ کەس و تاقمی تریش هاتنە کایەوە.

لە ناو رێکخراوە کوردییەکانی عیراق دا، یەکێتی دو نوقتەی لاوازی هەبو، نەیارەکانی بە ئاسانی ئەیانتوانی لای ئێران بۆ دژایەتی یەکێتی بە کاری بهێنن: یەکەمیان، هاوکاری پێشمەرگەکانی یەکێتی بو لە گەڵ حدکا و کۆمەڵەی زەحمەتکێشان دژی داوودەزگاکانی ئێران. لەم بارەیەوە هەر ئاگاداریەکیان هەبوایە، دوای لێ زیاد کردن و زل کردن، ئەیان گەیاندە کاربەدەستانی ئێرانی. دوەمیان، یەکێتی چەپ بو، لە ناو ئەویش دا

ڕێکخراوێکی مارکسی - لینینی تێ دا بوو، تاوانبار کردنی یەکێتی بە کۆمۆنیزم، کە سەرانی شۆڕش لە ئێران دا بە دوژمنی دین و ئیسلامیان دادەنا، کارێکی ئاسان بوو.

ئەگەر ڕێکخراوە کوردییەکانی عێراق، لە لای ئێرانییەکان دژی یەکتری قسەیان نەکردایە و، نهێنییەکانی یەکتریان بۆ ئێران ئاشکرا نەکردایە، بە دەنگێکی یەکگرتوو داواکانی خۆیان پێشکەشی بەرپرسان بکردایە، بێگومان ڕێزی کوردی عێراق زیاتر دەبوو. لەوانەیش بۆ زۆری داواکانیان کە بریتی بوو لە پشتیوانی سیاسی و یارمەتیدانی مادی دژی بەعس، جێبەجێ بووایە. بەڵام هەرچەند پارتی، بۆ ئەوەی باوەڕی کاربەدەستانی ئێران بە دەس بهێنێ، بۆ ڕاونانەوەی ڕێکخراوەکان و هێزەکانی، خۆی خستە خزمەتی ئێرانەوە.

•

خەڵکی کوردستانی ئێران، بۆ یەکەمین جار بوو، هەست بە ئازادی بکەن. چەندین تاقمی سیاسی لە شارەکانی کوردستان دا کەوتنە هەوڵی پێکهێنانی ڕێکخستن. کادرەکانی حدکا کە تازە گەڕابوونەوە، خەریکی کۆکردنەوە و سازدانی خەڵک و پێکهێنانی ڕێکخراوی ئاشکرا بوون. کادرەکانی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران (سازکا) یش خەریکی پێکهێنانی «ڕێکخراوی چەتر» بوون بە ناوی جیا جیاوە. چریکی فیدایی و، حیزبی تودە و، دەیان ڕێکخراوی تری وەکو: سازمانی موجاهیدین، پەیکار، وەحدەتی کومونیست... خەریکی خۆ ڕێکخستن بوون. ئەمەش ڕەنگدانەوەی هەلومەرجی سیاسی ئاران بوو.

لە ناو ئەم ڕێکخراوانەدا، سازکا، لە چاو ئەوانی تردا لە هەموویان زیاتر کادری خۆشناو و ناسراوی هەبوو، هەر لە ناو ئێران دا مابوونەوە، ناوکێکی پچووکی ڕێکخراوەییان هەبوو. زەمینەی گەشەکردن و پەرەسەندنی ئەمان لە هەموویان لە بارتر بوو، بەڵام بە هۆی جۆری بیرکردنەوەیان و شێوەی کارکردنیانەوە نەیانتوانی ببن بە گەورەترین هێزی کوردستانی ئێران. لە کاتێک دا حدکا بە هۆی ئەو ناوبانگەوە کە لە سەردەمی قازی محەممەد و جمهوریەتی مەهاباد ەوە بە میرات بۆیان بە جێ مابوو، لە ماوەیەکی کورت دا هەزاران کەسیان کۆ کردەوە و، هەزاران چەکداریان ڕێکخست و، توانییان ببن بە حوکمرانی ڕاستەقینەی زۆر شار و ناوچە. ئەم زلبوونە کتوپڕە سەرانی حدکای غەڕرا کرد بوو.

•

## قازی و مەلا

حدکا لە لایەن قازی محەممەد و پ د ک لە لایەن مەلا مستەفاوە دامەزرێنراوە. قازی محەممەد دوای ئیعدام کرانی ئیتر حیزبەکەی ماوەیەک کز بوو، تا سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران خۆی بۆ ڕێک نەخرابوو. بەڵام کەس لە کادرەکانی حدکا هەرگیز بیریان لەوە نەکرد بووەوە کە یەکێک لە بنەماڵەی قازی بکەن بە سەرۆکی حیزبەکەیان. ئەگەرچی زۆر کەسی ناسراویان تێ دا بوو. بە پێچەوانەی پارتی کە هەر لە سەرەتاوە مەلا مستەفا و، دوای مردنی ئەویش کوڕەکەیان کرد، بە سەرۆکی خۆیان. بێگومان ئەمە نیشانەی پێشکەوتنی فیکری حدک ی ئێران بوو لە چاو پدک ی عێراق دا.

•

لەو زەمانەدا پێشنیارمان بۆ سازکا و بۆ حدکا کرد کە:

- ڕۆژنامەیەکی کوردی - فارسی ڕۆژانە لە تاران دەربکەن. پێشنیان پێ دان بۆ

کاریکی وەها ئیمەش هاوکاریمان بکەین.

- یەکیەتی پیشەیی بۆ خوێندکاران، لاوان، ئافرەتان، مامۆستایان.. دروست بکەن.

- لە ناو خۆیان دا تەبا و گونجاو بن و، لە گەڵ کاربەدەستانی تازەی تیهران هەوڵ بدەن بە زمانی نەرم بدوێن و، بە گفتوگۆ کیشەکانیان چارەسەر بکەن.

هەردولایان گالتەیان بە پیشنیارەکانی ئیمە ئەهات. لایان وابو، چونکە ئیمە لە پاش چەندین ساڵ خەبات هیچ سەرکەوتنیکمان بە دەس نەهیناوە، تەجرەبەی کوردستانی عیراق بۆ ئەوە ناشی چاوی لی بکری یا سودی لی وەربگیری و، تەگبیرەکانیشمان بە کەلکی کوردستانی ئیران نایەن.

*

سازکا بە بیانوی ئەوەی کادرەکانی ئاشکرا نەبن، لە باتی ئەوەی ریکخستنیکی سەرانسەری، بە ناوی خۆیەوە، لە هەمو شارەکانی کوردستان دا دابمەزرینی، لە هەر شارە بە ناویکی جیاوازەوە، ریکخراویکی دامەزراند لە گەڵ ریکخراوی شارەکانی تر پەیوەندی نەبو. ناوەکان دریژ و، لە ژیانی سیاسی دا بەلگەی توندرەوی بون. وەکو:

- جمعیت دفاع از حقوق خلق کرد، لە ورمی.
- جمعیت دفاع از حقوق زحمتکشان و حقوق ملی خلق کرد، لە سەقز.
- جمعیت مبارزه برای ازادی و حقوق ملی خلق کرد، لە بۆکان.
- جمعیت دفاع از ازادی و حقوق زحمتکشان، لە نەغەدە.
- جمعیت راه رهائی زحمتکشان در کردستان ایران، لە مەهاباد.
- جمعیت دفاع از ازادی و انقلاب، لە سنە.
- اتحادیه دهقانان مریوان.

*

کەماڵ فوئاد دەربارەی ئەم هەمو ناوە دریژ و جیاوازانە قسەیەکی خۆشی گیرایەوە: کابرایەکی ریبوار لە ریگایەک تۆشی کابرایەکی سنەیی ئەبی، لی ی ئەپرسی: «برا ناوت چیە؟» ئەڵی: «بە ئەلقازگەڵ عەجەم و ئەلقاوگەڵ شیرینەوە، مەرحوم جەنابی باوکم نامی نیاگم موللا محەممەد نەسیمی شەکەری!» کابرا بە تورەییەوە تی ی ئەخوڕی: «ئیژم نامت چەس!» یەکسەر ئەڵی: «حەمە»

حیکمەت لە جیاوازی ناوەکان و، لەم ناوە دریژانە چی بو؟ ئەگەر بۆ ئەوەبی کە خەلک ئەم کومیتانە بە سەربەخۆ لە سازکا و، کاری جەماوەر بزانی، سەرانی سازکا لەوەدا بە هەڵە چوبون. هەمو کەس ئەو کومیتانەی بە دەسکردی سازکا ئەزانی.

*

## پادگانی مەهاباد

رۆژی ۵۷/۱۲/۱ ی تیهرانی، سەرکردایەتی حدکا پلانیکی دانا بە هاوکاری چەند ئەفسەریکی کورد دەستی بە سەر پادگانی مەهابادا گرت. ۱۸ تانک و ۳۶ توپی سەنگین و هەزاران پارچە چەکی تی دا بو. حدکا هیشتا زور لاواز بو نەیئەتوانی بە ریکوپیکی دەست بە سەر کەلوپەلی ناو پادگانەکەدا بگری. خەلک رۆژانە ناوی تالانیان کرد و، ئەوی بۆ حدکا مایەوە تەنیا ئەو شتانە بو کە خەلک پیان نەئەگویزرایەوە. حدکا، وەکو حیزب،

کەلکێکی ئەوتۆی لە چەک و دەسکەوتەکانی ناو پادگان وەرنەگرت، بەڵام ئەم کارە کە تەنیا ٨ ڕۆژ دوای سەرکەوتنی شۆڕش ڕووی دا، دەلالەتەکی گەورەی کردە نێوان سەرانی شۆڕش و کوردەوە، بە تایبەتی حدکا کە، وەکو کاربەدەستانی تاران ئەیانوت، هیچ دەورێکی نەبو بو لە «قیام» دا دژی شا، کەچی دوای سەرکەوتنی «قیام» ڕاستەوخۆ کەوتە دوژمنایەتی «ئینقیلاب».

*

نەورۆزی سنە

ئەحمەدی موفتی زادە، کە لایەنگرەکانی خۆی بە «عەللامە» ناویان ئەبرد، لە سنە بەهێزترین کەسایەتی گوێی لی گیراو بو. دژی ڕێکخراوە چەپەکان بو بە گشتی، بە تایبەتی دژی ڕێکخراوە مارکسیەکان بو، لە گەڵ حدکایش نێوانی نەبو، خۆی لەوان بە زلتر ئەزانی. ئاینپەرستێکی سونی شارەزا بو، کێشەی نەتەوایەتی کوردی بە لاوە گرنگ نەبو. لە دوای سەرکەوتنی شۆڕش بو بو بە ناوەندێکی دەسەلات لە ناو شاری سنە و دەوروپشتی دا. ژمارەیەکی زور ئاینپەرستی لە دەوری خوی بە ناوی «مەکتەبی قورئان» ەوە کۆ کرد بوەوە. کاربەدەستانی شۆڕشی ئێرانیش هەندی ئاخوندی شیعەیان بە نوێنەرایەتی خۆیان نارد بو بۆ سنە، ئەوانیش «دەفتەر» یان دانا بو دەسەلاتەکانیان لە سەرو هەمبو دەسەلاتێکەوە بو، کابرایەک سەرپەرشتی ئەکردن ناوی صەفدەری بو.

حدکا، سازکا، چریکی فیدایی، پەیکار، تودە و زور ڕێکخراوی تریش لە سنە بارەگایان دانا بو چالاکییان ئەنواند.

لە نێوان لایەنگرانی موفتی زادە و لایەنگرانی صەفدەری دا هەندی کێشە ڕووی دابو، بو بو بە هۆی تێکهەڵچونی چەکدار. ئەمە تەشەنەی کرد. خەڵک هەڵیان کوتایە سەر داودەزگاکانی حکومەت. «شەهرەبانی» یان چەک کرد و، چونە سەر «پادگان» ی سنە ئەویش بگرن. پادگانی سنە گەورە و قەرەبالغ بو. هێزی پەلاماردەرەکانیش ناڕێکوپێک و تێکەڵ و پێکەڵ بون. زوری بۆ تالان چو بون. پادگانەکە خوی نەدا بە دەستەوە بەرگری کرد و، لە کرماشانەوە بە هالیکۆپتەر هێزی پشتیوانییان بۆ هات و، نەگیرا. بەڵام شار کەوت بوە دەس خەڵک و، خرۆشانەکە نە نیشت بوەوە. لە تارانەوە دەستەیەکی نوێنەرایەتی پایەبەرز کە پێک هات بو لە: ئایەتوللا سەید مەحموودی طالقانی، ئەبولحەسەنی بەنی صەدر، هاشمی ڕەفسەنجانی.. چون بۆ سنە بۆ لێکۆڵینەوە لە هۆی شەڕەکە و، گفتوگۆ لە گەڵ نوێنەرانی ڕێکخراوە سیاسیەکان.

نوێنەرانی ڕێکخراوە سیاسیەکان لە ناو خویان دا یەکگرتو نەبون، بەرنامەیەکی سیاسی هاوبەشیان نەبو، هەر یەکەیان شتێکی ئەوت و شتێکی داوا ئەکرد، هەموشیان دژی سەرکردایەتی دینیی شۆڕش بون. ئەیانویست لە سنەوە تاران بگۆڕن. سەرەنجام پێکهاتن لە سەر ئەوەی کە دانیشتوانی سنە خویان شورایەک هەڵبژێرن بۆ بەڕێوەبردنی شارەکەیان و، لە تارانەوە کەسیان بە سەردا نەسەپێنن.

لەو ڕۆژانەدا چەندین کۆبونەوەی جەماوەری فراوان کرا بو، نوێنەرانی ڕێکخراوە سیاسیەکان قسە، یان وەکو خویان ئەیانوت «سوخەنرانی» یان تی دا ئەکرد، لە یەکی لەو کۆبونەوانەدا کە دەیان هەزار کەسی تی دا ئامادە بو، غەنی بلوریان قسەی کرد بو. غەنی بلوریان زیاتر لە ٢٠ ساڵ لە زیندانی شادا بو بو، لە ڕۆژانی قیام دا ئازاد بوبو، ئەگەرچی

لە سەرکردایەتی حدکا بو بەلام بە بیروباوەر تودەیی بو، بە هوی سالانی دریژی زیندانەوە لە دنیا دابراو و بی ئاگا بو لە گورانەکانی هەلومەرجی کوردستان. قسەکانی پیچەوانەی چاوەروانییەکانی خەلک و، خواستەکانیان ئەبی. هەزاران کەس بە یەک دەنگ قسەکانی پی ئەبرن و هاوار ئەکەن: «مامە غەنی بلوریان، بچورەوە بو زیندان!»

*

**شەری نەغەدە**

حدکا ویستی بە خوپیشاندانیکی سیاسی - چەکدار بارەگاکەی لە نەغەدە بکاتەوە. بو ئەو مەبەستە لە هەمو شارەکانی کوردستانی ئیرانەوە چەکدارەکانی خوی بانگ کرد بو کوبونەوە لە شاری نەغەدە. زوربەی دانیشتوانی نەغەدە ئازەری و، کورد کەمایەتیە لە ناو شارەکەدا. ئەم خوپیشاندانەی حدکا بو بە هوی ترس و وروژاندنی ئازەرییەکان. چەکدارەکانی ئەوانیش دامەزران. خوپیشاندانەکە بو بە شەری کورد و ئازەری. شەر چەند روژیکی خایاند و، سەدان کەسی تی دا کوژرا و، سەدان مال و دوکانی تی دا تالان کرا. زوری کوردەکانی نەغەدە ئاوارە بون.

ئەم روداوە سەرنجی منی راکیشا. کەوتمە لیکولینەوەی پەیوەندی کورد و ئازەری. کەرەستەیەکی زورم لە لا کو بوەوە. کتیبی «کورد و عەجەم» ی لی پەیدا بو.

*

گرتنی پادگانی مەهاباد لە ٥٧/١٢/١ و، گەمارودانی پادگانی سنە لە ٥٧/١٢/٢٧ و، هەلگیرسانی شەری نەغەدە ٣١ فروردین ٥٨ (٧٩/٤/٢٤) ئەم روداوانە بە دوای یەک دا کە هیشتا حکومەتی شورش خوی نەگرت بو، بیروڕایەکی زور خراپی لە لای سەرانی شورش و کاربەدەستانی تیهران دروست کرد.

بەشدارانی قیام، سەرەرای جیاوازی بیروباوەر و پایەی کومەلایەتییان، تەنیا لە سەر یەک مەسەلە ریک بون، ئەویش: دوژمنایەتی شا بو. نەگینا بەرنامەیەکی پیشەکی یا ئامادەکراویان نەبو بو لوزناغی دوای شا. تەنیا کەس کە بەرچاوی رون و ئەیزانی چی ئەوی خومەینی بو، خومەینی پش لە هەمویان بە دەسەلاتتر بو. ململانی لە سەر دەسەلات لە ناو بالی دینیی دا، ململانی لە نیوان بالی دینیی و بالی نەدینیی، لە ناو سەرکردایەتی شورشەکەدا هیشتا بە لادا نەکەوت بو. جوری رژیمی داهاتوی ئیران و، جوری دارشتنی پەیوەندییەکانی لە گەل دنیای دەرەوە، گرنگترینی کیشەکانی ناو سەرکردایەتی بو. ئەوەی خومەینی و سەرانی تری شورشەکە بیریان لی نەکرد بوەوە: مەسەلەی نەتەوایەتی بو.

شەرەکانی مەهاباد و سنە و نەغەدە، خواستە سیاسییەکانی کورد کە دران بە نوینەرانی حکومەتی شورش و خومەینی، کاربەدەستانی ئیرانی هوشیار کردەوە.

*

## حشع: ئاردی ناو درک

لە ٩ ی نیسانی ١٩٧٣ دا حکومەتی بەعس «پەیمانی دوستایەتی و هاوکاری» لە گەل یەکیتی سوڤیت ئیمزا کرد. ئەم هەنگاوەی بەعس بە لای سەرانی حشعەوە ئەوەندە گرنگ بو، ئیتر هەمو جورە هاوکارییەکی بو حەلال ئەکردن. بەعس بو پتەوکردنی ریزەکانی ناوخویشی ویستی «جبهە» یەک لە گەل پارتی و حشع ئیمزا بکا. لەم جبهەیەدا:

١. بەعس لە بریاردانی سیاسی ناو جبهە و دەولەت دا، «حیزبی قائید» و،

حیزبەکانی تر حیزبی دوەم ئەبون. هەمو رەخنەیەک لە دارودەزگاکانی حکومەت و حیزبی دەسەڵاتدار ئەبو لە ناو چوارچێوەی جەبهەدا ئەبرێتە دەرەوە.

٢. ڕێکخستنی سیاسی لە ناو هێزە چەکدارەکان دا: جەیش، جەیشی شەعبی، شورطە، ئەمن.. بە تەنیا پاوانی بەعس ئەبو. هیچ حیزبێکی کە بۆی ئەبو حیزبایەتییان لێ دا بکا.

٣. ڕێکخراوە پیشەیی و دیموکراتیەکانی کرێکاران، جوتیاران، قوتابیان، مامۆستایان.. ئەبو یەک بخرێن.

٤. حوکمی عێراق لە ڕێگای «مجلس قیادة الثورة» وە بە تەنیا لە دەس خۆی دا ئەبی.

لە ناو سەرکردایەتی پارتی دا هەبو، بە تایبەتی هەندی لەوانەی وەزیر بون، بەشدار بونی لەم جەبهەیەدا بە چاک ئەزانی، بەلام مەلا مستەفا بێ سەودو ڕەتی کردەوە. حشع بەو مەرجە قورسانە بە تەنیا لە گەڵ بەعس چوە جەبهەوە، بەلام «پەروەیەکی سیاسی نابەرامبەر» بو.

*

ساڵی ١٩٧٤ کە شەری بەعس و کورد دەستی پێ کردەوە، دوساڵ زیاتر بو حشع هاوپەیمانی بەعس بو. چالاکی قانونی دەس پێ کرد بو: ڕێکخراوەکانی بارەگای ئاشکرایان لە شارەکان دا دامەزراند بو، ڕۆژنامەی «طریق الشعب» و حەفتەنامەی عەرەبی - کوردی «الفکر الجدید - بیری نوێ» ی لە بەغدا دەرئەکرد و، لە بەرەدا بوبون بە ئەندام و، بە دو وەزیر: عامیر عەبدوڵلا و موکەڕەم تالەبانی، بەشداری لە وەزارەت دا و، بە چەند ئەندامی: یوسف حەننا، شەروان عەلی ئەمین، ئەحمەد حامید قادر، ئەحمەد دلزار، ئیبراهیم حاجی مەحمود، حەمە سەعید حەبیب، قادر ڕەشید، خەیری عەبدولحەمید قازی، مەحمود لەتفی خدر، سامیە شاکیر، لە دارودەزگا کارتۆنیەکانی حوکمی زاتی بەعسی دا (مەجلیسی تەنفیزی و مەجلیسی تەشریعی) دا، بەشداری کرد بو.

حشع لە سەرەتادا هیوای زۆریان لە سەر هاوکاری خۆیان و بەعس هەڵچنی بو، «پەیمانی دۆستایەتی و هاوکاری» لە گەڵ یەکێتی سۆڤیەت و، «ڕێگای ناسەرمایەداری» بەعس و دروشمە بریقەدارەکانی، بە جۆری سەری لە سەرانی حشع شێواند بو، کەسێکی خاوەن ئەزمونی درێژی وەکو عەزیز محەمەدی سکرتێری یەکەمی کومیتەی ناوەندی حیزبەکە، چاوەڕوانی ئەوە بو صەددام حسێن ببێتە «کاسترۆ» ی عێراق و، سەرەنجام حیزبی شیوعی و حیزبی بەعس تێکەڵاو بێن و، بێن بە یەک حیزب.

لە ملمڵانێ ی بەعس و کوردا ساڵی ١٩٧٤، حشع هەمو قورسایی خۆی خستە بەرە لای بەعس. لە سەر ئاستی دنیا، هەوڵێکی زۆری دا، شۆرشی کورد بەدناو بکا و، لە هەمو حیزبە کومونیستی و سوسیالیستیەکانی دنیای دابڕی. لە سەر ئاستی ناوخۆش، هەرچییەکی پێ کرا لە بواری سیاسی، ڕاگەیاندن، چەکدار، تەنانەت کوکردنەوەی دەنگوباس و هەواڵ بۆ حیزبی بەعس و دەزگا ئەمنیەکانی کردی.

*

حشع ساڵی ١٩٣٤ دامەزراوە. لە ١٩٣٤ ەوە تا ساڵی ١٩٧٩، کاتی جیابونەوەی لە بەعس، تەنیا ٣ جار کۆنگرەی گرتوە.

کۆنگرەی سێیەمینی حیزب، لە تەمەنی ٤٢ ساڵی حیزب دا، لە ژێر دروشمی: «دەس لە ناو دەس بۆ پێشەوە بەرەو دامەزراندنی سۆشیالیزم لە عێراق دا» لە ناوەراستی ئایاری ٧٦ دا لە بارەگای، حیزب لە گەرەکی مەسبەح لە بەغداد بە ئامادە بوونی ٣٠٠ ئەندام بەسترا. بەڵگەنامەکانی کۆنگرەکە بە زۆری تەرخان کرا بۆ بۆ پیا هەڵدانی دەسکەوتەکانی حوکم و، بەرە.

عەزیز محەمەد لەو تەقریرەدا کە بە ناوی کۆمیتەی ناوەندییەوە لە بەردەمی کۆنگرەدا خوێندییەوە لە چەند جێگایەکی دا بەمجۆرە باسی جوڵانەوەی کوردی کرد:

- «ویقف فی مقدمة منجزات الجبهة وضع قانون الحکم الذاتی لمنطقة کردستان وتصفیة التمرد الیمینی الرجعی فیها»

- «وان انهیار التمرد الرجعی المسلح خلق امکانیة موضوعیة افضل لتطبیق الحل السلمی - الدیمقراطی للمسألة الکردیة»

د. مەکەرەم تالەبانی، کە ئەوسا یەکێ بو لە دو وەزیرەکەی حشع لە ناو وەزارەتەکەی بەعس دا. لە ستایشی ئەو عەقڵەدا کە بەعس بۆ بەشدارانی جوڵانەوەکەی دەرکرد، سەر وتارێکی بە عەرەبی لە ژێر ناونیشانی: «اشداء علی الکفار رحماء بینهم» بۆ گۆڤاری «رۆژی کوردستان - شمس کردستان» نوسی. لە وتارێکی کەدا کە بە کوردی بۆ هەمان گۆڤاری نوسی بو بە بۆنەی گرتنی دو کۆنگرەی جیاوازی کۆمەڵەی خوێندکارانەوە بە هۆی ناکۆکی یەکێتی و پارتیەوە، ئەم دو لایەنەی شوبهاند بو بە سەگەکانی لەیلان و تەیملو.

پێخۆشحاڵی ئاشکرای حشع بە تێشکانی بزوتنەوەی کورد و، پشتیوانی لە رێککەوتنی جەزائیر، لە لایەک بۆ رازی کردنی سەرکردایەتی بەعس، بە تایبەتی سەددام حسێن و، لە لایەکی ترەوە لە بەر ئەوە بو وای ئەزانی ئەو بۆشاییە گەورەیەی لە ئەنجامی ئاشبەتاڵی سەرکردایەتی بارزانی دا دروست بوە، بەمان پڕ ئەکرێتەوە. ئەمە خەیاڵێکی بەتاڵ دەرچو. بەعس ئەیویست خۆی بۆشاییەکە پڕ بکاتەوە. کە لە مەسەلەی کوردا یەک چار بوەوە و، ئیتر ئیشێکی بە حشع نەما، کەوتە تەنگ هەڵچنین بە ڕێکەکانی حیزب و، ئازاردانی ئەندامەکانی پلەکانی خوارەوە.

کۆمیتەی ناوەندی لە ئازاری ١٩٧٨ دا کۆبونەوەی تەواوی ئەندامەکانی کرد و، راپۆرتێکی درێژی لە سەر هەلومەرجی جیهانی و، عەرەبی و، ناوخۆ بڵاو کردەوە. مانشێتی راپۆرتەکە ئەمە بو: «صیانة التحالف الوطنی وتعمیق المسیرة الثوریة مهمة کل قوی شعبنا التقدمیة».

سەرەتا راپۆرتەکە بەمجۆرە دەس پێ ئەکا:

«شهد العالم خلال السنة المنصرمة - منذ انعقاد الاجتماع الکامل الاعتیادی للجنة المرکزیة فی ١٨/ شباط ١٩٧٧ - استمرارا لعملیة تغیر میزان القوی لصالح القوی الثوریة العالمیة، وفی طلیعتها المنظومة الاشتراکیة.

فقد تحققت فی بلدان المنظومة الاشتراکیة، وفی مقدمتها الاتحاد السوفیتی، انجازات کبیرة فی تنفیذ خطط تطویر الاقتصاد الوطنی علی طریق تعزیز اسس المجتمع الاشتراکی المتطور، وبناء القاعدة المادیة والتکنیکیة للشیوعیة. واحراز منجزات ضخمة فی میادین العلم والتکنیك. وتعزیز القدرة الدفاعیة. وتوطد التلاحم والتعاون الوثیق بین الاحزاب الشیوعیة

في بلدان المنظومة الاشتراكية، ويتعزز التكامل الاقتصادي فيما بينها.»

له باسی هەلوەمەرجی ناوخۆدا دوای ئەوەی سەبارەتی سیاسەتی عێراق ئەکا لە دوژمنایەتی پیلانەکانی ئیمپریالیزم و سەهیونیزم و کۆنەپەرستی دا، باسی خۆش بونی گوزەرانی زۆر لە کەرتەکانی گەل و، پەرەپێدانی مافی شارستانیی ئافرەتان، ئەکا، ئینجا ئەنوسی: «وواصل العراق سياسته المعادية للامبريالية، على الصعيد الدولي، وساند سياسة التعايش السلمي والانفراج الدولي ونزع السلاح، و عارض بحزم سباق التسلح وانتاج القنبلة النيوترونيه. وقدم الدعم السياسي والمادي لحركات التحرر الوطني في اسيا وافريقيا وامريكا اللاتينيه. وكان موقف العراق في منظمه الامم المتحده ووكالاتها والمنظمات العالميه بارزا في الدفاع عن مصالح الشعوب والتصدي للسياسه الامبرياليه.

ان مسيرة العراق التقدمية هذه تثير حقد الدوائر الامبريالية والصهيونية والرجعية، التي راحت تخطط، ضمن الهجمة الشرسة على حركة التحرر الوطني العربية للتآمر على العراق. واصبح العراق هدفا مباشرا لهذا التآمر، خاصة بعد التطورات الاخيرة، في اوضاع المنطقة، اثر زياره السادات للقدس المحتله وتزايد المساعي لاحياء الاحلاف العسكريه الرجعيه - الامبرياليه، وتوريد السلاح الامريكي بكميات هائله ونوعيات متطوره الى الانظمه الرجعيه في المنطقه.

ومما له دلالته الخاصه، بهذا الصدد، اتساع الحمله الفكريه والاعلاميه الامبرياليه - الرجعيه ضد العراق. اذ دابت وسائل الاعلام، بشكل ملحوظ موخرا، في بعض الدول الرجعيه في المنطقه والقوى الرجعيه واليمينيه في الداخل، على السعي لشق الصف الوطني، واثاره الخلافات بين اطرافه، ومهاجمه الجبهه الوطنيه والقوميه التقدميه، والتحالف بين حزب البعث العربي والحزب الشيوعي العراقي. وتسعير العداء للشيوعيه والتشكيك بعلاقات الصداقه والتعاون مع الاتحاد السوفيتي، ومهاجمه تعزيز القدرات الدفاعيه للعراق، والتهديد باثاره المصاعب الداخليه وتقديم المساعدات للعناصر المعاديه للسلطه الوطنيه.»

هەرکەس بە چاوی بەراورد و رەخنەوە لەم راپۆرتە ورد ببێتەوە بەزەیی بە جەماوەری حشع دا دێتەوە، چ سەرکردایەتیەکی هەبوە و، چۆنی سەرکردایەتی کردوە، دەربارەی حیزبی بەعس هەمو بۆچونەکان پێچەوانە دەرچون:

- عیراق لە چوارچێوەی سیاسەتی ئەمریکی دا پەیمانی جەزائیری لە گەڵ شا مۆر کرد بو، بۆ ئەوەی کێشەی کوردی لە کۆڵ بیتەوە و، دەستی بەتاڵ بێ بۆ دوژمنایەتی سوریا، چونکە سوریا لەو کاتەدا دژی ریککەوتنی «فصل القوات» ی ئیسرائیلی - عەرەبی بو.

- عێراق خەریکی دروستکردنی چەکی کوشتنی بە کۆمەڵ بو: چەکی ناوکی، کیمیایی، بایۆلوجی.

- عێراق سیاسەتی پیکەوە ژیان بە ئاشتی نەگرت بو، لە گەڵ دراوسێکانی: سوریا و ئێران ناکۆک بو، زۆری نەخایاند هێرشی کردە سەر ئێران جەنگێکی خویناوی درێژی هەڵگیرساند لە هەردو میللەت سەدان هەزار کەس کوژرا و، سەدان ملیار دۆلار زیانی ماددییان لی کەوت.

- سیاسەتی پەکەیتی سۆڤیەت و پێشکەوتنی ئابوری و تەکنۆلۆجی بە راست دەر نەچو، چونکە ئەویش هەرەسی هێنا و، کە حشع بەو لیدان کەوت نە سۆڤیەت و، نەهیچ

وڵاتێکی تری «مەنظومە» ی وڵاتانی سۆسیالیستی لە سەری هەڵ نەدابە و، لە سەری نەکردەوە.

*

بەعس لەو کاتەوە هات بوونە سەر کار دەستی بە سەر هەموو ڕۆژنامەکانی عیراق دا گرت بوو:

- الثورە، ڕۆژنامەی سەرکردایەتی حیزبی بەعس بوو.
- الجمهوریە، ڕۆژنامەی وەزارەتی ئیعلام، واتە ڕۆژنامەی حکومەت بوو.
- التاخی، ڕۆژنامەی پارتی بوو. دوای دەس پێ کردنەوەی شەڕ بەعس خستیان بە ناوی حیزبە کارتۆنییەکانی کوردەوە دەریان ئەکرد. دواییتر ناوەکەیان گۆڕی بە العراق.
- طریق الشعب، ڕۆژنامەی حیزبی شیوعی بوو.
- هەفتەنامە و مانگنامەی عەرەبی، ئینگلیزی، کوردی، تورکمانی کە لە عیراق دەرئەچوون، هەمویان موڵکی دەوڵەت بوون، ڕۆژنامە و گۆڤاری ئازاد یا موڵکی تایبەتی نەما بوو.
- الراصد، کۆڵکە ڕۆژنامەیەکی عەرەبی بوو لە پاشماوەی ڕۆژنامەکانی سەردەمی عارف، کابرایەکی قەڵەمفرۆش بە ناوی: مصطفى عبداللطيف الفكيكي، ناو بە ناو بە فەرمانی بەعس، بۆ باسی بابەتێکی تایبەتی، بڵاوی ئەکردەوە.

دوای بڵاوکردنەوەی ڕاپۆرتەکەی حشع، «الراصد» هەر چوار لاپەڕەکەی ژمارەی ٤٢٨ ی ڕۆژی ٢٩ ی نیسان - ١٢ ئایاری ١٩٧٨ ی بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم ڕاپۆرتە تەرخان کرد بوو. بە مانشێتێکی گەورە نوسی بوی: «نهج غير موضوعي على حساب الحقيقه: مناقشه نقديه للتقرير السياسي للجنه المركزيه للحزب الشيوعي العراقي». دیار بوو بەعس ئێستر ئیشی بە حشع نەمابوو، گەڕی پێ ئەکرد، حشع ئەبوو لە قیبکەی خۆی تێ بگەیشتایە.

هەموو ئەم مەدح و سەنایە، حیزبی بەعسی ڕازی نەکرد، لە مانگی مایس دا ٣١ ئەندامی حیزبی شیوعی، بە تاوانی ئەوەی لە ناو ڕیزی هێزە چەکدارەکانی عیراق دا ڕێکخستنیان دروست کرد بوو، بە ئیعدام حوکم دا و ئیعدامی کردن و، کەوتە گرتن و ڕاونانی ئەندامەکانی. سەرکردایەتی حیزب چاوەڕوانی هێرشی وەهای نەئەکرد لە بەر ئەوە هیچ پلانێکی نەبوو بۆ خۆپارستن. هەموو هەوڵەکەیان ئەوە بوو عەزیز محەممەد چوو بۆ بینینی صەددام بۆ ئەوەی تکای لێ بکات ئەگەر هەر ئیعدامیان ئەکات، لە ڕۆژی دامەزراندنی حشع دا ئیعدامیان نەکات، بەڵکو جێبەجێ کردنەکەی چەند ڕۆژێ دوا بخات، بۆ ئەوەی ئەو یادەیان لێ تێک نەچی و سوکایەتییان بە سەردا نەیەت. ئەندامانی سەرکردایەتی بە دوای یەک دا چوونە دەرەوەی عیراق. بە وڵاتانی سۆشیالیستی و یەمەن و لوبنان و سوریادا بڵاو بوونەوە. چەند کەسێکیان لە بەغداد و کوردستان مابوونەوە. دەزگاکانی ئەمن شیوعیەکانیان زەلیل ئەکرد، ئەیان گرتن و پاکانەیان پێ ئەکردن و، ئیعترافیان پێ ئەنوسین.

لەو هەلومەرجە سەختەدا کە شیوعیەکانی تێ کەوت بوو، مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی: ئەندامی کومیتەی ناوەندی حشع، لە شوباتی ١٩٧٩ دا گەیشتە ناوزەنگ. مامجەلالی بینی. مەلا ئەحمەد ئەیشزانی حیزبەکەیان بە تەمای چیە و چی ئەکا. لەو کاتەدا دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی لە کوردستانی ئێران دا نەما بوو. حدکا خەریک بوو دەسەڵاتی پەیدا

نەکرد. چو بۆ تیهران لەوێ سەردانی حدکای کرد. بە تەمای ئەوە بو کادر و ئەندامە راونراو و لێقەوماوەکانیان لە کوردستانی ئیران دا نیشتەجێ بکا تا ئاسۆی سیاسی روون ئەبێتەوە و، دەرئەکەوێ کە پەیوەندیەکانی ئیران ئێوان و حیزبی بەعس بە کوێ ئەگا. وا دیار بو حدکا بە دەنگیەوە ئەهات بو. مەلا ئەحمەد گەرایەوە ناوزەنگ بارەگایەکی بچوکی دانا.

سەرکردایەتی یەکیتی هەندێ چەکیان بە دیاری دایە و، خەرجی ژیانی بارەگاکەیانی وەکو هەمو بارەگاکانی تری یەکیتی دابین کرد. تاک و تەرا شیوعیەکان ئەگەیشتنە بنکەکەی خۆیان و، یەکیتی «تەعلیمات» ی دابو بە هەمو ریکخراوەکانی و پێشمەرگەکانی لە هەر کوێ یەک هەر شیوعیەک پێویستی بە یارمەتی بو کۆمەکی بکەن. بە تایبەتی بۆ دەرباز بون لە چنگ داوودەزگاکانی بەعس. لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی حشع: فاتح رەسول و تۆما توماس و، هەندێ لە کادرە ناسراوەکانیان گەیشتنە ناوزەنگ. بەمجورە سەدان شیوعی دەرباز کران و، زۆری پێ نەچو ژمارەیان گەیشتە چەند سەد کەسێ.

مامجەلال و هاوڕیکانی تر بە خۆشیەکی زۆرەوە جیابونەوەی بەعس و حشع یان وەرگرت. یەکەم، چونکە لایان وابو بە هاتنی حشع بۆ شاخ، پشتیوانی یەکیتی سۆڤیت و هەمو حیزبە شیوعیەکانی دنیا لە گەڵ خۆی ئەهێنی بۆ شاخەکانی کوردستان. دوەمیان، بۆچونەکانیان سەبارەت بە حیزبی بەعس و سروشتی رژێمەکەی و، پلشەرزۆی هاوپەیمانیتی شیوعی - بەعس، بە راست دەرچو بو.

*

لە مانگی نیسان دا بەهائەدین نوری و کەریم ئەحمەد بە دوای یەک دا گەیشتنە ناوزەنگ. هەردوکیان لە سوریاوە بە ریگای تاران دا هات بون. ئەوان هاوڕیکانی خۆیان و ئیمەیان ئاگادار کرد کە حشع بریاری داوە خەباتی چەکدار بکا بۆ روخاندنی رژێمی بەعس و، ئەیانەوێ بەرەیەکی سیاسی فراوان لە هەمو هیزە عیراقیەکانی نەیاری بەعس پیک بهێنن. بەهائەدین و کەریم زور نەمانەوە گەرانەوە بۆ تیهران لەوێوە چونەوە بۆ سوریا. مەلا ئەحمەدیش زوری وەختەکە لە تیهران بو، بە زوری فاتیح رەسول لە ناوزەنگ بو.

تا ئەو کاتە جگە لە ناوزەنگ لە هیچ جیگایەکی تر بنکەیان نەبو و، هیشتا مەفرەزەی چەکداریشیان دروست نەکرد بو.

سەرانی حشع بە یەک چاو سەیری یەکیتی و پارتیان ئەکرد. لە ناکۆکی نیوان یەکیتی و قم دا، ئەیانویست دەوری ریش سپی بگێڕن. کەوتنە هەولدان بۆ ئەوەی لە گەڵ قم یش دوستایەتی دابمەزرێنن. لەو ئەو کاتە هیزیکی سیاسی بەدناوی دابراو بو لە هیزەکانی تر، پێویستی بە دوستایەتی حشع هەبو، بۆ ئەوەی ناوبانگی خۆی چاک بکا لە ناو کۆرە پێشکەوتنخوازەکان دا، حشع یش چونکە لە گەڵ بەعس هاوکاری کرد بو دژی شۆڕشی کورد و پارتی، ئەیویست ئەو رابوردوە ناشیرینەی خۆی لە گەڵ پارتی پاک بکاتەوە. راستیەکەیشی حشع پێویستیەکی زوریان بە پارتی هەبو، چونکە ئەوان لە بادینان ئەیانتوانی بۆ کاری حیزبی و هاتوچۆی سوریا، ریگایان بدەن یا ریگایان لێ بگرن.

سەرانی حشع بەرامبەر بەعس باوەریان وابو: بەعس لەو رۆژەوە خراپ بوە کە لە مانی داوە.

لە هەموی سەیرتر ئەوەبو، حشع ئەوسا و ئیستایش خۆی بە نوینەری (تیار) ی دیموکراتی دائەنا. کە هیزەکانی موعارەزەی عیراقی پۆل پۆل ئەکران بۆ (تیار) ی قەومی

عەرەبی، دینی، کوردی.. ئەو خۆی بە نوێنەری تەیاری دیموکراتی دائەنا. لە کاتێک دا کۆمۆنیزم، بە تایبەتی لەو زەمانەدا، باوەڕی بە دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا هەبو نەک بە دیموکراسی.

من خۆم پێشتر هیچ تێکەڵاوییەکم لەگەڵ سەرانی حشع نەبو، کەسم لە سەرکردەکانیان لە نزیکەوە نەدی بو و، نەئەناسی، بەڵام لە سەردەمی «اتحاد الشعب» و «ئازادی» وە تا سەردەمی «طریق الشعب» و «الفکر الجدید» و «الثقافة الجدیدة» بەردەوام ڕۆژنامە و بڵاو کراوە ئاشکرا و نهێنییەکانم خوێند بوەوە و، چاودێری ڕەوتی سیاسی و ناکۆکییەکانی ناو ڕیزەکانیانم کرد بو. زۆر لە هاوڕێکانم کە پێشتر ناوی هەندێ لە سەرکردەکانی حشعی بیست بو، کە دەیان ساڵ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و، مەکتەبی سیاسی بون و، لە سۆڤیەت خوێند بویان و، سەردانی چەندین کۆنگرەی جیهانییان کرد بو، وایان ئەزانی ئەمانە سیاسی زانا و بلیمەت و، فەیلەسوفی هەڵکەوتون، تین و تەوژمێکی سیاسی و ئایدیۆلۆجی بە جوڵانەوەکە ئەدەن. دوای ناسین و ئاشنا بون، وەکو ئەڵێن: «دەنگی دەهۆڵ لە دور خۆشە»، دەرکەوت زۆری ئەمانە کەسانی بێ ئاگا بون لە ڕوداوەکانی کوردستان و عێراق و ناوچەکە و دنیا. سەرچاوەی سەرەکی ڕۆشنبیرییان هەندێ لە نامیلکە و کتێبەکانی «دار التقدم» و، سەرچاوەی ئاگاداری و زانیارییەکانیشیان بەشی عەرەبی ڕادیۆی مۆسکۆ بو.

## جیابونەوەی بزوتنەوە

ئێمە لە خۆشیی ڕوخانی شا و سەرکەوتنی گەلانی ئێران دا بوین، هەزار و یەک هیوای سەوز و سورمان لە سەر هەڵچنی بو، لە پڕ یەکێتی دەلاقەیەکی تێ کەوت.

نەورۆزی ٧٩ ڕەسوڵ مامەند بارەگاکەی خۆی لە زەڵی وە گوێزایەوە بۆ گۆڕەشێر و، د. مەحمود عەلی عوسمانیش لە ناوزەنگەوە چو بۆ لای. بەمجۆرە بزوتنەوە جیابونەوەی خۆی لە یەکێتی ڕاگەیاند و، د. مەحمودیش دورکەوتنەوەی خۆی ئاشکرا کرد و، «بزوتنەوە» و «کۆمیتەی ئامادە کردن»، پێکەوە کەوتنە هەوڵی دروستکردنی حیزبێکی تازە. چەند ڕۆژی بو حازم لە سوریاوە هات بو. حازم ئەو زەمانە «امین سر» ی «قیادەی قطری» ی حیزبی بەعسی سەر بە سوریا و، لێپرسراوی «مکتب شؤون العراق» بو لە «قیادەی قومی» لە شام. هەوڵێکی زۆری لەگەڵ دابون، جیابونەوەکەیان دوا بخەن و، ئەو بکەوێتە ناوەوە بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی نێوان یەکێتی و ئەوان. هەوڵەکەی سەری نەگرت بو.

ئەو تاقمە لەم جیابونەوەیە بە تەمای چەند شتێ بون:

- لایان وابو ئەگەر لە یەکێتی جیا ببنەوە و، سەربەخۆیی سیاسی و ڕێکخراوەیی و پێشمەرگەییان هەبێ، زووتر گەشە ئەکەن و زیاد ئەکەن و، بەهێز ئەبن.
- لایان وابو ئەتوانن خەتی سێیەم لە نێوان جەلالی و مەلایی دا دروست بکەن و، هاوسەنگی نێوان ئەو دو حیزبە تێک بدەن. زۆری پێشمەرگەکانی هەردولا و، ئەندام و کادرەکانیان کە لە ناکۆکی ئەو دولایە و، شەڕی براکوژی بێزار بون، لە مان کۆ ئەبنەوە.

- لایان وابو حکومەتی عێراق ئامادەیە بە ڕێگای گفتوگۆی سیاسی چارەسەری کێشەی کورد بکا، بەڵام یەکێتی بۆ ڕازی کردنی سووریا و ترسی درێژە بە شەڕ ئەدا، ئەگەر ئەمان سەربەخۆ بن بە جیا لە یەکێتی ئەتوانن لە گەڵ بەعس ڕێک بکەون.

بۆ جیابونەوەکەیشیان چەند بیانوێکیان ئەهێنایەوە:

- مامجەلال تاکڕەوە، گوێ ناداتە سەرکردایەتی بە کۆمەڵ، بیروڕاکانی خۆی ئەسەپێنی، تورە ئەبێ و ڕێزی شعوری هاوڕێکانی ناگرێ.

- مامجەلال بە لای کۆمەڵەدا دائەشکێنێ، کۆمەڵە لە سەر حسابی بزوتنەوە بە هێز ئەکا. لە دابەشکردنی چەک و پارەدا زۆرتر بەشی کۆمەڵە ئەدا، کۆمەڵەیش «ماوی» و «متطرف» ن، دژی دین و مەلان و، دژی ئاغا و سەرۆک عەشیرەتن.

هیچ هەوڵ و تەقەلایەک بۆ پەشیمان کردنەوەیان لەم هەنگاوە سەری نەگرت. سوور بون لە سەر هەڵوێستی خۆیان. حەدکایش، بە تایبەتی د. قاسملو، کە ئەو کاتە بوبون بە هێزێکی گرنگ لە ناوچەکەدا، هانی دابون و بەڵێنی دابونی یارمەتییان بدات و کارئاسانییان بۆ بکات.

*

ڕەسوڵ مامەند لە سەرەتادا کە چوە گورەشێر و جیابونەوەی بزوتنەوەی لە یەکێتی ڕاگەیاند، لە ئەندامانی سەرکردایەتی: تاهیری عەلی والی، حاجی حاجی ئیبراهیم، سەید کاکە، قادر عەزیز، مەلا ناسیح و، د. مەحمودیش، قادر جەباری و عەدنان موفتی لە گەڵ ڕۆیشت بو. بە هەمویان ۱۵ . کەسێک ئەبون. جیابونەوەی ڕەسوڵ شتێکی چاوەڕوانکراو بو، بەڵام ڕۆیشتنی د. مەحمود بۆ هەموان کتوپڕ بو، چونکە هیچ کاتی باسی شتی وای نەکرد بو. بەڵام دوایی دەرکەوت د. مەحمود دەستێکی باڵای هەبوبو لە هاندانی ڕەسوڵ و هاوڕێکانی دا بۆ ئەم کارە. ئێمە کە دانیشتین بۆ لێکۆڵینەوەی کێشەکە و، دیاریکردنی هەڵوێستی یەکێتی لێوان، گەیشتینە ئەو باوەڕەی مادەم ئەوان بە هاوخەباتی ئێمە ڕازی نین خواحافیزیان بێ و، هەرکەسێکی کەش ئەڕوا بۆ لایان ڕێگەی لێ نەگرین خوا حافیزی بێ.

ئەم کارە هێزەکانی یەکێتی و ڕێکخراوەکانی بزوتنەوەی لە سەرانسەری کوردستان دا لەت کرد و، پشێوی و ئاژاوەی قوڵی خستە ناو ڕیزەکانی پێشمەرگەوە. پاش چەند ڕۆژێ هەندێ لە فەرماندەکانی پێشمەرگەیش جیابونەوەی خۆیان ڕاگەیاند. بە کردەوە بەشی هەرەزۆری سەرکردەکانی بزوتنەوە و، ڕێکخراوەکانی و کادرەکانی و پێشمەرگەکانیان لێمان جیا بونەوە. عومەر مستەفا مابوەوە، ئەویش کەسی لە بزوتنەوە بە دەورەوە نەبو.

مامجەلال حەزی ئەئەکرد ئەو ڕاستیە بسەلمێنی کە: بزوتنەوە لە یەکێتی جیا بۆتەوە، بەڵکو ئەیوت ئەمە باڵێکی بزوتنەوەیە و بزوتنەوەی ڕاستەقینە لە گەڵ یەکێتی ماون. لە گەڵ کاک عومەر قسەی کرد بۆ ئەوەی بزوتنەوە دروست بکەنەوە. نامەیان بۆ هەندێ لە کادرەکانی شار نوسی کە لە ڕیزی بزوتنەوەدا کاریان ئەکرد و، زۆریان کۆنە جەلالی بون بێنە دەرەوە. بە دوای یەک دا هاتن. لە ڕاستی دا بزوتنەوەکەی ئەمان لە چاو ئەوەی ڕەسوڵ دا لاواز و، تا ڕادەیەک دروستکراو بو، نەیئەتوانی کادر و فەرماندەکانی بزوتنەوە ڕابکێشێتەوە بۆ لای خۆی، هەرگیز نەیتوانی ئەو بۆشاییە لە ناو یەکێتی دا پڕ بکاتەوە کە بە جیابونەوەی ڕەسوڵ و هاوڕێکانی دروست بوبو.

*

### سیروان و زەرینجز

شەوی ٢٩ - ٣٠ ی نیسانی ٧٩ جاشەکانی زەرایەن، بە سەرکردایەتی حەمە خانی حاجی دلرا، بۆسەیەکی گەورەیان لە نزیک ئاوایی زەرینجو لە دەشتی شارەزوور دانا. سیروان (فەیسەل رەشید تالەبانی) و، تالیی لە پێشمەرگەکانی هەرێمی کەرکوک کە لە سەرکردایەتیەوە ئەگەڕانەوە بۆ بەری قەرەداغ کەوتنە ناوی. پێشمەرگەکان لە ناو هەرەبانەی تراکتۆرێک دا سوار بوون. لە بۆسەکەدا ٥ پێشمەرگە: سیروان (فەیسەل تالەبانی)، صدیق ئیبراهیم (حاجی چاوشین)، حەسەن ئەحمەد خاوی بێ، عەلی چەلەبی، نەجات رەحیم کەریم و، دوهاولاتی: کوژران و، ئەوانی تریان زۆر بە زەحمەت دەرباز بوون.

حەسەنخان وەکو دوایی دەرکەوت جاش - پێشمەرگەی پارتی بوو، کە لەم لەو ناوچەیەدا چاند بوی.

سیروان، هاوڕێ ی کۆمەڵە و، یەکێ بوو لە پێشمەرگەکانی مەفرەزەکانی سەرەتای دەسپێکردنەوەی خەباتی چەکدار. لە پێشمەرگایەتیەوە دەستی پێ کرد بوو، بووبوو بە فەرماندەی مەفرەزە و، کەرت و، ئینجا فەرماندەی هەرێمی کەرکوک. یەکێ بوو لە باشترین فەرماندەکانی پێشمەرگە. شارەزاییەکی زۆری لە ناوچەکە و دانیشتوانی و، هێزەکانی دوژمن دا پەیدا کرد بوو. سەرکردایەتی دەیان چالاکی کرد بوو. دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێم بە تایبەتی جەیش زۆر بە داخ بوون لێ ی. لە مایسی ٧٩ دا هاتە ناوزەنگ. ماوەیەک مایەوە، چەند رۆژێکی میوانی من بوو. لەو بێ سەر و بەرەیەدا کە ئێرانی تێ کەوت بوو، زۆری پادگان و پاسگاکان تالان کرا بوون، چەک و تفاقی جەنگ لە بازاڕی شارەکان دا ئەفرۆشران. هەندێ چەکی سووک و ناوڵەیی و نارنجۆک و مین و هۆکی تۆکی مان بۆ هەرێمەکەی کڕی و، گەڕایەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ.

سیروان لە ناو پێشمەرگە و خەڵک دا خۆشەویست بوو، کوژرانی زەرەرێکی گەورە بوو لە کۆمەڵە و یەکێتی.

ئەم خێزانە تێکۆشەرە لە شۆڕش دا زەرەری زۆریان لێ کەوت. جگە لە سیروان، براکانی تری؛ ئەیوب و غەریب و عومەر، هەریەکەیان لە مەیدانێکی تێکۆشان دا کوژران.

•

به بۆنەی مردنی مەلا مستەفاوە:

## مەلایی و جەلالی لە تەرازوودا

رۆژی ۱ ی مارتی ۱۹۷۹ ئاژانسەکانی دەنگوباس بلاویان کردەوە کە مەلا مستەفای بارزانی لە نەخۆشخانەیەکی واشنتۆن کۆچی دوایی کردووە. ئەم هەواڵە چاوەڕوانکراو بوو، چونکە لە مێژ بوو مەلا مستەفا تووشی سەرەتانی سی ببوو. هەر بەو بیانووشە لە تارانەوە چوو بوو ئەمەریکا و لەوێ مابووەوە. رۆژنامەی «دەیلی تەلەگراف» ی لەندەنی لە ژمارەی رۆژی ۳ ی مارت دا نووسی بووی کە بارزانی لە سەر حسابی «سیا» تیمار کراوە. بەلام ق م ئەم هەواڵەی بە درۆ خستەوە و، نووسی کە خۆیان خەرجی نەخۆشخانەکەیان داوە، داوایان لە رۆژنامەکە کرد بە درۆ خستنەوەکەیان بلاو بکاتەوە، رۆژنامەکە پشت گوێی خست.

کۆچی مەلا مستەفا لە کوردستان و، لە ناوچەکە و، لە ناو حیزبە کوردییەکانی کوردستان دا، بە جۆری جیا جیا دەنگی دایەوە.

ناوبانگی مەلا مستەفا و پارتی لە تاران دا باش نەبوو. بە نۆکەری شا و ساواک ناسرا بوون. لە ناو کوردا بە بەرپرسی خوێنی سلێمانی موعینی و چەندین کەس لە کوردەکانی تاران ناسرا بوو. هەر لەبەر ئەوەش لە خۆپیشاندانی شارەکانی کوردستانی ئێران دا، یەکێ لەو هوتافانەی دووپارەیان ئەکردەوە:

قیادەی موەققەتە - گورگە لە ناو میللەتا.

کێ بوو کاک سولەیمانی کوشت؟ بارزانی بوو بارزانی!

لە کۆبوونەوەی نوێنەرانی شورای شارەکانی کوردستان دا لە مەهاباد یەکێ لە داواکانیان لە نوێنەرانی حکومەتی ئێران دەرکردنی سەرانی قیادەی موەققەتە بوو.

مردنی مەلا مستەفا لە ناو ئێران دا بە جۆری جیاواز دەنگی دایەوە. رۆژنامەکانی تاران، بە تایبەتی ئەوانەی لای چەپ بوون، بە خراپی لە سەریان نووسی. لەمەکەریکی حدکا لە رۆژنامەکانی تاران دا دژی قسەی کرد و، کۆمەڵەی زەحمەتکێشان بەیانێکی درێژی لە سەر دەرکرد کردەوەکانی مەلا مستەفای بەرامبەر کوردەکانی ئێران بە بیر هێنا بووەوە. بەلام هەڵوێستی رەسمیی حکومەتی ئێران جیاواز بوو. ریگەیان دا تەرمەکەی لە ئەمەریکاوە بهێننەوە بۆ تاران و، حکومەتی ئێران خۆی بە هالیکۆپتەر گوێزایانەوە بۆ شنۆ و، رێگەیان دا بە پارتی ئەمە بکا بە موناسەبەتێک بۆ خۆپیشاندانی سیاسی و چەکدار.

بنەماڵەی بارزانی و سەرانی پارتی ویستیان ئەم رووداوە بکەن بە بۆنەی کرینەوەی ئابرووی خۆیان. ساڵی ۱۹٤٥ کە بارزانییەکان چوونەتە ئێران بە هۆی نەخۆشی تیفووسەوە چەند سەد کەسێکیان لێ مرد بوو، لە شنۆ نێژرا بوون. تەرمی مەلا مستەفایان بە فڕۆکە هێنایەوە تاران و، حکومەتی ئێران بە هالیکۆپتەر گوێزایەوە شنۆ. پارتی هەر دۆستێکیان لە کوردستانی ئێران دا هەبوو نامەیان بۆ هەموویان نووسی، هەروەها هەموو بارزانییەکان و ئەندامەکانی پارتی و چەکدارەکانیان بانگ کرد لە شنۆ کۆ ببنەوە. مەراسیمی ناشتنی تەرمەکەیان بە جێ هێنا. چەند کەسی بەم بۆنەیەوە شێعریان خوێندەوە و مەسعوودیش لە

پاتی بنەماڵەکەیان سیاسی بەشدارەکانی کرد.

بێگومان مەلا مستەفا یەکێ بو لە گەورەترین سەرکردەکانی کورد لەم قەرنەدا. لە ناو خەڵکی کوردستان دا لە هەمو سەرکردەکانی کە زیاتر پشتیوانی لێ کراوە، لە هەمویان زۆرتر سەرکردایەتی جوڵانەوەکەی کردوە و، لە هەمویان زیاتر لە سیاسەتی ناوەوەی عێراق و، لە سیاسەتی کوردیی دەوڵەتانی ناوچەیی ئێران و تورکیا و، دەوڵەتانی گەورە: بەریتانیا، یەکێتی سۆڤیەت، ئەمەریکادا دەوری هەبوە.

بە زۆر زمانی جیاواز، وتار و نامیلکە و کتێب لە سەر مەلا مستەفا و بارزانییەکان نوسراوە. زۆری ئەم کتێبانە بێلایەن نین، یا دەرویشەکانی بارزانی نوسیویانە بۆ ستایش و پیا هەڵدان، یا دوژمنەکانی نوسیویانە بۆ شکاندن و سوکایەتی پێ کردن. هەتا ئێستا بیۆگرافی مەلا مستەفا و لێکۆڵینەوەیەکی بێلایەن، پشت ئەستور بە بەڵگەکانی کورد خۆی و، بە بەڵگەی ناو ئارشیفەکانی عێراق، ئێران، تورکیا، یەکێتی سۆڤیەت، بەریتانیا و ئەمەریکا، لە سەر خۆی و جوڵانەوەکانی نەنوسراوە. بێگومان ئەمە ناتەواوییەکی گەورەیە لە ڕۆشنبیری کوردی دا.

ئەوانەی هاوچەرخ و هاوکاری مەلا مستەفا بون، کەمیان شتێکی ئەوتۆیان لە سەر نەنوسیوە. هەندێکیان مردون و هەندێکیشیان بە ڕێگاوەن بەرەو مردن. ڕەنگە زۆر مەسەلەی گرنگ کە ڕونکردنەوەی بۆ مێژوی کورد پێویست بێ، بە مردنی ئەمانە بچێتە ژێر گڵ.

بە مردنی مەلا مستەفا دەوری بنەماڵەی بارزانی لە ناو جوڵانەوەی کوردا تەواو نەبو. ناکۆکی نێوان یەکێتی و پارتی هەرما. بۆ تێگەیشتن لە پێشینەی مێژویی ئەم ناکۆکییە لێرەدا بە پێویستی ئەزانم ئاگادارییەکانی خۆم، کە هەندێکیم لە کتێب و سەرچاوەی جۆراوجۆر وەرگرتوە و، هەندێکیم لە هاوکارەکانی بیستوە و، هەندێکیشی خۆم تیا ژیاوم، بەم بۆنەیەوە بگێڕمەوە. خۆزگەم ئەوی ئەم باسەی من ئەخوێنێتەوە، باسەکەی هەژاری موکریانی پێشی ئەخوێندەوە کە کردویەتی بە پاشەکی چاپی تارانی «شەرەفنامە» بۆ ئەوەی تێگەیشتنێکی باشتری لە لا دروست بێ. هیوادارم لە پاشەڕۆژدا کەسانی کە لێکۆڵینەوەی زانستی لە سەر لایەنە جیاوازەکانی ژیانی مەلا مستەفا بنوسن.

*

## شێخ محەممەدی بارزانی

ناوی بنەماڵەی بارزانی لە مێژ نییە کەوتوتە ناو مێژوی سیاسی کوردەوە. ڕیچەڵەکیشیان بۆ دور ناچێ. هەرچەندە هەندێ نوسەری تازەی کورد، ڕیچەڵەکیان ئەبەنەوە بۆ سەر میرەکانی ئامێدی و، لەوانیشەوە بۆ سەر خەلیفەکانی عەباسی، بەڵام جگە لە ئیدیعایەکی بێ بناغەی مەلا مستەفا خۆی، کە لە ساڵانی دوایی تەمەنی دا کردویەتی، هیچ بەڵگەیەکی مێژویی پشتیوانی لەم چیرۆکە ناکا. بێگومان مەلا مستەفا نەوەی خەلیفەکانی عەباسی بێ یا نەبێ هیچ لە مەسەلەکە و، لە هەڵسەنگاندنەکان ناگۆڕێ.

ناوی ئەم بنەماڵەیە، بۆ یەکەمین جار لە سەردەمی شێخ عەبدولسەلام (؟ - ١٩١٤) دا کەوتوتە ناو ناوان.

شێخ عەبدولسەلام برا گەورەی شێخ ئەحمەد، مەلا مستەفا، شێخ محەممەد صدیق، شێخ بابۆ بوە و، کوڕی شێخ محەممەد بوە. شێخ محەممەدیش کوڕی شێخ عەبدولسەلام.

ئەمانە شێخی ئیرشادی تەریقەتی نەقشی بون لە بارزان. لەو سەردەمەدا سەدان خانەقا و تەکیە لە کوردستان دا هەبوە. شێخانی بارزان تەریقەتیان لە شێخانی نەهری وەرگرتوە و، خانەقای بارزان سەر بە خانەقای نەهری بوە. دوای رودلوەکانی ۱۸۸۰ کە خانەقای نەهری تێکچو، شێخ عوبەیدوللای نەهری و کورەکانی دور خرانەوە بۆ حیجاز. خانەقای بارزان نیتر ئازادیەکی زۆرتری هەبوە. بەلگەیەکی نوسراو لە سەر شێخانی بارزان و خانەقاکەیان، کە بگەرێتەوە بۆ سەردەمی پێش شێخ عەبدولسەلام، ژیانی کومەلایەتی، سیاسی، فەرهەنگیان رون بکاتەوە، لە بەر دەس دا نیە. عوسمان صەبری، ئەدیب و سکرتێری پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا، چیرۆکێکی لە سەر مردنی شێخ محەممەد نوسیوە، ئەبێ لە خویانی بیست بێ، چونکە ماوەیەک لە ناو بارزانیەکان دا ژیاوە.

عوسمان صەبری لە ژمارەی ۱۷ ی دوەمین سالی گۆڤاری «رۆناهی» ریکەوتی ۱ ی ئابی ۱۹٤۳ کە لە شام لە لایەن «میر جەلادەت بەدرخان» ەوە چاپ و بلاو کراوەتەوە، ئەم چیرۆکەی بلاو کردۆتەوە.

*

## شێخی بارزانیان چۆن هەلفراند!

ئەمرۆ لە ناو کوردەکانی خوارودا کاتی باسی شێخی بارزان ئەکەن، پیاو شێخ ئەحمەدی بیر ئەکەوێتەوە کە بە خودانی بارزان ناسراوە. ئەم شێخەی کە هەلفرێنراوە، شێخ ئەحمەدی خودانی بارزان نیە، بەلکو شێخ محەممەدی بارکێتی. دەرهەق خودانی بارزانیش، لە ژمارەکانی تردا، من زانینی خۆم ئەنوسم.

ئەم چیرۆکەی کە ئەمەوی بیگێرمەوە، شتێکی خەیالی نیە، بەلکو شتێکی قەوماو و راستە. لە پێشەوە من ئەم چیرۆکەم لە دەمی شێخی گارسی شێخ ئەورەحمان بیست، پاشان دوورودرێژ پرسیم و دوایی کە چومە بنجوێناوانی، لەکانی شێخی گارسی رەحمەتی بە تەواوی راست دەرچو.

شێخ محەممەدی بارزان یەکێ بو لە شێخەکانی تەریقەت، لەو شێخانەی کە نازانن شێخایەتی و موریدایەتی چیە، بە تەنیا لە نەزانیی میللەت کەلک وەرئەگرن و، خۆیان لە ژێر ناوی شێخایەتی دا بە سەر کوردی هەژاردوە ئەکەن بە گەورە و رێگای دەربارێکی شاهانە بۆ خۆیان و رێگای مەزنایەتی بۆ کورەکانیان خۆش ئەکەن. سەرەرای ئەمەش شێخ محەممەد مرۆڤێکی بەرادایی نەبو لە زۆر شێخ چاکتر و باشتر بو. وەک شێخەکانی ترمان ری ی بێ فەرمانیی خوای نەگرتوە، ئەگەر گوناحێکیشی هەبوبێ، ئەوە بو بێ ئەوەی هێزێکی مەعنەوی هەبێ، خۆی بە خاوەن مەعنەویەت پیشان دابێ و لە قەزای زیبار دا زۆر کەسی بە مورید لە دەوری خۆی کۆ کرد بووەوە، هەر ئەم گوناحەش بو کە بو بە هۆی هەلفراندنی.

لە سەرەتای سەدەی بیستەم دا لە قەزای زیبار شێخ محەممەدی بارزان لە ناو عەشیرەتەکانی مزوری، شیروان و بەرۆژیان دا ناوبانگێکی باشی پەیدا کرد بو، خەلکی ئەوی ئەوەندەیان خۆش ئەویست، لە پێناوی شێخ و داخوازییەکانی دا، مردنیان بە بەختیارییەکی گەورە دائەنا. سەرەرای دلپاکی خەلکی، دلچاکی و روخۆشی شێخ ئەم خۆشەویستیەی رۆژ بە رۆژ زیاد ئەکرد. هەمو رۆژێ دوای نوێژی ئێواری، شێخ ئامۆژگاری دینیی موریدەکانی ئەکرد و، دژواریی رۆژی قیامەت و ئاگری دۆزەخی بە بیر ئەهێنانەوە.

شێخ، ڕۆژێ لە ڕۆژان لە ناو ئامۆژگارییەکانی دا باسی ڕاپەڕینی جەنابی مەهدی ئەکا، لەوێ دا یەکێ لە مورییدە بە ساڵاچووەکان ناو و سیفەتەکانی مەهدی و چۆنیەتی و دەمی ڕاپەڕینی لە شێخ ئەپرسێ. شێخ بەم جۆرە وەڵامی مورییدەکەی ئەداتەوە:

- مەهدی، لە دوای پێغەمبەر چاکترین یاری خوایە، ناوی محەممەدە، ملی لە هی هەموو کەس درێژترە، گرنای ڕومەتی نووری لێ ئەباری، هەروەک شمشێر نایبڕێ تفەنگیش کاری تێ ناکا، کاتی هەڵسانی زۆر نزیکە. ڕەنگە ئەمڕۆ هاتبێتە دنیاوە. ئەو ڕۆژەی کە خوا فەرمانی پێ ئەدا دەرئەکەوێ..

مورییدێکی تر هەڵئەستێ و ئەپرسێ:

- قوربانا بەو شێوەیەی کە ئێمە لە شێخمان بیست، جەنجاڵیش وەک مەهدی هەڵئەستێ و کەرەکەیشی زۆر خێرایە، ئەتوانێ بە ڕۆژێ ڕێگای ساڵێک بڕێ. گەلۆ، جەنابی مەهدی چۆن لەم زاڵمە ڕزگار ئەبێ؟

بێگومان ئەو کاتەی شێخ باسی جەنجاڵ و کەرە خێراکەی بۆ مورییدەکانی کرد بوو، شێوەی ڕزگار بوونی مەهدی بە بیردا نەهات بوو، بەڵام وا یەکێ لە مورییدەکان ئەپرسێ و پرسیارەکەیش ئەبێ وەڵامی بدرێتەوە. ئەزانین لە لای شێخان نیەا کاتێ شێخ بینی هەموو گوێگرەکان چاویان لێ بڕیوە و چاوەڕوانی وەڵامێکن، شێخ بێ ڕامان ئەڵێ:

- ئەفڕێ، ئەفڕێ کورم ئەفڕێ...

لە هیچ کتێبێک دا حیکایەتی فڕینی مەهدی نیە. بەڵام بۆ ئەوەی شێخ خۆی بە ئەزان پیشان ئەدا ئەمەی وت مورییدەکانیش باوەڕیان پێ کرد، بەڵام نازانم خوایش ئەم درۆیەی لە شێخ قبووڵ ئەکرد یا نە.. ئەمە لە سەرەتاکانی شێخ دا ئەبینین. دوای ئەوەی شێخ ئامۆژگارییەکانی تەواو ئەکا لە مزگەوت دەرئەچێ و ئەچێ بۆ دیوەخان.

ئەوانەی کە ماڵی شێخی بارزانیان بینیوە ئەزانن شوێنی دیوەخانی شێخ چەند بەرزە. قاتی خوارەوەی مزگەوتە، هی دووەم خانەقایە (تەکیە) و، هی سێیەمیش دیوەخانە.

کاتێ شێخ لە مزگەوتەوە ئەچێ بۆ دیوەخان، مورییدەکان لە ناو خۆیان دا لە سەر ئامۆژگارییەکانی ئەو ڕۆژەی شێخ (سیفەتەکانی مەهدی) ئەدوێن. ئەیانویست بزانن کە ئەم سیفەتانە لە کێ دا هەیە. لە بەر ئەوەی ئەو سیفەتانەی شێخ باسی کرد بوون هەمووی لە خۆی دا هەبوون، هەندێ لە مورییدەکان ئەڵێن: هەیی و نەیی شێخی ئێمە خۆی مەهدییە. هەندێکی تریان ئەڵێن: کەی شێخ ڕاستیی لە ئێمە شاردۆتەوە تا ئەمڕۆ لێمان بشارێتەوە، ئەگەر ئەو مەهدی بوایە خۆی پێی ئەوتین. لە سەر ئەم قسەیە برای گەورە ئەڵێ:

- ئەی نایەتە بیرتان کە شێخ وتی: «دەمی ڕاپەڕینی زۆر نزیکە، لەوانەیە ئەمڕۆ هاتبێتە دنیاوە و ئەو ڕۆژەی کە خوا فەرمانی پێ ئەدا دەر ئەکەوێ». بەڵێ شێخ، مەهدی خۆیەتی، بەڵام بە فەرمانی خوا دەرئەکەوێ.

برای دووەم لە سەر قسەکەی سوورە کە شێخ مەهدی نیە. ئەم گفتوگۆیەیان درێژە ئەکێشێ و لە هەردوو لا کەسیان ناتوانێ ئەوی تر بهێنێتە سەر قسەی خۆی. ئەوسا ڕیش سپییەک لە مورییدەکان بە هەردوو برا ئەڵێ:

- کە عەقڵ هەیی پێویست ناکا بەم شێوەیە بە گژ یەکتری دا بچن. نایەتە بیرتان شێخ وتی: تفەنگ کار لە مەهدی ناکا. وەرن بچین بۆ دیوەخان بیدەینە بەر تفەنگ، ئەگەر مەهدی بێ گوللە نایبڕێ.

ئەم ئاللەی بارزان بیری لەوە نەکرد بووە کە ئەگەر شێخ مەهدی نەبێ، بۆچی ئەمرێ.
ئەمە بە بیری هەردوو برایش دا نەهات. قسەی هەمویان لە سەر ئەم تەگبیرە ئەبێ بە یەک.
شەش پیاو تفەنگەکانیان هەڵئەگرن و ئەچنە دیوەخان. لە پڕ هەر شەشیان لوولەی تفەنگەکانیان لە شێخ ئەکەن و پەلەپە ئەخەنە سەر پەلەپیتکە.

لە دەنگی تفەنگان و راچڵەکینی دوای ئەو، شێخ تێگەیشت کە ئەمانە بە بێ بەختی ئەیکوژن. بۆیە یەکسەر هەڵئەستێ و را ئەکا. مورییدەکان لە بەر دەرگا ئەیگرن. سەیر ئەکەن هەمو گوللەکان بە جلەکانی کەوتون و بە لەشی نەکەوتون. دوای ئەم تەجروبەیە ئیتر گومانیان نامێنێ کە شێخ مەهدییە.

بەلام هەندێک لە مورییدەکان دیسان نایانەوێ باوەر بەمە بهێنن، بۆیە لە نێوان ئەمان و ئەوانی تر (ئەوانەی باوەریان بە مەهدیەتی شێخ هێناوە) ئەبێ بە دەمەقاڵێ. ئەوسا ئەو ئاللەی کە رێگای تفەنگ بە شێخەوە نانی پێشانی مورییدەکان دابو ئەکەوێتە بەینیان و ئەڵێ:

- ئایا ئەم قسانەی ئێوە پێویست بەم دەمەقاڵێیە ئەکا! نایەتە بیرتان شێخ وتی: مەهدی ئەتوانێ بفڕێ! وەرن با تاقی بکەینەوە.

ئەم قسەیە ئەچێ بە مێشکی هەمویان دا و پێکەوە ئەچنە لای شێخ و بەم شێوەیە داواکەیانی پێ ئەڵێن:

- قوربانا زۆرمان باوەرمان وایە کە شێخ مەهدییە. بەلام هەندێ بێ ئیمان لە ناو ئێمەدا هێشتا باوەر بەمە ناهێنن. ئەمانەوێ شێخ ئەم گومانەیان لە دڵ دەرکا!

- من چۆن ئەتوانم ئەم گومانەیان لە دڵ دەربکەم و کێ پێ ی وتون کە من مەهدیم!

- قوربانا دڵی ئێمە هەمو ئەڵێ تۆ مەهدیت. ئەی شێخ نەبیستوە دڵی چل موسوڵمان لە سەر هەر شتێک بێ بە یەک ئەو شتە راستە و درۆ نیە؟ هەر گومانێ لە دڵی هەندێ لە مورییدەکان دا هەبێ ئەتوانی تۆ بەم فڕینە لە دڵیان دەربکەی.

- کوڕە ئێوە چەن ئەحمەقن، من چۆن ئەتوانم بفڕم!

ئەوسا ئاللەکەی بارزان، ئەو مورییدەی کە پێشتر رێگای تەجروبەی تفەنگەکەی پێشانی هاورێکانی دابو، ئەڵێ:

- گەلی مورییدانا لە بەر ئەوەی دەمی راپەڕینی مەهدی هێشتا نەهاتوە، بۆیە شێخ خۆی ئاشکرا ناکا، بەلام ئێمە ئەتوانین تاقی بکەینەوە. وەرن با دەست و قاچی شێخ بگرین و لە سەر خانەقاوە بەری بدەینەوە خوارێ! ئەو کاتە ناچار ئەبێ بفڕێ!

هێشتا ئاللەکەی بارزان قسەکەی تەواو نەکرد بو مورییدەکان دەست و لنگی شێخ ئەگرن و بێ ئەوەی گوێ بدەنە داد و هاواری ئەو رەبەنە لە سەر خانەقاوە ئەیهاوێژن بۆ خوارێ.

شێخ محەممەد کە زەلامێکی کەلە بو بە سەلامەتی ناگاتە حەوشە. هەردو دەست و قاچێکی و ملی و پشتی لە شەش جێگاوە ئەشکێ و شێخ بە راستی ئەبێ بە مەهدی! دوای ئەوەی وەتان پشت و ملی شێخ شکا بو، ئیتر پێویست ناکا بڵێن رۆژی دوایی گیانی بە گیانکێش سپارد و و لەشی بە گۆڕا ئەو کاتە ئەم شێخ ئەحمەدەی کە بە خوداتی بارزان ناسراوە تەمەنی شەش ساڵ بو. عوسمان سەبری

*

ئەم چیرۆکە هەندێ لایەنی باوەڕی بارزانیەکان و شێخەکانیان ڕوون ئەکاتەوە. عوسمان صەبری وەکو بەڵێنی دا بو لە ژمارەکانی ترا زانیاریەکانی خۆی لە سەر خودانی بارزان بنوسی، بەڵێنەکەی بە جێ نەهێناوە. هۆکەی چی بوە، دیار نیە.

ئەم چیرۆکە ڕاست بێ یان هەڵبەستراو، ئیهالەکەی لە ئەستۆی عوسمان صەبری دایە، کە بە درێژایی ژیانی و هەتا مردیش دڵسۆزی مەلا مستەفا بو.

*

## شێخ عەبدولسەلام

لە دوای مردنی شێخ محەممەد، شێخ عەبدولسەلامی کوری لە جێگای دانیشت. عەبدولسەلام برا گەورەی شێخ ئەحمەد، محەممەد صدیق، شێخ بابۆ، مستەفا بو. بارزان گوندێکە کەوتوتە نێوان ڕەواندز و ئاکری و سنوری تورکیا و لە بەینی هەردو ڕوباری زێ ی بادینان و ڕوکوچک دایە.

شێخەکانی ئەوی تواتی بویان هەندێ لە عەشیرەتەکانی دەوری خۆیان لەوانە؛ شیروانی، دولەمەری، مزوری، بەروژی، نزاری و، بەشێکی گەردی و هەرکی بنەجی، بهێننە سەر باوەری خۆیان. ئەوانەی چوبونە سەر ڕێ و ڕەوشتی شێخی بارزان، خۆیان بە «میللەت»ێک دائەنا کە دڵسۆزی و گوێڕایەڵی بو شێخی بارزان پێکەوەی ئەبەستن. لەناو خۆیان دا هاوکاری یەکتریان ئەکرد، بەدەنگ یەکەوە ئەچون و ژن و ژنخوازیان تەنها لەناو خۆیان دا ئەکرد. بە شێخی «بارزان» یشیان ئەوت «خودان» کە بەرزترین دەسەڵاتی دینی و دنیایی ئەوان بو. «خودان» واتەی خاوەن و، جۆرێکە لە «صاحب الزمان» ی شیعە.

شێخ عەبدولسەلام پیاوێکی هەڵکەوتو بوە. لە سەردەمی ئەودا بارزان ئەهەمیەتی پەیداکرد، نفوزی زیادی کرد، «خودان» بو ئەهێشتنی زوڵمی کومەلایەتی لەناو میللەتەکەی خوی دا هەندێک ڕیفورمی ئابوری، کومەلایەتی کرد، مولکیەتی زەویزاری هەڵوەشاندەوە کردیە خاوەنیتی گشتی هەموان، ژن و ژنخوازی ئاسان کردو مارەیی هەڵگرت. هەوڵی دا عشیرەتەکانی ژێر دەستی خۆیان چەکدار کەن. بارزان بوبوە پەناگای زورلێکراوان.

شێخ عەبدولسەلام نێوانی لەگەڵ مەسیحیەکان خۆش بو، حورمەتی ئەگرتن و، لەگەڵ میسیونێرەکانی ئینگلیزیش براپان: «ویگرام» دوستایەتی خۆش بو. لە کتێبەکەیان دا: «کوردستان: بێشکەی شارستانیتی» باسی ئەم دوستایەتیە ئەکەن.

شێخ عەبدولسەلام پەیوەندی لەگەڵ ڕێکخراوە سیاسیە کوردیەکانی ئەستەمول هەبوە، کە دوای ئینقیلابی عوسمانی (١٩٠٨) دامەزرابون، بە تایبەتی لە گەڵ شێخ عەبدولقادری شەمزینی، کە ئاشنایەتیەکی دێرینەی بنەماڵەییان هەبوە. بڵاو کراوەکانی ئەم ڕێکخراوانە ئەگەیشتە خانەقاکەیان لە بارزان.

یەکێ لە هەوڵە نیشتمانیەکانی شێخ عەبدولسەلام تەلەگرافێکە کە بو کاربەدەستانی عوسمانی ناردوە دەربارەی هەندێ مافی ڕوشنبیری و بەڕێوەبەرایەتی و دینی کورد، پێ ئەچێ ئەمەی بە هاندان و بۆ پشتیوانی لە شێخ عەبدولقادری شەمزینی بوبێ، کە ئەوسا پێشەوای بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد بوە لە ئەستەمول.

دالدەدانی زورلێکراوان لە بارزان و ڕەفتاری خودان لەگەڵ میللەتەکەی و، ڕیفورمەکانی کە بوبون بە هوی پەژارەی سەروکی عەشیرەت و شێخەکانی دەوروپشتی و،

گازاندەی بەردەوامی ئەوانە لەوەلغاری خۆدانی بارزان لە لای کاربەدەستانی تورک، هەروەها ناردنی ئەم تەلەگرافانە و کەمبوونەوەی دەسەلاتی عوسمانی لەناوچەکە، کاربەدەستانی عوسمانی لە موسل تووڕە ئەکاو، بڕیار ئەدەن شێخی بارزان تەمێ بکەن و ناوچەکە بهێننەوە ژێر دەسەلاتی حکومەت. فەریق محەممەد فاضیل پاشای داغستانی سەرکردایەتی هێزێکی گەورەی عوسمانی ئەکا بۆ هێرشی سەر بارزان. عەشیرەتەکانی دراوسێی بارزان نەک هاوکاری عەبدولسەلام ناکەن، بەلکو ئالیکاری عوسمانی ئەکەن بۆ داگیر کردنی ناوچەکە. بارزانیەکان چەند ڕۆژێک بەرەنگاری هێرشەکە ئەکەن. سەرئەنجام خۆیان پێ ڕاناگیرێ. شێخ عەبدولسەلام خۆی ئەشارێتەوە پەنا ئەباتە بەر مارشەمعون لە هەکاری. مارشەمعون دالدەی ئەدا. داگیرکەرانی بارزان داگیرئەکا، هەندێ لە گوندەکانی تالان ئەکاو ئەسوتێنێ و، هەر کەسێ بەردەس ئەکەوێ بە دیلی ئەیبا بۆ موسل. لەناو دیلەکان دا مەلا مستەفا و دایکی ئەگیرێن.

شێخ عەبدولسەلام بە نهێنی گەڕایەوە بارزان چەکدارەکانی لەپەنای شێرین کۆکردەوە. کەوتە پەلاماردانی هێزەکانی عوسمانی، ناچاری کردن لە ناوچەکە بکشێنەوە. والی نوێ ی موسل بە نەرمی لەگەلی جولایەوە، کەوتە گفتوگۆ لەگەلی. دیلەکانی بەردان. هەندێ زەرەری بۆ بژاردن. ژیانی ئاسایی گەڕایەوە بۆ ناوچەکە.

لە ١٩١٣ دا والی موسل سولەیمان نەظیف، کە ڕوشنبیرێکی کوردی «ئیتیحاد» ی بو، هێزێکی گەورەی نارده سەر بارزان بۆ گرتنی شێخ عەبدولسەلام. سەرخێلەکانی کورد، بە تایبەتی فارس ئاغای زیباری، هاوکاری لەشکری تورکیان کرد. شێخ ئەمجارەش خۆی نەدا بە دەستەوە و سەرلەنوێ خۆی شاردەوە. بە نهێنی چو بۆ ڕاژان بۆ لای سەید طەهای شەمزینی و، سەردانی سمکۆی کرد و، پێکەوە چون بۆ تفلیس بۆ دیتنی جێنشینی ئیمپەری ڕوسیا، بۆ ئەوەی داوای پشتیوانی لێ بکەن. کاربەدەستانی تورک خەلاتیکیان دانا بۆ بۆ ئەو کەسەی شێخ عەبدولسەلام بە زیندویەتی یا بە مردویەتی بگرێ. شێخ لە گەڕانەوەدا لە گوندێکی ناوچەی سۆما برادوست لە لایەن کابرایەکی شوکاکەوە لەگەل ٣ پاسەوانی دا بە فێل لە خەو دا گیران، و لە پایزی ١٩١٤ دا لە «سیرو» تەسلیمی کاربەدەستانی عوسمانی کردن. لەوێوە بە گیراوی برانە زیندانی موسل. پاش محاکەمەیەکی ڕوکەش لە ١٤ی کانونی یەکەمی ١٩١٤ دا شێخ عەبدولسەلام و هاوڕێکانی لە دار دران.

*

شێخ ئەحمەد

لەپاش هەلواسینی شێخ عەبدولسەلام، شێخ ئەحمەدی برای جێگای گرتەوە.

شێخ ئەحمەد دوەمین کوڕی محەممەد و، براگەورەی محەمەد صدیق و شێخ بابۆ و مەلا مستەفا بو.

شێخ ئەحمەد سالی ١٨٩٦ لە بارزان لە دایک بوە، سالی ١٩١٤ کە عەبدولسەلامی برای لە موسل هەلواسرا، شێخ ئەحمەد لە جێگەی ئەو بو بە «خودانی میللەتی بارزان».

شێخ ئەحمەد خوێندەواری نەبو، بەلام لە بەڕێوەبردنی کاروباری بارزانیەکان دا شارەزا بو، جێگەی بڕوای هەموویان بو، گوێڕایەلیی بێ چەند و چونیان ئەکرد، تەنانەت مەلا مستەفاو براکانیشی کە ئەچون بۆ زیارەتی ئەبو لەبەردەمی دا بە «چۆک» دا ئەبون. بەلام

TÜRKEI
SYRIEN
IRAN
Hakkari
Reza'iye
Maragha
Cizre
Zakho
Amadiya
Dohuk
Aqra
Oshnowiya
Miyandu ab
Mahabad
Rawanduz
Tell Afar
Mosul
Sinjar
Arbil
Raniya
Qala Diza
Saqqez
Koi Sanjaq
Bana
Makhmur
Altun Köprü
Chuarta
Kirkuk
Sulaimaniya
ash-Sherqat
Chamchamal
Qara Dagh
Halabja
Tuz
Kifri
Tekrit
Qasr-i Shirin
Khanaqin
Samarra
Shahabad
al-Haditha
al-Miqdadiya
al-Khalis
Ba'quba
Mandali
Hit
ar-Ramadi
Habbaniya
al-Falluja
Bagdad
پایتەخت
شارێکە دانیشتوانی زیاتر لە ١٠٠٠٠٠
شارێکە دانیشتوانی کەمتر لە ١٠٠٠٠٠
شارۆچکە
شاخ
ڕووبار
دەریاچکە
سەد
جادە
خەتی شەمەندەفەر
بیری نەوت
کوردستانی عیراق
2 500 000
0
100 km

رۆشنبیریی گشتی نەبوو، شارەزای کاروباری سیاسی کوردستان و عێراق و دنیا نەبوو، هەروەها شارەزای کاروباری جەنگی نەبوو. پاپەخشیشی پێ نەئەدا. هەوڵی ئەدا خۆی و عەشیرەتەکەی لە کاروباری سیاسییەوە نەگلێن، بە گۆشەگیری دوور لە کارتێکردنی دەوروپشت بژین.

لەسەردەمی عوسمانی دا بە هۆی هەڵواسینی براکەی و لەشکرکێشی عوسمانییەکانەوە بۆ سەر ناوچەکەیان، هەڵوێستی لە حکومەت سلبی بوو. بەڵام پێی نەئەکردن و دوای هاتنی ئینگلیزیش ١٩١٨ دیسان هەڵوێستی لە پەرستنی دەسەڵاتی حکومەت سلبی بوو. بە ئاگاداری ئەم هەندێ لە بارزانییەکان بەشداری دانانی ئەو بۆسەیە بوون کە لە ١٤ ی تشرینی دووەمی ١٩١٩ لە «بیرە کەپرە» بۆ حاکمی سیاسی موسڵ کولۆنێل بیل و حاکمی سیاسی ئاکری کاپتن سکوت دانراو هەردووکیان کوژران. لەدەمی بەسەراگرتنی شاری ئاکریش دا بەشدار بوون. هەروەها تۆشی چەن تێکهەڵچوونی چەکدار بوون لەگەڵ ئاسوورییەکان کاتێک ئینگلیز نیەریست لە ناوچەکانی ئەوان دا نیشتەجێی یان بکەن. دوای ئەوە زیتر لە بارزان گۆشەگیری هەڵبژارد، خۆی لە کاروباری سیاسی و حکومەتی هەڵنەئەقورتاند.

شێخ ئەحمەد هەوڵی دا نەریتەکانی شێخەکانی بارزان دایان هێنا بۆ پێچەوانەیی، هاوکاری یەکتری، دامەزراندنی پەیوەندی لەسەر بنچینەی دادپەروەری و وەکیەکی، گوێڕایەڵی بێ چەن و چوونی میللەت بۆ خوێندن، پارێزکاری میللەتی بارزان لە تێخزانی نوفوزی حکومەت و بیروباوەڕی دەرەوە. هەوڵی ئەدا میللەتی بارزان وەکو کۆمەڵێکی داخراو بێنێتەوە، نوفوزی دەوڵەتی تێ نەبێت، لەبەر ئەوە؛ دژی دامەزراندنی دەسەڵات و دەزگا ئیدارییەکانی حکومەت و، دژی دامەزراندنی قوتابخانە و، دژی تێکەڵاوی بوو لەگەڵ کاربەدەستانی حکومەت لە شارەکان. تەنانەت براکانی نەئەخستە بەر خوێندن بۆ ئەوەی فێری خوێندەواری نەبن. هەروەها دژی چالاکی پارتایەتی بوو لەناو بارزانییەکان دا.

شێخ ئەحمەد نوێژ و حەجی لە سەر بارزانییەکان هەڵگرت. ئەمەش لە لایەن دراوسێکانیەوە بە لە دین دەرچوون دائەنرا.

ناوچەی ژیانی بارزانییەکان ملبەندێکی شاخاوییە، ئەرزی کشتوکاڵی کەمە، بەروبومی زۆری نییە. سازوچێنین و کەزکردنەوەی تووی کنگر و، ئاژەڵداری، بە تایبەتی راگرتنی بزن، یەکێک بوو لە سەرچاوەکانی ژیانیان، لەبەر ئەوە لە سەر مەسەلەی لەوەڕگا و پاوان هەمیشە لەگەڵ عەشیرەتەکانی دراوسێ یاندا: برادۆست، زیباری، سورچی، هەرکی، ڕێکانی کێشەیان بوە.

*

## شۆڕشی بارزان ١٩٣١ - ١٩٣٢

لە هاوینی ١٩٣١دا برادۆستییەکان هێرشێکیان کردە سەر گوندەکانی: کرکال، کرلەک، بابکی، لە ناوچەی شێروانییەکان، هەندێ خانوویان سووتاندن، ئاژەڵ و گاو گوتاڵیان بە تاڵان بردن. هێزێکی بارزانییەکان بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفا چوون بە دویان دا، لە دەشتی هیرتی پەلاماریان دان تاڵانییەکانیان لێ گێڕانەوە.

زانجیرەیەک تێکهەڵچوونی چەکدار لە نێوان برادۆست و بارزانی دا رووی دا مەلا مستەفا کە برا بچوکی شێخ ئەحمەد و براکانی تری بوو وەکو فارمانی ئەو شەڕانە ناوی دەرکرد. قائیمقامی زیبار بۆ ئاشتی کردنی هەردوو عەشیرەت سەرانی هەردووکیانی بانگ

کرد، شیخ ئەحمەد چونکە لە کۆنەوە لە حکومەت بەدگومان بو، هەروەها گومانی نەکرد کە قائیمقام بەلای دوژمنەکانیان دا دایشکێنێ، خوی نەچو، بەلکو یەکی لە براکانی لە جێگەی خوی نارد. لە بەهاری ۹ ی کانونی یەکەمی ۱۹۳۱ دا هێزێکی جەیشی عێراقی کە پارەگاکەی لە «بلە» بو بە سەرکردایەتی عقید برلی العسکری دەوری گوندی بارزانی گرت و داوای لە شیخ ئەحمەد کرد خوی بەدەستەوە بدا. شیخ ئەحمەد ئامادە نەبو خوی بەدەستەوە بدا، بارزانیەکان هەلیانکوتایە سەر هێزەکانی عێراق و شکاندیان.

جەرجولی سیاسی بە هوی زستانەوە راوەستا. لە ۱۲ ی کانونی دوەمی ۱۹۳۲ دا ئەنجومەنی وەزیران بە بەهانەی یاخی بونی شیخ ئەحمەد و پەلاماردانی ئەو عەشیرەتانەی سەریان بو دەسەلاتی حکومەت دانەنواندوە و، بە بەهانەی نەدانی باجەوە.. بو دامەزراندنی «أدارە مدنیە منظمە» کە مەبەستی مەخفەری پولیس و دەزگای مدیری ناحیە بو بریاری دا جەیش بنێرێتە سەر بارزان، جێبەجێ کردنیشی سپارد بە وەزارەتەکانی دیفاع و کاروباری ناوخو.

لە ۱۰ ی مارتی ۱۹۳۲ دا وەزارەتی داخلیە ئینزاری شیخ ئەحمەدی کرد کە لە ماوەی ٤ روژدا بو دەربڕینی گویرایەلی و دلسوزی بو حکومەت لە بەردەمی قائیمقامی زیباردا ئامادە بی، هەروەها حاکمی سیاسی ئینگلیزیش هەمان داوای لی کرد. بەلام شیخ ئەحمەد ئامادە نەبو بچی چونکە ئەترسا بیگرن، بەلکو خوی بو بەرگری ئامادەکرد. لە ۱۵ ی مارتی ۱۹۳۲ هێزی زەمینی عێراق بە یارمەتی فروکەکانی بەریتانیا هەلیان کوتایە سەر بارزان، ئاوایەکان زەرەری زوریان لی کەوت، بەلام نەیانتوانی شیخ ئەحمەد بگرن، وە نەیانتوانی بەتەواوی دەست بەسەر ناوچەکەدا بگرن. دو فروکەی بەریتانی کەوتنە خواری، یەکێکیان فروکەوانەکانی تی دا مرد و، ئەوی کەیان دو فروکەوانی بە پەرەشوت لی دابەزی و گیران. کاپتن هولت بو بەردانی فروکەوانەکان چو بو دیەنی شیخ ئەحمەد، لەبەرامبەر ئازادکردنی ۲۵ بارزانی گیراودا بەردران. دوای ئەو شیخ نوروەینی بریفکانی بە نوێنەرایەتی حکومەتی عێراق چو بو گفتوگو لە گەل شیخ ئەحمەد. شیخ ئەحمەد هیچ خواستی سیاسی یا نەتەوەیی لە حکومەت نەبو، بەلکو ئەیویست: «عفو» بکری و وازیان لی بهێنن لە شوێنی خویان بژین، حکومەت دەست وەرنەداتە کاروباری ناوچەکەیانەوە، لە ناکوکی ئەوان و عەشیرەتەکانی تردا بەلای دوژمنەکانی دا دانەشکێنێ. بەلام حکومەت هیچ یەکی لە خواستەکانی قەبول نەکرد و، داوای خوبەدەستەوەدانی بی مەرج و، ریگە نەگرتن لە دامەزراندنی دەزگاکانی پولیس و ئیدارەیان لی کرد.

دوای چەند پێکدادانێک جەیش لە ۱۸ی مایسی ۱۹۳۲ دا بە بی شەر بارزانی گرت و پێشرەوی کرد بو چەند شوێنێکی تر. شیخ ئەحمەد بریاری دا خاکی عێراق بەجێ بهێلی و بچێتە تورکیا. نامەیەکی مالئاوایی بو قائیمقامی زیبار نوسی. لەگەل ٤٠٠ خێزان روژی ۲۲ ی حوزەیرانی ۱۹۳۲ پەرینەوە گوندی گرانە لەناو تورکیا کە سەربازگەیەکی تورکی لی بو. لەوی چەکەکانیان دانا. کاربەدەستانی تورک شیخ ئەحمەدیان بردە ئەنقەرە، چەن مالێکیان گویزانەوە ئەرزروم، پاش ماوەیەک مەلا مستەفا بارزانیەکانی کەیان ریگە دا بگەرینەوە ناوچەی شەمزینان.

لەشکرکێشی جەیشی عێراق دژی شورشی بارزان ۳ مانگ و ٥ روژی خایاند. ٦ فەوجی پیادە و ۲ بەطریەی چیایی و کەتیبەیەک سوارە بەشدار بون کە هەموی ئەیکردە:

٢٠٥ ئەفسەر و ٤٤٣٧ سەرباز. بە هەمووی ٤٨ کەسیان لێ کوژرا (لەوانە ٣ ئەفسەر) و ٧٨ کەسیان بریندار بوو. لە شۆڕشگێڕانی بارزانیش ١٩ کەس کوژراوە.

*

## لێبووردنی گشتی و دوور خرانەوەی شێخەکانیان

تورکیا و عێراق و بەریتانیا کەوتنە گفتوگۆ بۆ دیاریکردنی چارەنووسی بارزانییەکان. سەرەنجام عێراق لە ١٣ ی نیسانی ١٩٣٣ دا «لێبووردنی گشتی» بۆ دەرکردن. مەلا مستەفا و شێخ محەممەد صدیق و ئۆلیەگ لە گەڵ ٢٠٠ کەسی کە لە ٢٩ ی حوزەیرانی ١٩٣٣ دا لە شیروانی مەزن خۆیان بە دەستەوە دا. دوای ئەوانیش شێخ ئەحمەد گەڕایەوە.

عێراق شێخ ئەحمەدی لە موسڵ دەس بەسەر دانا و پاش ماوەیەک ڕێگەیان دا بگەڕێتەوە بارزان. تاقمێک لە بارزانییەکان بەسەرکردایەتی خەلیل خۆشەوی بە چەکداری لە ناوچەکەدا مابوونەوە، تەسلیم نەئەبوون، چونکە بەر لێبووردن نەکەوت بوون. عێراق ئەترسا سەرلەنوێ ڕاپەڕینێکی چەکدار بقەومێ. شێخ ئەحمەد و براکانیان بانگ کردنە موسڵ لەوێ دەسبەسەر گل درانەوە، بۆ دابینکردنی ژیانیان حکومەت مووچەیەکی کەمی بۆ بڕینەوە. لە کۆتایی ١٩٣٦ دا گوێزرانەوە بۆ بەغداد و لە وێوە برانە ناصرییە. کە جەنگی جیهانی دووەم هەڵگیرسا، بەریتانیا ئەیویست کورد ئارام بکاتەوە و لەگەڵی نەرم بێ، شێخ ئەحمەد و براکانی لەسەر داوای خۆیان لە ناصرییەوە، کە شارێکی عەرەبی بوو، گوێزرانەوە بۆ سلێمانی، کە شارێکی کوردی بوو (١٩٣٩)، ئەوسا دوورخراوەکان بە ژن و پیاو و، گەورە و منداڵەوە ٨٦ کەس بوون.

*

## بارزانییەکان لە سلێمانی

مەلا مستەفا بە منالی ئەخرا بوو بەر خوێندن. هەرگیز خوێندنی مەلایەتی نەخوێند بوو، لای هیچ کەس و لە هیچ مزگەوتێکیش دا «ئیجازە» ی مەلایەتی وەرنەگرت بوو. مەلایەتییەکەی لە ئاژناوێک زیاتر نەبوو. ئەو ماوەیەی لە سلێمانی بوو هەندێ دەرسی لای مەلا عەبدوڵڵای چرۆستانی و هەندێ دەرسیشی لای مەلا مستەفای صەفوەت خوێند.

مەلا مستەفا ناتومێد بوو لەوەی ڕێگای بدەن بگەڕێتەوە سەر جێگاوڕێگای خۆی لە بارزان، خۆیان تەعیین کرد بوو بە «قزڵچی غاپات»، و هەندێ لە خزمەکانیشی بە «حەسحەسی شەو». ئەو مووچەیەی بۆیان بڕی بوونەوە بەشی ژیانی نەئەکردن. بیری لەوە کردەوە بە بێ موافەقەتی حکومەت بە نهێنی بگەڕێتەوە بارزان و، زوو بۆ حکومەت بەهێنێ ڕێگای شێخ ئەحمەد و بارزانییەکان بدا بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان. شێخ لەتیفی حەفید لەمەدا یارمەتی دا. چەند کەسێکی بۆ هاودەنگی و شارەزایی لە گەڵ نارد، لەوانە محەمەی ساڵە سوور، مەجیدی قالەی حەمامچی، تا بە لای پێنجوێن دا، بە نهێنی بیگەیەننە بانە لە دیوی ئێران.

مەلا مستەفا ڕۆژی ١٢ ی تەمووزی ١٩٤٣ سلێمانی بەجێ هێشت بەرەو بانە و مەهاباد و بە لای ئەشنەوەدا بۆ ناوچەی شنۆ و، لە وێوە چووەوە ناوچەی برادۆست لە دیوی عێراق و ڕۆژی ٢٨ ی تەموز گەیشتەوە بارزان.

مەلا مستەفا لە ڕێگای گەڕانەوەی دا بۆ بارزان، چەند کەسێکی لەو بارزانیانەی لە

گوندەکانی نزیک ئەفعەدە و شنۆ دانیشت بون، لە گەڵ خۆی برد بوەوە و، لە پرادۆستیش تالیی بارزانی لە حکومەت قاچاخ بون ئەوانیشی دزیبوەوە. ئەمانە هەمو پەکیان گرتەوە.

مەلا مستەفا، بە هۆی ئامیر مەخفەری شیتنەوە خۆی هەواڵی بۆ حکومەت نارد گەوا: گەیشتۆتەوە ناوچەکە و، لە بەر خراپی هەلومەرجی ژیانیان و، رەفتاری کاربەدەستان هەلاتوە، نیازی شەر و خراپەی نیە و، ئامادەیە بە گفتوگۆ هەمو گیروگرفتەکان چارەسەر بکا. حکومەت خواستەکانی مەلا مستەفای پشت گوێ خست و، شیخ ئەحمەد و بارزانیەکانی لە سلێمانیەوە دور خستەوە بۆ حیللە.

بە درێژایی مانگی ئاب و ئەیلول بە ناوچەکەدا گەرا، تا ئەمات هێزەکەی زیادی ئەکرد. مەلا مستەفا کە زانی حکومەت گوێ ی ناداتی کەوتە گوشاربردن. لە مانگی تشرینی یەکەم دا کەوتە پەلاماردانی مەخفەرەکانی ناوچەکە. هەندێ لە بارزانیەکان بو بون بە پۆلیس، لەم مەخفەرانەدا بلاو بوبونەوە، ئەمەیش کارەکەی مەلا مستەفای ئاسان ئەکرد. مەخفەرەکانی: شانەدەر، خیرەزۆک، بیرەکەپرە، زێت، چەمێ، سەلکێ، مێرگەسۆر، نەرگوس، طیل، شنگیل، کانی بۆت، بیدیاڵ، شیروان، ریزان، شیتنە، بیدارون، کانی رەش.. گیران. بارزانیەکان پر چەک بون و هێزەکەیان گەورە بو. بەلام مەخفەرەکانی: مێرگە سور، بارزان، بلە، کە لە وانی تر گرنگتر بون نەگیران. عیراق لیوایەک سەربازی جەیشی نارد بۆ مێرگە سور. ئەم لیوایە رۆژانی ٦ و ٨ و ١٠ ی تشرینی دوەمی ٤٣ بە پشتیوانی فرۆکە، چەند هێرشێکی کرد، بەلام لە هەمویان دا شکا. راستیەکەی چەند ئەفسەرێکی کوردپەروەر لەم لیوایەدا بون، لەوانە: نوری مەلا مارف، ئەورەحمان قازی، نوری مەلا حەکیم، نوری ئەحمەد طەها.. بە نهێنی هاوکاریان لە گەڵ مەلا مستەفا ئەکرد.

*

پیوەندی و گفتوگۆ لە نێوان مەلا مستەفا و کاربەدەستانی عیراقی و بەریتانی دا دەستی پێ کرد. داواکانی مەلا مستەفا لە سنوری گیروگرفت و خواستەکانی عەشیرەتەکەی دەرنەئەچو. داوای ئەکرد: رێگای شیخ ئەحمەد و بارزانیەکان بدرێ بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان و، لەو سەردەمەدا کە خوراک بە هۆی جەنگی جیهانیەوە بە «کارتی تەموین» دابەش ئەکرا، بەشی ئەمانیش ئازوقەیان بۆ دابین بکرێ. فەرمانبەرانی تەموین لەو کاتەدا باریان بە قورتی هەژاران ئەکرد.

*

## حیزبی هیوا و شۆرشی بارزان

حیزبی هیوا، گەورەترین رێکخراوی سیاسی ئەوسای کورد، ویستی گەشە بە جولانەوەکە بدا لە بزوتنەوەیەکی خێلەکی دابراوەوە بیگۆرێ بۆ بزوتنەوەیەکی سیاسی نەتەوەیی. پەیوەندی لە گەڵ مەلا مستەفا دامەزراند. بۆ پشتیوانی لە شۆرش و تاوانبار کردنی حکومەت لە بەغداد بەیانی دەرئەکرد و، پیرخەرەوەی بە سەفارەتی دەولەتە گەورەکان ئەدا.

جولانەوەی کورد لە و زەمانەدا بێ پێشەوا بو. بۆشایی سەرکردایەتی تێ دا دروست ببو. شیخ مەحمود لە کوردستان دور خرابوەوە و، دەستی لە کاری سیاسی هەلگرت بو. رەفیق حیلمی کە بو بو بە سەرۆکی حیزبی هیوا، لە ناو حیزبەکەی دا جێگای پێ لەق ببو، حیزبەکەیشی خەریک بو هەلئەوەشا. کەسێکی وا هەلنەکەوت بو ئەم بۆشاییە پڕ

بکاتەوە. لەو کاتەدا کورد پێویستی بە یەکێ بوو، یان وەکو ئەو زەمانە وتویانە بە «زەعیم» هەبوو، ڕێبەری بکا. حیزبی هیوا و ئەفسەر و ڕوشنبیرەکانی کورد ئەم «زەعامەت»ە، یان بە شیاوی مەلا مستەفا ئەزانی و، هەر ئەو زەمانە بە «زەعیم مەلا مستەفا» ناویان ئەبرد.

*

لەو کاتەدا هێشتا دووەمین جەنگی جیهانی بە لادا نەکەوت بوو. پشێوی و ناتارامی بە قازانجی بەریتانیا نەبوو. بەریتانیا داوای لە مەلا مستەفا کرد، دەس لە شۆڕش هەڵبگری، هەڕەشەی لێ کرد، کە درێژەدان بە شۆڕش دژی عێراق، واتە دوژمنایەتی بەریتانیا و دەوڵەتانی هاوپەیمان و، داوای لە حکومەتی عێراقیش کرد کێشەکە بە خۆشی چارەسەر بکا.

*

نوری سەعید، لە ۲۵ی کانونی یەکەمی ٤۳ دا وەزارەتێکی نوێ ی پێک هێنا. ۳ کورد لە وەزارەتەکەی دا بوو. دووانیان: ئەحمەد موختار بابان و عومەر نەظمی، پێوەندییان بە جولانەوەی کوردەوە نەبوو، بەڵام سێ یەمیان، سیاسی ناسراوی کورد: ماجید مستەفا بوو، کە ماوەیەکی درێژ هاوکاری شێخ مەحموود بوو لە شۆڕشەکانی دا و، دواییتر پاش کوتایی شۆڕشەکانی شێخ مەحموود چوو بوە ناو دەزگای بەڕێوەبەرایەتی عێراقەوە. کرایە وەزیری دەوڵەت. چارەسەرکردنی کێشەی کورد بەم سپێردرا.

*

ماجید سەردانی شێخ ئەحمەدی کرد لە حیللە. داوای لێ کرد یەکێ لە کوڕەکانی بنێری بۆ لای مەلا مستەفا بۆ ڕاگرتنی شەڕ و دانانی ڕێوشوێنی گفتوگۆ. شێخ ئەحمەد، محەممەد خالیدی نارد و، دوای موافەقەتی مەلا مستەفا، ڕۆژی ۲۹ی کانونی یەکەمی ٤۳ گەڕایەوە. بە دوای ئەمەدا ماجید مستەفا ڕۆژی ۷ی کانونی دووەمی ٤٤ چوو بۆ سەردانی مەلا مستەفا لە مێرگە سوور. ماجید دوای یەک ڕۆژ گەڕایەوە بەغداد.
ماجید مستەفا لە دیەنی بارزانی دا هانی دابوو، کە لە باتی خواستنی ناوچەیی داوای مافی نەتەوەیی بکا و، ئەفسەرەکانی پەیوەندی پێش هەمان ئامۆژگاری و داوایان لە مەلا مستەفا ئەکرد و، پێیانیان ئەدایە هاوکاری بکەن و، لە جموجۆڵی جەیش و حکومەت ئاگاداریان ئەکرد.
دوای ئەمە ئیتر، ناوەڕۆکی شۆڕشی بارزان خەریک بوو ئەگۆڕا. ئەگەر تا ئەوسا شۆڕشێکی خێڵەکی بوو، دژی زوڵمی کۆمەڵایەتی و، لە پێناوی چەسپاندنی دادی کۆمەڵایەتی دا، بوو بە شۆڕشێکی کوردەی خاوەن داوای سیاسی.

*

لە سەر داوای ماجید وەزارەتەکەی نوری سەعید لە دانیشتنی ڕۆژی ۲۵ ی کانونی دووەمی ٤٤ دا بڕیاری دا چەند ئەفسەرێکی کورد، کە تا ئەوسا لە ڕیزی جەیش دا بوون، دابنێ بە ئەفسەری پەیوەندی لە ناوچەکانی کوردستان دا. ئەمانە زۆربەیان ئەندامی حیزبی هیوا بوون، کران بە ئەفسەری پەیوەندی: بەهادین نوری بۆ سلێمانی، ئەمین ڕەواندزی بۆ ڕەواندز، عیززەت عەزیز بۆ بارزان، مستەفا خۆشناو بۆ بلە، میرحاج ئەحمەد بۆ ئاکرێ، مەجید عەلی بۆ ئامێدی، سەید عەزیزی شەمزینی بۆ مێرگە سوور، فوئاد عارف بۆ پشدەر. حکومەت دەسەڵاتی سیاسی و شارستانی دابوونی بۆ چاودێری جۆری دابەشکردنی ئازوقەی

تەمرین و، ڕەفتاری کاربەدەستان و، ئەفسەرانی کورد پێکبێنن.
ئەم ئەفسەرانە بەستراو بوون بە وەزیری دەوڵەت، ماجید مستەفاوە.

*

ڕۆژی ١٢ ی شوباتی ٤٤ شێخ ئەحمەد و خێزانەکەی و دەستوپێوەندەکانی گەڕانەوە بۆ بارزان.
ڕۆژی ٢٢ ی شوباتی ٤٤ مەلا مستەفا گەیشتە بەغداد. لەم سەفەرەدا وەصی، نوری سەعید، سەفیری بەریتانی، وەزیری پەیوەندیدار، سەرانی حیزبی هیوا و، گەلێ کەسایەتی کورد و عەرەبی.. بینی. سەردانەکەی حەفتەیەکی خایاند و گەڕایەوە بارزان.
بێگومان ئەمە سەرکەوتنێکی سیاسی گەورە بو لە ژیانی مەلا مستەفادا گۆڕینێکی گەورەی بە دی هێنا. لە کابرایەکی خێڵەکی ئاوارە و دەس بە سەری سەرچەم حکومەت بو بە پێشەوایەکی نەتەوەیی، جێگەی تۆمەتی کورد و، جێگەی بایەخ پێ دانی حکومەتەکانی عێراق و بەریتانیا.

*

نوری سەعید گەشتێکی بۆ کوردستان کرد. لە کەرکوک لە گەڵ سەرانی خێڵەکانی کورد کۆ بوەوە، بەڵێنی سەلماندنی مافە نەتەوایەتیەکانی کوردی پێ دان.
وەزارەت، سەبارەت بە مافەکانی کورد، لە ناو خۆی دا ناکۆک بو. لە دەرەوەی وەزارەتیش لە ناو هەندێ لە کۆڕە نەتەوەپەرستەکانی عەرەب دا ناڕەزایی هەبو. لە ٣ ی حوزەیرانی ٤٤ دا نوری سەعید دەستی لە وەزارەت هەڵگرت و، حەمدی پاچەچی وەزارەتێکی نوێ ی پێک هێنا.
ئەم وەزارەتەیش دو کوردی تێ دا بو؛ ئەحمەد موختار و تۆفیق وەهبی، بەڵام ماجیدی لێ دور خرایەوە. کاری ئەفسەرانی پەیوەندیش تەواو بو، داوایان لێ کرا بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان لە ناو جەیش دا.
هەمو لایان وابو کە حکومەتی تازە بەڵێنەکانی حکومەتی پێشو سەبارەت بە مافەکانی کورد جێبەجێ ناکا.

*

ئەفسەرەکان چالاکی سیاسی زۆریان دەس پێ کرد. هەندێکیان لە بارزان مانەوە بۆ هاوکاری مەلا مستەفا و، مستەفا خۆشناو و میرحاج چون بۆ کوردستانی ئێران و، عیزەت عەزیز چو بۆ سوریا بۆ پێوەندی لە گەڵ حیزبی خۆیبون، بۆ بە دەستهێنانی پشتیوانی بۆ جوڵانەوەکەیان.
مەلا مستەفا لە نیوەی دوەمی ساڵی ١٩٤٤ دا، لە گەڵ هەندێ لە ئەفسەرەکانی هاوکاری، گەشتێکی سیاسی دەس پێ کرد بۆ سەردانی هەمو سەرانی ئێل و پیاوە دەس ڕۆیشتوەکانی زیباری، سورچی، هەرکی، خۆشناو، شەقلاوە، دەشتی هەولێر. هەر لەم گەشتەدا سەردانی سەعید قەزاز، موتەصەریفی هەولێری کرد.
حکومەتی عێراق لە گەشتەکەی مەلا مستەفا و، چالاکی ئەفسەرەکان کەوتە گومان و پەژارە. هێزەکانی جەیش و شورطەی ساز ئەدا.

*

لە ١٧ای تشرینی یەکەمی١٩٤٤ دا مەلا مستەفا یادداشتێکی دا بە وەزیری

کاروباری ناوخۆ. کورتەکەی ئەمە بو:

١. یەکخستنی ناوچە کوردنشینەکانی کەرکوک، سلیمانی، هەولیر، دهوک، خانقین.

٢. دانانی وەزیریکی کورد لە وەزارەت دا کە بەرپرسی کوردستان بی.

٣. لە هەر وەزارەتیک دا جیگریکی وەزیر لە کورد دابنری.

٤. کاروباری روشنبیری، ئابوری، کشتوکال، جگە لە کاروباری جەیش و شورطە، لە دەسەلاتی ئەم وحدە اداریە بی.

بۆ یەکەمین جار خواستەکانی مەلا مستەفا لە داوای تایبەتی و خیلەکیەوە گورا بو بۆ خواستی سیاسی و، لە باتی کورد نەدوا. کاربەدەستانی حکومەت ئەم گۆرینەیان بە فیتی ئەفسەرە کوردەکان دائەنا.

عیراق کەوتە راونان و گرتن و دورخستنەوەی ئەفسەرەکانی گومانی لی ئەکردن. بەلام ئەوان لە چالاکی نەکەوتن و، عیززەت عەزیز، مستەفا خۆشناو، میرحاج ئەحمەد، محەمەد مەحمود، جەلال ئەمین بەگ.. دایانە پال مەلا مستەفا.

لە ١٥ ی کانونی دوەمی ٤٥ دا ئەفسەرەکان ریکخراویکی تازەیان بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفا بە ناوی «هەیئەتی ئازادی» وە دامەزراند. بەرنامەکەیان بە کورتی بریتی بو لە:

١. یەکخستنی عەشیرەتەکان.

٢. رزگار کردنی کوردستان بە ریگای سیاسی.

٣. دامەزراندنی پەیوەندی لە گەل حیزبە سیاسیەکانی کورد.

٤. دانی خواستەکانی کورد بە نوینەرانی سیاسی دەولەتانی بیگانە.

٥. کاری راگەیاندن و بلاو کراوە.

٦. خەبات دژی سیاسەتی ئیستیعماریی عیراق.

٧. ریکخستنی هیزی چەکدار.

*

ئەم هەیئەتە، وەکو لە نامەکانی دا بۆ سەرکردایەتی حیزبی هیوا و لقەکانی دا دەرئەکەوی، ئەیەو سەرکردایەتی شورش بکا. لەو کاتەدا حیزبی هیوا هەبو، ئەم ئەفسەرانەیش هەمویان ئەندامی هیوا بون، بۆچی ریکخراویکی تازەیان دامەزراندوە. رەنگە یەکی لەم دو هۆیەی هەبوبی: یان لە توانا و ویستی حیزبی هیوا نائومید بون سەبارەت بە بەشداری و سەرکردایەتی شورش، یان ئەم هەیئەتەیان دامەزراندوە باسکی جەنگیی شورشەکە و، حیزبی هیوا باسکی سیاسی جولانەوەکە بی.

*

لە نامەیەک دا کە لە ٣٠ ی کانونی دوەمی ٤٥ بە ئیمزای سەرۆکی حیزبی هیوا بۆ مەلا مستەفا نوسراوە، ئەلی: «هەمو بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی ئەگەر بە ریکوپیکی بە پی ی بەرنامەیەکی ورد ریک نەخری، بیگومان ئەنجامەکەی سەرگەردانی و مالویرانی و سەرنەکەوتن ئەبی. هەروەکو ئیوەیش ئەزانن بزوتنەوەی نەتەوەیی ئەبی سەرکردەیەک و دو دەستی بەهیزی هەبی: دەستیکی سیاسی و دەستیکی چەکدار.»

*

ئەم ئاڵوگۆڕانە حیزبی هیوایان شلەقاند و، تووشی تەنگوچەڵەمەیەکی ناوخۆیی قووڵیان کرد. ئاژاوەی تێ کەوت و یەکێتی ڕیزەکانی تێکچوو. لە سەر دوو مەسەلەی سەرەکی لە ناو خۆیان دا ناکۆک بوون: یەکەمیان، پشتیوانی لە شۆڕشی بارزان بکری یا دەستی لێ هەڵبگیری. دوای ئەوەی دەرکەوت ئینگلیز دوژمنایەتی ئەکات؟ دووەمیان، کورد لە خەباتی ڕزگاریخوازی دا پشت بە ئینگلیز یان بە یەکێتی سۆڤیەت ببەستی.

ئەوسا و ئێستایش، بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەک بە دەستەوە بێ، زۆر کەس ماجید مستەفا تاوانبار ئەکەن بە نۆکەرایەتی ئینگلیز و، بە پیلانگێڕان بۆ تێکدانی حیزبی هیوا.

*

ئەگەرچی هەیئەتی ئازادی لە گەڵ حیزبی هیوا پەیوەندی بە هێزی هەبوو و، داوای لێ کرد نامە و بەیاننامە بدا بە سەفارەتی دەوڵەتە گەورەکان، بەڵام خۆیشی کەوتە چالاکی: بەیاننامەی بۆ حکومەتی عێراق نووسی، داوای لێ کرد کۆبوونەوەی هێزەکانی بڵاوە پێ بکا و، ماڵەکانی کورد بسەلمێنی. نامەی بۆ سەفارەتەکان نووسی. بەیانی ئاراستەی گەلی عێراق کرد دەربارەی ڕەوایی خەباتی کورد. ئیشۆکاری بە سەر ئەندامەکانی دا دابەش کرد.

*

بە درێژایی ٣ مانگ لە مارتەوە تا حوزەیران چەندین یەکتربینین لە نێوان مەلا مستەفا و ئەفسەرانی بەریتانی و کاربەدەستانی عێراقی دا و، لە نێوان هەندی لە ئەفسەرەکان و، نوێنەرانی بەریتانی و عێراقی دا بوو. لەم دیدەنییانەدا داوایان لە مەلا مستەفا ئەکرد: ڕێگە لە موناوەرە و لەشکرکێشییەکانی جەیش نەگری. ئەفسەرە کوردەکان بنێرێتەوە سەر کارەکانی خۆیان لە ناو جەیش دا.

نیشتمانپەروەرانی کورد هیوایەکی زۆریان لە سەر مەلا مستەفا و جووڵانەوەکەی هەڵچنی بوو.

*

وەکوو لە نامەی ڕۆژی ٣ ی مارتی ١٩٤٥ دا کە بە ئیمزای سەرۆکی هەیئەتی ئازادی بۆ حیزبی هیوا نووسراوە، هەیئەتی ئازادی بەرنامەی بۆ شۆڕش ئامادە ئەکرد، کورتەی خاڵە سەرەکییەکانی:

- مانگی مارت بە مانگی شۆڕش دابنێن.
- حیزبی هیوا دەسەڵاتی هەبێ نامە و بەیان و یادداشت بە ناوی «زەعیم» ەوە بڵاو بکاتەوە.
- پەیوەندی لە گەڵ نوێنەرانی دەوڵەتانی بیگانە بکەن.
- دوای دەس پێ کردنی جووڵانەوەکە، بە ناوی هەیئەتی ئازادییەوە بەیانێک بۆ گەلی عێراق دەربکەن ئامانجەکانی ڕوون بکاتەوە.
- ئەوانەی ئەیانتوانی بەشدار بن لە ئەفسەر و ڕووناکبیر بنێرن بۆ لایان.
- لە گەڵ دەس پێ کردنی شۆڕش دا ئەم کارانە بکری: مانگرتنی قوتابیان لە شارەکان. خۆپیشاندان و بەیان دەرکردن لە هەموو شارەکانی کوردستان دا. تێکدانی ڕێگاوبان و بڕینی تەلی تەلگراف و تەقە لە نارندەکانی حکومەت. هاوکاری نەکردن لە گەڵ حکومەت و، لە ناوبردنی ئەوانەی هاوکاری ئەکەن.

*

حیزبی هیوا بە ناوی خۆی و زەعیم و یەکیتی لاوانەوە بەیانی بۆ گەلی عیراق و، نوێنەرانی جیهش دەرکرد و، یادداشتی بۆ سەفارەتەکانی ئەمریکا، فەرەنسا، یەکیتی سۆڤیەت و چین نارد.

*

بارزانییەکان بە چەکداری هاتوچۆی داوودەزگاکانی حکومەتیان ئەکرد. ڕۆژی ۸ ی تابی ٤٥ لە ناو مەخفەری میرگە سووردا لە مشتومڕێک دا لە سەر ئازوقەی تەموین وەلی بەگ کوژرا. وەلی بەگ خزمی نزیکی خودان و، یەکێ لە پیاوە ناسراوەکانی بارزان بو. لە ناو مەخفەرەکەدا بو بە شەڕ و چەند پۆلیسێک کوژرا و، مەخفەرەکە گیرا. بارزانییەکان، لە تۆڵەی خوێنی وەلی بەگ دا، لە چەند جێگای تر هەڵیان کوتایە سەر مەخفەرەکانی ناوچەکە. نێوانی بارزانییەکان و عیراق تێک چو.

حکومەت ئیتزاری مەلا مستەفایان کرد تاوانبارەکان تەسلیم بکا و، خۆیشی لە بەردەمی کاربەدەستانی حکومەت دا ئامادە بی. لە هەمان کات دا حوکمی عورفی لە ۱۹ ی تاب دا لە موسڵ و هەولێر ڕاگەیەندرا و، جیهش خۆی ئامادە کرد بۆ لەشکرکێشی.

ڕۆژی ۲۵ ی تابی ٤٥ یەکەمین پێکدادان لە قۆڵی ڕەواندز ڕوی دا.

سەر لە نوی شەڕی بارزانی - عیراقی هەڵگیرسایەوە.

مەلا مستەفا هەمو هێزەکانی و نوێنەرەکانی هاوکاری لە دەوری بارزان کۆ کرد بوەوە و، جەبهەیەکی لێ دامەزراند بو بۆ بەرەنگاری هێرشی گەورەی جەیشی عیراق. پێی ئەچی ئامانجی سەرەکی پاراستنی ناوچەی بارزان بوبی، ئەگینا ئەبو: هێزەکانی لە سەنگەردا دانەمەزرێنی بۆ شەڕی جەبهەیی لە گەڵ جەیشی عیراق، هێزەکانی و هاوکارەکانی لە سەرانسەری کوردستان دا بڵاوە پێ بکا. چالاکی پێشمەرگەیی لە هەمو شوێنەکان بنوێنن.

عیراق هەمو هێزەکانی خۆی بە پشتیوانی هێزی ئاسمانیی لە سەر بارزان کۆ کردەوە. بێگومان هێزێکی خێڵەکیی ناڕێکوپێکی بێ پشتیوان و یارمەتی، چەند ئازا و لە خۆ بوردو بی، لە بەردەم جەیشێکی نیزامی دا، لە شەڕێکی جەبهەیی دا، خۆی پێ ڕاناگیری.

*

## کشانەوەی بارزانییەکان بۆ ئیران

دانوستندنی بارزانی - عیراقی تێکچو، جەیشی عیراقی لەشکرکێشیی دەس پێکرد (تابی ۱۹٤٥ - تشرینی یەکەمی ۱۹٤٥). بارزانی بڕیاری دا بەر لە یارینی بەفر و گیرانی ڕێگاکان بکشێتەوە کوردستانی ئیران (تشرینی یەکەمی ۱۹٤٥) کە ئەوسا لە ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەتی دا بو. ڕۆژی ۱۱ ی تشرینی یەکەمی ۱۹٤٥ لە کێلەشین ئاوا بون.

*

لەم لەشکرکێشیانەی جەیشی عیراق دا ٥ جەحفەل لیوا: لیواکانی ۱ جگە لە فەوجێکی، لیواکانی ۳ و ٤ و ٥ و لیوای ۱٥ جگە لە فەوجێکی، فەوجێکی لیوای ۱٤ و ٥ فەوجی شورطە و، هێزی عەشایری کورد، بەشدار بون. بە هەموی ۳۷٤ کوژراو و بریندارییان هەبو. لە شۆڕشگێرانی بارزان ۲۲ کەس کوژراوە.

*

## مەلا مستەفا لە کوردستانی ئێران

بارزانیەکان چونە ئێران لە ناوچەکانی شنۆ، نەغەدە، تەرگەوەر و مەرگەوەر بڵاو بونەوە. کاربەدەستانی سزایەتی ئاگادار بون لە ئالوگۆری نامە و هاتوچۆی نوێنەرانی بارزانی و بەریتانیا بۆ لای یەکتری. باوەڕیان بە مەلا مستەفا نەبو. گومانیان لێ ئەکرد بە ڕێنیی ئینگلیز چو بێتە ئێران بۆ ئاژاوە نانەوە. لە بەر ئەوە داوایان لێ کرد ماوەیەک خۆی ون بکا و، لە بەرچاوان نەمێنێ. قازی محەممەد و سەرانی دیموکراتیش گوێیان نەدانێ. مەلا مستەفا چوە مێرلاوای سەردەشت دانیشت.

مەلا مستەفا خەریک بو نائومێد بێ. دونامەی بۆ ئیبراهیم ئەحمەد نارد یەکێکیان بۆ خۆی و ئەوی تریان بۆ بابەعەلی شێخ مەحمود. داوای لێ کرد بو نامەکەی بە بابەعەلی بگەیەنێ. ئیبرایم ئەحمەد و هاوڕێکانی لە ژ ک لقی کوردستانی عیراق نامەکەیان کرد بوەوە. مەلا مستەفا داوای لە بابەعەلی کرد بو قسە لە گەڵ کاربەدەستانی عیراق بکا لێیان خۆش بێ بۆ ئەوەی بە کۆمەڵ بگەڕێنەوە و تەسلیمی حکومەتی عیراق ببنەوە. ئەگەر هەر لێبوردنیشیان بۆ دەرناکەن وا ئامادەن بگەڕێنەوە عیراق و بچنە زیندانەوە بەو مەرجەی حوکمی ئیعدامەکانیان بۆ بگۆڕن بە مونەبەد. ئیبراهیم ئەحمەد نامەکە ناگەیەنێ بە بابەعەلی لە باتی ئەوە بە یارمەتی شێخ لەتیفی شێخ مەحمود مەزبەتەیەک ئەنوسن بە ناوی کوردەکانی عیراقەوە، بە زۆر سەرۆکی عەشیرەت و پیاوی ناسراوی کوردستانی عیراقی ئیمزا ئەکەن، گوا مەلا مستەفا نوێنەری کوردەکانی عیراقە و ڕێزگرتن و یارمەتی دانی واتە ڕێزگرتن و یارمەتی دانی کوردەکانی عیراقە. دوای گەیشتنی ئەم مەزبەتەیە ئینجا قازی محەممەد لا لە مەلا مستەفا ئەکاتەوە و، بانگی ئەکەن بۆ مەهاباد و، بارزانیەکانیان کرد بە پێشمەرگە و پلەی «جەنەراڵ» یشیان دا بە مەلا مستەفا.

چوار لک لە بارزانیەکان پێک هێنرا و، ئەفسەرە کوردەکان بون بە فەرماندەیان و، پارێزگاری لای سەقزیان پێ سپێردرا. ئازایانەو بە دلسۆزی تا ڕوخانی حکومەتی کوردستان ناوچەکەیان لە هێرشی ئەرتەشی ئێران پاراست.

*

## دامەزراندنی پارتی

ئەو ماوەیەی لە مەهاباد بون بە چاولێکەری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، مەلا مستەفا و ئەفسەرەکانی هاوکاری لە گەڵ حەمزە عەبدوللا قسەیان کرد بە یەک بۆ دامەزراندنی حیزبێکی لەو بابەتە کە جێگەی هەمو ڕێکخراوە کوردیەکانی عیراق بگرێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە حەمزە عەبدوللای ناردەوە بۆ کوردستانی عیراق. حەمزە پەیوەندی لە گەڵ سەرکردایەتی حیزبەکانی: شۆڕش، ڕزگاری، لقی کوردستانی عیراقی ژ - ک.. کرد بۆ یەکگرتن لەم حیزبە نوێ یەدا. لە ١٦ ی ئابی ١٩٤٦ دا لە بەغدا یەکەمین کۆنگرەی دامەزراندنی «پارتی دیموکراتی کورد» بەسترا. لەم کۆنگرەیەدا پرۆژەی ئەو پرۆگرامەی حەمزە لە ئێرانەوە هێنا بوی پەسند کرا و، کومیتەیەکی ناوەندی بۆ هەڵبژێردرا و، مەلا مستەفایش بە سەرۆکی حیزب دانرا. زۆری سەرکردە و ئەندامەکانی شۆڕش و ڕزگاری چونە ئەم حیزبە تازەیەوە. ئیبراهیم ئەحمەد ئەگەرچی لەم کۆنگرەیەدا بەشداری کرد، بەلام لەو کاتەدا ئامادە نەبو ڕێکخراوەکەی خۆی: ژ ک هەڵوەشێنێتەوە و تێکەڵاوی پارتی بێ.

کە جمهوریەتی مەهاباد ڕوخا بارزانیەکان خۆیان نەدا بەدەستەوە، کەوتنە گفتوگو

لەگەڵ تاران، مەلا مستەفا چو بۆ تاران، شا و سەرۆکوەزیران و، گەورە ئەفسەرانی ئەرتەش و، سەفیری ئەمەریکای بینی. داوای لە سەفیر کرد بۆ کە خۆی و هەمو عەشیرەتەکەی پەنابەر لە ئەمەریکا وەربگیرێن. سەفیر داواکەی جێبەجێ نەکرد بو. تاران داوای لە مەلا مستەفا کرد: چەک دابنێن و، لە نزیک هەمەدان نیشتەجێ بکرێن. مەلا مستەفا بە رواڵەت رەزامەندی خۆی بۆ دەربڕی بون، بەڵام وت بڕی دوا بڕیار لە دەس شێخ ئەحمەد دایە، ئەبێ ئەویش موافەقەت بکا. بەم بەهانەیە گەڕایەوە ناو بارزانیەکان.

شێخ ئەحمەد رازی نەبو بچێ بۆ هەمەدان، بڕیاری دابو بڕواتەوە بۆ عێراق. تاران پەلەی بو لەم هێزە چەکدارە، کە بە مەترسی ئەزانی بۆ سەر خۆی، هەڵیوەشێنێ، ئەوانیش نەیانئەویست کات بە سەر بەرن تا زستان لێ ئەپەڕێ و ڕێگە بەفراوییەکانی کێلەشین - دالانپەر ئەکرێنەوە، بۆ ئەوەی بە خۆشی لە ئەنجامی ڕێکەوتن لەگەڵ عێراق یاخود بەشەر بگەرێنەوە ناوچەکانی خۆیان. کاربەدەستانی تارانی ئەمەیان لێ وەرنەگرتن، داوایان لێ کردن: یا دەسبەجێ چەک دابنێن و بچنە ناوچەی هەمەدان خەریکی کشتوکاڵ بن، یاخود دەسبەجێ بگەرێنەوە بو عێراق.

*

### بارزانی ئەگەڕێتەوە بۆ کوردستانی عێراق

ئەرتەشی تارانی ویستی بە زور چەکیان بکا و بیانگوێزێتەوە بو دەرەوەی کوردستان، چەن لێکهەڵچونی چەکدار لە نێوان هێزەکانی بارزانی - تارانی دا روی دا. بارزانیەکان بەرگرییەکی نازایەنەیان کرد و، بە دەم شەرەوە بەرەو سنوری عێراق کشانەوە (نیسانی ۱۹٤۷). وەکو جەلالی ئەمین بەگ چەند جار ئەیگێڕایەوە: هەندێ لە ئەفسەرەکان زور لە گەڵ مەلا مستەفا خەریک بون بۆ ئەوەی قانیعی بکەن نە بیر لە خو بە دەستەوەدان بکاتەوە و، نە بیر لە پەنابردن بۆ یەکێتی سۆڤیەت، بەڵکو درێژە بە شۆرش بدا. مەلا مستەفا گوێ ی لێ نەگرتن. لە مێژوی نوێ ی کوردا چونی مەلا مستەفا بو سۆڤیەت بە قارەمانێتییەکی بێ وێنە دائەنرێ، کەچی هیچ کەس ناپرسێ: بۆچی مەلا مستەفا نەمایەوە و، هێزەکانی بە ناو کوردستان دا بڵاو نەکردەوە و، درێژەی بە جەنگی پارتیزانی نەدا. لە کاتێک دا زیاتر لە ۵۰۰ چەکداری گەلێ گیانباز و گوێڕایەڵی لە گەڵ بوە و، هەمو هێزە چەکدارەکانی عێراق لەو کاتەدا نەئەگەیشتە ۱۰ هەزار کەس!

عێراق ئامادە نەبو لێبوردنی گشتی «عفو عام» یان بو دەربکا. زۆری لێ ئەکردن بێ قەید و شەرت تەسلیم بێن. مەلا مستەفا ۵٦۰ چەکداری لێ هەڵبژاردن و کەوتە رێ بەرەو ناوچەی بارزان، شێخ ئەحمەدیش لەگەڵ هەمو بارزانیەکانی کە دا بە خاووخێزانەوە خۆیان دا بە دەست عێراقەوە. بە پێ ی «بەیانی رەسمی» حکومەتی عێراق: ژمارەی ئەو بارزانیانەی لە رۆژانی ۱۷ و ۱۸ ی نیسانی ۱۹٤۷ دا بە بێ قەید و شەرت بە دو کاروان خۆیان بە دەستەوە دا بریتی بو لە ۱٥٥۰ پیاو و، ۱٦۸٦ ئافرەت و، ۱۳۲۹ منال. بارزانیەکان پۆل پۆل کران. هەندێکیان لە دەشتی دیانا، شوێنێکی دور لە بارزان، نیشتەجێ کران. شێخ ئەحمەدو هەندێکی تریان درانە دادگاو حوکمی جیاجیا دران. شێخ ئەحمەد خۆی حوکمی ئیعدام درا.

مەلا مستەفا ۳ ژنی هەبو. هەمویان گێڕانەوە عێراق. درانیان لە گەڵ کورەکانیان تا ماوەیەک گیران و دواتر دەس بەسەر دانران. سێ یەمیان کە کچی مەحمود ئاغای زیباری

بو لە گەڵ مەسعودی کوری چوەوە ماڵی باوکی لە موسڵ. لە کاتی شۆڕشی بارزان دا مەحمود ئاغا جاشی چەکداری حکومەتی عیراق بو.

*

## چونی بارزانی بۆ سۆڤیەت

مەلا مستەفا نەیتوانی عیراق والی بکا «لێبوردنی گشتی» یان بو دەربکا، پاش ئەوەی نائومێد بو بە ناو سنوری ئیرانی - تورکی دا کەوتە ڕێ بەرەو یەکێتی سۆڤیەت. ئەم ڕێ پێوانە درێژە ٥٢ ڕۆژی خایاندوە. کاربەدەستانی سۆڤیەتی چەکیان لێ وەرگرتن و، پەرش و بڵاویان کردنەوە بە ناو کۆمارەکانی سۆڤیەتی دا. دەربارەی ژیانی مەلا مستەفا لە سۆڤیەت زۆر کەم ئەزانرێ، خۆیشی زۆر کەمی باس کردوە. سەرانی پارتی وایان بڵاو ئەکردەوە کە جەنەراڵە لە لەشکری سوردا، بەڵام ئەڵێن تا مردنی ستالین قەسابی کردوە، دوای مردنی ئەو ئینجا گوزەرانیان نەختێ باشتر بوە و، ئازادیەکی کەمیان دراوەتێ.

*

## ئیعدامی ئەفسەرەکان

شێخ ئەحمەد ئیعدام نەکرا، بەڵام بە حوکمدراوی لە زیندانی بەسرا گلدرایەوە تا شۆڕشی ١٤ تەموزی ١٩٥٨. ٤ لەو ئەفسەرانەی هاوبەشی شۆڕشی بارزان بون: عیزەت عەبدولعەزیز، خەیروڵلا عەبدولکەریم، مستەفا خۆشناو، محەممەد مەحمود هەڵواسران. بەر لە هەڵواسینیان بە چەند سەعاتێ بە کۆمەڵ نامەیەکیان بۆ میللەتی کورد نوسیوە. نامەکەیان ٤ بەندە، لە یەکێکیان دا داوا لە گەلی کورد ئەکەن: «دوای جەهالەت نەکەوێ». هەمو ئەوانەی شارەزای بەسەرهاتی ئەم ٤ شەهیدە بون، ئەڵێن: «مەبەستیان لە - جەهالەت - سەرکردایەتی مەلا مستەفای بارزانی بوە».

*

## سەرۆکایەتی پارتی

پارتی دوای ئەوەی لە کونگرەی یەکەمی دا مەلا مستەفای هەڵبژارد بە سەرۆکی خۆی، لە دو کونگرەی تریشی دا: کونگرەی دوەم (مارتی ١٩٥٠ لە بەغداد) و کونگرەی سێیەم ( کانونی دوەمی ١٩٥٣ لە کەرکوک)، سەرۆکایەتیەکەی نوێ کردەوە. بە درێژایی ئەو ماوەیەی مەلا مستەفا لە یەکێتی سۆڤیەت بو (١٩٤٧ - ١٩٥٨) بێ ئەوەی سەرکردایەتی پارتی و مەلا مستەفا ئاگایان لە یەکتری بێ، پارتی پروپاگاندەیەکی بەربڵاوی بۆ مەلا مستەفا ئەکرد، وەکو قارەمانی نەتەوەیی کورد و، کاوەی سەدەی بیستەم و، جەنەراڵی لەشکری سوری سۆڤیەتی. لە بەیان و وتارەکانی دا بە شان و شکۆی بارزانی دا هەڵئەدا و، وێنەکانی بڵاو ئەکردەوە. هەمزە عەبدوڵلا نامیلکەیەکی بە عەرەبی لە سەر شۆڕشی بارزان نوسی، هەر ئەو زەمانە پارتی بڵاوی کردەوە و مەرحومی محەممەد ئەمین کردی بە کوردی. مەلا مستەفا لای خەڵک کرا بو بە سەرکردەیەکی ئەفسانەیی لە شکان نەهاتو و، بگرە بە «بتێکی پەرستراو». بێگومان ئەمە نیشانەی لاوازیی کەسایەتی سەرکردەکانی ئەوسای پارتی بوە، کە هیچیان بە خۆیان دا ڕانەئەبینی سەرۆکایەتی پارتی و، سەرکردایەتی جوڵانەوەی کورد بگرنە دەس و، بۆ کەسایەتیەکی نەخوێندەواری خێڵەکیی دور وڵاتی چارەنوس نەزانراویان بە جێ هێشت بو.

*

## ١٤ تەمموز و بارزانی

بۆ پەرۆشبوونی لە شۆڕشی ١٤ تەمموزی ١٩٥٨ مەلا مستەفا لە ڕۆژانی یەکەم دا تەلەگرافێکی بۆ سەرکردایەتی شۆڕشەکە نارد. لایەنگری و پشتیوانی خۆی دەربڕی بوو، داوای کرد بوو ڕێگای بدەن بگەڕێتەوە بۆ عێراق بۆ خزمەتی جمهوریەت. ڕۆژنامە کوردییەکانی ئەو کاتە بروسکەکەیان بڵاو کردەوە. نوێنەرەکانی پارتی: ئیبراهیم ئەحمەد و عەلی عەبدوللا لە سەردانی کاربەدەستانی عێراق دا داوای بەردانی بارزانییە گیراوەکان و گەڕانەوەی ئەوانەی دەرەوەیان کرد بوو.

شۆڕشی ١٤ تەمموز لێبووردنی گشتی بۆ هەموو بارزانییەکان دەرکرد، چ ئەوانی لە زیندان بوون و چ ئەوانی لەدەرەوە پەنابەر بوون. شێخ ئەحمەد ئازاد کرا لە ناو خەڵک دا وەکو قارەمانی نیشتیمان سەیری ئەکرا. ڕۆژنامە کوردییەکان لەسەریان ئەنووسی، وێنەیان بڵاوئەکردەوە، گفتوگۆیان لەگەڵ ئەکرد. شێخ ئەحمەد هیچ ئارەزووی سیاسی نیشان نەئەدا.

تا ئێستاش وا باوە عەبدولکەریم قاسم مەلا مستەفای هێناوەتەوە و، عەبدولسەلام عارف موافیق نەبوە لە سەر گەڕانەوەی. عەزیز عوقەیلی پێش لە بیرەوەریەکەی دا وا ئەڵێ. بەڵام ئیبراهیم ئەحمەد، کە ئەوسا سکرتێری پارتی و، خۆی چو بە دوای بارزانی دا بۆ هێنانەوەی ڕووداوەکە بە جۆرێکی تر ئەگێڕێتەوە.

مەلا مستەفا دو جار بە بروسکە داوای لە سەرکردایەتی شۆڕشی تەمموز کرد بوو؛ ڕێگای بدەن بگەڕێتەوە عێراق، بەڵام هیچ وەڵامێکیان لێ نەگەیرا بووەوە. ئەمانیش بە بابەعەلی شێخ مەحموود ئەڵێن، کە ئەوسا وەزیر ئەبێ لە وەزارەتەکەی قاسم دا، داوا لە کاربەدەستان بکا کارئاسانی گەڕانەوەی بکەن، ئەویش هیچ دەنگێکی نابێ. مەلا مستەفا تەلەگرافێک بۆ ئیبراهیم ئەحمەد ئەکا، داوای لێ ئەکا: ٣ پاسپۆرت، بۆ خۆی و میرحاج ئەحمەد و ئەسعەد خۆشەوی پەیدا بکا و، موافەقەتی کاربەدەستانی عێراقیان بۆ وەربگرن بۆ گەڕانەوەیان.

ئیبراهیم ئەحمەد بە هۆی کەریم قەرەنیەوە ئەچێ بۆ لای تاهیر یەحیا، کە ئەوسا بەڕێوەبەری گشتی پۆلیس ئەبێ، داوای لێ ئەکا لەو ڕووەوە یارمەتی بدەن. ئەویش پێشنیاریان بۆ ئەکا کە سەردانی ئەبو ئەحمەد بکەن، ئەو ئەتوانی کارەکەیان بۆ جێبەجێ بکا. مەبەستی لە ئەبو ئەحمەد عەبدولسەلام عارف ئەبێ، کە ئەوسا جێگری سەرۆکی وەزیران و وەزیری کاروباری ناوخۆ بوو. بە تەلەفۆن دیدەنیەکیان بۆ ڕێک ئەخا. مەسەلەکە لە گەڵ عارف باس ئەکەن. بە ڕووی خۆشەوە گوێیان لێ ئەگرێ و، بەڵێنیان ئەداتێ کارەکەیان بۆ جێبەجێ بکا. بە تەلەفۆن لە گەڵ دەزگای پەیوەندیدار قسە ئەکا بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکەیان. ئامۆژگاریشیان ئەکا کە لە ڕێگای گەڕانەوەدا بە قاهیرەدا بێنەوە بۆ ئەوەی عەبدولناسریش ببینن، بزانن بیروڕای ئەو چیە لە سەر کێشەی کورد. ئیبراهیم ئەحمەد بە دوای کارەکەدا ئەچێ و پاسپۆرتەکانی بۆ ئامادە ئەکەن. ڕۆژی ١٧ ئەیلول، ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری پارتی و، نوری ئەحمەد طەها بە نوێنەرایەتی کومیتەی ناوەندی پارتی و، شێخ صادقی بارزانی، بە فڕۆکە ئەگەنە پراگ: پایتەختی چیکوسلوڤاکیا.

مەلا مستەفا لە سەر داوای خۆی لە ڕووسیاوە بەڕێ کرا بو بۆ پراگ لەوێ چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەکرد بۆ عێراق. لە کۆشکێک دا لە گوندێکی نزیک شاری پراگ دانرا بو. ئیبراهیم ئەحمەد و هاوڕێکانی لە میوانخانەی پارتی کومونیست دائەبەزێن. پاش چەند

ڕۆژی بە فڕۆکە چوونە قاهیرە. لەو کاتەدا فایەق سامەرائی سەفیری عیراق ئەبێ لە میسر، بە خۆی ئەوەوە لەوێ سەرۆک عەبدولناسریان بینی. ناسر ڕەزی وا ئەبێ کە شێوەی بەڕێوە بردنی «محافظات»، لە میسر بکرێ بە نموونە بۆ چارەسەری کێشەی کورد لە عیراق دا.

لە قاهیرەوە بە ڕێ کەوتن، ڕۆژی ٦ ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٨ گەیشتنە بەغداد. مەلا مستەفا وەکو قارەمانی سەرکەوتوو پێشوازی کرا.

مەلا مستەفا لە کۆشکەکەی نووری سەعید دانرا. قاسم مانگی ٥٠٠ دیناری بۆ خۆی و ١٥٠ دیناری بۆ عوبەیدوڵڵای کوڕی و ٥٠ دیناری بۆ لوقمان بڕییەوە. مانگی نیسانی ٥٩ بارزانییەکان، ئەوانەی لە یەکێتی سۆڤیەت بوون، بە کەشتی گەیشتنەوە بەسرا. پێشوازی حکومەتی و جەژنییان لێ کرا. بۆ ئەوانیش مانگی ٣٥ دینار بۆ سەڵت و ٥٠ دینار بۆ خێزاندار مووچەیان بۆ بڕدرایەوە. هەروەها بۆ شێخ ئەحمەد ١٥٠ دینار و هەموو ئەوانەی لە گەڵی گەڕا بوون لە نێوان ٣٠ تا ٥٠ دیناریان بۆ بڕییەوە. زیاتر لە ٦٠٠ تفەنگیشیان دانێ بۆ پارێزگاری خۆیان.

*

## گەڕانەوەی بارزانی لە شیعری کوردی دا

لە ژێر تەئسیری ئەو پڕوپاگاندە زۆرەدا، کە چەندین ساڵ بوو سەرانی پارتی بۆ مەلا مستەفایان کرد بوو، کە گەڕایەوە خەڵک وەکو قارەمانی نەتەوەی کورد پێشوازی کرد. ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو سەردەمە: ژین، هەتاو، پێشکەوتن - التقدم، خەبات، ئازادی، ڕۆژی نوێ، بلێسە، نەورۆز.. بابەت و باسی زۆریان لە سەر نووسی. ئەگەرچی زۆری هەڵدانە بە شان و باڵی بارزانی دا، بەڵام بۆ یەکێ کە بیەوێ لە سەر ئەو ماوەیە بکۆڵێتەوە کەرەستەی بە نرخیان تێ دایە. شاعیرە ناودارەکان؛ کامەران، دیلان، کاکەی فەلاح، هەژار، قەدری جان و، شاعیرە لاوەکان؛ شێرکۆ بێکەس، جەمال شارباژێڕی... شیعری درێژیان لە ستایشی بارزانی و بە بۆنەی گەڕانەوەیەوە دانا. تەنانەت بەشی کوردی ڕادیۆی بەغداد کە هەندێ لەم شیعرانەی بە دەنگی شاعیرەکان بڵاو ئەکردەوە، شیعرێکی درێژی کابرایەکی فەیلی، ناوی مەلا نامدار بوو، بڵاو کردەوە لە دوای هەموو بەندێکی شیعرەکەی دا ئەم دێڕەی دووبارە ئەکردەوە: «هاتەوە خۆش هاتەوە، شێر و شەکر هاتەوە، ئەکبەر وەطەنچی هاتەوە!»

*

میرحاج ئەحمەد کە یەکێ لە ئەفسەرە چالاکەکانی حیزبی هیوا بوو و، بەشداری شۆڕشی بارزان بوو، لە گەڵیان چوو بۆ مەهاباد و، لەوێش فەرماندەی یەکێ لە فەوجەکانی هێزی بارزانییان بوو، لە گەڵ مەلا مستەفا چوو بۆ یەکێتی سۆڤیەت و، هەر لە گەڵ ئەویش گەڕایەوە بۆ عیراق. پارتی کردیان بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، بەڵام میرحاج هەتا مرد ترخنی کاروباری پارتی نەکەوت و، تێکەڵاوی سیاسەت نەبوو، وەکو ئەیانوت لە گەڕانەوەی دا وت بووی: «کاری سیاسی لە گەڵ مەلا مستەفا ناکرێ».

*

دوای شۆڕشی ١٤ ی تەمموز بە ماوەیەکی کەم ناکۆکی لە نێوان نەتەوەپەرستەکانی عەرەب و شیوعی و دیموکراتەکان دا لە سەر کێشەی «وەحدە» لە گەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوو (سووریا و میسر) دروست بوو. مشتومڕێکی توند دامەزرا کە ئاخۆ عیراق «وەحدە» یان «ئیتیحاد» بکا. شیوعییەکان بە توندی دژی هەردووکیان بوون. قاسمیش زۆرتر

عیراقی بو تا عەرەب. ئەم مشتومڕە بو بە کیشەیەکی گەورە. نەتەوەپەرستەکان ویستیان لە ڕیگای پیلانگیرانەوە ئەم کارە بکەن. لە ٨ ی مارتی ٥٩ دا لە موسل ڕاپەڕینیکی سپایی بە سەرکردایەتی عەقید شەواف ڕووی دا. ڕاپەڕینەکە بە توندی سەرکوت کرا. بارزانییەکان لەم سەرکوتکردنەدا بەشدار بون و، هەندی چەکیان لە «مقاومە شعبی» وەرگرت. ڕیکخراوی «مقاومە شعبی» هیزیکی چەکدار بو لە خەلک دروست کرا بو بۆ سەرکوتکردنی نەیارەکانی حکومەتی قاسم و، لە ژیر نفوز و دەسەلاتی حشع دا بو.

## کۆنگرەی چوارەمی پارتی *

لە چین و ئەلمانیای دیموکرات لە پال پارتی کومونیست دا هەندی وردە پارتی سیاسی تر هەبون، وەکو لەوارەیەکی ڕوکەش و دروستکراو، بو سەلماندنی هاوپەیمانیتی پرولیتاریا و بورجوازی بچوک لە قوناغی دامەزراندنی سوشیالیزم دا، هیلرا بونەوە. لە دوای شورشی ١٤ ی تەموز حشع بە جوریکی چاوەڕی نەکراو پەرەی سەند و گەورە بو. زور لەوانەی چەپ بون لایان وابو دەوری حیزبە سیاسیەکانی تر نەماوە و، ئەگەر مایی ئەبی بێ بە لوتابخانەی پیگەیاندنی دۆستی شیوعی، وەکو لە چین و ئەلمانیای دیموکراتی کراوە. حەمزە عەبدوللا، سکرتیری پارتی و هەندی لە هاوڕیکانی لەم باوەڕەدا بون. بە ئاشکرا بە لای حشع دا دایان ئەشکاند.

لە ڕوژی ١ ی ئاپاری ٥٩ دا «خەبات» ی ئورگانی پارتی بە مانشیتی گەورە نوسی: «سلاو لە چینی کریکار و پیشڕەوەکەی». مەبەست لە پیشڕەوەکەی چینی کریکار: حشع بو. یەکیتیەکانی: لاوان، لوتابیان، ئافرەتان، کریکاران، جوتیارانی کوردستان، هەلوەشینرانەوە و چونە ناو ڕیکخراوە عیراقیەکانەوە کە بە دەس حشع وە بون.

ڕاسکی نەتەوەیی ناو سەرکردایەتی پارتی لە گەل ئەم ڕاسکەدا لە بەربەرەکانی و ململانی دا بو، بەلام توانای یەکلایی کردنەوەی نەبو. مەلا مستەفا (لە ٣ ی حوزەیرانی ١٩٥٩ دا) تاقمی چەکداری ناردە سەر بارەگای حیزب لە شەقامی «مرتضی» لە بەغدا، دەستیان بە سەر بارەگاکەدا گرت و، حەمزە و هاوڕیکانی: نەژاد ئەحمەد، خەسرەو توفیقیان.. بە زور دەرکرد و، ئیبراهیم ئەحمەد و هاوڕیکانیان لە جیگا دانان. ئەمەش یەکەمین جار بو زور بە کار بهینری بو یەلاداخستنی ناکوکیە ئایدیولوجی و ڕیکخراوەییەکانی ناو حیزب.

دوای ئەوە کونگرەی چوارەم (تشرینی یەکەمی ١٩٥٩ لە بەغداد)، حەمزە و هاوڕیکانی بە یەکجاری لە پارتی دەرکرد. سەرکردایەتیەک هەلبژیردرا جیگای ڕەزامەندی بارزانی بو. مەلا مستەفا هەمیشە بایەخیکی تایبەتی ئەدا بەو کەسانەی گومانی جاسوسی یەکی لە دەولەتە گەورەکانی لی بکرایە. لەم کونگرەیەدا مەلا مستەفا د. مورادی عەزیز، کە کوردیکی ئیرانی بو، داتا بە ئەندامی م س چونکە گومانی لی ئەکرد جاسوسی سوڤیەت بی.

## کۆنگرەی پینجەمی پارتی *

سالی ١٩٦٠ کە پارتی ئیجازەی کاری قانونی درا کونگرەی پینجەمی لە ٥ - ٨ ی مایسی ١٩٦٠ دا لە بەغدا بە ئاشکرا بەست. مەلا مستەفا بۆ ئەوەی بەشداری کونگرە ئەبی

یان خۆی لووس رابگری گەڕا بوەوە بارزان. دەستەیەک لە نوێنەرانی کۆنگرە چوون بە دوی دا بۆ بارزان و، بە هەزار تکا و پاڕانەوە ئینجا رازییان کرد بێتە کۆنگرە، کە هات پێیش وت بوی: «حەز ئەکەم سەرۆکی قەحبە بم و سەرۆکی ئێوە نەبم! حەز ئەکەم پێم بڵێن: حیز بە و، حەز ناکەم پێم بڵێن حیزبی بە!». ئەو ڕۆژە مەلا مستەفا ئەیویست گەورەیی خۆی و بچووکی ئەوان بسەلمێنی، سەرانی پارتی ئەم سوکایەتی پێ کردن و جنێوانەیان قبوڵ کرد و، کۆنگرەی پێنجەم بە تێکرای دەنگ مەلا مستەفای هەڵبژاردەوە بە سەرۆکی پارتی.
بەهانەکەی قبووڵکردنی ئەم سوکایەتییەیش ئەوەبو: قاسم حیزبی شیوعی و وەطەنی دیموقراطی لەت کردوە، گەرەکیەتی پارتی یش لەت بکا، بۆ ئەوەی یەکیەتی ریزەکانی حیزب بپارێزن و ئەعبلن پیلانەکەی قاسم سەر نەگری، ئەمەیان کرد.
بێگومان ئەمە ناتوانرێ بە نیشانەی هەستکردنی سەرکردەکانی پارتی بە لێپرسراوەتی حیزبی و نیشتمانی دابنرێ، بەڵکو بەڵگەی لاوازیی کەسایەتییان بوە. ئەگەر سەرکردایەتی پارتی ئەوسا ئەم سوکایەتیەی قبوڵ نەکردایە، خۆی بە بێ بارزانی ملی ڕێگای خەباتی بگرتایە، با حیزبێکی بچووکتریش بوایە لەوەی کە هەبو، لەوانە بو رەوتی ڕوداوەکانی کوردستانی عیراق بە بارێکی کەدا بڕۆیشتایە. لەو سەردەمەدا چەند حیزبی تر لە عیراق دا هەبون، بە قەوارە و نفوز و دەسەلات لە پارتی بەهێزتر بون، هەمویشیان کەسایەتی شارستانی رێبەرییان ئەکرد نەک شێخی عەشیرەت، لەوانە: محەمەد حسین رەضی (ماموستای سەرەتایی) ڕێبەری حیزبی شیوعی عیراق و، کامل چادرچی (مهندس) ڕێبەری حیزبی وطنی دیموقراطی و، صدیق شەنشل (محامی) ڕێبەری حیزبی ئیستیقلال و، فوئاد ڕیکابی (مهندس) ڕێبەری حیزبی بەعس.
مەلا مستەفا لەم کۆنگرەیەدا وتی: من تەنیا ٣ (مرشح)م هەیە بۆ کۆمیتەی ناوەندی: ئاهیدەی شێخ سەلام، هاشم عەقراوی، ئیسماعیل عارف. هەرسێکیان هەڵبژێردران. لەمەش دیسان مەبەستی سوکایەتی بو بە حیزب و کۆمیتەی ناوەندی.

*

ڕۆژنامەی «الثورە» بەغدادی کە سەر بە قاسم بو وتارێکی نوسی داوای تواندنەوەی کوردی کرد بو. ڕۆژنامەی «خەبات» ئەم باسەی زل کرد و ناڕەزاییەکی زۆری لە ناو کوردا خولقاند. مادەی دوەمی «دەستوری کاتی» عیراقی بە بەشی لە نەتەوەی عەرەب دائەنا. خەبات لە وتارێکی دا لەم مادەیەی کولی بوەوە. نوسی بوی عەرەبی عیراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب و، کوردی عیراق بەشێکە لە نەتەوەی کورد. لە سەر ئەمە ئیبراهیم ئەحمەد کە سەرنوسەری خەبات بو درا بە دادگا.

*

## تێکچونی قاسم و مەلا مستەفا

مەلا مستەفا لە دوای گەڕانەوەیەوە هەوڵێکی زۆری ئەدا قاسم لە خۆی ڕازی بکات و، کارێکی وەها نەکات دلی برەنجی. لە خۆپیشاندانێکی گەورەدا کە لە بەردەمی سەرای سلێمانی بۆ پیشوازی لە هاتنی بارزانی کرا، لە شوێنی وتار دانەوە تورە بو لەو کەسەی وێنەی ئەوی بەرز کردبوەوە. بە تورە بونەوە داوای لە کابراکە کرد وێنەکەی دابگری و، وتی: «من سەربازی زەعیم عەبدولکەریمم». وەکو بەهادین نوری لە یادداشتەکانی دا ئەگێڕێتەوە لە بونەیەکی تردا بە قاسمی وتوە: «من لەبەتانی قوندەرەکانتم!». نیوانخۆشیی قاسم و مەلا

مستەفا درێژی کێشا تا ئەحمەد ئاغای زێباری کوژرا.
عەبدولکەریم قاسم لە کاتی حەرەکاتی بارزان دا لە چلەکان دا سەرپەرشتیکەری چەکدارە یەکرێگیراوەکانی عەشیرەتە کوردەکانی سەر بە حکومەت بوە. کە مەلا مستەفا وەکو قارەمانی نەتەوەیی کورد گەڕایەوە بۆ عیراق سەردانی قاسمی کرد. قاسم لە ناو ئامۆژگارییەکانی دا بۆ بارزانی داوای لێ کرد بۆ: «عفاالله عما سلف» واز لە دوژمنایەتی کۆن بهێنێ. بە دوای تۆڵەدا نەگەڕێ. سەردانی ماڵی هەموو ئەو سەرۆک عەشیرەتانە بکا کە کاتی خۆی شەڕیان لە گەڵ کردوە. هەمویان ئاشت بکاتەوە و دۆستایەتییان لە گەڵ بکا.
شێخ ئەحمەد خودانی بارزان حەزی نەئەکرد مەلا مستەفا تێکەڵاوی سیاسەت بێ، بەلام مەلا مستەفا «طموح»ی زل و زۆری هەبو. مەلا مستەفا ئەیویست «طموح»ە سیاسیەکانی خۆی (گەورەی کورد بێ) و «طموح»ە عەشیرەتییەکانی خۆی (گەورەی بارزان بێ) پێکەوە بگرێ‌ تەنێ. بۆ رازی کردنی شێخ ئەحمەد، مەلا مستەفا چەند بارزانیەکی نارد ئەحمەد ئاغای زێباری یان لە جادەیەکی موسڵ دا بە ئاشکرا کوشت. ئەمە پێچەوانەی ئامۆژگارییەکانی قاسم بو بۆ مەلا مستەفا. ئەوەش یەکەمین درزی کردە پەیوەندی مەلا مستەفا و قاسمەوە.
شەڕی تۆڵەسەندنەوەی بارزانییەکان لە گەڵ عەشیرەتەکانی دراوسێیان دەستی پێ کرد. شەڕ لە گەڵ رێکانی، ئەروەیی، برادۆست، زێباری.. هەڵگیرسا. رێکخراوەکانی پارتی پشتیوانییان لە بارزانیەکان ئەکرد. بروسکەی پشتیوانییان بە خەڵک ئیمزا ئەکرد. رۆژنامەی خەبات بڵاوی ئەکردەوە. شیوعیەکانیش پشتیوانییان لە بارزانیەکان کرد و، خستیانە چوارچێوەی شەڕی کۆنەپەرستی و دەرەبەگیەوە. هەندێ لەم عەشیرەتانە بە کۆمەڵ پەنایان بۆ تورکیا و ئێران برد. ئیتر هەلومەرجی کوردستان بەرەو گرژی و دەستپێکردنی شەڕ ئەرۆیشت.

•

مەلا مستەفا بۆ بەشداری لە ئاهەنگەکانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ٦ ی تشرینی دوەمی ١٩٦٠. دا چو بۆ یەکێتی سۆڤیێت تا ١٣ی کانونی دوەمی ١٩٦١ مایەوە. هەندێ ئەڵێن بارزانی لەم سەفەرەدا بەڵێنی پشتیوانی لە سۆڤیێت وەرگرتوە و، هەندێکیش ئەڵێن سۆڤیێت هیچ جۆرە بەڵێنێکیان پێ نەداوە، بەڵکو داوایان لێ کردوە کێشەکانی لە گەڵ قاسم بە ئاشتی چارەسەر بکا.
مەلا مستەفا کە گەڕایەوە عیراق، دوای ماوەیەک بە ناوی سەردانی شێخ ئەحمەدەوە ئیتر بە یەکجاری بەغدادی بە جێ هێشت و گەڕایەوە بارزان دانیشت. بە رواڵەت «گۆشەگیری» هەڵبژارد بو، بەلام لە راستی دا کەوت بوە پەیوەندییەکی فراوان لە گەڵ ئاغا و بەگزادەکانی کوردستان. هانی ئەدان خۆیان چەکدار بکەن و، بە چەکداری لە جادە گشتیەکان دا خۆیان پیشان بدەن.

•

### وەفدی ئاغاکانی کوردستان

هەرلە هەوەڵی شۆڕشی ١٤ ی تەمموز نیشت بوەوە. شیوعیەکان دەسەلاتیان کەم بوبوەوە. لە هەندێ جێ کەوت بونە بەر هێرشی قاسم. ئاغا و بەگزادەکانی کوردستان خەریک بو خۆیان ئەگرتەوە و، لە ناو خۆیان دا کەوت بونە هاتوچۆ و یەکتر بینین.

وەفدێکی گەورەیان پێکەوە نا بۆ سەردانی بەغداد و بینینی مەسئولەکانی حکومەت. مەبەستی سەرەکی ئەم وەفدە دەسکاری قانونی ئیسلاحی زەراعی بو، بەلام ئەو خواستەیان لە ژێر هەندێ خواستی سیاسی وەکو مافی نەتەوایەتی دا داپۆشی بو.

وەفـــدەکـە چوە بەغـــداد. ســەرانی پارتی و ڕۆژنامــەی «خەبات» ئەم وەفـــدە و چالاکیـەکانی پشت گوێ خست. ڕۆژنامەی «اتحاد الشعب»ی حشع هێرشی کردە سەریان. ئەمانەیان بە کۆنەپەرست دائەنا. بەلام ڕۆژنامەی عەرەبی - کوردی «صوت الاکراد - دەنگی کورد» ڕۆژانە ناوی ئەندامانی وەفدەکە و چالاکیـەکانی بلاو ئەکردەوە. ڕۆژنامەی «دەنگی کورد» عومەر جەلال حەویزی دەری ئەکرد کە پارێزەرێکی کۆیی بو.

وەفدەکە شتێکی بە شت نەکرد و، قاسم ئامادە ئەبو بە کۆمەڵ بیانبینێ و، گوێ ی لە خواستەکانیشیان نەگرت، چۆن هات بون بەو جۆرە گەڕانەوە بۆ کوردستان. لە ناو ئەوانەدا تەنیا صدیق بەگی میران توانی بە تەنیا دیدەنی قاسم بکا.

*

## هەلگیرسانی شۆڕشی ئەیلول

پەیوەندی نێوان مەلا مستەفا و قاسم ساردی و گرژی تێکەوت بو. مەلا مستەفا ئەیویست قاسم ناچار بکا پەیوەندی لە گەڵ چاک بکا. سالی ١٩٦٠ لە کۆبونەوەیەکی فراوانی کۆمیتەی ناوەندی و ئیحتیاتەکانی و لجنەی تفتیش و مورالقبەدا.. کە مەلا مستەفاش بەشدار بو. لەم کۆبونەوەیەدا مەلا مستەفا هێرشی کردە سەر قاسم و، داوای لە حیزب کرد خۆیان بۆ بەرەنگاری ئامادە بکەن و، هەندێ کار بکەن، وەکو: بڕینی خەتی تەلەفۆن و کارەبا، تێکدانی ڕێگا و پرد.. بۆ ئەوەی قاسم ناچار بکا خواستەکانیان جێبەجێ بکا. هەندێ لە ئەندامانی م س وت بویان کاری وەها ئەبێتە هۆی هەلگیرسانی شەڕ بێ ئەوەی ئێمە خۆمان بۆ شۆڕش و بەرەنگاری ئامادە کرد بێ.

*

مەلا مستەفا هەندێ لە کاوانیـەکانی ڕاسپارد بوسەیەکیان بۆ صدیق میران داناو لە نێوان کۆیی - شەقلاوەدا کوشتیان. دوای کوشتنی ئەحمەد ئاغای زێباری، ئەمە دوەمین سەرۆکی عەشیرەت بو، بە فەرمانی مەلا مستەفا بکوژرێ. صدیق بەگی میران گەورەی ئاغاکانی خۆشناو و، لە سەردەمی پاشایەتی دا نائیب و، ماوەیەک بو خۆی لە گەڵ قاسم ڕێک خست بوەوە و، دیدەنی کرد بو. لە سەر کوشتنی ئەو فەرمانی گرتنی سکرتێری پارتی ئیبراهیم ئەحمەد دەرچو، بە سەری دا ڕۆژنامەی عەرەبی «خەبات» و هەفتەنامەی کوردی «کوردستان» داخران، چونکە سەرنوسەری یەکەم و، خاوەن ئیمتیازی دوەم بو.

مەلا مستەفا لە پشتی سەرکردایەتی پارتیەوە کەوتە هاندانی سەرۆکی خێلەکان بۆ خۆپیشاندانی چەکدار. ئەمانە خۆیان بە هۆی «قانونی ئیسلاحی زەراعی» و، هەلتەکاندنی ڕژێمی دەرەبەگی لە قاسم و شۆڕشی ١٤ تەمموز بە داخ بون. لە زۆر جێ عەشائیر بە چەکداری کۆبونەوە. وەکو ئەلێن: بارزانی لە «دوڵ»ێک و مەکتەبی سیاسی، لەو کاتەدا، لە «دوڵ»ێکی تر بو. ئەوان کۆبونەوەی چەکداری خێلەکانی کورد و، هەمو جۆرە پێکادانێکی چەکداریان پێ کارێکی زیانبەخش بو. نەیشیان ئەزانی ئەم خۆسازدان و خۆپیشاندانە مەلا مستەفای لە پشتەوەیە، ئەوانیش وەکو شیوعیـەکان وایان ئەزانی ئەمە پیلانی ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانیێتی، پیلانی ئێرانە بۆ ناتەوەی ئاژاوە.

م س مامجەلالی نارد بۆ هەڵسەنگاندنی هەلومەرجی کوردستان و، خاوکردنەوەی گرژی. کە گەیشتە کوردستان و کۆبونەوەی چەکداری هوزە کوردیەکانی دی و، چاوی بە نامەی مەلا مستەفا کەوت، کە بۆ عەباسی مامەند ئاغای ئاکوی نوسی بو، دەربارەی سازدانی خیلەکانی ناوچەکە، ئەویش ئیتر بیروڕای خوی گۆری و، پشتیوانی لە داواکەی مەلا مستەفا کرد و، هاتە سەر باوەڕی ئەوەی ئیتر کاتی دەسپێکردنی شورش هاتوە.

ماوەیەک تی پەڕی مامجەلال هەوالی نەبو. بە دوای مامجەلال دا، م س عومەر مستەفای نارد، کە تازە لە کاتی گوێزانەوەی دا، لە گیراوی هەلات بو. ئەویش کە هەلومەرجی شورشگێرانەی کوردستانی بینی مایەوە و، شوێن هەڵلاکە کەوت.

چەکدار لە هەمو شوێنە گرنگەکانی کوردستان کۆبونەوە، پارتی دەستی لە کۆکردنەوە و هاندان و ڕێکخستنیان دا نەبو. ناڕیکوپێک و بی سەروبەر بون. مەلا مستەفا هانی دابون. وای ئەزانی ئەمە قاسم ئەترسێنی و، سەرئەنجام ناچاری ئەکا، بۆ خاو کردنەوەی هەلومەرجی ئالوزاوی کوردستان داوای پارمەتی لی بکا، ئەوسا ئەویش مەرجەکانی خوی بە سەردا ئەسەپێنی.

*

حکومەتی قاسم لە ۹ - ۱۱ ئەیلولی ٦١ دا فەرمانی دا بە کەرتەکانی جەیش لە جادەکانی دەربەندیخان و دەربەندی بازیانەوە بەرەو سلیمانی بکشین. فڕۆکەی جەنگی پش کەوتە فڕین بە سەر خزیپشاندانی چەکداری عەشاتیردا. پاش تەقوتۆقیکی کەم هێزی عەشائیر کەوتە چولکردنی سەنگەرەکانی و هەلاتنیکی ناڕیکوپێک. جەیش پیشڕەوی کرد و، شوێنەکانی گرت. کادر و ئەندامەکانی پارتی بش کە تەجرەبەی شەڕیان نەبو، بە شێوەیەکی عەسکەری ڕیک ئەخرا بون، ئەوانیش هیوایان بە هێزی عەشائیر بو. کە عەشائیر شکا ئەوانیش شکان و پەرەوازە بون. ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی پارتی وەکو ئاوری ناو درکیان لی هات بو، هەر یەکەیان کەوت بوە شوێنێکەوە؛ ئیبراهیم ئەحمەد و نوری شاوەیس لە بەشدەلە، مامجەلال لە چەمی ریزان، عومەر مستەفا لە دوروبەری بیتواتە، مەلا عەولا لە سەلین و، محەممەدی حاجی تاهیر لە نزیک ماوەت، حیلمی عەلی شەریف لە دەربەند بیلولە، عەلی حەمدی، عەلی عەسکەری، ئەحمەد عەبدوللا لە بادینان بون. هەندێ تاقمی پچوکی تریش بە سەرانسەری کوردستان دا بلاو بوبونەوە.

پارتی شیرازەی لە بەر یەک هەلوەشا. بارەگاکانی داخران و ژمارەیەکی زۆر لە ئەندام و لایەنگرەکانی گیران و، لە سلیمانی بارەگای حیزبەکەیان کردن بە زیندانی ئەندامەکانی.

*

کوژی رۆژنامەوانی قاسم

لە ۲۳ ئەیلولی ۱۹٦۱ دا قاسم لەو کونفرەنسە رۆژنامەوانیەدا کە بە بونەی هەلگیرسانی شورشی کوردەوە بەستی، وتی: «.. لە زەمانی منەوە بە ڕولەکانی گەل رابگەیەنن، ئەم بزوتنەوەیە چیابونەوە خوازە، ئینگلیز لە پشتیانەوەیە و ئەمریکاش دوایان کەوتوە. بەلگەی بێنەرومەمان هەیە ئەوە رون ئەکاتەوە کی لە پشتی ئەم جولانەوەیەوەیە... جولانەوەکە لە ناویرا، هەندێ تاقم و دەستەی راکردو مارون، سەرەکانی ئەوانیش لەناو ئەچین.. سەبارەت بو حکومەتی بەریتانی و لایەنی تر لە پشتی ئەم جولانەوەیەوەن..

سەفارەتی بەریتانی دایکانیە و ئەمریکاش هاوبەشیەتی...»

قاسم لەو کاتەدا دوو کێشەی گەورەی لە گەڵ وڵاتانی رۆژئاوا هەبوو: کێشە لە گەڵ کومپانیاکانی نەوت و، کێشە لە گەڵ کوێت. دوای کشانەوەی هێزەکانی بەریتانیا قاسم کوێتی کردبوە قەزایەکی بەصرە و شێخی کوێتیشی بە قائیمقام دانابوو، هێزیشی ئامادە کرد بو بۆ گرتنی. ئەمەش ئاکوکیەکی تری لەنێوان قاسم و بەریتانیاو هەمو دەوڵەتانی عەرەبی و دەوڵەتانی ناوچەکە لەوانە ئێران و تورکیا دروست کردبو... قاسم ئەیویست وای دەربخا بزوتنەوەی کورد بە هاندانی ئینگلیز و ئەمریکا لە تولەی ١٤ تەمموز دەرچون لە پەیمانی بەغدا و ئاکوکی لەگەڵ کومپانیاکانی نەوت و داواکردنەوەی کوێت ... دا دەستی پی کردوە.

لەو سەردەمەدا وا باو بو، بەردێک لە ئاسمان بکەوتایەتە خوارێ، ئیمپریالیزمی جیهانیمان پی تاوانبار ئەکرد. لە بەر ئەوە هەقی بو گومانیان لی بکا. بەلام ئەمریکا قازانجێکی لە دۆستایەتی کوردا نەبو، بگرە دۆستایەتی کورد دلی دو دۆستی گرنگ؛ ئێران و تورکیای، لی ئەرەنجاند، کە هەردوکیان ئەندامی سنتو و، یەکێکیان بە بالێکی گرنگی ناتۆ دائەنرا.

ئەمریکا و ئینگلیز زۆر زو قاسمیان بە درۆ خستەوە.

*

## هەلوێستی سۆڤیەتی لە شۆرشی کورد

کە شۆرشی ئەیلول دەستی پی کرد. یەکێتی سۆڤیەت لێی بی دەنگ بو، نە هەلوێستی دوژمنانەی بەرامبەر بزوتنەوەی کورد دەربری، وە نە پشتیوانی لی کرد. لەم مەسەلەیەدا نە پشتیوانی لە قاسم کرد و نەدژی راوەستا، بەلکو گوێی خوی لی خەواند، پەلاماری توندوتیژی کاربەدەستانی عێراق بو دامرکاندنەوەی شۆرشی کورد و، بو سەرکوتکردنی چالاکیەکانی حشع دەستی پی کرد بو، لەگەڵ ئەوەش دا پەیوەرەکانی سۆڤیەت لە عێراق دا خەریکی کاری خویان بون، پەیوەندی ئاسایی سۆڤیەتی - عێراقی بەردەوام بو، یەکێتی سۆڤیەت بە ناوی بەجێهێنانی گفتەکانی خویەوە هەمو چەک و تفاقی جەنگی پێویستی شەری ئەرزی و ئاسمانی دژی کورد بو جەیشی عێراقی دابین ئەکرد، قاسم بە چەکی سۆڤیەتی دریژەی بە جەنگی کوردستان ئەدا.

*

## شێخ ئەحمەد و شۆرش

گەورەترین ئاواتی شێخ ئەحمەد ئەوە بو لی ی بگەرێن بچێتەوە ناو عەشیرەتەکەی خوی و سەرپەرشتیان بکا، ئەوەیشی بۆ لوا بو. حکومەت مووچەی مانگانەی بو خوی و هەمو دەست و پەیوەندەکانی بری بوەوە، لە بارزان خانوی بو کرد بونەوە، بەرێزەوە سەیری ئەکردن. ئەگەرچی مەلا مستەفا سەروکی پ د ک بو، بەلام شێخ ئەحمەد نەیئەهێشت نە پ د ک و نە هیچ پارتیەکی تر لە ناو «میللەت» ی بارزان دا چالاکی سیاسی بنوێنن و لە هیچ بارزانیەکی قبوڵ نەئەکرد بچێتە هیچ حزبێکەوە. لەبەرچاوی خەلک نارەزایی خوی لە مەلا مستەفا نەئەشاردەوە، کە ئەیەوی سەر لە نوی بارزانی و کورد لە بەلاوە بگلێنی، شێخ ئەحمەد هەمیشە دلسوزی و گوێرایەلی خوی بو کاربەدەستانی عێراق دەرئەبری.

کە شۆرشی ئەیلول دەستی پی کرد (١٩٦١) شێخ ئەحمەد لە بارزان دانیشتبو،

بەشداری هیچ خۆ ئامادە کردنێکی نە کرد بو، بەلام هێزی ئاسمانی عیراق بارزانی بۆردومان کرد. لەگەڵ ئەوەش دا شێخ ئەحمەد بروسکەیەکی بۆ عەبدولکەریم قاسم نارد، دڵسۆزی خۆی و عەشیرەتی بارزانی بۆ ئەو حکومەتی عیراقی و، نارەزایی توندی بەرامبەر مەلا مستەفاو دەسپێکردنی شۆرش دەبری. هەروەها بە دەنگی خۆی لە ئیستگەی رادیۆی بەغدادەوە داوای لەگەڵی کورد کرد: «ئالوز ئالوز» نەکەن، دوای مەلا مستەفا نەکەون و بگەڕێنەوە ناو «عەیل و عەیالی خۆ» یان. هەولی دا ئەحیلی زۆرایەتی بارزانیەکان لە جولانەوەکەدا بەشدار بن و، ناوچەی بارزانی لە روی چالاکی و هاتوچوی پێشمەرگەدا داخست بۆ ئەوەی کاربەدەستانی عیراق رازی بکا. کاتێک عیراق کەوتە دروستکردنی «وحدات غیر نظامیە» لە عەشیرەتە کوردەکان دژی شۆرشی ئەیلول، شێخ ئەحمەدیش موافەقەتی کرد بارزانیەکان «وەحدە» یەک پێک بهێنن بە سەروکایەتی شێخ محەمەد خالیدی کوری. ئەم «وەحدە» یە لە هەندێ شەری گرنگ دا بەشداریوون لەوانە گرتنی گەلی علی بەگ و چیای کورەک.

شێخ ئەحمەد جوامێرێکی راستگۆ و سەرراست بو. دڵسۆزی بارەگاکانی خۆی بو. گوێ ی نەئەدایە مالی دنیا. تەنانەت پارەی کالەمزی لە یەکتری جیا نەئەکردەوە، بۆ «مصلحت» ی بارزان بێ ئەندازە دڵسۆز و، لە رەفتار و بریارەکانی دادپەروەر بو. لەناو بارزانیەکان دا پایەیەکی پیرۆزی هەبو. سەرەرای ئەوەی گەلێک کارەساتی بەسەر هاتبو، تووشی گیران و سورانێکی زۆر ببو، بەلام پیاوێکی سادیلکە بو، رۆشنبیری گشتی نەبو، دەستی وەرئەئەدایە کاروباری سیاسەتی گشتیەوە. دوا سالەکانی تەمەنی خۆی بە گۆشەگیری لە ناو بارزانیەکان دا بەسەر برد و، لە سەرەتای سالی ١٩٦٩ دا نەخۆشی تینی بۆ هێنا. حکومەت بە هالیکۆپتەر گواستیەوە بۆ نەخۆشخانەی ئیبن سینا لە بەغداد. رۆژی ١١ ی کانونی دوەمی ٦٩ لە نەخۆشخانە کۆچی دوایی کرد و حکومەت تەرمەکەی بە هالیکۆپتەر هێنایەوە بۆ بارزان و لەوێ ناشتیان.

بانگەوازەکەی شێخ ئەحمەد کارێکی گەورەی لە بارزانیەکان کرد. زۆریان وازیان لە مەلا مستەفا هێنا. مەلا مستەفا ناوچەی بارزانی بە جێ هێشت. روی کردە چیاکانی بادینان. لەو کاتەدا علی حەمدی و ئەحمەد عەبدوللا و علی عەسکەری (کە هەرسێکیان ئەندامی کومیتەی ناوەندی بون) لە بادینان بون. لە گەڵ مەلا مستەفا یەکیان گرتەوە. مەلا مستەفا علی حەمدی و علی عەسکەری نارد بۆ تورکیا «مالی پەنابەری» بۆ وەربگرن. تورکیا ئامادە نەبو بە پەنابەر وەریان بگری. علی حەمدی ئەم رازەی مەلا مستەفای درکاند، لە بەر ئەوە رقی لی هەلگرت، لە یەکەمین هەل دا کوشتی.

شێخ ئەحمەد لوبولی نەئەکرد مەلا مستەفا لە ناوچەی بارزان بێ، مەلا مستەفا لە ژێر گوشاری شێخ ئەحمەدی برای و جەیشی عیراق دا بە ناچاری روی کردە ناوچەی بالەکایەتی. دەوری مەنطقەی راپەیات گیرا. پاش تاپلوقەدانێکی درێژ گیرا. ئەمە ناوچەیەکی فراوانی ئازاد کرد.

*

خامۆشی بالی بە سەر ناوچەکانی سلیمانی و کەرکوک و هەولێردا کێشا بو. هیچ چالاکیەکی پێشمەرگەیی، سیاسی، رێکخراوەیی گرنگی تێ دا نەما بو. مەلا مستەفا ئەم خامۆشیەی بە «مونامەرەیەک» دائەنا کە سەرانی پارتی رێکیان خستوە بۆ ئەوەی جەیش

دەستی بەتال بێ بۆ تێکشکاندنی ئەو. ئەحمەد تۆفیق، ڕێبەری حیزبی دیموکراتی کوردستان و هاوڕێکانی، دژی مەلا مستەفایان ئەدا دژی حیزب. کەوتنە دەرکردنی بڵاوکراوەیەک بە ناوی «دیوانی بارزانی»، ئەم بڵاوکراوەیە تەرخان کرا بۆ بۆ ستایشی سەرکردایەتی بارزانی و، شکاندنی سەرکردایەتی پارتی و، قولکردنەوەی ناکۆکییەکانیان. هەواڵی چالاکی پێشمەرگەکانی بادینانی قەبە ئەکرد و، توانج و پلاری لە پارتی ئەگرت. ڕاستییەکەی هۆی ئەم خامۆشییە تێکشکانی ڕێکخراوەکانی پارتی بو، نەک مونامەرەی سەرکردەکانی.

*

## کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی

لە مانگی کانونی یەکەمی ١٩٦١ دا زۆرایەتی ئەندامانی کومیتەی ناوەندی پاش چەند مانگ لە یەک دابڕان لە گوندی عەوەالان لە نزیک چەمی ڕێزان کۆ بونەوە. لەم کۆبونەوەیەدا بڕیاریان دا:

- جوڵانەوەکە لە باوەش بگرن، ڕێکی بخەنەوە و سەرکردایەتی بکەن.
- دروشمی دیموکراسی بۆ عیراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان بەرز بکەنەوە.
- بارەگای م س دابنێن و، ڕێکوپێکی دەرکردنەوەی خەبات و بڵاوکراوەکانی پارتی دابنێن.

لەم کۆبونەوەیەدا بڕیاریان دا دەستەیەکی نوێنەرایەتی بە سەرۆکایەتی عەلی عەبدوللا بنێرن بۆ لای مەلا مستەفا بۆ ئەهێشتنی گلەییەکانی و، پتەو کردنەوەی پەیوەندی نێوان سەرۆک و سەرکردایەتی.

مەلا مستەفا بۆ پارێزگاری عەلی عەبدوللا لە گەڕانەوەیدا تاقمی بارزانی لە گەڵ ئەنێری. دەمەو بەیانییەک لە ناوچەی برادوست تووشی چەند جاشێکی سولییەکان ئەبن. ئەبێ بە تەقەوتۆق. عەلی عەبدوللایان لێ دائەبڕی دوای دو ڕۆژ ئینجا ئەو دۆزنەوە. مەلا مستەفا لە سەر ئەم ڕووداوە وت بوی: «ئارا داوا ئەکەن حیزب قیادەی شۆرش بکا! کە توشی شەڕ بون لە باتی ئەوەی قیادەی شەڕەکە بکا، خۆی پەس کردوە!»

*

پارتی دوای ئەو کۆبونەوەیەی کۆمیتەی ناوەندی کەوتە خۆڕێکخستنەوە و خۆ سازدانی پێشمەرگەیی و ڕێکخراوەیی و ڕاگەیاندن و، لق و ناوچەکانی ڕێک خستەوە. ڕێکخراوی شارەکانیشی بە نهێنی زیندو کردەوە و، لە هەندێ شار پێشمەرگەی نارشاری دامەزراند.

پارتی لە ناو پۆلیسەکانی هەولێر و سلێمانی دا ڕێکخستنێکی زۆری دامەزراند بو. لە دەوروبەری نەورۆزی ١٩٦٢ دا بە یارمەتی ئەوان دەیان مەخفەری لە قەزاکانی چوارتا، پێنجوێن، قەرەداخ ئازاد کرد. سەدان پارچە چەکی دەس کەوت و، دەیان عەریف و سەدان پۆلیس و، چەندین ئەفسەر هاتنە ڕیزی جوڵانەوەکەوە. ناوچەیەکی فراوان لە هێزەکانی حکومەت ئازاد کرا. ئەمە ئەگەڕێتەوە بۆ ئازایەتی و دڵسۆزی پۆلیسەکان، ئەگینا کەمالی شێخ غەریب لە پێنجوێن و عەبدولوەهاب ئەتروشی لە چوارتا، کە دوایی بون بە دەسەڵاتداری ناوچەکە، ئامادە نەبون بە خۆشی مەخفەرەکان تەسلیمی پێشمەرگە بکەن، بەڵکو لە ژێر گوشاری پۆلیسەکان دا تەسلیم بون.

جولانەوەکە تا ئەحات بەهێزتر ئەبو. پارتی لە سەر شێوەی جەیش لە دەستە (۱۰) پێشمەرگە، پەل (۳۰) پێشمەرگە، لق (۱۲۰) پێشمەرگە، ڕێکی خستن و، چەند هێزێکی پێک هێنا: هێزی ڕزگاری بە سەرکردایەتی مامجەلال لە چەمی ڕیزان، هێزی کاوە بە سەرکردایەتی عومەر مستەفا لە پێتراتە، هێزی خەبات بە سەرکردایەتی عەلی عەسکەری لە چوارتا، کەرتی ۳ و ٤ ی قەرەداخ بە سەرکردایەتی کەمال موفتی، کەوتنە کاری پێشمەرگانە.

مەلا مستەفا لەو کاتەدا بە ناوچەکانی بالەکایەتی، خۆشناوەتی، ئاکۆیەتی.. دا، ئەگەڕا. ئەیئەهیشت ئەو جۆرە ڕێکخستنە پێشمەرگەیییە بخرێتە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ئەوەوە. خۆی بە هەمو هێزەکەی ئەوت لەشکر و، هەر لەشکرێکی کرد بو بە چەند قولێکەوە، سەرلقۆلی بو دانا بون.

*

## نارەزایی مەلا مستەفا لە م س

مەلا مستەفا لە هەمو جێگایەک و لە هەمو کۆر و کۆمەڵێک دا بە ئاشکرا دژی مەکتەبی سیاسی، بە تایبەتی دژی ئیبراهیم ئەحمەد، قسەی ئەکرد. ئەمەی لای ڕۆژنامەنوانەکانیش باس ئەکرد. زۆر باسی لەم بابەتە لە کتیبی: «گەڕانی بە ناو پیاوە ئازاکان دا» ی ڕۆژنامەوانی ئەمریکی دانا ئادەم شمیت و، کتیبی: «شەری کوردەکان» ی ڕۆژنامەوانی بەریتانی دەیڤید ئادەمسن دا هەیە. جنێوی ناشیرینی پێ ئەدان و تۆمەتی نارەوای ئەخلاقیی بە پاڵ ئەدان.

لە ناو جولانەوەکەدا بە کردەوە دو سەرکردایەتی و، دو شێوەی جیاواز لە ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی جولانەوەکەدا هەبو:

یەکێکیان، سەرکردایەتی مەلا مستەفا بو، کە شوێنێکی دیاریکراوی ئەبو، لە ناوچەکانی بالەکایەتی، خۆشناوەتی، ئاکۆیەتی ئەگەڕا و، لەویوە سەرکردایەتی هەمو هێزەکانی بادینانی ئەکرد.

ئەوی تریان، مەکتەبی سیاسی بو، کە پێک هات بو لە ئیبراهیم ئەحمەد، نوری شاوەیس، عەلی عەبدوللا.. کە بارەگاکەی لە ئەشکەوتی مالومە بو، لەویوە سەرکردایەتی هەمو ڕێکخستنەکانی پ د ک و پێشمەرگەکانی سلیمانی و کەرکوک و هەولێری ئەکرد. کەوت بوە دەرکردنی «خەبات» و بەیان و بلاو کراوە.

مەلا مستەفا، بەم گەڕانە، جگە لە ناوچەکانی بادینان، چۆمان، ڕەواندز، شەقلاوە و ئارادەیەک قەلادزە و ڕانیەی هێنا بوە ژێر دەسەلاتی خۆی، لە شوێنێک دانەئەمەزرا گەڕوک بو. لە مەش دو مەبەستی هەبو: یەکەمیان، خۆپاراستن لە هێرشی ئاسمانیی عێراق. دوەمیان، ئەیویست بە شێنەیی و هەنگاو بە هەنگاو تەنگ بە م س هەلبچنی و، ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ئەوانیش بهێنێتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە.

بۆچونی مەلا مستەفا بۆ حیزب، وەکو بۆچونی بو بۆ عەشیرەت. چۆن ئەندامانی عەشیرەت ئەبی بی چەن و چون گوێڕایەلی فەرمان و ئامۆژگاری و قسەکانی سەرۆکی عەشیرەت بن، ئەبی ئەندامانی حیزبیش بە هەمان دلسۆزی گوێڕایەلی فەرمان و ئامۆژگاری و قسەکانی سەرۆکی حیزب بن، لەوەتی گەڕابوەوە بۆ عێراق، لە چەند کۆر و کۆبونەوەدا ئەیوت: «من شای بەریتانیا نیم ڕەمزێکی بی دەسەلات بم، یا سەرۆکی حیزب نابم یا ئەگەر

سەرۆکی حیزب بوم ئەبی سەرۆکێکی راستەقینە بما» لە مەیش مەبەستی ئەوە بو هەمو دەسەلاتەکان لە دەس خوی دا بی و، هیچ کاری بی ئاگاداری و رەزامەندی ئەو نەکری. لە ولاتێکی دواکەوتوی وەک کوردستان دا، هیچ سنورێک نیە بۆ دەسەلاتەکانی «سەرۆکی راستەقینە».

*

م س لەو ماوەیەدا ئەشکەوتی مالومەی کرد بو بە بارەگای خوی. سەرکردایەتیەکی ناوەندیی سیاسی، پیشمەرگەیی، ریکخراوەیی، راگەیاندنی دامەزراند بو. بە دەزگای بیتەل لە گەل هەمو هیزەکانی پیشمەرگە و لقەکانی پارتی پەیوەندی رۆژانەی هەبو. ئیبراهیم ئەحمەد، بە پیچەوانەی مەلا مستەفا، لە شوینی خوی ئەتجولا، بە دریژایی ئەو ماوەیە سەردانی هیچ ناوچە و هیز و لقیکی نەکرد.

*

رۆژنامەی «الثورة» ی بەغدادی کە سەر بە قاسم بو، ئەمریکا و ئەلمانیای رۆژئاوای تاوانبار کردبو بەوەی ئەیانەوی مسئلەی شورشی کورد لە کوری گشتی ئەتەوە یەکگرتوەکان دا باس بکەن. رۆژنامەکە سەفیری ئەمریکی کلە بەغداد دەرکرابو، تیتهام ئەکرد بەوەی لە کونفرەنسی دیپلوماتەکانی ئەمریکا لە ئەثینا خەریکی پەیوەندیە بو ئەم بەسەلەیە. سەفیری ئەمریکی لە حوزەیرانی ٦٢ دا هەوالەکەی بە توندی بە درۆ خستەوە، وتی: «ولاتە یەکگرتوەکان بایەخ بە شورشەکەی مەلا مستەفای بارزانی نادا و هیچ نیازیکی نیە ئەم مسئلەیە بخاتە بەردەمی ئەتەوە یەکگرتوەکان»

*

پیوەندی لە گەل ئیران

صالح یوسفی لە بەغداد لە گەل سەفارەتی ئیران پەیوەندی دامەزراند. بە دوای ئەمەدا شەمسەدین موفتی لە خانەقینەوە بە نهینی چوە قەسری شیرین و گەرایەوە بەغداد. زەمینەی دروستکردنی پەیوەندی لە گەل تهران ساز بو. سالی ١٩٦٢ عومەر مستەفا و عەلی عەسکەری نامەی مەلا مستەفایان برد بۆ ئیران. ئیران بە نهینی پەیوەندی لە گەل م س دامەزراند و، ئەمەریکیان بۆ پیوەندی نارده لایان. ئەمانیش ئەوروحمان روتەیان کرد بە بەرپرسی پیوەندیەکانیان. پیوەندیەکانیان زۆر بە نهینی و لە گەل ساواک بو. تهران چاوپوشی لی ئەکردن تازوقە و داوودەرمان و کەرەستەی چاپ لە بازاری تهران بکرن و، لە سنوریکی تەسک و نەزانراودا هاتوچوی دەرەوە بکەن. بۆ یەکەمین جار کەمال فوئاد لەم ریگایەوە سەردانی کوردستانی کرد.

مەلا مستەفا ئەمەی پی خوش نەبو، ئەیویست پەیوەندی لە ریگەی خویەوە بی.

*

پەیوەندی بەعس و شورش

بەرەی حیزبە قەومیەکانی عەرەب لە عیراق دا لە ژیر دروشمی: «یا اعداء الشیوعیة اتحدوا» ریک کەوت بون عەبدولکەریم قاسم بروخینن. ئەگەرچی بە ئاشکرا لە بەیان و بلاوکراوەکانی خویان دا هیرشیان ئەکرد، سەر شورشی کورد و، بە یاخیبونیکی کونەپەرست و شعوبی دەستکردی قاسمیان دائەنا بۆ دورخستنەوە و لیدانی ئەتەوەپەرستەکانی عەرەب، بەلام لە هەمان کات دا بە نهینی پەیوەندیان لە گەل دامەزراند

بوو. تاهیر یەحیا بە ڕێگەی کەریم قەرەنی لە گەڵ م س پەیوەندی کرد بوو، پێک هات بوون لە سەر ئەوەی: کە بزووتنەوەی نەتەوەپەرستەکانی عەرەب هەر کارێکیان کرد بۆ ڕووخاندنی قاسم، جوولانەوەی کورد لە دژیان ڕانەوەستێ و، ئەوانیش لە یەکەمین بەیان دا دان بە مافی نەتەوەیی کوردا بنێن لە سەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی.

•

## مانگرتنی خوێندکارانی زانستگای بەغداد

لە دوا حەفتەکانی ١٩٦٢ دا هەندێ گێروگرفت لە یەکێ لە قوتابخانەکانی بەغدادا ڕووی دا بوو، بەعسییەکان، کە لەو کاتەدا خەریکی دانانی ڕێوشوێنی ڕووخاندنی قاسم بوون، ئەمەیان قۆستەوە بۆ ڕێکخستنی مانگرتنێکی گەورەتری خوێندکارانی زانستگای بەغداد. سەرکردایەتی پارتی لە چوارچێوەی ئەو پەیوەندییەدا کە لە گەڵ بەرەی نەتەوەیی، بە تایبەتی بەعس دایان مەزراند بوو، داوایان لە «یەکێتی قوتابیانی کوردستان» کرد: لەو مانگرتنەدا دژی قاسم بە چالاکی هاوکاری لە گەڵ «الاتحاد الوطني لطلبه العراق» بکا. بەرەی نەتەوەیی عەرەب ئەم یەکێتییەیان بۆ کۆکردنەوەی خوێندکارەکانی خۆیان لە ڕێکخراوێکی تایبەتی دا، دژی «اتحاد طلبه العراق» کە لە دەس شیوعییەکان دا بوو، دامەزراند بوو. جگە دژی ئەم مانگرتنە ڕاوەستا و، خوێندکارەکانی لایەنگری، لەو شوێنانەی ئەیانتوانی، دریژەیان بە دەوام ئەدا. ئەو کاتە من خوێندکاری پۆلی یەکەمی بەشی زانستی سیاسی بووم لە زانستگای بەغداد و، ئەندامی ڕێکخراوی قوتابیانی پارتی و لیژنەی بەغدای یەکێتی قوتابیان بووم.

مانگرتنەکە تا ڕووخانی قاسم بە ئینقیلابی شوبات دریژەی کێشا.

•

## ئینقیلابی شوبات

لە ٨ ی شوباتی ٦٣ دا قەومییەکانی عەرەب بە ئینقیلابێکی خوێناوی هاتنە سەر کار، عەبدولسەلام عارف بوو بە سەرکۆمار و ئەحمەد حەسەن بەکر بە سەرۆوەزیر. بەیانی یەکەمیان خوێندەوە، بەڵام باسی ئۆتۆنۆمی تێ دا نەبوو، لە گەڵ ئەوەیش دا صالح یوسفی لێپرسراوی پارتی لە بەغدا و، ئەندامی م س، بە ناوی پارتییەوە بروسکەیەکی پشتیوانی بۆ سەرانی ئینقیلابەکە لێدا سەرەتاکەی بە؛ «تلاحمت ضربات ثورتنا بضربات ثورتکم...» دەس پێ کرد بوو. لەو کاتەدا سەرانی ئینقیلاب خەریکی پاکتاوکردنی شیوعییەکان بوون و، هێشتا چارەنووسی ئینقیلابەکەیان بە لادا نەکەوت بوو.

•

ڕووخانی قاسم و هاتنە سەرکاری بەعس لەلایەن هەموو ناحەزانی ڕژێمی قاسمەوە بە خۆشییەکی زۆرەوە پێشوازی کرا، لەوانە ئەمریکا. کاربەدەستانی بەعس لە ڕۆژی یەکەمی جوولانەوەکەیانەوە بانگەوازی کوشتاری شیوعییەکانیان دەرکرد، پەیوەندی نێوان عێراق و یەکێتی سۆڤییەت بە توندی گرژ بوو، یەکێتی سۆڤییەت و پارتە کۆمۆنیستەکانی دنیا هێرشێکی پڕوپاگەندەی فراوانیان دژی کاربەدەستانی ئینقیلابی شوبات دەس پێ کرد. سەرکردەکانی ئینقیلاب بەر لە جوولانەوەکەیان لەگەڵ سەرکردایەتی بزووتنەوەی کورد ڕێک کەوتبوون لەسەر ئەوەی لە بەیانەکانی یەکەمین جوولانەوەدا مافی نەتەوەیی گەلی کورد لەسەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی بسەلمێنن بەرامبەر بە پشتیوانی جوولانەوەی کورد لە کودەتاکەی ئەوان.

شەر لە نێوان کوردو عێراق دا راوەستا گفتوگۆی سیاسی بۆ دۆزینەوەی چارەسەری هێمنانە دەستی پێ کرد.

ئەمریکا بە لایەوە گرنگ بو دەسەلاتی بەعس بمێنێ، چونکە سنوری دانا بۆ نفوزی سۆڤیێتی لە سیاسەتی دەرەوەی دا لەبەر ئەوەی بزوتنەوەی کورد، یەکێک بو لە هەرە گرنگەکانی روخانی عەبدولکەریم قاسم و ئەگەر درێژە بکێشێ یەکێک ئەبێ لە هەرە گرنگەکانی روخان یا هیچ نەبێ لاوازکردنی هەر رژێمێکی لە عێراق دا دەسەلاتدار بێ، لەبەر ئەوە وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمریکا دین رسک نامەیەکی ئاراستەی حکومەتی بەعس کرد کە هەوڵ بدەن بگەنە لایەلاکردنی هێمنانە، هەروەها راسپاردەیەکی دەمێشی بۆ بارزانی نارد کە شەر دەس پێ نەکاتەوە، هەوڵ بدا ناکۆکیەکانی خۆی لەگەڵ دەسەلاتدارانی بەغدا بە رێگەی دانوستان یەلادا بخات.

*

گفتوگۆی کورد - بەعس دەستی پێ کرد.

بە نوێنەرایەتی مەلا مستەفا و سەرکردایەتی پارتی مامجەلال چو بۆ بەغداد. سەرانی ئینقیلابەکەی بینی و، بۆ بە دەسهێنانی پشتیوانی عەرەب چو بۆ قاهیرە بۆ بینینی سەرۆک عەبدولناصر و، بۆ جەزائیر بۆ بینینی سەرۆک ئەحمەد بن بیللا.-مەلا مستەفا ئەم سەفەرەی پێ خۆش نەبو.

رۆژی ٥ ی مارت وەفدی حکومەت کە پێک هات بو لە: طاهیر یەحیا (سەرۆکی ئەرکانی جەیش) و فوئاد عارف (وەزیری دەوڵەت) و عەلی حەیدەر سلێمان (سەفیری عێراق لە واشنتون) چون بۆ نزیک رانیە بۆ دیتنی مەلا مستەفا و سەرانی شۆرش. خواستەکانیان دانی. گەرانەوە بەغداد.

حکومەت ئەمجارە «وەفدی شەعبی» نارد. رۆژانی ٧ و ٨ ی مارت وەفدە شەعبیەکەی حکومەت لە چوارقورنە لە گەڵ مەلا مستەفا و سەرانی شۆرش چەند جاری کۆبونەوە. لە سەر هەندێ شتی سەرەتایی رێک کەوتن.

بەعس ئەو بەلێنەی بە کوردیان دابو سەبارەت بە مافی ئوتونومی بە بیانوی نالەباری هەلومەرجی سیاسی و، نارازی بونی ناصر و ناصریەکان نەیهێنایە دی. ئەمەش یەکەمین پەیمانشکێنی بو. جمال الاتاسی لەو پێشەکیەدا کە بۆ کتیبەکەی منذر موصلی: «عرب و اکراد» نوسیویەتی لە زمانی سەرانی بەعسەوە، بە تایبەتی علی صالح سعدیەوە، دان بەم پەیمانشکێنیەدا ئەنێ.

بەعسیەکان، لە ماوەیەکی کورت دا: شیوعیەکانیان پاکتاو کرد و، قەومیەکانی هاوخەباتی خۆیان لە کار دور خستەوە. ئەیانویست تا بە تەواوی جێگیر ئەبن و هێزەکانی خۆیان رێک ئەخەنەوە گیچەلی کورد بیلایەن بکەن، بە تایبەتی بە هیوای ئەوە بون لە سوریاش بەعس کاروبار بگرێتە دەس.

لە ١٠ ی مارت دا «المجلس الوطنی لقیادە الثورە» بەیانێکی دەرکرد بۆ لێبوردنی تەواوی «.. قاموا بالحرکە المسلحە الکردیە فی المنطقە الشمالیە..» و، رۆژی ١١ ی مارت بەیانێکی دەربارەی کێشەی کورد بلاو کردەوە، مافی نەتەوەیی کوردی لە سەر بنچینەی «لامەرکەزی» سەلماند «.. یقر الحقوق القومیە للشعب الکردی علی اساس اللامرکزیە، وسوف یدخل هذا المبدا فی الدستور المؤقت والدائم عند تشریعهما..».

*

حەشع جەزرەیەکی کوشندەی بەرکەوت. سکرتیرەکەی و ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی سەرکردایەتی و کادرە ناسراوەکانی گیران و کوژران. تەنیا جێگای کە ئەیانتوانی خۆیانی تی دا بگرنەوە کوردستان بو. زۆریان رویان کردە کوردستان. لە کوردستان بە دو جۆر پیشوازییان کردن:

– مەلا مستەفا بە خۆشیەوە بەرەو پیریان چو، دالدەی دان و، ساوەی خۆریکخستنەوەی دان و، پیویستیەکانی دابین کردن.

مەلا لە مەش چەند مەبەستیکی هەبو: یەکەمیان، لە ناکۆکی دا لە گەڵ م س حشع بە لای خۆی دا رایکیشی. دوەمیان، لەو ریگایەوە پشتیوانی یەکیتی سۆڤیەت و حیزبە شیوعیەکان بە دەس بهینی.

– م س کەوتە تفنگ پی هەلچنین و چەک کردن و گرتنیان و، لە چەند جیگایەک کە بە چەکداری لی ی کو بوبونەوە چوە سەریان.

*

## کونگرە لە کۆیە

مەلا مستەفا ئەیویست دەسەلاتی م س لاواز بکا. بۆ ئەم مەبەستە ژمارەیەک لە سەرانی خیل و کەسایەتی کوردی بانگ کرد بۆ کۆبونەوەیەک لە رۆژانی ۱۷ تا ۱۹ ی مارت لە کۆیە. هەندی لە سەرکردەکانی پارتی یش بەشدار بون. لەم کۆبونەوەیش دا مەلا مستەفا نارەزایی خۆی لە سەرانی پارتی دەبری. ناکۆکیەکە کە تا ئەوسا شاردراوە بو ئیتر ئاشکرا بو.

لەم کۆبونەوەیەدا خواستەکانی کورد باس کرا و، وەفدیک لە چەند کەسایەتییەکی ناسراوی کورد بە سەرۆکایەتی مامجەلال پیک هینرا بو گفتوگۆ لە گەڵ بەغداد. ئەم وەفدە چونەوە بو بەغداد. یادداشتیکان ئامادە کرد و، مافەکانی کوردیان لە روانگەی کوردەوە رون کردەوە.

چەند جاری لە گەڵ وەفدی حکومەت دانیشتن. باری سەرلەبیان جیاواز بو. بەعس پرۆژەی لامەرکەزی ئیداری ئامادە کرد بو، ئەمانیش پرۆژەیەکیان ئامادە کرد بو بە ناوی حوکمی زاتیەوە کە لە راستی دا حوکمی فیدرالی بو. دیار بو ئەم دو لایەنە ناگەنە یەک، بە تایبەتی دوای ئەوەی بەعس لە سوریاش کاروباری گرتە دەست.

بەعس خۆی ئامادە ئەکرد بو هیرشیکی فراوان بو سەر کوردستان. هەوالەکانی ئەم خۆئامادەکردنە ئەگەیشتەوە سەرکردایەتی شورشی کورد. مامجەلال بۆ ئەم مەبەستە سەردانی ئەحمەد حەسەن بەکر و طاهیر یەحیا و سەرانی بەعسی کرد بو. لای بەکر پەژارەی خۆی دەبری بو. بەکر ئینکاری کرد بو، بۆ ئەوەی دلنیای بکا بە مامجەلالی وت بو: «واخون عرضی وما اخونکم!»

بەعس خۆی بە حیزبیکی وەحدەوی دائەنا. هەر بەو بیانوشەوە کەوتە دژایەتی قاسم و پیلانگیران و هەولی کوشتنی. دوای ئەوەی کاروباری گرتە دەست باسی وەحدەی عیراق و میصر و سوریا گەرم بو. بۆ ئەو مەبەستە چەند کۆبونەوەیەکی ۳ قۆلی لە قاهیرە کرا. لەو کاتەدا مامجەلالیش لە قاهیرە بو کە گەرابوەوە لە گەڵ چەند خوێندکاریکی هاوریم لە بەغدا

چوون بۆ سەردانی مامجەلال. ئەمانویست بزانین ڕەوتی وەحدەی عەرەبی بە چی گەیشتوە و چارەنوسی کورد لەو وەحدەیەدا چی ئەبێ؟ لە مامجەلالیان پرسی. مامجەلال وتی: «نە ئێستا و نە پاشەڕۆژی نزیک وەحدەی عەرەبی نابێ!» وتمان: «ئەگەر بوو؟» ئەو بە دڵنیاییەوە سوور بوو لە سەر ئەوەی نابێ.

مامجەلال ئیزنی لە بەعسییەکان وەرگرت بچێ بۆ سەردانی عەبدولناصر. ڕێگەیان دا. مامجەلال ناصری بینی و چوە بیروت کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی گرت. خەریکی گەڕانەوە بو بۆ بەغداد. جەنەراڵ تەیموری بەختیار، سەرۆکی پێشوی ساواک، کە تازە لە شا جیا بوبوەوە لە بیروت ئەبێ. مامجەلال هوشیار ئەکاتەوە و، ئاگاداری ئەکا کە نەگەڕێتەوە بەغداد چونکە بەعس نیازی گرتنی هەیە. دوای ئەم هەواڵە بە چەند ڕۆژێکی کەم بەعس لە ناکاو پەلاماری کوردستانی دا و هەمو ئەندامەکانی دەستەی نوێنەرایەتی کوردی گرت..

ئەم کارەی بەعس لە کاری دەولەت نەئەچو، بەڵکو لە کاری باندی مافیا ئەچو. ئەمە بێ باوەڕییەکی قوڵی لە لای سیاسیەکانی کورد دروست کرد. وای کرد سەرانی کورد باوەڕ بە بەڵێنەکانی بەعس و گفتی سەرکردەکانی نەکەن و، گومان لە هەمو هەنگاو و بڕیار و ڕێککەوتنێکیان بکەن.

*

## هەڵگیرسانەوەی شەڕ

بەیانیی ٩ ی حوزەیرانی ١٩٦٣ بە بەیانێکی درێژ «المجلس الوطني لقيادة الثورة» ی بەعس شەڕی لە گەڵ کورد ڕاگەیاند. من لەو کاتەدا هێشتا لە بەغداد بوم، لە ترسی گرتن لە گەڵ هەندێ لە هاوڕێکانم چوم بۆ هەولێر و، لەوێوە بۆ بنکەی پێشمەرگە لە پەلکانەی دەشتی هەولێر بەرەو مالومە. هاوڕێکانم کە لە بەغدا مابونەوە زۆریان گیران، یەکێکیان: محەممەد صدیق عەبدولرەحمان، کە پێکەوە خوێندکار و، لە کاروباری ڕێکخراوەیی پارتی و قوتابیان دا هاوکار بوین، دوای گیرانی بە ئەشکەنجە کوشتیان.

*

کاربەدەستانی بەعس لە بەیانی ڕۆژی ٩ ی حوزەیران دا لە ناکاو، هێرشی زەمینی و ئاسمانی گەورەیان بو سەر کوردستان دەس پێکرد، لەو کاتەدا هێشتا نوێنەرایەتی کورد لە بەغدا بو دانوستان مابونەوە، بەعس نوێنەرەکانی گرت، لە باتی گفتوگو بو دۆزینەوەی چارەسەری هێنانە لەژێر ئەشکەنجە و ئازاردا نامەی پەشیمانی لە بزوتنەوەی کوردو نارەزایی دژی بارزانی بە صالح یوسفی و عەبدولحسێن فەیلی نوسی و، هەندێکیانی بۆ قسە کردن هێنایە سەر تەلەفزیۆن. لە کوردستان پەیڕەوی سیاسەتی ئەرزی سوتاوی کرد، بە هەزاران کەسی گرت و بە سەدانی کوشت، چەند گەڕەکی کوردنشینی لە ناو شاری کەرکوک تەخت کرد، کوێرانە بوردومانی سەدان گوندی کرد، بە کورتی شەڕێکی هەڵگیرساندەوە، کەدەزگاکانی ڕاگەیاندنی سۆڤیەتی بە شەڕی «جینوساید» یان دا ئەنا. کەچی ئەمریکا نەک گوشاری بو سەر بەعس نەهێنا بو ڕاگرتنی شەڕو لابەلاکردنی ناکۆکیەکانی لەگەڵ بزوتنەوەی کورد بە ئاشتی، بەڵکو پشتیوانی لە حکومەتی بەعس کرد. تورکیا ڕێگەی دا بە فڕۆکەی عیراقی بچێتە ناو خاکی ئەوانەوە بو ڕاونانی پێشمەرگە.

*

هەڵگیرسانەوەی شەر و، توندوتیژیی هێرشەکانی بەعس ناکۆکییەکانی ناوخۆی کرد بە ژێرەوە. مەلا مستەفا لەو هەلومەرجەدا، کە ناوچەی بارزان کەوت بوە بەر هێرشێکی سەخت، هەر نەیتوانی بەرگری بکا، نەیئەتوانی شەری بەعس و، لە هەمان کات دا شەری م س بکا.

•

بەعس و سۆڤیێت

دەسەلاتی بەعس لە ناوەوە کەوتە لەتلوەهامی شیوعیەکان. تەگەرەدان لە کاری پسپۆر و شارەزاکانی سۆڤیێتی و، راگرتنی ریکەوتنە ئابوری، بازرگانی، تەکنیکی، روشنبیریەکانی سۆڤیێتی - عیراقی سالانی ۱۹۵۹ - ۱۹٦۰. و، هەولدانی کرینی چەک و تفاقی جەنگی لە بەریتانیا و، کردنەوەی دەرگای کار بۆ کومپانیاکانی بەریتانی، ئەمریکی، ئەلمانی و ژاپونی.

لەدەرەوەش، هێرشێکی فراوانی پروپاگەندەی دژی «ئیستیعماری شیوعی» سۆڤیێتی و ولاتانی ئەوروپای رۆژهەلات دەس پی کرد، هەولی دا پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئێران و تورکیا و دەولەتانی ئەوروپایی رۆژئاوا پاش بکات. دانی بە کوێت دا نا و، بەیەنی لەگەڵ میصر ئیکچو.

یەکیەتی سۆڤیێت خەریک بو هەمو ئەو جیگە پیمانەی لە ۱۹۵۸ - ۱۹٦۳ لە عیراق دا دایمەزراند بو لەدەس بدا. عیراق لە روی هەلویستەوە بەرامبەر سوڤیێت بچیتەوە دوخیانی سەردەمی نوری سەعید.

موسکویش کەوتە:

- دەسپیکردنی فراوانترین هێرشی پروپاگەندە دژی رژیمی بەعس.

- کە بەعس جەنگی کوردستانی دەست پی کردەوە، هانی مەنگولیای دا داوا لە ریکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان بکا، بو لیدوانی جینوسایدی کورد لە ژیر سایەی رژیمی بەعسی عیراق دا، لە خولی ۱۸ کوبونەوەی گشتی دا. بەلام پاش چەن روژی داواکەی خوی کیشایەوە، چونکە میصر بو ئەوەی مەسەلەی کورد دورایەکی ناوەدولەتی پەیدا نەکا، داوای لە سۆڤیێت کرد بو ئەم داوایە بکیشیتەوە.

- کاتیک سوریا «لیوای یەرموک» ی نارد بو یارمەتیدانی جەیشی عیراق لە دژی کورد، یەکیەتی سۆڤیێت نوتێکی دا بە سوریا و ئێران و تورکیا دەربارەی گەلەکومەکیی چوار قولی دژی گەلی کورد لە عیراق دا.

- هەروەها مامجەلالی، سەروکی نوینەرایەتی کورد بو دانوسەندن لەگەڵ رژیمی بەغداد، کە لەو کاتەدا لە ئەوروپا بو بانگ کرە بو گفتوگو بو موسکو. نوینەرایەتی سۆڤیێتی لە گفتوگودا لەگەڵ مامجەلال، پشتیوانی خویان لە خەباتی رەوای کورد لە پیناوی بەدیهینانی عیراقیکی دیموکراتی و کوردستانی ئوتونوم دا دەربری، داوایان لی کرد کورد دریژە بە خەباتی شورشگیرانە بدا، ئەوانیش یارمەتی مادی و مەعنەوی ئەدەن. هەروەها دەستەیەکی نوینەرایەتی پ د ک یان بە سەروکایەتی سکرتیری پارتی ئیبراهیم ئەحمەد بانگ کرد بو سەردانی یەکیەتی سۆڤیێت، ئاموژگاری بزوتنەوەی کوردیان کرد، کە پەیوەندیەکانی خوی لەگەڵ دنیا فراوانتر بکا، بەلام پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل دروست نەکا، هەروەها داوایان لی کرد یارمەتی حشع بدەن بو ئەوەی لەو کارەساتەی تی ی کەوتوە

دەرپێت و سەرلەنوێ خۆی ڕێک بخاتەوە.

وەزیری کاروباری دەرەوەی سۆڤیێتی گرومیکو، لەو نۆتەدا لە ٩ تەممووزی ١٩٦٣ کە دابوی بە سەفیرەکانی دەوڵەتانی ئێران و تورکیا و سووریا نووسیبوی: «یەکێتی سۆڤێت ناتوانێ دەستەوەستان ڕاوەستێ بەرامبەر بەو ڕووداوانەی لە لای خوارووی سنوورەوە ئەقەومێن..»

دەزگاکانی ڕاگەیاندنی سۆڤیێتی و دەوڵەتانی سۆسیالیست و حزبە کۆمۆنیستەکانی دنیا لەسەر ئەم ئاوازە هەواڵەکانی جەنگی کوردستانیان بڵاو ئەکردەوە، حزبی بەعسیان بە جینۆساید دژی گەلی کورد تاوانبار ئەکرد، و ئەیانوت جینۆساید و پێشێلکردنی مافەکانی مروڤ بەرامبەر گەلی کورد لە عێراق دا ئاشتی بە مەسەلەی ناوخۆ دانێری، چونکە کاربەدەستانی عێراق پەیمانە جیهانیەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان و ڕاگەیاندنی جیهانی ی مافی مروڤ و.. شکاندوە.

هاوزەمان لەگەڵ تێکچوونی پەیوەندی عێراقی - سۆڤیێتی، پەیوەندی ئێرانی دوای چەندین ساڵ گرژی هەلومەرجێکی گرنگی تێکەوت، خاوبونەوەی جەنگی ساردی سۆڤیێتی- ئەمریکی لەسەرەتای شەستەکان دا بە تایبەتی دوای «تەنگژەی مووشەکی کوبا» کە ئەمریکاش ساروخەکانی خۆی بەبێ ڕەزامەندی تورکیا لە تورکیا کێشابوەوە - بەرامبەر ساروخەکانی سۆڤیێتی لە کوبا، هاوپەیمانە ڕۆژهەڵاتیەکانی ئەمریکا بە سیاسەتی خۆیان دا چونەوە، شا بە ناوی «سیاسەتی مستقلی ملی» بەوە هەوڵی دا جۆرێک لە هاوسەنگی لە ئێران پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئەمریکاو لەگەڵ یەکێتی سۆڤیێت دروست بکا، وە کەوتە هەوڵدانی دروستکردنی پەیوەندی ئابوری، بازرگانی، تەکنیکی، لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت . لە ٢٧ ژوئیەی ١٩٦٣ دا یەکەمین ڕێکەوتنی ئابوری ئێرانی- سۆڤیێتی ئیمزا کرا بۆ دروستکردنی بەنداو و، دو ئیستگەی کارەبا و، پرۆژەیەکی ئاودێری.

•

مامجەلال کە چوبو بۆ دیتنی ناسر، دوای سەردانی لوبنان و ئەورووپا و یەکێتی سۆڤێت، بە ڕێگای ئێران دا گەڕایەوە کوردستان.

ژمارەیەک سیناتۆر و کۆنگرێسمان لە ئەمریکا داوایان لە کامەران بەدرخان کرد بۆ کە مەلا مستەفا سەردانێکی ئەمریکا بکا، ئەگەر ئەو نەتوانێ کاربەدەستێکی شۆڕشەکە بچێ. ئیبراهیم ئەحمەد و سەید عەزیزی شەمزینی بە ڕێگای ئێران دا چونە ئەورووپا. ئیبراهیم ئەحمەد بە نیازی گەشتێکی سیاسی بو لە ئەورووپا و ئەمریکا.

ئیبراهیم ئەحمەد لەم گەشتەدا، بۆ یەکەمین جار لە گەڵ کاربەدەستانی ئێرانی، بە تایبەتی ساواک، دانیشت. سەردانی مۆسکۆی کرد و، نوێنەرێکی ئیسرائیلی بینی و، هەوڵێکی سەرنەکەوتوی سەردانی ئەمریکای دا.

ئیبراهیم ئەحمەد و سەید عەزیزی شەمزینی، کە ئەوسا ئەندامی م س بو، چون بۆ یەکێتی سۆڤێت. نوێنەرانی سۆڤیێتی داوایان لێ کرد بون، لە گەڵ شەرعیەکان نەرم بن و هاوکاریان بکەن. بەڵام ئیبراهیم ئەحمەد بە توندی ڕەخنەی گرت بو لە هەڵوێستی حشع بەرامبەر مەسەلەی کورد و، لە پشتیوانی حشع لە قاسم. یەکێتی سۆڤێت بەڵێنی هەندێ یارمەتیان دا بە تایبەتی چەندەیەکی کەم پارە و، ئیستگەیەکی رادیو، بەڵام سەردانەکە یەگشتی سەرکەوتنێکی زۆری بەدەست نەهێنا، بە تایبەتی چونکە زۆری پێ نەچو

هەلومەرجی ناوخۆی عیراق سەرلەنوێ بە قازانجی یەکێتی سۆڤیەت گۆڕایەوە.

*

## ئینقیلابی عارف

لە ١٨ ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٣ دا بەعس ڕوخا. مۆشیر عەبدولسەلام عارف و تاقمی لە جەنەراڵەکانی جەیش دەستیان بە سەر کاروباری عیراق دا گرت. حکومەتی نوێ ی مۆشیر عارف هەمو لاوازیی و گیروگرفتەکانی حکومەتی پێشوی بەعسی بە میرات بۆ بە جێ مابو، بگرە لاوازتر بو بو. ئینقیلابی یەک لە دوای یەک ڕۆژەکانی جەیشی گلۆڵ کرد بو، جەنگی کوردستان ببوە بارێکی گران بە سەر ئابوری عیراقەوە. لە هەمان کات دا هەلومەرجی کوردستانیش بە هۆی سیاسەتی تەزوی سوتێنەراوی بەعسەوە خراپ بو، ئابلوقەی ئابوری و وشیگیر و وشەکوژی و ویرانکردنی ژمارەیەکی زۆر دێهات و سوتاندنی هەمو خەلە و خەرمانی کوردستان، خەلکی پەرێشان کرد بو.

جەیشی عیراق ئەگەرچی شەری ڕانەگرت بو لە گەڵ بزوتنەوەی کورد، بەلام بە هۆی ئالوگۆری سەرکردەکانی و گیروگرفتەکانی ناوخۆیەوە جاری لە هەلومەرجێک دا نەبو بە توندوتیژی جاران درێژە بە شەر بدا. پەیوەندی لە نێوان مەحافظی سلێمانی و مەلا مستەفادا بۆ ڕاگرتنی شەر دەستی پێ کرد. ناصر ئامۆژگاری مۆشیر عارفی کرد بو کێشەی کورد بە ئاشتی چارەسەر بکا و، یەکێتی سۆڤیەت و ئەمەریکایش، هەر یەکەیان لە لای خۆیەوە، لە هەردولایان ڕاسپارد بو، کێشەکانی نێوانیان بە ئاشتی بە لادا بخەن. لەم کاتەدا ئیبراهیم ئەحمەد و سەید عەزیزی شەمزینی لە گەشتی سیاسی بون لە ئەوروپا. دوای ئەم ڕوداوە ئەوانیش گەڕانەوە کوردستان. تەنیا دەولەت، کە ئاشتی پێ ناخۆش بو، ئێران بو.

*

## پێکهاتنی مۆشیر - بارزانی

لە ١٠ ی شوباتی ١٩٦٤ دا ڕادیوی بەغداد بەیانێکی مۆشیر عارفی خوێندەوە و، بەیانێکی پشتیوانی مەلا مستەفایشی بە دودا خوێنرایەوە.

بەیانەکەی مشیر عارف ٩ خاڵ بو ئەمە کورتەکەیەتی:

١. اقرار الحقوق القومیە لاخواننا الاکراد ضمن الشعب العراقی فی وحدە وطنیە واحدە متاخیە وتثبیت ذلک فی الدستور.

٢. بەردانی گیراوەکان و دەرکردنی لێبوردنی گشتی.

٣. گێرانەوەی بەڕێوەبەرایەتی بۆ ناوچەکانی ژورو.

٤. گێرانەوەی فەرمانبەرەکان.

٥. لابردنی گژوپەیوەند لە سەر گویزانەوەی خواردەمەنی.

٦. دەسکردن بە ئاوەدانکردنەوەی ناوچەی ژورو.

٧. بژاردنی زەرەر و زیانی ئەوانەی زەویەکانیان بوە بە ژێر ئاوی دوکان و دەربەندیخانەوە.

٨. دانانی ڕێکخو شوێنی گێرانەوەی ئاسایش و ئارامی بۆ ناوچەی ژورو.

٩. وەزارەتە پەیوەندیدارەکان ناوەرۆکی بەیانەکە جێبەجێ بکەن.

مەلا مستەفایش لە بەیانەکەی دا نوسی بوی:

«... بۆ بەجێهێنانی ئارەزووی سەرکۆمار... سەبارەت بە پاراستنی یەکێتی ریزی نیشتمانی و، ریگرتن لە رژانی خوێنی بێ تاوان و، بۆ کۆتایی بە شەری براکوژی و، بە هۆی سابیت بوونی پاکی نیازی دەسەلاتی حوکمڕان، بڕیارمان دا دەس پێشکەری بکەین بۆ راگرتنی شەر و، داوا لە براکانم بکەم بگەڕێنەوە سەر جێگاوڕێگای خۆیان و بکەونەوە سەر کاری ئازاد و سەربەرزانەی پێشوویان، بە مەبەش بواری دەسەلاتی نیشتمانی تەدری دەس پێشکەری بکا بۆ .. گێڕانەوەی ژیانی ئاسایی و ئاسایش و ئارام بۆ ناوچەکە و، هەڵخستنی هەلی داتنان بە مافە نەتەوەییەکانی هاوڵاتییانی کوردا لە ناو گەلی عێراق دا لە یەک یەکگرتنی نیشتمانی دا...»

لەو کاتەدا کە ئەم بەیانانە خوێندرانەوە من لە گەڵ نزیکەی ..١ قوتابی لە چوخماخ لە کۆنگرەی «یەکێتیی قوتابیانی کوردستان» بووم. عەلی حەمدی، لێپرسراوی ئەوسای لقی ٤ ی سلێمانی، لە کردنەوەی کۆنگرەکە و هەندێ لە کارەکانی دا بەشدار بوو. کە پرسیارمان لێ کرد دەربارەی راگرتنی شەر و گفتوگۆی کورد و حکومەت، بێ ئاگایی خۆی پیشان دا.

مەلا مستەفا بێ ئاگاداری و پرسی م س شەری راگرت بوو و، لەم گفتوگۆیەیش چەند مەبەستێکی هەبوو:

١. ئەیویست دەستی بەتاڵ بێ بۆ بە لاداخستنی ناکۆکی لە گەڵ م س و، یەکلایی کردنەوەی ملمڵانی ی دەسەلات لە ناو بزووتنەوەی کوردا بە قازانجی خۆی.

٢. کوردستان لە چەند مانگی هێرشی بەعسی دا کەوت بووە ژێر گوشاری سەختی ئابلوقەی ئابوورییەوە. خواردەمەنی و سووتەمەنی زۆر گران و بە زەحمەت دەس ئەکەوتن. بەعس خەڵە و خەرمان و پووش و پاوانی کوردستانی سووتاند بوو، زۆر شوێنی ویران کرد بوو. خەڵک بە گشتی لە ژیانێکی سەخت و دژواردا بوون. ئەیویست خەڵک پشوویەکی پیا بێنێتەوە. هەلومەرجی ژیان لە بارزان زۆر سەخت بوو، لەم رووەوە گوشاری شێخ ئەحمەدی لە سەر بوو.

مەبەستی سەرەکی مەلا مستەفا لە گفتوگۆ یەکلاییکردنەوەی ملمڵانی ی دەسەلات بوو لە گەڵ سکرتێر و سەرکردایەتی حیزب. مەلا مستەفا وای لە کاربەدەستانی عێراق گەیاند بوو، کە ئەو: هیچی ناوێ، ئەیەوێ ئاسایش بگەڕێتەوە ولات و، ئەویش بگەڕێتەوە بەرزان خەریکی شوانی بێ، بەڵام ئیبراهیم ئەحمەد و ئەوان بە هیچ رازی نابن، ئەگەر ئەم کۆسپە لابەری گیروگرفتەکە چارەسەر ئەکرێ.

*

مەلا مستەفا بە هەموو شێوەیەک ئەیویست، لە ململانێی دا لە گەڵ م س حکومەت بە لای خۆی دا رابکێشێ و، باوەڕی موشیر عارف بە دەس بهێنێ. مەلا مستەفا بۆ بە جێهێنانی مەبەستەکانی خۆی لە هیچ قسەیەک نەئەسڵەمییەوە و، لە هیچ بەڵێنێک نەئەپرنگایەوە. زۆر جار ئەم قسە و بەڵێنانە لای چاودێرێکی بێلایەن بە شتی نابەجێ دائەنران، بەڵام هەمیشە هاوکارەکانی بۆیان بە فەلسەفە و حیکمەت و، تاکتیکی زیرەکانە ژماردووە. مەلا مستەفا خۆی تەفسیرێکی تری هەبوو بۆ ئەم مەسەلەیە، ئەیپرسی: «قسە چیە؟» خۆی وەڵامی ئەدایەوە، ئەیوت: «قسە بایە! ئەویان لە قوون و ئەمیان لە دەم دەرئەچێ!» بەم تێگەیشتنە هیچ دریخی نەئەکرد لە ستایش کردنی موشیر عارف و رازی کردنی دا.

- عارف دژی ژیانی حیزبایەتی بو، بە چاو لێکەری ناصر «الاتحاد الاشتراکی العربی» دامەزراند بو. ئەمیش دژایەتی خۆی بۆ حیزبایەتی راگەیاند.
- عارف ئەیویست داوودەزگای بەڕێوەبەرایەتی و پۆلیس بگەڕێنەوە ناوچە ئازادکراوەکان، ئەویش فەرمانی بۆ فەرماندەکانی پێشمەرگە دەرئەکرد کارئاسانی گەڕانەوەیان بکەن.
- عارف ئەیویست پێشمەرگە بلاوەی لی بکەن و بگەڕێنەوە سەر کارەکانی خۆیان، ئەمیش داوای هەمان شتی لی ئەکردن.
- نوێنەرەکانی حکومەت جارێک باسی نەورۆزیان کرد بو کە بیکەن بە جەژنی رەسمی، مەلا مستەفا هەلی دابویە کە پێویست بە نەورۆز ناکا چونکە وەکو بە عەرەبی وت بوی: «لنا عیدان، عید رمضان و عید قوربان»
- بۆ بەرپەرچدانەوەی پروپاگاندەی ئەبارەکانی کە: «بارزانی کوردی بە پرتەقال فرۆشتوە» بەیانێکی بە کوردی دەرکرد بو لە چاپخانەی کامەرانی چاپی کرد بو تیی دا نوسیویتی:
«لە کۆبونەوەی یەکەمی بەینی ئیمە و نوێنەرانی میری دا کە نوێنەرانمان بریتی بون لە نوێنەری پارتی و عەشایەر و سەربەخۆکان، حکومەتی عیراق دانی ناوە بە هەقی میللەتی کوردا و لە بەیانی سەرۆک کومار سیادەتی مشیر الرکن عبدالسلام محمد عارف دا بلاو کراوەتەوە و بریاری تەواوی حکومەتیش ئەوەیە کە هەقی مەشروعی گەلی کورد وەکو شەعبێک بە تەواوی بدات لە ناو چوارچێوەی کۆماری خۆشەویستی عیراق دا، وە ئێمەش گفتی سیادەتی سەرۆک کۆمار بە راست ئەزانین و لامان وایە کە هەرگیز لە گفتی خۆی کە داویەتی پەشیمان نابێتەوە چونکە هەرگیز پیاوێکی پیاو و موسلمانێکی پاک و جی ی بروایە و (المؤمن و مؤتمن) وەک لە حەدیثی شەریف دا فەرمویانە.
.. ئێمەش ئێستا چاوەروانی ئەنجامی ئەم دلوایەی خۆمانین و لێشمان رونە کە حکومەتمان نیەتی پاشە و دەست درێژ ناکاتە سەر حقوقی مەشروعی میللەتی کورد..
لە ئەنجاما بە پێویستی ئەزانم کە پێتان بلێم.. کە کاروبارتان کە سودی گەلی کوردی وا بە دەستێکی پاکی ئەمینەوە هەتا هەتایە هەقی میللەتمان نەفرۆشراوە و نەئەفرۆشری وە لە ری ی ئەو هەقەدا بارزانی لە پێش هەمو کەسێکەوە گیانی لە سەر دەست بوە و هەمیشە خۆی فیدا ئەکات بۆ گەلی کوردی قارەمان.»
بەم قسانە ئەیویست حکومەت لەو ململانێیەدا بە لای خۆی دا رابکێشێ.
مەلا مستەفا لە ئەخشەکەی دا سەرکەوتو بو؛ حکومەتی بە لای خۆی دا داشکاند و، خۆی وەکو ئاشتیخواز و، ئیبراهیم ئەحمەد و هاورێکانی وەکو شەرخواز ئەخاتە بەرچاو.

*

## لیوا عشرین

لە دوای دەس پێکردنی شۆرشەوە لیوای عشرین بە سەرکردایەتی زەعیم صدیق مستەفا هێنرا بوە سلێمانی. ئەم لیوایە لە درندەترین کەرتەکانی جەیشی عیراق بو. زۆر کەسی بە بێ تاوان کوشت و زۆر کەسی بەبێ تاوان گرت و، چەندین گوند و ئاوایی وێران کرد. لە هەر شەرێک دا کە ئەشکا ئەگەرایەوە تۆلەی لە دانیشتوانی سلێمانی ئەکردەوە. ناو بە ناو لە ناو شاردا بلاو ئەبونەوە و کوێرانە ئەکەوتنە گرتن و لێدانی خەلک. کە ئەم هێزە

بلاو ئەبوەوە خەلک بۆ ئەوەی لە گیچەڵ و شەڕی پارێزراو بێ دوکانیان دا ئەخست و ڕیبوار دەستی نەکرد بە ڕاکردن. خەلک ڕاهات بوون کە ئەمە ئەبو هەرکەس بیپرسیایە چیە؟ ئەیانوت: «ئەرز قلیشاوەتەوە». ئەویش دەستی نەکرد بە ڕاکردن و خۆشاردنەوە لە ناو کۆلانەکان دا.

بەیانی ٩ حوزەیران ئەم لیوایە «منع التجول» ی ڕاگەیاند. زۆر کەس ئەیانزانی بۆ وەکو ڕۆژانی تر چوبونە بازار، یا لە دیهاتەکانی دەوری سلیمانیەوە هات بون بۆ ناوشار، زۆری ئەمانە کوژران. هەلومەرجی ئەو ڕۆژانە ئەوەندە سەخت بو کەس نەیئەتوانی کوژراو و مردو بیا بۆ گۆرستان بە ناچاری لە ناو حەوشی مالەکانی خۆیان دا ئەیان شاردەوە.

لە ئەنجامی ئەم منعە تەجەولەدا هەرکەسێکیان بەر دەس کەوت گرتیان. چەند هەزار کەسی گیران. زیاتر لە سەد کەسیان کوشتن و هەندێکیشیان زیندە بە چاڵ کردن و، ئەوانی تریشیان لە ناو تەویلەکانی «تاولەی سواری» دا گرت و ٥٢ سەعات نان و ئاویان نەدانی.

سالی ٦٤ ئەم لیوایە گوێزرایەوە بۆ شوێنێکی دور لە سلیمانی. زەعیم صدیقی فەرماندەی لیواکە بیست بوی لە نزیک عەربەت کەمینیان بۆ داناوە. مەلا مستەفا شێخ ئەحمەد ئاغا و چەند پێشمەرگەیەکی لە گەڵ ناردن بۆ ئەوەی بە سەلامەتی ڕەتیان بکەن.

*

ئیبراهیم ئەحمەد و سەید عەزیز گەرانەوە کوردستان، لە گەڵ ئەندامانی تری م س: نوری شاوەیس، عەلی عەبدوللا، عومەر مستەفا، جەلال تالەبانی، چونە رانیە بۆ دیدەنی مەلا مستەفا و گفتوگۆ لە سەر جۆری ڕێککەوتنی لە گەڵ حکومەتی عیراق.

م س لە مەلا مستەفایان پرسی کە ئاخۆ جگە لەو دو بەیانە هیچ ڕێککەوتنێکی نهێنی دەربارەی سەلماندنی مافی نەتەوەیی کورد لە بەین دا هەیە؟ مەلا مستەفا پێ ی دائەگرت کە جگە لەو دو بەیانە ئاشکرایە، شتێکی تر لە بەین دا نیە.

م س لای وابو کە ئەو بەیانەی عارف خواستەکانی کورد ناهێنێتە دی، حکومەتی عارف لە هەلومەرجێکی ناوەکی و دەرەکی لاواز دایە، کورد نەگەرچی بە هۆی شەڕی ٥ مانگەی بەعسیەوە وەزعی خراپە، بەلام هێشتا هەلومەرجی ئەم باشترە ئەتوانی گوشار بۆ سەر عیراق بهێنی ئۆتۆنۆمی بسەلمێنی. بارزانی پێ سور بو لە سەر ئەوەی کە وەزعی خەلک خراپە و ماندون، ناتوانن درێژە بە شەڕ بدەن، هەروەها ئەمەریکا و ڕوس ئەیانەوێ ئەو حکومەتە ئەروخێ و لە گەلی ڕێک بکەون.

م س ئەیویست مەلا مستەفا قانیع بکا: یاداشتێک دەربارەی مافی نەتەوەیی کورد ئامادە بکەن و، وەفدێکی خاوەن دەسەلات دروست بکرێ بۆ گفتوگۆ لە گەڵ حکومەت. مەلا مستەفا نەچوە ژێر باری ئەم داوایانەوە.

لەو هاتوچۆیانەدا کە نوێنەرانی حکومەت ئەیان کرد، ئەندامانی م س محافظی سلیمانی عەبدالرزاق محمودیان بینی. بەلام گفتوگۆکەیان بێ ئەنجام بو، چونکە بیرورای مەلا مستەفا لە گەڵ ئەوان بە تەواوی جیاواز بو. ناچار خۆیان لە ٢ی مارتی ٦٤ دا یاداشتێکی دریژیان دەربارەی خواستەکانی کورد دا بە حکومەت. مەلا مستەفا ئامادە نەبو ئیمزای بکا، بە وەفدی حکومەتیشی وت کە ئەو لە سەر ئەو یاداشتە موافیق نیە.

*

گفتوگۆکانی بەرزانی - عارف تاریکوبێک و بێ سەرەوبەر بو. هەردولایان

پەیوەستیان بە کات و، بە راگرتنی شەر و، هەر لایەکیشیان مەبەستی تایبەتی خۆی هەبو.

م س لە هەڵسەنگاندنی بنکەی سیاسی و پێشمەرگەیی و ڕێکخراوەیی خۆی دا بە هەڵەدا چوبو. تا چەند حەفتەیەک لەوەو پێش هەمو بەیان و بڵاوکراوەکانیان بەم دێرە کۆتاییان پێ ئەهێنا: «ئیتر بۆ پێشەوە لە ژێر ئاڵای پارتی مان دا بە سەرۆکایەتی بارزانی» و، لە هەمو شەرەکانی ٦٣ دا بە شانازییەکی زۆرەوە باسی قارەمانیەتی «کاوەی سەدەی بیستەم» یان نوسی بو. لایان وابو چونکە «حزبیان لە سەر حەق» ن و، ئەوە ئیتر بەسە بۆ ڕوتکردنەوەی بارزانی لە دەسەڵاتەکانی و، سازدانی خەڵک لە دژی.

•

بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی نێوان سەرۆک و سکرتێر، چەند کەسی لە کادرەکانی پارتی کەوت بونە ناوبژی لەوانە: د. مەحمود عەلی عوسمان، حەبیب محەممەد کەریم، د. فوئاد جەلال، جەمال شالی. مەرجی سەرەکی مەلا مستەفا بۆ پێکهاتن لە گەڵ م س ئەوە بو: ئیبراهیم ئەحمەد لە سکرتێری حیزب لا ببرێ و، مامجەلال لە جێگای دابنرێ. لەوانە بو قبوڵکردنی ئەم داوایەی مەلا مستەفا، ناکۆکییەکانی کەمێ خاو بکردایەتەوە و، ڕوداوەکان بەو ئاقارە خوێناوییە دا نەرۆیشتنایە کە رۆیشتن. بەڵام ئیبراهیم ئەحمەد و، ئەندامانی تری م س بە لاسارییەکی زۆرەوە ئەم پێشنیارەیان بە بیانوی «شەرعیبەتی حیزبی» یەوە رەت کردەوە، لە کاتێک دا زۆر لە میژ بو خزیان ڕێگایان دا بو بە مەلا مستەفا، کاتێک هەمزە و هاوڕێکانی لە سەرکردایەتی حیزب دەرکرد، ئەم شەرعیبەتە بە تفەنگ بشکێنی.

کونفرەنسی ماوەت

م س لە ٤ - ٩ ی نیسانی ٦٤ دا لە ماوەت کۆنفرەنسێکی بەست. نزیکەی ٧٠ کەس لە نوێنەرانی لق و ناوچەکانی پارتی و نوێنەرانی ڕێکخراوەکانی قوتابیان و مامۆستایان ئامادە بون. فوئادی مەلا محەمود و من بە نوێنەرایەتی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بەشدار بوین.

لە فەرماندەکانی پێشمەرگە: مامجەلال، عومەر مستەفا، حیلمی عەلی شەریف، بەشدار نەبون، لە ناو هێزەکانیان دا مابونەوە، چونکە مەترسی هەڵگەڕانەوە و یاخی بونیان لی ئەکردن. سالح یوسفی و، حسێن فەیلی، کە تازە لە زیندان دەر چو بون، ئەوانیش ئەهات بون.

ئیبراهیم ئەحمەد، نوری شاوەیس، مەلا عەبدوڵلا ئیسماعیل، لە «هەڵو» کانی ناو کونفرەنس بون. نوری شاوەیس لە وەڵامی یەکێک دا کە ئەگەر مەلا مستەفا هێرشی بۆ هێنان چی ئەکەن؟ وتی: «لە سەر پەردەکەی قەشان رەشاشی دائەبەستم شەڕیان لە گەڵ ئەکەم مەگەر بە سەر لاشەکەم دا تی بپەڕن.»

هەندێ کەس پێشنیاریان کرد وەکو دوا تەقەللا بۆ بەلاداخستنی سیاسی ناکۆکییەکان وەفدێکی کۆنفرەنس بچی بۆ لای مەلا مستەفا، «هەڵو» کان بە ناپەدلی و لە ژێر گوشاری زۆرایەتی ئەندامانی کونفرەنس دا قبوڵیان کرد. وەفدەکە کە پێک هات بو لە: ئەحمەد خەیلانی، عەبدوڵلا زیباری، عەلی سنجاری.. چو و گەڕایەوە. هیچ ئەنجامێکی نەبو. مەلا مستەفا لە ناو ئەوانەدا ئیبراهیم ئەحمەدی بە عەقڵی ئەگێرکەر دائەنا، ئەیویست لە پێشەوە لەو بدا و، مامجەلال لە جێگای دابنی. هەر بۆ ئەو مەبەستە نامەیەکی بۆ

مامجەلال نوسی بو، داوای لی کرد بو بچی بۆ لای ئەو، واتە بۆ لای «حەق» و لە گەڵ «باطل» نەبی و ئایەتیکی قورئانی بونوسی بو کە نوح لە کاتی تۆفانەکەدا بە کورەکەی ئەلی: «یا بنی ارکب معنا ولا تکن مع القوم الکافرین».

کونفەرەنس بریاری دا مەلا مستەفا لە دەسەلاتەکانی روت بکاتەوە: دەسەلاتی گفتوگۆ و ریککەوتن لە گەڵ حکومەتی عیراق، دەسەلاتی لابردنی فەرماندەکانی پیشمەرگە، دەسەلاتی گرتنی کۆنگرەی پارتی.. بەلام ئەویش بە بروسکەیەک کە تیی دا نوسی بوی: «بەو سیفەتەی رشیسی حزب و قائیدی عامی پیشمەرگە و وەکیلی میللەتە» بریاری دا: «عومەر مستەفا لە هیزی کاوە و، عەلی عەسکەری لە هیزی خەبات و، کەمال موفتی لە هیزی قەرەداغ و مامجەلال لە هیزی رزگاری لابرات و، لە جیگای ئەوان کاکی ئەحمەی، نوری مەعروف، رەشید سندی، نوری مەلا حەکیم.. دابنی.»

وەکو دوایی ئەیان گیرایەوە: ئەوانەی لە ناو پیشمەرگەدا بون، بە تایبەتی مامجەلال و حیلمی و عومەر مستەفا، ئەیانزانی نفوزی مەلا لە ناو پیشمەرگەدا بە هیزە، لە بەر ئەوە ئەیان ئەویست پیوەندی پارتی لە گەڵ مەلا مستەفا تیک بچی، بەلکو لە گەڵ ئەوە بون هەرچونی بی لە گەلی بسازین.

بریارەکەی کۆنفەرەنس بری نەکرد و، فەرمانەکەی مەلا مستەفا جیبەجی بو.

*

بە دوای کـونفـەرەنسی مـاوەت دا م س لە رۆژی ۱۹ ی نیـسـان دا، بەیانیکی دوورودریژی دەرکرد بە ناونیشانی: «اتفاقیە المشیر - بارزانی: اصلح ام استسلام؟»

لەم بەیانەدا بە دریژی ناوەرۆکی بەیانەکانی مارشال عارف و مەلا مستەفا شی کرا بووەوە و، هەندی فەرنەیان لە بروسکەکانی بۆ فەرماندەکانی پیشمەرگە هینا بووەوە و، هۆکانی ناکۆکییەکانی خۆیان لە گەڵ ئەو بە دریژی رون کرد بووەوە و، هەندیکیشیان لە بریارەکانی کۆنفەرەنس دەربارەی روتکردنەوەی مەلا مستەفا لە دەسەلاتەکانی نوسی بووەوە. هەمو کارەکەیان بە «خۆبەدەستەوە دان» داتا بو ئەک بە «ریککەوتن»

سەرناوی بەشیکی بەیانەکە ئەم پرسیارە بو: «لماذا لا تتراجع امام البارزانی هذه المرة؟» بیانوەکەیشیان بۆ نەکشانەوەی ئەمجارەیان ئەوە بو: مەلا مستەفا ئەیەوی کۆتایی بە شۆرش بهینی، بەلام ئەوان ئەیانەوی دریژە بە شۆرش بدەن. هەمو ئەو جارانەی ئەشەبو لە بەردەمی مەلا مستەفادا پکشینەوە کشابونەوە، ئەمجارەیان کە ئەبو بکشینەوە نەکشانەوە. ئەمەش هەلەیەکی کوشندە بو کـرد بیان زەرەری گەورەی دا لە جـولانەوەی کـورد و لە پاشەرۆژی خۆیان.

دوای ئەمەیش بەیانیکی تریان دەرکرد دەربارەی دەستوری تازەی عیراق.

*

عـارف لە ٤ ی نیـسـانی ۱۹٦٤ دا دەسـتـوری کـاتیی ۲۷ ی تەموزی ۱۹٥۸ ی هەلوەشـاندەوە و دەسـتـوریکی کاتیی تازەی بلاو کردەوە. لە سـەردەمی جـمـهـوری دا ئەمـە دوەمـین جـار بو حکومـەتی ئینقـیـلاب دەسـتـوری کـاتی دائەنا و، بی پرسی خـەلک و هەلبژاردنی نوینەرانی گەڵ، پلشە رۆژی عیراق و مافی کوردی دیاری نەکرد. دەستورەکەی عارف لە چاو ئەوەی قاسم دا، ئەگەرچی دریژتر بو، بەلام بۆ دواوە چونیکی گەورە بو، بە تایبەتی لە بواری مافە نەتەوەییەکانی کوردا.

دەربارەی عەرەبایەتی عیراق دەستورەکەی عارف لە مادەی یەکەمی دا ئەلێ: «.. والشعب العراقي جزء من الامة العربية هدفه الوحدة العربية الشاملة وتلتزم الحكومة بالعمل على تحقيقها في اقرب وقت ممكن مبتدئة بالوحدة مع الجمهورية العربية المتحدة» لە کاتێک دا مادەی دوەمی دەستوری قاسم وت بوی: «العراق جزء من الامة العربية»

دەربارەی مافەکانی کورد مادەی نۆزدەهەمی دەستورەکەی عارف ئەلێ: «العراقيون لدى القانون سواء. وهم متساوون في الحقوق والواجبات العامة لا تمييز في ذلك بسبب الجنس او الاصل او اللغة او الدين ويتعاون المواطنون كافة في الحفاظ على كيان هذا الوطن بما فيهم العرب والاكراد ويقر هذا الدستور حقوقهم ضمن الوحدة العراقية» لە کاتێک دا مادەی سێهەمی دەستورەکەی قاسم نوسی بوی: «يقوم الكيان العراقي على اساس من التعاون بين المواطنين كافة باحترام حقوقهم وصيانة حرياتهم ويعتبر العرب والاكراد شركاء في هذا الوطن ويقر هذا الدستور حقوقهم القومية ضمن الوحدة العراقية»

*

## هەندێ لە هەڵەکانی م س

م س لە ماوەی چەند ساڵی رابوردودا هەندێ هەڵەی تاکتیکی کرد بو. بۆ چەکدار کردنی هێزەکانی چەکی لە خەڵک سەند و، هەر کەس چەکی هەبوایە لێ ی وەر ئەگرت. ئەمەش توڕەبونێکی زۆری خوڵقاند بو. لە هەمو دێهاتەکان دا زەکاتی لە جوتیاران ئەسەند و، ئاەونە و پارەشی لە سەر دانا بون. لە هەمو گوندەکان دا داوای لە خەڵک کرد بو «هێزی نزیەدار» پێک بهێنن کە ئەبو ئەرکی پێشمەرگایەتی بە دی بهێنن.

م س لە گەڵ هێزەکانی خۆیشی رەفتاری باش نەبو، بە پێچەوانەی مەلا مستەفاوە کە هەمیشە لە گەڕان دا بو بە ناو خەڵک و پێشمەرگەدا. ئەوان لە ئەشکەوتی ماڵومە و دوایێتر لە عەبابەی داپان کوتا بو. فەرمانیان بۆ پێشمەرگە دەرئەکرد، بێ ئەوەی تێکەڵاویان بێ و لە گیروگرفت و سکاڵا و گلەییەکانیان تێ بگەن و هەوڵی چارسەریان بدەن. وەکو پێویست ریزی فەرماندەکانیان نەئەگرت، بە تایبەتی هەندێ لەو ئەفسەرانەی لە ژیانی پێشمەرگایەتی دا لێهاتویی زۆریان نەنواند بو. لە پارەمەتیدانی پێشمەرگەدا کەموکوری زۆر هەبو، بە چەند مانگ جارێک پارەمەتیەکی کەم ئەدران.

*

## نەیارەکانی م س

مەلا مستەفا زیرەکانە توانی نارەزایی خەڵک و پێشمەرگە و هەندێ لە ئەندامانی پارتی و، نارەزایی حشع و کاژیک و حیزبی دیموکراتی کوردستان و سەرۆکی عەشیرەتەکان و، مانەو بونی خەڵک لە شەر و ئابلوقەی ئابوری.. بقۆزێتەوە.

سەرکردایەتی ئیبراهیم ئەحمەد جگە لە مەلا مستەفا، لە ناو کوردستانی عیراق دا، چەند دوژمنی تری هەبو:

- نارازییەکانی ناو پێشمەرگە، بە تایبەتی هەندێ لە ئەفسەرەکان کە پێکەوە بە نهێنی «تکتل» یکیان دروست کرد بو.

- حشع. ناکۆکی پارتی و حشع کۆن بو. حشع پارتی بە حیزبێکی بورجوازی نەتەوەیی دائەنا. پارتی پێش چەند جارێ داوای هەڵوەشاندنەوەی لقی کوردستانی حشعی کرد بو. لە دەسپێکردنی شۆرش دا حشع هەڵوێستی سلبی بو. لایەنگرەکانیان لە هەندێ

شوێنی کوردستان چەکیان بۆ حکومەت لە دژی شۆڕش هەلگرت. کە ئینقیلابی شوبات فەرمانی قەلاچۆ کردنی بۆ دەرکردن، ویستیان لە کوردستان بنکە دابنێن و هێزی چەکدار پێکەوە بنێن. هەلویستی مەلا مستەفا و مەکتەبی سیاسی لەم مەسەلەیەدا جیاواز بو: مەلا مستەفا دالدەی دان و، کارئاسانی بۆ کردن، بەلام ئیبراهیم ئەحمەد ڕێگەی نەدان، بنکەکانیان داخستن و چەکدارەکانیان چەک کردن. لە هەندێ شوێن شەر و پێکادان ڕوی دا، لە هەردو لا کوژران.

– کاژیک، لەوەتی دامەزرا بو پارتی بە حیزبێکی ئانتەتەوەیی لەو ڕێکە مارکسی و، پارتی پش ئەوانی بە «کوردەکوژە» دائەنا. لایان وابو هەلێکی لە بار هاتۆتە پێشەوە بۆ زال بونی بالی نەتەوەیی و تێکشکاندنی بالی مارکسی لە جولانەوەی کوردا.

– حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران. ئەحمەد توفیق و کادر و پێشمەرگەکانیان زۆر بە گەرمی پشتیوانییان لە مەلا مستەفا کرد. هەندێ لە نامە و بەیانەکانی مەلا مستەفا ئەمان ئەیاننوسی. لە سەنگەسەر ئەمان بون بە ئیشکگری گیراوە سیاسیەکانی سەر بە ئیبراهیم ئەحمەد.

*

لە عیراقیش دا حکومەت لەو ململانێیەدا پشتیوانی لە بالی ئەومی مەلا مستەفا ئەکرد دژی بالی توندڕەوی ئیبراهیم ئەحمەد و، لە ئاستی عەرەبی دا عەبدولناسر و، لە ئاستی جیهانیی دا یەکێتی سۆڤیەت و ئەمەریکاش پشتیوانییان لە چارەسەری ئاشتی ئەکرد و، هەنگاوەکانی بارزانییان پێ باش بو.

*

## هەلویستی سۆڤیەتی لە ئینقیلابی عارف

دەسەلاتی بەعس تەنیا ۹ مانگ ژیا. لە ۱۸ ی تشرینی دوەمی ۱۹٦۳ دا مارشال عەبدالسلام عارف کە سەرکۆماری عیراق بو لەسەردەمی دەسەلاتی بەعس دا، خۆی ئینقیلابێکی ساز کرد، حیزبی بەعسی دور خستەوە، ڕژێمی نوێ دەستی لە دوژمنایەتی سۆڤیەت هەلگرت، پەیوەندیەکانی عیراقی لەگەل میصر باش کردەوە، هەروەها پەیوەندی عیراقی – سۆڤیەتی بردەوە ئاستی سالانی ۱۹۵۹-۱۹٦۳.

ئەو گروکفەی سۆڤیەت بو پشتیوانی بزوتنەوەی کورد لە عیراق دا دەستی پێ کرد بو بە تەواوی ئیشتەوە و، ئەو پشتیوانیە ئاشکرایەی لە جێی ئەکرد ئەویش سنورێکی بۆ دانرا. سۆڤیەت ئەیویست ڕژێمی نوێ بمێنێ و جێگیر بێ، یەکێک لە گرنگترین گیروگرفتەکانی حوکمی عیراق مەسەلەی کورد بو. سۆڤیەت لە بارزانی ڕاسپارد کێشەی خۆی لەگەل عیراق بە خۆشی لایەلا بکات و، شەر لەگەل عیراق ڕابگرێ، هەروەها لە ڕێگەی ناصرەوە لە مۆشیر عارفیان ڕاسپاردە کە کێشەی کورد بە ئاشتی چارەسەر بکات و شەر لەگەل کورد ڕابگرێ. تەنانەت ئامۆژگاری جێی پێشیان کرد ڕێکخستنەکانی خۆی هەلوەشێنێتەوە، بچێتە ناو «الاتحاد الاشتراكي العربي» بەوە کە مۆشیر عارف لە سەر شێوەی میصر خەریکی دروستکردنی بو. کەوتەوە چەکدارکردنی جەیشی عیراقی و، کەوتەوە جێبەجێ کردنی ئەو پڕۆژانەی تەواو نەبوبون. جگە لە سۆڤیەت، ئەمەریکاش لە بارزانی ڕاسپارد بو شەر لەگەل عیراق بوەستێنێ و کێشەی کورد بە ئاشتی چارەسەر بکا.

خروشۆف بروسکەیەکی کورتی بو مۆشیر عارف لێدا سەبارەت بە ڕاگرتنی شەر

لەگەڵ کورد. بۆ ئەوەی تای تەرازووی ململانێی ناوخۆی ئەم دوو باڵەی ناو یەک جوڵانەوە بە قازانجی بەرژەوەندییەکانی خۆی، واتە جێگیر بوونی ئارام و ئاسایشی ڕژێم لە عێراق دا، بەلادا بخات. لەپاش ئەوەی هەوڵی ڕێکخستنەوەی هەردوو باڵ بدا، بە ئاشکرا لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی سۆڤیەتییەوە پشتیوانی لە کارەکانی بارزانی کردو دژی باڵەکەی تر دوا کە بە قسەی ئەوان: «ناویان ئەکردە ئاشی ئیمپریالیزمەوە».

پشتیوانی سۆڤیەتی لە بارزانی دیارە هەر قسە بوو، ئەویش بۆ ئەوە بوو پاڵی پێوە بنێن بەرەو ڕێککەوتن لەگەڵ عارف. ئەم پشتیوانییەی بارزانی بە درێژایی ۲۰ ساڵ تەجروبەی کرد بۆ هیچی لێ سەوز نەبوو بوو، لە هەمان ساڵ دا بارزانی لە بەرامبەر «پارە» و «چەک» دا بە ئێران و ئیسرائیلی فرۆشت. بارزانی لە سنوورێکی دیاریکراودا ڕێگەی دابوو بە بوونی سیاسی و چەکداری حشع لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی دا، لەوەش چەن مەبەستێکی هەبوو، یەکێکیان بۆ ئەوەی بیانکاتە دەسکەلای هەڕەشە لە ئێران و ئەمریکا. یەکێکی تریان بۆ ئەوەی حشع دەنگوباسی پەیوەندییەکانی دەرەوەی بارزانی لەگەڵ وڵاتانی ناحەزی سۆڤیەت بگەیەنێتەوە بە یەکێتی سۆڤیەت. بەهێزبوونی پەیوەندی بارزانی لەگەڵ ئێران (۱۹٦٤) و لەگەڵ ئیسرائیل (۱۹٦٥) وە هەوڵدانی ئاشکرای بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا، سۆڤیەتی وا لێکرد کە ئیتر بارزانی وەکو ساڵانی ۱۹٦۱-۱۹٦٤ فەرامۆش نەکا. بەڵکو کەسانێک ئەرخان بکا پەیوەندی بەردەوامی لەگەڵ هەبێ، جارووبار ڕاسپاردە، نامە، پارە ... بهێنن و ببات.

•

## کۆنگرەی شەشەم

مەلا مستەفا بۆ ئەوەی «شەرعییەت» ی حیزبی بە بڕیارەکانی خۆی بدا پێویستی بە پشتیوانی سەرکردایەتییەکی تازە بوو، بۆ ئەو سەرکردایەتییەش پێویستی بە گرتنی کۆنگرەی حیزب بوو. پەیڕەوی ناوخۆی پارتی هەمان پەیڕەوی کۆنگرەی ئاشکرای پێنجەم بوو لە بەغدا، کە تا ئەوسایش کاری پێ ئەکرا. لەو پەیڕەوەدا دەسەڵاتەکانی سەرۆک، سکرتێر، کۆمیتەی ناوەندی، کۆنفرانس، کۆنگرە، دیاری کرا بوو. بەستنی کۆنگرە پێویستی بە هەندێ دەسپێکەن و ڕێوشوێنی نیزامیی بوو، بەڵام مەلا مستەفا ئەیوت: «ئەگەر بڵێی ئەحمەدیش بتوانێ پەیڕەوی ناوخۆ دابنێ، من کە سەرۆکی حیزبم بۆچی ناتوانم بیگۆڕم!»

مەلا مستەفا بێ ئەوەی گوێ بداتە مەرجە دیاریکراوەکانی ناو «پەیڕەوی ناوخۆ» بۆ بەستنی کۆنگرەی شەشەمی پارتی، لە ۷ ی تەمموزی ۱۹٦٤ دا قەرەباڵغییەکی تێکەڵ و پێکەڵی ٤٠٠ کەسی لە قەڵادزە کۆ کردەوە. هەندێکیان ئەندامی پارتی بوون، بەڵام زۆربەیان ئەندام نەبوون، یا مەرجەکانی بەشداربوونی کۆنگرەیان تێ دا نەبوو. لە ناو ئەوانەدا ئەندامی کاژیک و حشع هەبوو.

لەم کۆنگرەیەدا لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی پێشوو تەنیا: هاشم عەقراوی، ساڵح یوسفی، عەبدولحسێن فەیلی، نوعمان عیسا بارزانی، ئیسماعیل عارف، بەشدار بوون. ساڵح و عەبدولحسێن تازە لە زیندان دەرچوو بوون، مەعلوم نەبوو مافی ئەندامەتییان ماوە یا نە. ۱٤ کەس لە سەرکردایەتی پێشووی حیزب بە تاوانی خیانەت دەرکران، لەوانە: ئیبراهیم ئەحمەد، نوری شاوەیس، عەلی عەبدوڵڵا، عومەر مستەفا، جەلال تاڵەبانی، حیلمی عەلی شەریف، مەلا عەبدوڵڵا، سەید عەزیزی شەمزینی و عەلی عەبدوڵڵا کە لەو ناوچەیەدا بوون

هەردوکیان دەس بە سەر دانران. سەرکردایەتیەکی تازەی بۆ حیزبەکە دانا لە: حەبیب کەریم، د. محەمود عەلی عوسمان، صالح یوسفی، ئیسماعیل عارف، عەبدولی سۆران، صدیق ئەمین، عومەر شەریف، شیخ محەممەدی هەرسین، عەزیز عەقراوی، هاشم عەقراوی، د. فوئاد جەلال، عەلی سنجاری، یەدوللای فەیلی..

هەروەها بریاریان دا بچنە سەر «ئیمپراتوریەتی ماوەت» وەکو مەلا مستەفا پێ ی ئەوت.

حەبیب محەممەد کەریم، لە نامەیەک دا کە لە ۱۱ / ٥ / ۱۹٦٤ دا بۆ شەمسەدین موفتی دەربارەی هەلومەرجی ئەو رۆژانە نوسیویتی: «فان البارزاني ومن يتبعه من البسطاء والمتاخرين عقليا والانتهازيين في واد والحزب والعناصر المدركة الواعية في واد اخر، وهو بعقليته الفردية العشائرية الاقطاعية متفق على مجموعة من الاجراءات الملتوية مع الحكومة، وان قواته تهاجم مقرات الحزب ولروعه وتعتقل الاعضاء البارزين وتجرد الكوادر من اسلحتهم ويشكل في بعض المناطق لجانا محلية - داود صائغية - وفق خطة تهدف الى تكوين حزب مطيع له طاعة عمياء يكون اداة في يديه يستعملها كما يشاء ويريد..»

حەبیب خۆی بو بە سکرتیری ئەم حیزبە!

دوای ئەم کوژنگرەیە دەسەلاتەکان بە تەواوی کەوتە دەس مەلا مستەفا و، دەزگا سەرکردەییەکانی پارتی، ئەگەر لەوەو پیش وەکو دا ـدەزگا (مؤسسات) کەمی دەسەلات و نرخیان هەبوبی، ئەوا بون بە قەوارەی بۆش و کارتۆنی. مەلا مستەفا بە ئارەزوی خۆی ئەیگۆرین و، عەلی ئەسوراندن و، بۆ گفتوگۆیش ئەوانەی ئەنیردران وەکو نوینەری مەلا مستەفا ئەدوان، نەک وەکو نوینەری حیزب یان گەلی کورد.

*

مەلا مستەفا بە درێژایی سالانی ٦٤ - ٦٦ لە گەران دا بو. ناوچەکانی رانیە، قەلادزە، دوکان، چوارتا، پینجوین گەرا. بە رۆژ ئەنوست و، بە شەو دائەنیشت بۆ ئەنجامدانی کارەکانی.

خۆی وا پیشان ئەدا پیاویکی خاوەن باوەری ئیسلامە. ریزی زۆری لە مەلا ئەگرت و، لایەنگری ئەوە بو شەر و کیشە و ناکۆکی لە سەر بنچینەی «شەرع» چارەسەر بکری. لە هەمان کات دا بە دزی خەلکەوە «مەشروبات» یشی ئەخواردەوە.

ناوی هیچکام لە کورەکانی، جگە لە دلشاد، کوردی نیە. هاوسەرەکەی ئیدریس دو کوری پیکەوە ئەبی، ئەیانەوی مەلا مستەفا ناویان لی بنی. مەلا مستەفا داوا ئەکا ناویان بنین «ذوالکفل» و «ئیسرافیل». ئیدریس ئەترسی منالەکانی لە پاشەرۆژدا ببن بە گالتەچی منالان. لە ناوا پەنا بۆ یەکی لە هاوکارە نزیکەکانی مەلا مستەفا ئەبا کە بەلکو تکای لی بکا ناویکی تریان بۆ بدۆزیتەوە. دوای رجا و تکا ناوەکانیان ئەگۆرن.

ئەو کاتە هیشتا زۆر کەس نەشارەزای مەلا مستەفا بون. لە کاتی گفتوگۆدا کە بیاتوتایە؛ «مامۆستا»، مەلا مستەفا تورەو جنیوی لوری بە کابرا ئەدا و، ئینجا ئەیوت: «من مامۆستا نیم، عەلی مەردان مامۆستایە، ئیبراهیم ئەحمەد مامۆستایە!» زۆر کەس جنیوی پیسیان خوارد تا فیر بون لە باتی وشەی مامۆستا «ئەفەندی» یان «ئەز خولام» بە کار بهینن.

لە دانیشتنەکانی دا هەمیشە چەلەز و هەسان و داری لە لا بو. بە دەم قسە کردنەوە

خەریکی تاشینی دارەکە ئەبو. دارچەقۆی لی دروست ئەکرد و، ناو بە ناو ئەم دارچەقۆیانەی بۆ یادگار بە دیاری ئەدا بەم و بەو.

زۆر شارەزا بو ا، ژیانی لادێ و، دڵ و دەرونی دانیشتوانی دێهات و کاروباری عەشیرەتەکان دا. ئەیزانی چییان لە گەڵ باس ئەکا و چۆنیان ئەدوێنی. خۆیشی زۆر سەرگروشتە و چەرۆک و قسەی پێشینانی ئەزانی. حەزی لە سواری و، لە راگرتنی ئەسپی رەسەن و مەردلاری بو. رەوەی ئەسپ و رانەمەڕی گەورەی هەبو. خۆشترین رابواردنی راوی بەراز و راوی خەدگرو بو. خەدگرو گیانداریکی خشۆکە وەکو قنزری و بزنەوە. لای هەمو بارزانیەکان کوشتنی وەکو ئەرکێکی ئاینی وا بو.

کە بیویستایە ئاغایەک یان پیاوێکی دەسرۆیشتوی ناوچەکە ئابورت بکا، هێزێکی گەورەی لە گەڵ خۆی ئەبرد و، بە ناوی دزستایەتیەوە ئەبو بە میوانی. چەند رۆژی خۆی و هێزەکەی نانی کابرایان ئەخوارد تا ئابورتی ئەکرد.

حەزی ئەکرد هاوکارەکانی پشکێنی و هەمویان کەمرکوریان هەبی و، چاو بەرەو ژێری ئەو بن. کە شکاتیان لە لای ئەو لە یەکی بکردایە لە سەر دزی، لە باتی ئەوەی بیگوری، یان بانگی بکا بو لیپرسینەوە. ئەیوت: «باشە ئەمەیان بەشی خۆی دزیوە، کەمی تیر بوە ئیتر کەمتر دزی ئەکا. ئەگەر یەکێکی تازە دابنیم ئەو لە سەرەتاوە دەس پی ئەکا و زۆرتر ئەدزی.» زۆر جار ئەوانەی تاوانبار بون بە دزی بانگی ئەکردن بۆ لای خۆی، لە باتی ئەوەی حسابیان لە گەڵ بکا، ئەیوت: «تۆ لەسەیەکی وایان بە پاڵ داوی، دیارە مرحعاجی!» هەندی پارەی بە خەلات ئەدایە. ئەوەی پارەی لی وەرنەگرتایە بەر غەزەبی لە برانەوە نەهاتوی ئەکەوت.

گومانی لە هەر کەس هەبوایە کە جاسوسی روس، ئینگلیز یا ئەمەریکایە ریزی زیادی ئەکرد و نزیکی ئەخستەوە لە خۆی، بە تەمای ئەوەی راپورتی باشی لە سەر بنوسی.

لە هەمو کۆڕ و کۆمەڵێک دا بە ئاشکرا ئەیوت: «کورد پیاوی تی دا نیەا». زۆر جار هێرشی ئەکردە سەر قازی محەممەد. بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆی بنوێنی، زووجار باسی نازایەتی خۆی و شارەزایی و بلیمەتی لە دانانی پلانی جەنگی دا، بە جۆرێکی پڕ «موبالەغە» ی لە باوەر نەهاتو، ئەگیرایەوە. تەنیا مەبەستیشی لەم موبالەغەیە ئەوە بو کە: بە دانیشتوەکانی بسەلمێنی لە روی خۆی دا کەس ناویری بلی وانیە. لە دانیشتنیکی لەو مبالغ دا ئەلی: «تۆپەکان لە حکومەت گرت بو داوام لە عیزەت کرد مەعسکەرەکەی پی تۆپباران بکات. تۆپێکی تی گرت سەری کرد. تۆپێکی تری تی گرت کورتی کرد. گوللەی تۆپەکان کەم بون. بە عیززەتم وت تۆ لاچۆ خۆم تۆپەکەم دامەزران و گوللەیەکم گرتە مەعسکەرەکە لە ناوەراستی مەعسکەرەکەو دا». نوری ئەحمەد طەها لە کۆڕەکە دا نەبی. مەلا مستەفا روی تی ئەکا ئەلی: «نوری وانەبو!» کاک نوری ئەلی: «بەلی ئەزەبنی لەو کاتەدا کە تۆ تۆپەکەت پیوە نان قزعەبان دابەش ئەکرد هەر مەنجەل و قاپ و قاچاخ بو تەچو بە ئاسمان دا». عیزەت عەزیز یەکی لە ئەفسەرە هەلکەوتوەکانی جەیشی عیراق بوە و، دەوری لە بەریتانیا دی بو.

هەندی جار بە مەعناوە هاوکارەکانی خۆی ئەشکاند. جاریکیان لە دانیشتنیکی گەورەدا رو ئەکاتە کۆڕەکە و ئەلی: «من و ئەم پیاوە هەردوکمان ناومان مستەفایە و، بە هەردوکمان بە قەدەر چۆلەکەیەک مێشکمان هەیە!»

گرنگترین پیوانە لای مەلا مستەفا بۆ هەڵسەنگاندنی خەڵک، رادەی دڵسۆزیی ئەو کەسە بو بەرامبەر بە خۆی. ئەوەی دڵسۆزیی خۆی بۆ بسەلماندایە ئیتر گوێ ی نەئەدایە رەفتار و، هەڵسوکەوتی. هەرچیەکی بکردایە لێ ی نەئەپرسیەوە.

*

## داهێنانی نەریتی دزێو

ساڵی ١٩٦٤ لە مێژوی بزوتنەوەی سیاسی کوردستانی عیراق دا نوقتەی وەرچەرخانێکی شومە، شوێنەوارەکانی وەکو رەگی گوڵی لە جوڵانەوەی کوردا جێگیر بو. ناکۆکی نێوان سەرۆکی حیزب و سکرتێری حیزب شۆڕ بوەوە ناو ناخی رێکخراوە سیاسی و پێشمەرگەییەکانی پارتی و. لە ئەنجام دا ناو خەڵک و جوڵانەوەی کورد و، بو بە سەرەتای شەڕێکی ناوخۆی لە برانەوە نەهاتو.

مەلا مستەفا چەند نەریتێکی دزێوی لە جوڵانەوەی کوردا داهێنا، وەکو: پەنا بردن بۆ چەک بۆ بە لاداخستنی ناکۆکی سیاسی، پەنا بردن بۆ دوژمن بۆ بە پەلاداخستنی ملمڵانێ ی دەسەلات لە گەڵ نەیارەکانی، کوشتنی نەیاری سیاسی، لە باتی گفتوگۆی سیاسی شەرە جنێوی ناشیرین..

١. شەڕی ناوخۆی لە برانەوە نەهاتو.

مەلا مستەفا هێزێکی گەورەی کۆ کردەوە لە بارزانی و، عەشائیری ناوچەکە و، پێشمەرگەکانی پارتی و، لە مانگی تەمموزی ١٩٦٤ دا چوە سەر بارەگای م س لە ماوەت. لوقمانی کوری سەرپەرشتی راستەوخۆی لەشکرکێشییەکەی ئەکرد. دوای تەقەوتۆقێکی کەم هێزەکەی م س شکا. کشایەوە ئێران. ئێران چەکی کردن و پێشمەرگەکانی برد لە هەمەدان لە ئۆردوگایەکی کردن و، چەند کەسێ لە کاربەدەستەکانیش: ئیبراهیم ئەحمەد، عومەر مستەفا، حیلمی عەلی شەریف، جەلال تاڵەبانی، نوری ئەحمەد طەهای برد بۆ تاران. نوری شاوەیس کە لە سەر پردی لەشان رەشاشی دائەبەست، لەو کاتەدا لە سلێمانی بو، لە رێگای بەغدادەوە بۆ ئەداوی چو بۆ ئەوروپا.

٢. پەنا بردن بۆ دوژمن بۆ بەلاداخستنی ملمڵانێ ی ناوخۆ.

لەو هێرشەدا کە سەرۆکی پارتی رێکی خست، هێزەکانی بە ئازوقەی حکومەت تێر و، بە تەقەمەنی حکومەت پۆشتە کردو، بە ئاگاداری و بە ناو حکومەت دا گواستەوە بۆ سەر ماوەت.

سکرتێری پارتی و هاورێکانیشی کە بەرگەی هێرشەکەیان نەگرت پەنایان بردە بەر ئێران.

پەنابردن بۆ عیراق و پەنا بردن بۆ ئێران، لە ئێوان ئەم دو لایەدا دژی یەکتری بو بە نەریتێکی حەلاڵ لە لای هەردوکیان.

٣. تێکچونی بەها بەرز و پیرۆزەکانی کوردایەتی.

چەند باندی، بە ناوی «لیژنەی پێشمەرگەی ناوشار» لە کانی ماسی دروست کرا. «کانی ماسی» کارێزێکە کەوتوتە خوارووی سلێمانی نزیک گوندی قەرەتۆغان. ناوشاری سلێمانی بە ناو لە ژێر دەسەلاتی حکومەتی عارف دا بو، بەلام کانی ماسی شوێنێکی ئازاد و لە ژێر دەسەلاتی شۆرش دا بو.

بەرپرسەکانی ئەم لیژنەیە بریتی بون لە: حەمەرەشی ئەحمە شانە، مەحمودی شا

محەممەد، وەستا گۆرونی کەماپچی.. ئەمانیش چەند باندێکیان لە سەرسەریە هەرە بەدناوەکانی سلێمانی دروست کرد، لەوانە: عوسمەی ئامە، سالە سپک، حەمە عەلی لەمۆج، حەسەنی فارس، ئەحمەدی فارس، سەلاحی فاتە قەمبور، ئەحمە سی سەر، بەکری خانم، عومەری مارف.. ئامۆژگاری و فەرمانی راستەوخۆیان لە بارەگای بارزانی، یا راستتر لە مەلا مستەفا وەرئەگرت، دەسەڵاتێکی بێ سنووریان دابوونێ. ئەرکی سەرەکییان بڵاوکردنەوەی ترس و تۆقاندن و سەرکوتکردنی نەیارە سیاسییەکانی بارزانی بو.

چالاکییەکانی ئەم باندانە بریتی بو لە:

– پەلامارەدان و پشکنینی سەدان ماڵ، لەوانەی ئەندامی پارتی بون و، گرتن و فڕاندن و راوونانی سەدان ئەندامی پارتی لە لایەنگرانی م س و، کوشتنی هەندێکیان.

– سەرانە سەندن و راوەڕووت و بڕینی شەوانەی بە ئاشکرای ماڵی کەسانی بێ دەسەڵات.

– پەلامارەدانی ئەندامە ناسراوەکانی حشع و گرتن و فڕاندنی هەندێ لە کادر و ئەندامەکانیان و، کوشتنی هەندێکیان بەڕێبەری دڕندانەیەوە لەوانە: ئەورەحمانی سالحی خلە بنجو، کە بە زیندوویەتی سوتاند بوویان.

– لە ماوەیەش سەیرتر تاشینی برۆی هەندێ لەو گەنجانەی قژیان درێژ کرد بو، یا پانتۆڵی جوانیان لە بەر کرد بو، رەنگ کردنی قاچ و ئەژنۆی ئەو کچانەی کراسی کورتیان لە بەر کرد بو.

کارەکانی باندی کانی ماسی لە هەمو لایەک دەنگی دابووەوە. زۆر کەس هاواریان بۆ مەلا مستەفا برد و شکاتیان لە لا کرد. مەلا مستەفا بۆ پاککردنەوەی خۆی لەم تاوانانە بەهانەیەکی دەرکرد بێ ئاگایی خۆی دەبڕی و، بە ناو چەند کەسێکی کەمی لە هەرە بەدناوەکانیان دەرکرد. بەهانەکەیان بە شوێنە گشتییەکان دا هەڵواسی. بەڵام بەهانەکە بۆ خاوکردنەوەی توڕەبون و ناڕەزایی خەڵک بو، ئەگینا هیچ کەس لەمانە نە بە راستی لە پێشمەرگایەتی دەرکران و، نە لێکۆڵینەوەیان لە گەڵ کرا. خۆیشیان بە شانازییەوە ئەیانوت ئەوان جگە لە سەرۆک بارزانی کەسی کە ناناسن و، کاغەزی کەس ناخوێننەوە.

٤. داهێنانی «الاغتیال»ی سیاسی

مەلا مستەفا ئەحمەد ئاغای زێباری و صدیق میرانی خۆشناوی بە هۆی ناکۆکی عەشایرییەوە کوشت. لە سالانی شۆرش دا بە هۆی ناکۆکی سیاسییەوە تاقمێکی لە کادرەکانی پارتی کوشت. عەلی حەمدی، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و لێپرسراوی لقی سلێمانی و مەحمودی حاجی توفیق، ئەندامی لقی سلێمانی؛ دوایێتر عوسمان عوزێری و مەجید شوانی لە زیندان دا کوشت و، سالەکانی دوایش بە فەرمانی ئەو ئەحمەد عەبدوللا، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و، ئەحمەد رەشوانی ئەندامی لیژنەی ناوچە لە ناو شاری هەولێر و، خالیدی حاجی لەوەجی کۆکۆیی لە ناو هەڵەبجە دا کوژران..

«ئیغتیال» رێبازێکی قوڵی کردە ناو کۆمەڵی کوردەوە. سەرەڕای ئەوەی دوژمنایەتی لە ناو حیزبەکان دا قوڵتر ئەکرد، دوژمنایەتی خوێناوی لە نێوان هەندێ عەشیرەت و بنەماڵەدا دروست کرد. لێرەدا دو نمونەیان باس ئەکەم:

– مەلا مستەفا، عوسمان عوزێری کوشت. عوسمان کادری راگەیاندن بو. ئەندامی پارتی بو. لە رادیۆی بەغداد کاری کرد بو. شاعیر و نوسەر و روناکبیر بو. چو بوە ریزی

پێشمەرگەوە لە رادیۆی کوردستان بە دڵسۆزی کاری ئەکرد. لە سەر ئەوەی برازای حاجی برایمی چەرمەگا بو گرتیان و لە زیندان دا کوشتیان. ساڵ وەرگەڕا پاسکی م س دەستیان بە سەر چەند ناوچەیەک دا گرت و، چەند کەسێکیان لە کادرەکانی پاسکی مەلا مستەفا گرت، لەوانە: سیامەند و ملکۆ کە بارزانی و، عومەر شەریف کەرکوکی بو. ئەمانە لە کرۆە لە زیندان دا بون. خزمەکانی عوسمان چونە سەر زیندانەکە و بە زۆر دەریان هێنان و لە تۆڵەی خوێنی عوسمان دا هەرسێکیان کوشتن. مەلا مستەفا ئەم داخەی لە دڵ گرت. دوای ١١ ی ئازار هەسەر خێلی چەرمەگای بۆ میوانی بانگ کرد بۆ بارەگاکەی خۆی لە ناوپردان. لە سلێمانییەوە بە ری کەوتن بچن بۆ لای. لە رێگای خەلەکان بۆسەیەکی بۆ دانان. هەمویان لە ئۆتۆمۆبیل دابەزاند و، لە هەمان شوێن دا هەمویان کوشتن.

- جەزای عەلی کاتب لە هەڵەبجە خالیدی حاجی ئەرەبی کوشت. لە تۆڵەی ئەمەدا کۆکۆیەکان لە سلێمانی ئازادی برای جەزایان کوشتەوە.

٥. داهێنانی موهاتەرات لە گفتوگۆی سیاسی و حزبایەتی دا

مەلا مستەفا پیاوێکی جنێوفرۆش و دەم پیس بو. وشەی «لوندەر» ی لە قسەکانی دا بە زۆری بە کـــار ئەهێنا. لای وا بوە لە ناو کـــوردا تۆمەتـــی دزی و داوێن پیـــسی کاریگەرترە لە تۆمەتی سیاسی، بۆ شکاندنی دوژمنەکانی ئەم رێگایەی بە کار ئەهێنا.

کە باسی ناکۆکییەکانی خۆی ئەکرد لە گەڵ ئیبراهیم ئەحمەد و هاوڕێکانی لە ناو خەڵک دا تاوانباری ئەکردن بەوەی: «سواری ژنی خەڵک ئەبن، سواری پێشمەرگە ئەبن و، سواری یەکتری ئەبن ..» یان «لە کاتێک دا پێشمەرگە و خێزانەکانیان نان نیە بیخۆن، ئەوان دزیبیان لە ماڵی میللەت و شۆرش کردوە ..»

ئەم قسانە شیاوی سەرکردەی جولانەوەیەک نەبون، هەندی کەسی نزیکی کە پێ ی ئەڵێن ئەم قسانە نەکا، مەلا مستەفا ئەڵێ: «کورد لەوە تێ ناگات کە بڵێم من ناکۆکی سیاسیم لە گەڵ ئیبراهیم ئەحمەد هەیە، بەڵام لەوە تێ ئەگا کە بڵێم دزییان کردوە و، خەڵکیان گاوە و گانیان داوە.. من دوژمنەکانی خۆم بەم رێگایە ئەشکێنم.»

هەردولا کەوتنە داهێنانی ناوەناتۆرە لە یەکتری. لە نوسینەکانیان دا یەکتریان بە خیانەت و جاشایەتی تاوانبار ئەکرد. زاراوی «جەلالی» و «مەلایی» و «تاقمەکەی جلە - بلە» و دواییتر «جاشەکانی شەستوشەش» و «مەلا چزمیی» بون بە وتەی سەرزار. هەژاری موکریانی، شێخ محەممەدی هەرسین، سەعید ناکام لە داهێنان و خۆشکردنی ئاگری ئەم شەرە جنێوەدا دەوری سەرەکییان هەبو. سەیر ئەوەیە ئەمانە هەرسێکیان بە رێچەڵەک ئێرانین. لە کوردستانی عیراق دا جگە لە خێزانەکانی خۆیان کەسوکاری تر و خزمیان نەبو دڵیان بۆ کوژرانیان بسوتی. ئەم ئەریتە ناشیرینە بو بە بەشی لە چالاکی حزبەکان.

هەردولا کە یەکتریان بە جاشایەتی تاوانبار ئەکرد، هەردوکیان دو حزبی خاوەن بەرنامە و ریبازی سیاسی و رێکخستن و بنکەی جەماوەری بون. هەر یەکەیان هەزاران رۆشنبیر و جوتیار و کرێکاری لی کۆ بوبوەوە. هەریەکەیان بەهانە و بیانوی خۆی هەبو. شەری ناوخۆی نێوان ئەم دو باڵەی پارتی وەکو شەری ناوخۆی نێوان دو عەشیرەتی بارزانی و زیباری، یا تەنانەت هەسەر جولانەوەکە و عەشیرەتە کوردەکانی سەر بە حکومەت نەبو. ئەگەرچی بارزانی و لایەنگرەکانی هەولێکی زۆریان داوە بۆ سوک کردنی مەسەلەکە بیخەنە قالبی ناکۆکی شۆرش و جاشی ٦٦ وە و، جاشی ٦٦ یش وەکو هەسەر جاشەکانی تری

کوردستانی عیراق لە قەلەم بدەن. بەلام ئەمە شەپھاتنێکی نامەعقول بو، هەر لە لای لایەنگرە کەللە رەقەکانی خۆیان ئەپەخوارد.

*

مەلا مستەفا دوای ئەوەی م س ی دەرکرد بۆ تەهران رێگای بۆ تەخت بو. خۆی بە تەنیا بو بە دەسەلاتداری یەکەم لە بڕیاردانی شەر و ئاشتی دا، لە دامەزراندن و بڕینی پەیوەندی سیاسی دا، لە دانان و لابردنی کاربەدەستانی شۆڕش دا. هەندێ داوودەزگای بە ناوی: مەجلیسی قیادەی ثورە، مەکتەبی سیاسی، مەکتەبی تەنفیزی، مەکتەبی عەسکەری، دروست کرد. مەکتەبەکان شتی کارتۆنی و روالەت بون. دەسەلاتەکان هەمو لە دەس خۆی دا کۆ بوبوە.

حکومەتی عیراق هەندێ هەنگاوی هاویشت: گیراوەکانی بەردا، مۆچەخۆرەکانی گیرایەوە سەر کارەکانیان، خوێندکارەکانی گیرایەوە زانستگا، زەرەر و زیانی هەندێ لە زەرەر لێ کەوتوەکانی دوکان و دەربەندیخانی بژارد، مەسعود محەمەدی دانا بە وەزیری کاروباری سەرو.. بەلام هیچ هەنگاوێکی لە مەیدانی سەلماندنی مافە نەتەوەییەکانی کوردا نەنا. ئەمەش لە ناو خەلک و سەرکردایەتی تازەدا مقۆمقۆی دروست کرد بو. چەند نامەیەک لە نێوان مەلا مستەفا و حکومەت دا ئالوگۆڕ کرا. بۆ بە درێژ خستنەوەی رەخنە سیاسیەکانی م س یادداشتێکی دەربارەی مافەکانی کورد دا بە حکومەتی عارف، هیچی کەمتر نەبو لەو یادداشتەی پێشتر م س ئامادەیان کردبو. ئەم یادداشتە صالح یوسفی و شەوکەت عەقراوی و عەگید صدیق بردیان بۆ بەغدا، بەلام مەلا مستەفا بە عەگیدی وت بو: «لە لاوە بە کاربەدەستانی عیراق بلێ، مەلا مستەفا باوەڕی بەو یادداشتە نیە، بەلکو لە ژێر گوشاری دەروپشتەکەی دا ئیمزای کردوە، بۆ ئەوەی نەلێن کوردی فرۆشتوە.»

عەبدولسەلام عەرەبێکی سونەی نەتەوەپەرستی بەرچاوتەنگ بو، رقی لە کورد و شیعە بو. بە تەمای سەلماندنی هیچ مافێکی کورد نەبو، بەلکو هەروەکو صوبحی عەبدولحەمید، یەکێ لە وەزیرە نزیکەکانی لە بیرەوەرییەکانی خۆی دا نوسیویەتی: عارف بە هیچ جۆری باوەڕی بە مالی کورد نەبوە.

*

رێکخراوە سیاسیەکانی پارتی بە زۆری لە گەل م س بون. دوای کشانەوەی ئەوان بۆ تەهران، چەند کەسێکی کۆمەلەی نارەندی کە لە کوردستانی عیراق ما بون، لەوانە: عەلی عەبدوللا، نوری شاوەیس، زەبیحی لە بەغدا مەکتەبی سیاسیان پێک هێنایەوە و، گۆڤارێکیان بە ناوی «پێشڕەو» بە کوردی و، لقی بەغدایش بە عەرەبی «باهۆز» ی دەرئەکرد. ئەحمەد عەبدوللا لە بادینان و، محەمەدی حاجی تاهیر لە سلێمانی و، مەلا عەبدوللا ئیسماعیل لە هەولێر.. درێژەیان بە کاری رێکخراوەیی دا. لە کوردستانی عیراق دا دو رێکخراو بە ناوی پارتیەوە کاریان ئەکرد و، هەردوکیان خۆیان بە «شەرعی» ئەزانی.

*

دوای شکاندنی م س، مەلا مستەفا دەستی کرایەوە بۆ دامەزراندنی پەیوەندی لە گەل دنیای دەرەوەدا.

*

## لە گەڵ ئەمریکا

مەلا مستەفا لای وابو دنیا بە پەلەی ئەمریکا و روسیا ئەگەڕێ و، بۆ داپێنکردنی سەرکەوتن، ئەبێ پشتیوانی یەکێ لەم دو زلهێزانە بە دەس بهێنرێ. لەو کاتەوە کە لە سۆڤیەت گەڕابوەوە هیچ هیوایەکی بە پشتیوانی سۆڤیەتی نەما بو. هەوڵی ئەدا پشتیوانی ئەمریکی بە دەس بهێنێ. ئەمەی ئەنشاردەوە و، هەر لە سەرەتای دەس پێ کردنی جولانەوەکەوە هەوڵی بۆ دابو. لە سەرەتادا ئەحمەد تۆفیقی راسپارد ئەم کارە بە ئەنجام بگەیەنێ. ئەحمەد تۆفیق دوجار، بۆ ئەم مەبەستە، هەوڵی دا. جارێک چو بۆ بەیروت و جارێک بۆ تاران. هەر ئەمیش بو رۆژنامەوانی ئەمریکی دانا ئادەم شمیتی هان دا سەردانی کوردستان بکا و، لە گەڵ خۆی هێنای.

مەلا مستەفا لە گفتوگۆکانی دا لە گەڵ شمیت (١٩٦٢) چەند جار داوای یارمەتی ئەمریکی کرد. شمیت لە گەڕانەوەی دا بە زنجیرە چەند وتارێکی لە رۆژنامەی «نیویورک تایمس»ی ئەمریکی دا بڵاو کردەوە. نوسی بوی مەلا مستەفا داوای یارمەتی لە ئەمریکا ئەکا. عێراق ئەمەی کرد بە کەرەسەی پروپاگاندە دژی جولانەوەی کورد و، رۆژنامەکانی بەغدا هێرشیان کردە سەری. مەکتەبی سیاسی لە «خەبات» دا ئەمەیان بە درۆ خستەوە و، گفتوگۆیەکی کورتیان بڵاو کردەوە کە گوایە بارزانی لەوە زیاتر هیچی تری نەوتوە و، ئەوی تری هەڵبەستراوی رۆژنامەوانەکە خۆیەتی. مەلا مستەفا ئەم بە درۆ خستنەوەیەی پێ ناخۆش بو، چونکە خۆی ئەم داوایەی پێ شەرم نەبو، حاشایشی لێ نەئەکرد.

تا ساڵانێکی زۆر ئەمریکا هیچ بایەخێکی بە جولانەوەی کورد و بە مەلا مستەفا نەئەدا و، ئامادە نەبو هیچ جۆرە پەیوەندییەکی لە گەڵ دابمەزرێنێ. بەڵام هەر کۆڵی نەدا و، لە رێگای شای ئێران، کاربەدەستانی ئیسرائیل و، شای ئوردونەوە هەوڵی ئەدا دەرگای ئەمریکای لێ بکرێتەوە.

*

## لە گەڵ ئێران

ئێران لە ١٩٦٤ بە دواوە پەیوەندی راستەوخۆیان لە گەڵ مەلا مستەفا، وەکو دەسەڵاتی ئەمری واقیع، دامەزراند. دوای ئەمە پەیوەندییان تا ئەهات بە هێزتر ئەبو. شەمسەدین موفتی لە تاران بو بە نوێنەری مەلا مستەفا. بۆ یەکەمین جار ساڵی ١٩٦٥ سەرەرای ئەوەی چەند هەزار دانە تفەنگی برنەویان دایە، هەندێ چەکی قورسیشیان دایە لە شەڕەکانی دا بە کاریان بهێنێ. ئەمە عێراقی ترساند و، تەنگوچەڵەمەیەکی دیپلوماسی لە نێوان هەردو دەوڵەت دا دروست کرد.

ئێران هەمیشە بۆ جولانەوەی کورد لە عێراق دا گرنگییەکی تایبەتی هەبوە. لەو کاتەدا کە مەلا مستەفا نەیئەتوانی کەڵک لە سنورەکانی تورکیا و سوریا وەربگرێ، ئێران بۆ ئەو وەکو تەنیا دەروازەی دنیا بو. حزبی دیموکراتی کوردستان کە لە ناکۆکی سەرۆک و سکرتێرەدا پشتیوانی بێ چەن و چونیان لە سەرۆک کرد بو، کەوتە بەر گوشار و تەنگ پێ هەڵچنین. مەلا مستەفا نەیئەتوانی هاوسەنگی لە نێوان شا و دیموکرات دا رابگرێ. ئەبو لایەکیان هەڵبژێرێ. دیموکرات بۆ ئەو کەڵکێکیان نەما بو، شا و ساواکی هەڵبژارد.

*

## لە گەڵ ئیسرائیل

ئیسرائیل لە گەڵ حکومەتەکانی عەرەب لە شەڕدا بو، کوردیش لە عیراق دا لە گەڵ حکومەتێکی عەرەبی دا لە شەڕدا بو. ئیسرائیل ئەیویست ئەو «دوژمنی دوژمنە» بکا بە دۆستی خۆی. یەکەم جار لە گەڵ ئیبراهیم ئەحمەد لە ئەورووپا قسەیان کرد بو، بەڵام ئەمانی دەسەڵاتی ئەو لە سەر ئەرزی کوردستان، پەیوەندی لە گەڵ ئەو بێ سود کرد بو. ساڵی ١٩٦٥ ئیسرائیل چەند نوێنەرێکی نارد بۆ کوردستان بۆ دیتنی مەلا مستەفا. ئیتر پەیوەندیەکی هەمیشەییان دامەزراند. مەلا مستەفا لای وابو: جولەکە نفوزێکی گەورەیان هەیە لە هەمو دنیادا، بە تایبەتی لە ئەمریکا، بە هیوا بو ئیسرائیل دەرگای دۆستایەتی لە گەڵ ئەمریکا بۆ بکاتەوە.

•

## هەڵگیرسانەوەی شەڕ

ئەو گرۆوەی م س کرد بوی لە سەر ئەوەی مەلا مستەفا تاقەتی درێژە پێ دانی شۆڕشی نەماوە و، لە گەڵ عارف ڕێک کەوتوە بۆ ئەوەی کۆتایی بە شۆڕش بهێنێ ڕاست دەرنەچو. بگرە مەلا مستەفا کە خۆی لە «دێ» لە دایک و، لە «دێ» گەورە و، لە ناو شاخ و عەشیرەتدا پێ گەیشت بو، هەرگیز لەو ژیانە وەڕس نەئەبو کە لە گەڵ سروشت و تێگەیشتن و ئارەزوی ئەو ئەگونجا. ئەگەر هەر باسی وەڕس بون بکرابە «سیاسیەکانی ئەشکەوت» کە ڕۆژنامەوانی بەعسێتی دەیانخستە ئادەمەسەن ناوی لێ نا بون، کە هەمو شاری و خوێندەواری ناخۆشی تەدبیر بون، لەو ژیانە بێزار بوبون.

وردە پێکادان لەم لاو ئەولا دەستی پێ کردەوە و، شەڕی کورد - حکومەتی عیراق لە ١ ی نیسانی ١٩٦٥ دا هەڵگیرسایەوە.

بە هەوڵ و تەقەلای ناوخۆ و، ناوبژی تاران، مەلا مستەفا لە حوزەیرانی ٦٥ دا ڕێگەی دا بە لایەنگرانی م س - جگە لە ئیبراهیم ئەحمەد و سەید عەزیزی شەمزینی - هەموییان بگەڕێنەوە کوردستانی عیراق. پێشمەرگەکانیان نارد بو مەیدانەکانی شەڕی ڕەواندز و، سەرکردەکانیان: عومەر مستەفا، حیلمی عەلی شەریف، مامجەلال، عەلی عەسکەری دەس بە سەر نارد بۆ دولە ڕەقە و، پاش ماوەیەک نوری شاوەیس، عەلی عەبدوللا، نوری ئەحمەد طەحایش، چونە لایان.

•

مەلا مستەفا ئامادە نەبو هیچ نەرمی و لێبوردنێکی ڕاستەقینە بەرامبەر باسکی م س بنوێنێ:

- نەی ئەهێشت بە ناوی پارتیەوە کار بکەن.
- نەی ئەهێشت پارتیەکی تازە دابمەزرێنن و درێژە بە کاری سیاسی بدەن.
- لە ناو حیزبەکەی خۆی و دامودەزگاکانیشی دا جێگەی ئەتەکردنەوە.

ئەمانەی لە دولە ڕەقە دەس بەسەر بێ ئیشوکار دانا بو. ڕێگەی نەئەدان بێ ئیجازە بەم لاو ئەولادا بڕۆن. لە باتی ئەوەی سەر لە نوێ لە دامودەزگاکانی شۆڕش دا کار و فەرمانیان پێ بسپێری هەوڵی ئەدا سوک و ڕیسوایان بکا. شێخ محەممەدی هەرسین لە وتارەکانی دا بە «گەمەجەر و گوجەر» ناوی ئەبردن. هەڵوێستی مەلا مستەفا لەم دەس بەسەرانە بەم گفتوگۆیەدا دەرئەکەوێ:

جەژن دێتە پێشەوە. ئەوڕەحمان ڕوتە، کە دۆستی ئێمان و نزیکی مەلا مستەفا نەبێ، ئەنێرن بۆ لای مەلا مستەفا ئیجازەیان بۆ وەربگرێ، بە بۆنەی جەژنەوە بچن بۆ بینینی ژنەکانیان. ئەوڕەحمان ئەچێ بۆ لای و بە نائومێدی ئەگەڕێتەوە بۆ لایان. هەر لە دوورەوە کە ڕوتە دەرئەکەوێ، عەلی عەبدوللا لێ ی ئەپرسێ: «ها ڕوتە! شەربەت یان ژەهر؟» ڕوتە لوت ئەدا بە یەکا و قسە ناکا. سەری ئەکەنە سەر ئەڵێن: «چی وت؟»
ڕوتە ئەڵێ: «وتی ئیجازەیان نادەم.»
ئەڵێن: «نەیوت بۆچی ئیجازەمان نادا؟»
ڕوتە ئەڵێ: «قسەیەکی ناشیرینی کرد بۆ گێڕانەوە ناشێ!»
زۆری لێ ئەکەن ڕوتە ناچار ئەبێ بۆیان بگێڕێتەوە، ئەڵێ: «وتی ئیجازەیان نادەم بۆ ئەوەی ژنەکانیان حیز بێن!»
عەلی عەبدوللا لەو کاتەدا پیاسە ئەکا لە بەر خۆیەوە ئەڵێ: «یەکو کە پیاوێکی بێ ئەدەبە!»
نوری شاوەیس یەکسەر عەلی دایەوە وت بوی: «گەوادە خۆی تەجروبەی هەیە. پانزە ساڵ لە سۆڤیەت بوە!»
ئەو کاتە نوری شاوەیس، عەلی عەبدوللا، عەلی عەسکەری، نوری ئەحمەد طەها ژنیان هەبو، ئەوانی کەیان هێشتا ژنیان نەهێنا بو.
بۆ ئەوەی نوری شاوەیس بشکێنێ ناردی لە ناوشاری سلێمانی تەلەیان لە ناهیدەی شێخ سەلام کرد. ناهیدە لە گەڵ دەزگا ئەمنییەکانی حکومەت تێکەڵاوی پەیدا کرد بو. ناهیدە بریندار بو نەمرد. بەڵام مەلا مستەفا لە کۆڕە گشتییەکانی خۆی دا ئەیوت: «من ناردومە تەقە لە.. بکەن کەچی بەر قولی کەوتوە».

*

ساڵی ١٩٦٥ منیش وەکو خوێندکارەکانی تری زانکۆی بەغداد گەڕامەوە بەغداد بۆ ئەوەی درێژە بە خوێندن بدەم. هەمو ئەو خوێندکارانەی چوبونە ڕیزی شۆڕشەوە لە زانکۆ دەرکرا بون. منیش یەکێ بوم لە دەرکراوەکان. مەلا مستەفا لیستەیەکی دابو بە حکومەت، ناوی زیاتر لە ٦٠ خوێندکاری تێ دا بو. هەندێکیان هیچ پەیوەندیەکیان بە پێشمەرگایەتیەوە نەبو، خۆیان لە بەر تەمەڵی یا هۆی تر لە خوێندن بە جێ مابون، کەچی ناوی من و چەند خوێندکارێکی تری، کە لە شۆڕش دا بوین بەڵام لە گەڵ مەلا مستەفا نەبوین، تێ نەخرا بو. ئەو کاتە د. عەبدولعەزیز دوری سەرۆکی زانکۆ بو. هەوڵێکی زۆرمان دا تا وەرگیراینەوە.
لە ١٦ ی ئەیلولی ١٩٦٥ دا جەنەراڵ عارف عەبدولرەزاق هەولی ئینقیلابی دا بەڵام سەرکەوتو نەبو، بە سواری فڕۆکە هەڵات بۆ میسر. لەو کاتەدا من لە «ئەمنی عام» لە بەغداد گیرا بوم. ڕەشید موحسین، کە ئەوسا هاوکاری عارف عەبدولرەزاق و، دوایی بو بە یەکێ لە دامەزرێنەرەکانی تورع (التجمع الوطني العراقي) بەڕێوەبەری گشتی «ئەمن» بو. دوای ئەم ڕوداوە موشیر عارف، ئەوڕەحمان بەزازی ڕاسپارد وەزارەت پێک بهێنێ. لە دوای ١٤ ی تەموزەوە ئەوە یەکەمین جار بو کەسێکی «مەدەنی» ببێ بە سەرۆکی وەزیران. بەزاز مامۆستای قانون و، باوەڕی بە ڕژێمی پارلەمانی هەبو. لای وابو کاتی ئەوە هاتوە دەسەڵاتی سوپایی کۆتایی پێ بهێنرێ.

«ئەمن» مەسەلەکەی حەوالەی «محکمە امن الدولە» کرد بو. لەوانە بو حوکمێکی گرانتم بەسەردا بدەن. هاتنی بەغزاز بۆ من خەبەری پیرە بو، چونکە بە بۆنەی جەژنی ١٨ ی تشرینەوە چەند وەجبەیەک گیراوی سیاسی بەردا، یەکێکیان من بوم کە بە کەفالەتێکی زۆر قورس بەربوم.

*

بەربونەوەی موشیر عارف

رۆژی ١٣ی نیسانی ٦٦ موشیر عارف لە هالیکۆپتەردا سوتا. جەنەرالەکانی جەیش کۆبونەوە بۆ دانانی یەکێکی تر لە جێگای ئەو. ئەورەحمانی برایان هەلبژارد بە سەر کۆمار و، ئەویش ئەورەحمان بەزازی دانایەوە بە سەرۆکی وەزیران.

جولانەوەی کورد سەرەرای گیروگرفتەکانی ناوخۆی بوبو بە فاکتەرێکی گرنگ لە سیاسەتی ناوەکی و دەرەکی عیراق دا. پشتیوانی ئیران لە مەلا مستەفا زیادی کرد بو بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە عیراقی ئەترساند و، پروتیستی رەسمیی دابویە. بەزاز لای وابو کە گیروگرفتی کورد بە شەر چارەسەر ناکرێ و، لە کۆنفرەنسێکی رۆژنامەوانی دا وتی: ئەگەر چل پەنجا کورد بە شاخەوە بیان گیروگرفتەکە هەر ئەمێنی. چەند جار باسی رێگەی گفتوگۆی کرد بۆ چارەسەری کێشەی کورد. لە هەمان کات دا پەیوەندی و ئالوگۆری بیروڕا لە نێوان سەرکردایەتی بارزانی و حکومەتی بەزاز و، لە نێوان مەکتەبی سیاسی و حکومەتی بەزازدا کرا.

*

لە ئاستی لاساری و رقی مەلا مستەفادا ئێمە تاقمەکەی م س نەرمی ئەنوێنن و، بۆ ئەوەی مەلا مستەفا لە خۆیان ئەدوێنن و، ناچاری ئەکەن لە سەر حسابی مافەکانی کورد (تنازل) بۆ دوژمن بکا، قازانجی خۆیان و جولانەوەکە و کورد لەوەدا بو: چالاکی سیاسی حزبەکەیان رابگرن. بەلام ئەمانیش ئامادە نەبون مەیدان بۆ مەلا مستەفا چۆل بکەن.

رێکخراوەکانی ئەمان لە شارەکان و لە ناو پێشمەرگەدا درێژەی ئەدا بە کار کردن. مەلا مستەفا گومانی لێ ئەکردن و، بە مەترسی دائەنان، خەمی بو لە گەل حکومەت هاوکاری بکەن و دژی ئەم رابوەستن. لە ناو لقەکانی ئەم حزبەدا ئیستیفتایەک کرا بو کە ئەوانە بەو جۆرە بێ ئازادی و بێ کار بمێننەوە، یان هەلبێن بۆ لای حزبەکەی خۆیان. زۆرایەتی دەنگی دابو ئەگەر مەترسیان هاتە سەر هەلبێن.

*

مەلا مستەفا رۆژێک مەفرەزەیەکی بارزانی نارد بو بۆ دولەرەقە بە دوای: مامجەلال، حیلمی، عومەر مستەفا، عەلی عەسکەری دا بۆ ئەوەی بیانگرێتەوە بۆ لای ئیدریسی کوری. بارزانیەکان لە پێش دا سەردانی هەباس ئاغا ئەکەن و ئاگاداری ئەکەن کە بۆ مەبەستێکی وەها هاتون. هەباس ئاغا تێ ئەگا ئەمانەیەن بۆ کوشتن. مامجەلال و هاورێکانی لە مەبەستی هاتنەکەیان ئاگادار ئەکا. ئەوانیش لە ناو خۆیان دا قسە ئەکەن و، وا رێک ئەکەون جاری ئەوانەی مەترسیان لە سەرە هەلبێن و، ئەوانی تریش لە نزیکترین هەل دا خۆیان دەرباز بکەن. مامجەلال، عومەر، عەلی، حیلمی بە ٤ قولی لە ٢٨ی کانونی دوەمی ٦٦ دا هەلاتن و، لە پێشەوە لە ناو سلێمانی دا، لە چەند جێگایەک کە بۆ خۆحەشاردانیان ئامادە کرا بو، خۆیان شاردەوە. پاش ماوەیەک حیلمی بۆ بەغداد و عەلی

بۆ کەرکوک چوون.
ئەوانەی لە دۆلە ڕەقە مابوونەوە: نووری شاوەیس، نووری ئەحمەد طەها، عەلی عەبدوللا، لە ژێر مەترسی ژیان دا نامەیەکیان بۆ مەلا مستەفا نووسی، ئارەزاییان لە ڕاکردنی هاوڕێکانیان دەبڕی و، ئامادەیی خۆیانیان دەبڕی بۆ هاوکاری لە گەڵیان. نامەکە زۆرتر لە پاکانە ئەچوو. لە گەڵ لێدوانێکی درێژدا لە خەبات دا بڵاو کرایەوە.
دوای ئەمە مەلا مستەفا کەوتە ڕاونان و گرتنی هەمو ئەوانەی گومانی لێ ئەکردن. هەندێ لە پێشمەرگەکان و فەرماندەکانیان کە سەر بە مامجەلال بوون و مەلا مستەفا فەرمانی گرتنی بۆ دەرئەکردن، خۆیان ئەئەدا بە دەستەوە. باخی بوون لە ناو پێشمەرگەدا دەستی پێ کرد.
ڕاکردووەکانیش کەوتنە چالاکی: سەرکردایەتی هەمو ڕێکخراوە نهێنیەکانیان گرتە دەست. دەستیان کرد بە دەرکردنی «خەبات» بە عەرەبی و، «خەباتی کوردستان» کە ئۆرگانی حیزب و «ڕزگاری» کە گۆڤاری پێشمەرگە و «پێشڕەو» کە گۆڤاری تیۆری بوو بە کوردی. لە گەڵ حیزبە عەرەبیە قەومیەکانی عێراق و، لە گەڵ ئەورەحمان بەزازی سەرۆوەزیرانی عێراق پەیوەندییان دامەزراند. دوای چەند مانگی ئیبراهیم ئەحمەد، کە لەو کاتەدا لە تاران بوو، گەڕایەوە بەغداد.
لە ١٩٦٤ ەوە ئاماجی یەکەمی مەلا مستەفا لە هەمو گفتوگۆکانی لە گەڵ حکومەتی عێراق لە ناوبردنی نەیارەکانی بوو. ئەمە بە جۆری بە سەر بیرکردنەوەی دا زاڵ ببوو، بەدیهێنانی مافە نەتەوەییەکانی لە لا ببوو بە مەسەلەی دووەم.
چەند جار و لە چەند کۆڕ و کۆمەڵ دا کە ئامۆژگاری فەرماندەکانی ئەکرد ئەیوت: ئەگەر کەوتنە بەر پەلاماری دوژمن، دە سەربازی عێراقی لە لایەکەوە و، یەک جاشی جەلال لە لایەکی ترەوە هێرشیان بۆ هێنایت، تۆیش تەنیا یەک گوللەت پێ بوو، ئەگەر بەو گوللەیە بە سەرکەوتوویی بتوانی هەر دە سەربازەکە بکوژی، بەلام بە سەرکەوتوویی نەتوانی جاشەکەی جەلال بکوژی، ئەوا ئەبێ بیدەی بە جاشەکەی جەلالەوە.

*

## بەیانی ٢٩ ی حوزەیران

جەیشی عێراق لە ٢ ی مایسی ٦٦ دا پەلاماری چیای هەندرێنی دا و گرتی. بەلام لە ١٤ ی هەمان مانگ دا هێزێکی تێکەڵاو لە پێشمەرگەی پارتی و حشع، هێرشی پێچەوانەیان بۆ کرد و گرتیانەوە. شیوعیەکان لەم شەڕەدا، بۆ یەکەمین جار و دوایین جار، دەوری سەرەکییان هەبوو.
لەم کاتەدا لە ناو هێزەکانی قەرەداغ، ڕزگاری، کاوەدا هەندێ لە فەرماندەکانی: کەمال موفتی، ئەنوشیروانی فوئاد مەستی، ئەحمەدی حەمەدەمین دزەیی و، هەندێ لەو پێشمەرگانەی سەر بە م س بوون لە مەلا مستەفا هەڵگەڕانەوە. مەلا مستەفا ترسێکی زۆری لێ نیشت و، ئەمەی بە پیلان دانا.
لە ١٣ ی حوزەیران دا حەبیب محەمەد کەریم، عەلی عەبدوللا، سالح یوسفی، نافیز جەلال حەویزی بۆ گفتوگۆ لە گەڵ حکومەتی بەزاز ناردە بۆ بەغداد. لە ٢٩ ی حوزەیرانی ٦٦ دا دوو بەیان خوێندرایەوە: یەکێکیان ئەورەحمان بەزاز، سەرۆوەزیرانی عێراق، بە ناوی حکومەتەوە و، ئەوی تریان حەبیب محەمەد کەریم، سکرتێری تازەی پارتی، بۆ

پشتیوانی لە بەیانەکەی بەزاز بە ناوی مەلا مستەفاوە.

بەیانەکەی بەزاز پێک هات بوو لە ١٢ ماددە. ئەگەرچی بەیانەکە دان بە مافی نەتەوەیی کوردا ئەنێ، بەڵام هیچ چوارچێوەیەکی بۆ دیاری نەکرد بوو. لەم بەیانەدا باسی چەندین کێشەی گرنگ کرا بوو لەوانە: کردنی زمانی کوردی بە زمانی رەسمیی خوێندن و دائیرەکان و، بەشدار کردنی کورد لە پایە بەرزەکانی حکومەت دا. وەرگرتنی قوتابیی کورد بۆ خوێندن لە دەرەوە. فەرمانبەران لە ناوچەکەدا کورد بن. هەڵبژاردنی گشتی و رێگە دان بە حیزب و رۆژنامەی سیاسی. لێبووردنی گشتی. گەڕانەوەی کرێکار و فەرمانبەری دەرکراو بۆ سەر کارەکانیان. تەرخانکردنی پارە بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستان. گەڕانەوەی جوتیارەکان بۆ شوێنەکانی خۆیان.

پاسەکانی بە شێوەیەکی وەها لاستیکی داڕێژرا بوون، هەر لایە ئەیتوانی بەو جۆرە لێکی بداتەوە کە خۆی ئەیویست.

*

هەندێ کەس ئەڵێن، حکومەتی عێراق لە ئەنجامی ئەو شکانەدا ئەم بەیانەی خوێندەوە کە لە هەندرین توشی هات. رەنگە ئەمە جۆرێ لە خۆ هەڵکێشانی هەندێ تاقم بێ، بە تایبەتی شیوعییەکان، کە هەندێکیان لەم شەڕەدا بەشدار بوون. ئەگینا نە شەڕی هەندرین و نە هیچ شەڕێکی تر لە مێژووی شۆڕشی ئەیلول دا ئەوەندە کاریگەر نەبوە کار لە بڕیاری سیاسی حکومەت بکا، بە تایبەتی شەڕ لە شاخێکی سەخت و دوور و دابڕاوی وەکو هەندرین کە لە هەموو شارێکی گەورەی کوردستان دوورە. لە دوای ١٤ ی تەمووزی ١٩٥٨ وە، بەزاز یەکەمین سەرۆوەزیرانی مەدەنی بوو، تا ئەو کاتە هەر لە جەنەراڵەکانی جەیش هەڵئەبژێردران. بەزاز رووبەرووی ٣ ئەرکی قورس بوبوە: دوورخستنەوەی جەیش لە ژیانی سیاسی و، گێڕانەوەی وڵات بۆ ژیانی پارلەمانی و، چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمەی ئابووری. ئەمانەیش هەموو بەسترا بوون بە چارەسەرکردنی کێشەی کوردەوە. بەزاز لای وابوو کێشەی کورد نابێ بە گفتوگۆ چارەسەر بکرێ و، ئەگەر چەند چەکدارێ بە شاخەوە بێنن کێشەکە هەر ئەمێنێ. شکانی جەیش لە هەندرین پشتیوانی بوو لە باری سەرنجی ئەو.

*

بەزاز لە ژێر گوشاری جەنەراڵەکانی جەیش دا لە ئابی ٦٦ دا وازی هێنا. وەزارەتێکی نوێ بە سەرۆکایەتی جەنەراڵ ناجی طالیب دامەزرا. حکومەتی تازە خۆی بە بەیانی حوزەیرانەوە نەبەستەوە، بەزازیش وتی ئەوە بەرنامەی حکومەتەکەی ئەو بوە، حکومەتی دوای ئەو ئەتوانێ جێبەجێ ی بکا و ئەتوانێ دەستی لێ هەڵ بگرێ.

*

عێراق رێگەی دا بە پارتی لە بەغداد رۆژنامەیەکی عەرەبی بە ناوی: «التاخی» دەربکات. ئەمە دووەمین جار بوو لە سەردەمی جمهوری دا رێگا بە پارتی بدرێ لە بەغداد رۆژنامە بڵاو بکاتەوە بۆ روونکردنەوەی بیروبۆچوونەکانی خۆی بۆ رای گشتی عێراق.

«التاخی» لە چاو هەموو رۆژنامە ئاشکراکانی ترا، زۆرتر داوای ژیانی دیموکراتی و، دابین کردنی ئازادی حیزبایەتی، رۆژنامەوانی، دەس پێ کردنی ژیانی پارلەمانی ئەکرد. هەروەها بایەخی بە مێژوو و ئەدەب و فەرهەنگی کوردی ئەدا. دوای ماوەیەک پاشکۆیەکی هەفتانەیشی بە کوردی بڵاو کردەوە.

*

وەزارەتەکان چەند جارێ گۆڕان. ئەمەیش نیشانەی ناکۆکی ناو جەنەراڵەکانی جەیش بو لە سەر یاسە سیاسیەکانی عیراق. ئەوەحسان عارف، بە پێچەوانەی کاکیەوە کابرایەکی دڕ و توندوتیژ نەبو، زۆری حیزبە سیاسیەکان لە سەردەمی ئەم دا بوژاپونەوە و خۆیان ڕێک خست بوەوە. بۆ زۆر کۆبونەوەی گرنگ کەسایەتیە جەنگیەکانی ئەو زەمانە، وەکو: ئەحمەد حەسەن بەکر، عەبدولعەزیز عوقەیلی، طاهیر یەحیا، ناجی طالیب.. ی بانگ ئەکرد و، پرسی پێ ئەکردن و، ڕەئی وەرئەگرتن. هەندێ لە مانە، بە تایبەتی بەعس، بە تەمای ئینقیلاب بون، لە بەر ئەوە حەزیان ئەکرد کێشە و گیروگرفتەکانی جەنەراڵ عارف، لەوانە کێشەی کورد، ئاڵۆزتر و زۆرتر بێ.

لە ٢٩ ی حوزەیرانی ٦٦ وە، مەلا مستەفا شەڕی لە گەڵ عیراق ڕاگرت بو، بەڵام شەڕی لە گەڵ پاسکی م س ڕاگەیاند بو. لە هەر جێگایەکی بۆی بلوایە هێرشی ئەکردە سەر بنکە و بارەگا و هێزەکانیان. حکومەتی عیراق زۆرتر تەماشای ئەم شەڕەی ئەکرد بێ ئەوەی ڕێگەی پێ بگرێ. حالەتی «نە شەڕ و نە ئاشتی» باڵی بە سەر هەلومەرجی کوردستان دا کێشا بو. مەلا مستەفا لە ڕوی پێشمەرگەیەوە خەریکی خۆ بەهێز کردن و، لە مەیدانی پەیوەندی دەرەکی دا خەریکی دامەزراندنی پەیوەندی تازە بو.

دوای ئەوەی تیدرێس سەردانی بەغدای کرد و، سەرکۆمار و هەندێ لە کەسایەتیەکانی کورد و عەرەبی بەغدادی بینی، سەرکۆماری عیراق، جەنەراڵ عارف لە ٢٦ ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٦ دا هاتە کوردستان و، چو بۆ سەردانی مەلا مستەفا. لەم کۆبونەوەیش دا چەککردنی جاشەکانی ٦٦ (١) یەکەم داوای بو.

*

شەڕ و ئاشتی و، کلیلی چارەسەرکردنی کێشەی ناوخۆی جولانەوەی کورد لە دەمی مەلا مستەفا دا بو، ئەویش بە هیچ شتێ ڕازی نەئەبو بە تەسلیم بونی بێ قەید و شەرتی ئەمان نەبێ، ئەمانیش ئامادە نەبون تەسلیمی بن.

پاسکی م س لە ٨/٢٨ - ٦٦/٩/٢ دا کۆنفرەنسێکی بەست. ڕاکردوەکان بیانوەکانی خۆیان و ناکۆکیەکانیان لە گەڵ مەلا مستەفا ڕون کردەوە. کۆنفرەنس پشتیوانی لە بەیانی ٢٩ ی حوزەیران دەربڕی و، ستایشی حکومەتی کرد. بەڵام لە باتی ئەوەی هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگەی بە لاداخستنی هێنانەی ناکۆکیەکان بدا، ناکۆکیەکانی قوڵتر کرد و، بیانوی سیاسی و ئایدیولوجی بۆ تاشی و، سەرکردایەتی بارزانی بە خیانەت و جاشایەتی تیران تاوانبار کرد.

لە بەرامبەر ئەمەدا کۆنگرەی حەوتەم لە ١٥ - ٦٦/١١/٢٠ دا بەسترا. ئەم کۆنگرەیەیش لە باتی ئەوەی هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگەی بە لاداخستنی هێنانەی ناکۆکیەکان بدا، ناکۆکیەکانی قوڵتر کرد و، بیانوی سیاسی و ئایدیولوجی بۆ تاشی و، لایەنەکەی تری بە خیانەت و جاشایەتی عیراق تاوانبار کرد. هەندێ لە دەرکراوەکانی کۆنگرەی شەشەم، لەوانە: نوری شاوەیس و عەلی عەبدوللا هەڵیان بردرانەوە بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و، کرانەوە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی.

*

## کۆنگرەی شەش

باسکی جەلالی خۆی بە حیزبێکی تازە دانەنەنا، بەڵکو خۆی بە خاوەنی مێژوویی و شەرعی پارتی دانا. لە کۆتایی مارتی ١٩٦٧ دا کۆنگرەی لە کەلار بەست. وەکو نیشانەی درێژەدان بە کۆنگرەکانی پێشوی ناوی نا کۆنگرەی شەشەم. ئیبراهیم ئەحمەد کە لە کۆنگرەی پێنجەمەوە سکرتێری حیزبەکە بو، هەر بە سکرتێریش مابوەوە. کۆنگرەکەی کردەوە.

ئەم کۆنگرەیە بڕیارەکانی کۆنفرەنسی ماوەت، کە ئەو هەمو کێشە و گیروگرفتانەی لە ناو جوڵانەوەی کوردا خوڵقاند بو، بە باش نرخاند و، پشتیوانی لە هەڵوێستی سەرکردایەتی ئیبراهیم ئەحمەد و، هەمو هەنگاوەکانی کرد. مەلا مستەفای لە حیزبەکە دەرکرد. بۆ خۆ جیا کردنەوە لە حیزبەکەی مەلا مستەفا پرۆگرامێکی تازەی دانا، دامەزراندنی سۆشیالیزمی لە عیراق دا کرد بە ئامانجی ستراتیجی خۆی.

بە کردەوە دو حیزبی دوژمن بە یەک بە ناوی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کە ئۆرگانی هەردوکیان «خەبات» بو، لە ناو کوردستانی عیراق دا کاری ڕێکخراوەیی، سیاسی، پێشمەرگەیی، ڕاگەیاندنیان ئەکرد و، هەر یەکەیان خۆی بە خاوەن و میراتگری مێژوویی حیزبەکە دائەنا.

•

## کورد و جو

لە ڕوژانی جەنگی شەش ڕۆژەی عەرەب - ئیسرائیل (حوزەیرانی ١٩٦٧) دا مەلا مستەفا، بە ئاشکرا، بەیانی دەرکرد بۆ پشتیوانی لە عەرەب و، ئامادەیی دەربڕی بۆ ناردنی چەند هەزاری پێشمەرگە بۆ بەشداری لەو شەڕەدا دژی ئیسرائیل.

دوای شکانی عەرەب بە چەند ڕۆژێ لە ڕێگای تارانەوە، بە نهێنی، چو بۆ ئیسرائیل بۆ پیرۆزبایی لە سەرکەوتنەکەیان. گوڵدا مائیر و مۆشی دایان و، چەند کەسی تر لە کاربەدەستە گەورەکانی ئیسرائیل بە گەرمی پێشوازییان کرد. لەو سەردانەدا وت بوی: «کورد و جو ئامۆزان، هەردوکیان نەوەی حەزرەتی ئیبراهیمن، لە بەر ئەوە ئەبێ هاوکاری یەکتر بکەن». شوێنی شەڕەکانیان لە سینا پیشان دا و، هەندێ لەو چەکە ڕوسیانەی لەو شەڕانەدا لە جەیشەکانی عەرەبیان گرت بو بە دیاری پێشکەش کرد.

•

حاڵەتی «نە ئاشتی و نە شەڕ» باڵی بە سەر پەیوەندی کورد - حکومەت دا کێشا. بەڵام شەڕی کورد و حکومەتی عیراق نیزیکتر بو بە شەڕی کورد - کورد، بە تایبەتی دوای جەنگی شەش ڕۆژەی عەرەب - ئیسرائیل، کە عیراق ٤٠ هەزار سەربازی نارد بۆ ئوردون.

•

یەکێتی سۆڤێت بایەخی بە جوڵانەوەی کورد نەئەدا لە هیچ بەشێکی دا جگە لە عیراق، بەڵکو خەریکی دامەزراندن و قوڵکردنەوەی پەیوەندی ئابوری - بازرگانی بو لەگەڵ ئیران و تورکیا و خەریکی قوڵکردنەوەی پەیوەندی ئابوری- سیاسی بو لەگەڵ عیراق و سوریا.

لە عیراق جگە لە پەیوەندی ئابوری، بازرگانی، ڕوشنبیری .. نزیکەی هەمو چەک و تفاقی جەنگی هێزە چەکدارەکانی عیراق لە یەکێتی سۆڤێت تەئمین ئەکرا، کە هەر بو

جەنگی کوردستان بەکاری نەهێنا. نەوتی عیراق کە گرنگیەکی جیهانیی هەیە، لە کانونی یەکەمی ١٩٦٧دا عیراق و سۆڤیەت ڕێکەوتنێکی سەرەتاییان ئیمزا کرد بۆ پارەمەتیدانی «کومپانیای نەوتی عیراق» بۆ دەرهێنانی نەوتی پەترۆلجاری رومەیلە. جەنگی شەش ڕۆژەی عەرەب - ئیسرائیل ١٩٦٧ بو بە هۆی بڕینی پەیوەندی عیراقی - ئەمریکی و عیراق ناچار بو بو خۆ پڕچەک کردن زیاتر پشت بە یەکیتی سۆڤیەت ببەستی.

لە ئیران، جگە لە ڕێکەوتنی ئابوری ١٩٦٣، سالی ١٩٦٦ ئیران و سۆڤیەت لەسەر دروستکردنی دامەزراوی تواندنەوەی ئاسنی ئەصفەهان و، راکیشانی لولەی گوێزانەوەی گازی سروشتی ئیرانی بو یەکیتی سۆڤیەت ڕێکەوتن، پاش ٤ سال ئیران کەوتە ناردنی گاز.

لە تورکیاش، ئاکوکی یونانی- تورکی لەسەر قوبرس پەیوەندی ئەمریکی - تورکی گرژ کردبو. تورکیا بەرەو چاکردنی پەیوەندی خوی لەگەل یەکیتی سۆڤیەت ئەچو.

*

سەردانی جەنەراڵ عارف لە ئیران

پشتیوانی ئیران لە مەلا مستەفا دژی عیراق گەیشت بوە رادەیەکی خەتەرناک. کاربەدەستانی عیراق گەیشت بونە ئەو باوەرەی «کولەکەی روح» ی جولانەوەی کورد لە ئیرانە. سەرۆکی عیراقی، ئەورەحمان عارف، سەردانی رەسمیی لە تیران کرد و، شای بینی. عارف، پیشتر سەردانی بارزانی کرد بو، بارزانی پی رازی نەکرا بو، لەم سەردانەدا ویستی ئیران رازی بکا و، ئەو کولەکەیە بشکینی کە روحەکەی تیایە.

هیشتا ئەم سەردانە بە ئەنجام نەگەیشت بو، عارف روخا.

*

ئینقیلابی بەعس ٦٨

حیزبی بەعس بو جاری دوەم لە تەموزی ١٩٦٨ دا بە ئینقیلابیکی دو قوناغی دەسەلاتی گرتەوە دەست. واتە واتیکی زوریان بە دواوە بو کە بە هاوکاری ئەمریکی - بەریتانی هاتون، بەلام رژیمی بەعس کەلکی لە تەجروبەکانی ١٩٦٣ وەرگرتبو، لە بەیانی یەکەمی ئینقیلاب دا بەلینی بەهیزکردنی پەیوەندی دابو لەگەل یەکیتی سۆڤیەت. راستیەکەشی دەسەلاتی بەعس لە سیاسەتی دەرەوەی دا هەولی بەهیزکردنی پەیوەندی ئابوری، سیاسی، دیپلوماسی، جەنگی لەگەل یەکیتی سۆڤیەت و ولاتانی سۆسیالیستی دا، دانی بەشلەمانیای دیموکراتی دا ناو «سەرەتای هولشتاین» ی شکاند، دانی بە جمهوریەتی سوسیالیستی ڤیتنام دا نا، لە ناوەوەش هەولی سەوداکردنی دا لەگەل حشع و قەومیەکانی عەرەب و هەولی چارەسەرکردنی گیروگرفتی کوردی دا.

*

بەعس ویستی هەردو باسکی جولانەوەی کورد؛ جەلالی و مەلایی، رازی بکا و بە لای خوی دا رایانکیشی. لە وەزارەتەکەیان دا دو وەزیریان بو مەلایی و، وەزیریکیان بو جەلالی تەرخان کرد بو. وەزیرەکەی لە باتی جەلالی دانرا بو، طەها محیەدین بو، راستیەکەی طەها زیاتر لەوەی جەلالی بی، دلسوز و گویرایەلی بەعس بو.

ئەم کارەی بەعس مەلا مستەفای وروژاند. مەرجی پیشەکی مەلا مستەفا چەککردنی جاشی ٦٦ (١) بو. مەلا مستەفا لە هەر ڕێککەوتنیک دا لە گەل حکومەت، ئەگەر گوژاندنەوەی کەسایەتی و حیزبەکانی تری کورد و، ناسینی خوی وەکو پیشەوای

تاقانە داهێن نەکردایە، ئامادە نەبو قبوڵی بکا. لەو کاتەدا بەعس ئامادە نەبو بچێتە ژێر باری ئەم مەرجانەوە، بە تایبەتی خۆیان لاواز بون و، لە ناو خۆیان دا ململانێ ی دەسەڵات لە نێوان باڵەکانی بەعس دا، هێشتا بە لادا نەکەوت بو. بارزانی وەزیرەکانی خۆی کێشایەوە و، پەیوەندی لە گەڵ بەعس گرژی تی کەوت و، سەرەنجام گەیشتەوە شەڕ.

*

بەعس هێشتا بەشێکی گەورەی هێزەکانی لە نێوەڕن بو، هێشتا خۆی جێگیر نەکرد بو، نەیئەتوانی، یا نەیئەویست هێزەکانی خۆی بە شەڕی کوردستانەوە خەریک بکا، خۆی تەماشای نەکرد و، یارمەتی جەلالیی تەدا بۆ شەڕی بارزانی. شەڕی کورد و کورد گەیشت بوە ئەوپەڕی توندوتیژی.

هێزەکانی مەلا مستەفا لە زۆر جێگا شکان و راونران. یارمەتی تەهران بۆ بارزانی لەم قۆناغەدا زۆر زیادی کرد، تەنانەت گەیشتە ئەوەی هێزەکانی خۆی بە جلی پێشمەرگەوە ئەنارد بو مەیدانەکانی شەڕ. لە گەڵ ئەوەیش دا هەر لە کشانەوەدا بو، هەندێ لە هاوکارە نزیکەکانی بارزانی پێشنیاریان کرد بو ماڵ و بارەگاکەی بگوێزنەوە دیوی تەهران، مەلا مستەفا قبوڵی نەکرد بو. تەنیا یەک شت مەلا مستەفای لەم چەرمەسەرییە رزگار ئەکرد ئەویش راگرتنی شەڕ و گفتوگۆ و رێککەوتن بو لە گەڵ بەعس.

*

پاسکی م س چارەنوسی خۆی بە بەعسەوە بەست بو، خۆی بە هاوپەیمانی ژیان و مردنی بەعس دائەنا. بەعس لە ململانێی ئەم دو هێزەدا، بە چەک و پارە و هێز، یارمەتی م س ی ئەدا. هەندێ پایەی بەڕێوەبەرایەتی بە ئەندامەکانی ئەمان سپارد بو. رێگەی داهێن لە بەغداد رۆژنامەی «النور» بە عەرەبی دەربکەن. لە شارەکانی کوردستان دا بنکە و بارەگایان دامەزراند بو، لە هەندێ شوێن ئەمانیش لە پاڵ دەزگاکانی حکومەت دا حوکمڕانیيان ئەکرد. جۆرێ لە ازدواجیەتی سلطە دروست بوبو. لە بواری مافەکانی کوردا هەندێ هەنگاوی نا بو، وەکو: دروستکردنی محافظەی دهوک لە قەزاکانی دهوک، زاخو، ئامێدی، شێخان. دامەزراندنی زانکۆی سلێمانی و کۆڕی زانیاری کورد و، یەکێتی نوسەرانی کورد. کردنی نەورۆز بە جەژنی رەسمی. دەرکردنی مانگنامەی بەیان و، هەفتەنامەی هاوکاری.. بەلام ئەم بڕیارانە، کە زۆرتر لایەنی بەڕێوەبەرایەتی و رۆشنبیرییان هەبو، بەس نەبون بۆ رازی کردنی گەلی کورد و چارەسەرکردنی کێشەکەی، کە پەیوەستی بە چارەسەری سیاسی بو. سەرەڕای ئەو هەمو دڵسۆزییەی پاسکی م س بۆ رژێمی تازە لە خۆیان نیشان دابو، بەعس هیچ دەسکەوتێکی سیاسی وای نەدانێ، لە بەردەمی گەلی کوردا سەربەرز و لەسەیان سوار بێ.

*

## گۆڤاری رزگاری

«مجلس قیادە الثورە» موافەقەتی کرد لە سەر دەرکردنی هەفتەنامەی «رزگاری». ناوەکەی مامجەلال خۆی بژارد بو. من خاوەنی ئیمتیاز و شازاد صائیب سەرنوسەری بو. ئەوسا عەبدوللا سەللوم سامەرائی وەزیری ئیعلام و حەسەن عەلەوی مدیر الصحافە بو.

لەو کاتەدا هیچ گۆڤار یا رۆژنامەیەک لە عیراق دا بە کوردی دەرنەئەچو.

ئەوسا ئەوانەی «رزگاری»مان دەرئەکرد و، لە رزگاری کۆ ئەبوینەوە، مەبەستێکی دیاریکراومان هەبو. ئەمان ویست «تیار»ێکی تازە لە جوڵانەوەی نەتەوەیی کوردستانی

عێراق دا دابەشبوون جیاواز بێ لە ڕێبازی هەردوو باڵ: جەلالی و مەلایی پارتی و، هەردوو باڵی قیادەی مەرکەزی و لیژنەی مەرکەزی حیزبی شیوعی. لە کارەکەمان دا سەرکەوتوو بووین: بیری دامەزراندنی «کۆمەڵە» مان گەڵاڵە کرد و زەمینەمان بۆ خۆش کرد.

هیچ کەس لە ئێمە کادری پێشەیی و مووچەخۆری مەکتەبی سیاسی نەبوو. مەکتەبی سیاسی نە بۆ ژیانی خۆمان و نە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕزگاری هیچ پارەیەکی ماددییان نەداین. بۆ ژیانی خۆمان و ژیانی گۆڤارەکە پشتمان بە خۆمان بەست بوو.

چاپخانەی «ژین» ی یادگاری پیرەمێردمان بە هەموو دەزگا و کەرەستە کۆنەکانییەوە کڕییەوە، تەنانەت ژمارەی تەلەفۆنەکەیشی کە ژمارە ١ ی سلێمانی بوو. لە بەغدادیش دەزگایەکی ئینتەرتایپ مان کڕی، ئەوسا تازەترین دەزگای دارشتنی ڕستەی نووسین بوو. پارەی کڕینی هەموو ئەمانە خۆمان پەیدامان کرد. م س فلسێکی نەدا. بەڵام چونکە لە ئێمە دڵنیا نەبوون موڵکییەتی ڕەسمیی چاپخانەکەیان خستە سەر ناوی کاک عومەر مستەفا.

ژمارەیەکی زۆر نووسەری گەنجی لێ کۆ بوویەوە، ژمارەیەکیش لە نووسەرە ناسراوەکان وتاریان بۆ ئەنووسی، لەوانە: ئیبراهیم ئەحمەد، بە زنجیرە «ژانی گەل» و، زەبیحی، هەندێ وتار لەوانە: «سۆسیالیزم بە زمانی سادە» و، شاکیر فەتاح، بە زنجیرە چەند بەشێکی لە کتێبی یەزیدییەکان بڵاو کردەوە. محەممەد مستەفا کوردی، بە زنجیرە شیعرێکی سالمی لێک دایەوە. ئەحمەد خواجە، هەندێ وردە بابەتی بۆ نووسین. محەممەد سالح دیلان، وتارێکی لە سەر نیزامی گەلهەوی و، چەند شیعرێک و، جەمال شارباژێڕی، چەند شیعرێکی بۆ ناردین.

جگە لەوان ئێمەیش خۆمان بنەماڵەی گۆڤارەکە چەندین وتارمان بۆ ئەنووسی.

من بە ناوی خۆمەوە و، بە ناوی خوازراوەوە زۆرم باس و بابەت ئەنووسی. یەکێ لەو وتارانە: «هەژاری موکریانی شاعیری دەرباری بارزانی» بوو، کە لێکۆڵینەوەیەک بوو لە سەر چاپی یەکەمی دیوانی: «بۆ کوردستان» ی هەژار. هەژار بەم وتارە زۆر نارەحەت بوو، وای زانی بوو ئیبراهیم ئەحمەد نووسیویەتی. لە سەر ئەوە چەند شیعرێکی «هەجو» ی بۆ داناوە، لە سەر پێشەی خۆی شیعرەکانی هەموی جنێوی سووک و قسەی ناشیرینە.

ئێمە لەوانە بووین لە سیاسەتی سەرکردایەتی پارتی ڕازی نەبووین، بە تایبەتی شەڕ لە گەڵ بارزانی و هاوکارییان لە گەڵ بەعس، حیزبەکە فەسادی لێ کەوتبوو، زۆری سەرکردەکانمان بە دڵ نەبوو. خۆمان لە ناو خۆمان دا جۆرێ لە (تکتل) مان دروست کرد بوو. ئەمانویست بە ڕێگای ئووسوولی ڕێکخراوەیی ڕێبازی حیزبەکە ڕاست بکەینەوە و، سەرکردایەتییەکەی بگۆڕین. لەو هەڵبژاردنەدا کە لە کۆنفرانسە ناوچەییەکان دا کرا، بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی لیژنەی ناوچە و، نوێنەرانی کۆنگرەی حیزب، ژمارەیەکی زۆرمان لەوانە بوون، کە لە تکتل یا تیارەکەی ئێمە بوون. م س گومانی لێ ئەکردین بەڵام هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نەبوو. ئەنجامی هەڵبژاردنەکانیان بە دڵ نەبوو. بە بیانووی جۆراوجۆرەوە کۆنگرەیان دواخست و نەیان هێشت بەستری تا ڕێککەوتنی ئازاری بە سەردا هات.

*

سەرکردایەتی بەعس لە ناو خۆیان دا لە ملمڵانێ ی دەسەڵات دا بوون. لە سەر جۆری ڕەفتار کردن لە گەڵ جوڵانەوەی کورد ناکۆک بوون. سەددام حسێن، تازە خەریک بوو لە ناو بەعس دا جێگە بە هاوڕێکانی لێژ بکا و دەسەڵات بگرێتە دەس. ئەیویست کاری

کورد بۆ بە هێزکردنی شوێنی خۆی بەکار بهێنێ.

بەعس موئتەمەری بەست. یەکێ لە باسەکانی موئتەمەر کورد و، جۆری چارەسەرکردنی کێشەکەی بوو. داوایان لە پاسۆکی م س کرد بوو پرۆژەیەکیان بە نووسراوی بۆ ئامادە بکا لە سەر بۆچوونی خۆیان دەربارەی چارەسەری کێشەی کورد.

لەم پرۆژەیەدا نووسی بوویان چاری بنەڕەتی کێشەی کورد بەوە تەکری دان بە مافی نەتەوەیی کوردا بنێن لە سەر بنچینەی ئازادی بڕیاردانی چارەنووس، کە لە قۆناغی ئێستادا کورد بە شێوەی ئۆتۆنۆمی بەکاری ئەهێنێ.

یەکێ لە بەعسییەکان کە پرۆژەکەی دی بوو، وت بووی: «ئەمانە بە چەک و پارە و ئازووقەی ئێمە شەڕ ئەکەن داوای مافی چارەنووس ئەکەن، ئەگەر سەرچاوەیەکی تری یارمەتیدانیان هەبوایە، ئەبوو داوای چییان بکردایە!»

لەو ماوەیەدا:

- پاسۆکی جەلالی ئەیتوانی بە شەڕ کێشەکە لە گەڵ سەرکردایەتی بارزانی یەکلایی بکاتەوە، هێزەکانی بارزانی لە مەیدان دا مانەوە و، بەرەنگاری سەختیان کرد.
- ئێران بە ئاشکرا هاتە ناو شەڕەکەوە بۆ یارمەتی دانی بارزانی و، سنوورەکانی بۆ کردەوە و هێزی دایە و، عێراق توانای ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستەوخۆی ئێرانی نەبوو.
- سەددام ئەیویست کارتی کوردی لە دەس ئێران دەربهێنێ و، لە ملمڵانێی دەسەڵاتی ناو باڵە جیاوازەکانی خۆیان و، ئێوان بەعس و نەیارەکانی دا بە کاری بهێنێ.

موئتەمەری بەعس بڕیاری گفتوگۆی دا لە گەڵ سەرکردایەتی بارزانی و، دوای ئەوە بە ماوەیەکی کورت کەوتنە پەیوەندی و ئاڵوگۆڕی نوێنەر و نێردراو.

*

بەعس بۆ ئەوەی زەمینەی ڕێککەوتن لە گەڵ مەلا مستەفا خۆش بکات، لە حوزەیرانی موئتەمەری قوطری دا بڕیاری لێ دا و، لە گۆڤاری «الثورە العربیە» ی دا وتارێکیان نووسی بوو، هێزە کوردیەکانیان هەڵسەنگاند بوو، باسی جەلالییان کرد بوو کە لە گەڵ هەموو حکومەتەکان دا هاوکارییان کردوە، باسی بارزانیشیان کرد بوو کە هێزی سەرەکییە لە بزووتنەوەی کوردا و، بیانوویان بۆ پەیوەندییەکانی لە گەڵ ئێران و ئیسرائیل دۆزی بووەوە.

لە ڕۆژنامەی «الثورە» ی ئۆرگانی بەعس دا سەروتارێکیان بە ناونیشانی: «کیف السبیل الی حل المشکلە الکردیە» دا بڵاو کردەوە. زۆر بە زوویش لە گەڵ مەلا مستەفا کەوتنە پەیوەندی و هاتوچۆ.

*

یەکێتی سۆڤیەت ئەیویست دەسەڵاتی بەعس و بزووتنەوەی کورد و حشع بگەیەنێتە یەک، قورسایی خۆی خستە سەر بارزانی. لە کۆتایی ١٩٦٩ و سەرەتای ١٩٧٠ دا دانوستاندن لە بەینی سەرکردایەتی بەعس و سەرکردایەتی بارزانی دا لە ناوپردانەوە دەستی پێ کرد و، گفتوگۆ بڕایە بەغداد. دوای هەموو کۆبوونەوەیەکی گرنگ سەفیری سۆڤیەتی ئەندامانی هەردوو نوێنەرایەتی ئەدی، هەوڵی ئەدا بیرو بۆچوونەکانیان لە یەک نزیک بخاتەوە، چارە بوو ناکۆکییەکان بڕەوێنەوە، تەنانەت کاتێ کە نوێنەرایەتی کورد پێی داگرت لەسەر بەشداربوونی نوێنەری حشع لە گفتوگۆدا وە نوێنەرایەتی بەعسی ئەمەی ڕەت کردەوە بە بیانووی ئەوەی حشع حیزبێکی کوردی نییە و حیزبێکی عێراقیە، کاربەدەستانی سۆڤیەتی

داوایان لە نوێنەرایەتی کورد کرد دەس لەو خواستە هەڵبگرن بۆ ئەوەی ئەمیستە کوسپی بۆ پێشەوە چوونی رەوتی دانوستاندن.

*

بارزانی پێویستی بە پشوودانی بوو بۆ ئەوەی ئەبارەکانی، کە بوبوون بە هێزێکی سیاسی و چەکداری گەورە، پاکتاو بکا. ئەمجارەیش لە گفتوگۆدا لە گەڵ حکومەت چەک کردنی جاشەکانی ٦٦ (!) کەوت بوە پێش سەلماندنی مافەکانی کوردەوە.

دەستەی نوێنەرایەتی بەعس و سەرکردایەتی بارزانی لە بەغداد چەندین کۆبوونەوەیان کرد، بۆ دیاریکردنی مافەکانی کورد لە سەر بنچینەی حوکمی زاتی و، کە رەوتی دانوستان تەگەرەی تێ کەوت، سەددام خۆی چو بۆ سەردانی مەلا مستەفا و، بەوجۆرەی ئەو داوای کرد، داواکانی قەبوڵ و، ئیمزایان کرد.

بەعس هەمو ئەمەی لە پشتی باسکی م س دوە ئەکرد، بگرە بۆ ئەفسەردان و چاوبەستەکی ئەمان، هەمیشە بۆیان دوبارە ئەکردنەوە کە ئەوان هەرگیز دەس لە دەستەکانیان هەڵناگرن و ئەیانوت: «احنه ما نفرط باصدقائنا وحلفائنا». لە کاتێک دا خەریک بون ئەگەیشتنە یەک تەعلیماتیکان نوسی بو بۆ جەیش کە گفتوگۆ لە گەڵ بارزانی سەرئەکەوتوە، خۆیان بۆ شەر کۆ بکەنەوە. لە هەمان کات دا لە تەلەفزیۆنی بەغدادەوە کاریکاتێری مەلا مستەفایان بە «ردا، العمالة» وە بڵاو ئەکردەوە. لە پڕ دەزگاکانی راگەیاندنی عێراق هەواڵی ریککەوتنی بەعس - بارزانییان بڵاو کردەوە و، بەیانی ئازاریان خوێندەوە. مەلا مستەفایان وەکو پێشەوای جوڵانەوەی کورد و، حیزبەکەیان وەکو هاوپەیمانی خۆیان ناسی و، مافی نەتەوەیی کوردیان لە سەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی سەلماند. لەو کۆنگرە رۆژنامەوانییەدا کە بەکر بەستی، لە وەڵامی پرسیارێک دا سەبارەت بە چارەنوسی جەماعەتی م س، بەکر وتی: «هەمو هێزە غەیرە نیزامییەکان هەڵئەوەشێنرێنەوە».

ئەمە سەرکەوتنێکی گەورە بو بۆ مەلا مستەفا، بەڵام خیانەتێکی ئاشکرا و غەدرێکی گەورە بو لە مامجەلال و حیزبەکەی. ئەمە دوەم جار بو لە پشتەوە خەنجەری غەدری لێ بدەن جاری یەکەم: ساڵی ١٩٦٣ و جاری دوەم: ساڵی ١٩٧٠. ئەمە کارێکی لە مامجەلال کرد تا هەتایە باوەری بە سەددام حسین و حیزبی بەعس نەمێنێ و، هەرگیز لێیان ئەمین نەبێ.

*

کاربەدەستانی عێراق لە بەیانی ئازاری ٧٠ دا مافی نەتەوەیی کوردیان لەسەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی سەلماند. پ د ک لە عێراق گرنگییەکی گەورەی پەیدا کرد و، بە ئاشکرا کەوتە چالاکی، رۆژنامەی «النور» داخراو لە جێی ئەو «التآخي» کەوتەوە دەرچون. ٥ کورد خرانە وەزارەتەوە و چەن کوردی تر کرانە وەکیلی وەزارەت، چەندین فەرمانبەری گەورە لە ئەندامانی پارتی دانرا لەوانە ٣ محافظی سلێمانی، هەولێر، دهۆک، هەروەها ٦ فەوجی «حرس حدود» لە پێشمەرگە پێک هێنرا. چەندین قوتابی کورد لە کوللیەکانی عسکری و شورطە وەرگیران. چەند کەسێک بە سەفیر دانران.

یەکێتی سۆڤیەت و هەمو حیزبە کۆمۆنیستییەکانی دنیا ئەم هەواڵەیان بە خۆشیەوە وەرگرت و، هەندێکیان بروسکە یا نامەی پیرۆزباییان بو ناردن. سەرۆکی دەستەی

سەروکایەتی ئەنجومەنی بەرزی سۆڤیەت نیکولای پودگورنی و سەروکی ئەنجومەنی وەزیرانی یەکیتی سۆڤیەتی ئەلیکسی کوسیجین لە بروسکەیەک دا کە روژی ۱۷ ی ئازاری ۱۹۷۰ بو سەرکوماری عیراق بەکریان نارد بو نوسی بویان: «نحن واثقون من ان تنفیذ هذه الاتفاقیه الهامه سیساعد علی تعزیز الوحده الوطنیه والصداقه بین شعبی الجمهوریه العراقیه الشقیقین - العرب والأکراد، علی نجاح تحقیق التحولات الاقتصادیه - الاجتماعیه فی البلاد لصالح الشعب العراقی بأسره ورفع مستوی حیاته ورفاههم»

بەیانی ئازاری ۱۹۷۰ تین و تەوژمیکی زوری دا بە بزوتنەوەی کورد لە سەرانسەری کوردستان دا. پاش ئینقیلابی تورکیا (۱۹۷۱) ژمارەیەکی زور تیکوشەری کوردی تورکیا پەرەوازە بون، یەکیتی سۆڤیەت دالدەی نەدان لەبەر ئەوە لە ولاتانی ئەوروپای خورئاوا بونە پەنابەر. یەکیتی سۆڤیەت پەیوەندی لەگەڵ پارتی بەهیز کردبو، بەردەوام نوینەرایەتی پ د ک و بارزانییان ئەدی و بانگییان ئەکردن بو کونگرەی پارتیە کومونیستەکان. «زەمالە» یان ئەدا بە خوێندکارەکانیان. سەردانی بارەگای بارزانیان ئەکرد. دەزگاکانی راگەیاندنی سۆڤیەتی لە سەر تەجروبەی نوی ی عیراق ئەیانئوسی.

پەیوەندی ئابوری و بازرگانی و روشنبیری لە نیوان عیراق و ولاتانی سوسیالیستی دا لە ژیر سایەی دەسەلاتی بەعس دا لە جاران زیاتر گەشەی کرد. ریکەوتنیک بو هاوکاری راوە ماسی (کانونی دوەمی ۱۹٦۹)، ریکەوتنیک بو هاوکاری ئابوری و تەکنیکی (تەموزی ۱۹٦۹) بو بارمەتیدانی کومپانیای نیشتیمانی نەوت بو دەرهینانی نەوت و گازی رومەیلە و راکیشانی لولەیەک لە شوینی دەرهینانیەوە بو سەر مینای فاو، وە چاکردنی مینای فاو بو پیشوازی ئەوتکیشی گەورە، پروتوکولیک بو هاوکاری لە بەکارهینانی ئەتوم بو مەبەستی ئاشتیخوازانە، ریکەوتنیک بو هاوکاری لە رادیو و تەلەفزیون (۱۹٦۹)، لە نیسانی ۱۹۷۰ دا ریکەوتنیکی عیراقی - سۆڤیەتی نوی ئیمزا کرا بو بو هاوکاری ئابوری و تەکنیکی. ئەو قەرزانەی یەکیتی سۆڤیەت دابوی بە عیراق تا نیسانی ۱۹۷۱ گەیشتە ۳ر٤٢٤ ملیون روبل. هەروەها پەیوەندی بازرگانی عیراق لە گەڵ ئەڵمانیای دیموکراتی، پولونیا و ولاتانی تری ئەوروپای روژهەلات پەرەی سەند.

*

بەیانی ئازار دانی بە مافی ئەتەوەیی کوردا نا بو، بەلام چەند کەموکوریی بنەرەتی تی دا بو:

زور لە میژ بو پارتی ئوتونومی بو کوردستان و دیموکراسی بو عیراقی کرد بو بە دروشمی سەرەکی خوی. لەم گفتوگویانەدا وەفدی کوردی لە هەردو مەسەلەدا: ئوتونومی و دیموکراسی دا بازی بە سەر چەند سەرەتایەکی بنەرەتی دا دابو.

لە باسی دیموکراسی دا بەعسیەکان بە راشکاوی وت بویان: وئیمە حیزبیکی شورشگیرین بە شورش هاتوینەتە حوکم. باوەرمان بە دیموکراسی روژئاوایی و دیموکراسی لیبرالی نیە. هەلبژاردنی گشتی واتە تەسلیم کردنی حوکم بە کونەپەرستەکان» وەفدی کوردی بو ئەوەی گفتوگوکەیان لە سەر ئەوە نەپچری وازی لە باسی دیموکراسی و هەلبژاردنی گشتی و ژیانی پارلەمانی هینا بو. بو پاساودانی ئەمەش وت بویان ئیمەش حزبیکی شورشگیرین باوەرمان بە دیموکراسی لیبرالی نیە.

لە باسی ئوتونومی دا بەعس دانی نابو بە مافی کوردا لە سەر بنچینەی ئوتونومی

بەڵام مەسەلە گرنگەکانی هەڵگیرا بوون بۆ سالانی دوایی، لەو گفتوگۆیەدا باسی قانونی ئۆتۆنۆمی و ناوچەی ئۆتۆنۆمی نەکرا بوو. دەسەڵاتەکانی حکومەتی ئۆتۆنۆم لە کوردستان دا چیە و دەسەڵاتەکانی حکومەتی ناوەندی لە ناوچەی ئۆتۆنۆم دا کامانەن؟ کوردستانی عیراق کوێیە و لە کوێ دا تەواو ئەبێ. دیاریکردنی ناوچەی ئۆتۆنۆم دانرا بۆ یەکخرێتە دوای سەرژمێری گشتی تا بەو پێیە زۆرایەتی هەر جێگایەک کورد بۆ بخرێتە ناوی. دیاری کردنی چارەنوسی ناوچەکانی کەرکوک، خانەقین، سنجار و زۆر شوێنی تر هەڵگیرا بوون بۆ دوای دەرکەوتنی ئەنجامی سەرژمێرەکە. کێشەی فەیلیەکان (کە بەعس بە ئێرانی دائەنان) و کێشەی یەزیدیەکان (کە بەعس بە عەرەبی دائەنان) بە چارەسەرنەکراوی هێڵرا بوەوە.

مەلا مستەفا لەو کاتەدا تەنگاو بو. پێویستی بە پشودان هەبو. دیموکراسی و ئۆتۆنۆمی و شتی لەو بابەتانە لەو کاتەدا ئەویان نەئەهێنا شەڕیان لە سەر بکات، بە تایبەتی چونکە ڕێککەوتنەکە دوژمنەکانی ئەوی تەواو نەکرد و، دەسکەوتی زۆری بۆ دابین نەکرد.

*

## کۆنگرەی هەشتەم

کۆنگرەی هەشتەمی پارتی لە تەمووزی ۱۹۷۰ دا بەسترا.

ئەم کۆنگرەیەش وەکو کۆنگرەکانی تر فەرمالیغ و، جۆرێ لە خۆپیشاندانی سیاسی بو بۆ تازە کردنەوەی گوێرایەڵی کوێرانە بۆ سەرۆک. هەلومەرجی سیاسی ئەم کۆنگرەیە لە چاو هەمو کۆنگرەکانی کەدا جیاواز بو. سەرکردایەتی بارزانی و سەرانی پارتی بە هۆی بەیانی ئازار و، پشتیوانی فراوانی ناوەوە و دەرەوە، هەستیان بە سەرکەوتنێکی گەورە ئەکرد و، لە خۆیان بایی بوبون.

نوێنەری زۆر لە حیزبە نەیارەکانی بەعس، لەوانە حشع، بانگ کرا بون. ئەوانە کۆنگرەکەیان کرد بە دوانگە دژی بەعس.

پارتی بۆ ئەوەی پیشانی بەعسی بدا کە هێشتا پشتیوانی ئێرانی ماوە، کامەران بەدرخان کە لە بەغداد پێشوازی ڕەسمیی لێ کرابو و، وەکو میوانێکی بەڕێز ڕەوانەی لای مەلا مستەفا کرا بو، بێ ئەوەی سەری بەغداد بداتەوە لە ڕێگای تارانەوە گەڕایەوە ئەوروپا.

ئەم کۆنگرەیە بێ باوەڕی لە نێوان بەعس - بارزانی دا قوڵتر کرد.

بۆ کۆمیتەی ناوەندی هەندێ ئەندامی تازە دانران. کوڕانی مەلا مستەفا: ئیدریس و مەسعود، بون بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و، دارا تۆفیق کە هەتا چەند ڕۆژێ پێش کۆنگرە ئەندامی پارتی نەبو، لە سەر داوای مەلا مستەفا ئەویش کرا بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، چونکە بە جاسوسی سۆڤیەتی ئەزانی، سەرەڕای چەند کەسێ لە فەرماندەکانی پێشمەرگە کە هەندێکیان نەخوێندەوار بون.

*

بەعس داوایان لە مەلا مستەفا کرد یەکێ لە کوڕەکانی بنێرێ بۆ بەغداد بێ بە جێگری سەرکۆمار. بۆ ئەم مەبەستە عەزیز شەریفیان نارده لای. مەلا مستەفا بۆ ئەوەی ڕەتی بکاتەوە وت بوی: «ئەم شەو خوداوەندی بارزان هاتە خەوم وتی نابێ هیچ بارزانیەک کاروباری حکومەت وەربگرێ»، پاش پێ داگرتنێکی زۆری حکومەت، پێشنیاری حەبیب محەمەدی کرد. بەعس ڕەزای کرد چونکە حەبیب بە ڕەچەڵەک ئێرانی بو. مەلا مستەفا

ئەمەی ئەزانی، بە ئەنقەست ئەوی پیشنیار کرد بوو، بۆ ئەوەی رەتزی بکەن.

بەعس جارێکی تر فوئاد عارفی نارد بۆ لای بۆ ئەوەی یەکێکی کە دابنێ. فوئاد عارف زۆری بۆ وت بوو کە دانانی جێگری سەرکۆمار چەند گرنگە. مەلا مستەفا پێ ی وت بوو: «کەواتە خۆت بیکە! لە تۆ باشترمان دەس ناکەوێ».

هەمو ڕێککەوتنێکی راستەقینە لە گەڵ هەر حکومەتێکی عیراق بوایە، لە ئەنجام دا ئەبو مەلا مستەفا پەیوەندی لە گەڵ دەوڵەتانی دەرەوە ببڕێ و، لەشکرەکەی بڵاوە پێ بکا یا بیخاتە بەر فەرمانی دەزگایەکی حکومەتەوە و، پارە لە هیچ لایەک وەرنەگرێ و، زیندانی نەبێ و هیچ کەس نەگرێ و نەکوژێ و، خۆیشی وەکو هەمو هاوولاتیەک لە جێگایەک دا دابنیشێ.. ئەمانەش لە گەڵ تێگەیشتن و بیرکردنەوە و قازانجی مەلا مستەفا نەئەگونجان. مەلا مستەفا خۆی بە بەرزتر دائەنا لە دەوڵەت و دادوەزگا قانونیەکانی. لە بەر ئەوە لە گەڵ هیچ حکومەتێک، بە راستی، ڕێک نەئەکەوت و، هەوڵی ئەدا باروداخی ناتاسایی بەو جۆرەی خۆی ئەیویست بێنێتەوە.

*

## ئیستیعاب یان تێکەڵاوبونەوە؟

ڕێککەوتنی ئازاری بەعس - بارزانی سەرکەوتنێکی گەورە بو بۆ بارزانی و بۆ کورد، بەلام شکانێکی سیاسی کوشندە بو بۆ جەلالی. وورەی هێزەکانی داڕمێ و لە بەر یەک هەلوەشا. ڕێکخراوە سیاسیەکانی مابو ئەویش کەوت بوە ژێر گوشاری مەلایی و خەلک.

مەلا مستەفا لە بەعس ئەمین نەبو، هەر لە سەرەتاوە بۆ مەبەستی تاکتیکی لە گەلی پێک هات بو، یەکی لە مەبەستەکانی لە ناوبردنی جەلالی بو. کە ئەترسا لە هەر ڕوبەروبونەوەیەکی تازەدا لە گەڵ بەعس، دیسان ئەمان بێنەوە لایەن. فاخیر مێرگەسوری لە سلێمانی پەیوەندی لە گەڵ چەند کەسێکی جەلالی کرد بو، ئارەزوی پیشان دابو بۆ ئاشتبونەوە و یەکگرتنەوە. ئەم پەیوەندیە گەشەی کرد و، گەیشتە ئەوەی مام جەلال خۆی سەردانی مەلا مستەفای کرد.

ئەمان ئەیانویست قەوارەی حیزبەکەیان بپارێزن، ناوەکەی بگۆڕن و لە گەڵ پارتی دۆست و هاوکار بن و، سەرکردایەتی حیزبەکەیان لای مەلا جێگیر بێ و، سەرۆکایەتی بارزانی قەبول بکەن. بەلام بارزانی قەبولی نەئەکرد ئەمان وەکو حیزبێکی جیاواز و سەربەخۆ بمێنن، چونکە گومانی ئەکرد جارێکی تریش لی ی هەلبگەڕێنەوە. لە بەر ئەوە تەنیا یەک ڕێگەی بو دانان ئەویش تێکەلاو بونەوە بو بە پارتی.

*

ئەم بیروڕایانە لە ناو ڕیزەکانی جەلالی دا باس ئەکرا. دو ڕەئی هەبو: یەکێکیان، لای وابو کە هەوڵی ئاشتبونەوە بدرێ لە گەڵ بارزانی، بەلام پارێزگاری سەربەخۆیی حیزبەکە بکرێ. ئەوی تریان، لای وابو کە هەردو حیزب لە ڕوی بیروباوەڕ و پێکهاتنی چینایەتی و ڕێبازی سیاسیەوە لە گەڵ یەک جیاواز نین و، مانەوەی حیزبەکە لە داوارۆژدا ئەبێتەوە بە هۆی شەری ناوخۆ و، پالدانەوە بە حکومەتەوە، لە بەر ئەوە هەلوەشاندنەوەی حیزبەکە و تێکەلاو بونەوەی بە چاک ئەزانی.

ئەوانەی ڕەئی دوەمیان هەبو، بە زۆری لەوانە بون کە بە تەمای دامەزراندنی کۆمەلە

بون، جگە لەوەیش ئەوانە لایان وابو تا ئەم حیزبە بۆشاییەکی سیاسی بە جێ نەهێلێ، بواری گەشە کردنی ڕێکخراوێکی تازە نابێ.

*

ئەو کۆنگرەیەی کە پێش ١١ ی ئازاری ٧٠ بە ساڵێک ئەبو بەستری و، نەبەسترا بو. ئەمجارە ئەبو کۆ ببێتەوە بۆ لیدوانی چارەنوسی حیزبەکە، چونکە ئیتر گۆڕینی سەرکردایەتی و ڕاستکردنەوەی ڕێبازی سیاسی، هیچ بایەخێکی نەمابو.

کۆنگرە بەسترا. ئەندامەکانی ئەوانە بون کە لە کۆنفرەنسە ناوچەییەکان دا پێش ١١ ئازار هەڵبژێردرا بون. زۆریان لە نارازییەکانی ناو حیزب و، لایەنگرانی (تیار) ەکەی ئێمە بون. ئێمەیش پێشتر هەمو قسەمان کرد بو بە یەک، کە لە نرخی ئاشتبونەوەدا لە گەڵ مەلا مستەفا ئەم حیزبە هەڵبوەشێنینەوە و تێکەڵاوی حیزبەکەی ئەوی بکەینەوە. کۆنگرە بە زۆرایەتیەکی دیار بڕیاری: گۆڕینی ناوی حیزبەکە و، هەڵوەشاندنەوەی و یەکگرتنەوەی دا لە گەڵ حیزبەکەی بارزانی.

سەرکردایەتی بارزانی بەڵێنی دابو بە سەرکردایەتی جەلالی کە سێیەکی ئەندامانی لق و ناوچەکان لە کادرەکانی ئەمان دابنێ و، لە هەڵێکی نزیک دا کۆنگرەی نۆهەمی پارتی ببەستێ و، ئەندامانی سەرکردایەتی کاریان پێ بسپێردرێ. بەڵام نە کۆنگرەی نۆهەم بەسترا و، نە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی کاریان پێ سپێردرا، بەڵکو بۆ بێ نرخکردنی ئەو هەنگاوە گرنگە، سەرکردایەتی بارزانی ناوی لەم تێکەڵاو بونەوەیە نا: «ئیستیعاب». لە زۆر جێگاش لە لیژنەی ناوچە و لقەکان دا جێگەیان نەکردنەوە.

*

یەکێ لە مەرجەکانی مەلا مستەفا ئەوە بو، کە ئیبراهیم ئەحمەد و هەندێکی تر لە سەرکردەکانیان لای ئەو جێگیر بن. مانگی شوباتی ١٩٧١ ئیبراهیم ئەحمەد، مامجەلال، عومەر مستەفا، عەلی عەسکەری، بە ڕێ کەوتن بۆ بارەگای بارزانی. ئەمانە چەند کەسێکی کەیشیان، لەوانەی ئاواتیار بون لای سەرکردایەتی بارزانی، لە گەڵ خۆیان برد بۆ ئەوێ، لەوانە حامید قادر، حەمەی لەمەرج، مام طەها خۆشناو، قادر کۆکۆیی، کەماڵ مەولود..

منیش کە لەرمانی گرتن و حوکمی «محکمه الثوره» ی عیراقم بە دواوە بو لە گەڵ ئەوان ڕۆیشتم. ماڵ و خێزانەکەی مەلا مستەفا لە دیلمان و، شوێنی کارکردنی ڕۆژانەی ئیدریس و مەسعود لە قەسر و ماکۆسان بو. ئێمەشیان لە خانویەک دا لە قەسر و ماکۆسان دانا. تا چەند مانگێ من لە گەڵ ئیبراهیم ئەحمەد لە ژورێک دا بوم.

بۆ یەکەم جار کە لە گەڵ عەلی عەسکەری چوم بو سەردانی ئیدریس. کاک عەلی منی پێ ناساند، ئیدریس بە پێکەنینەوە وتی: «نای چەند هەوڵمان دا ئیعدام یکری ی بەردەس نەکەوتی!» وتم: «وا بە پێ ی خۆم هاتومەتە بەردەستان»

لە ڕۆژانی ١١ ی ئازاردا شوکری حەدیثی موحافیظی سلێمانی بو. شوکری بەعسی بو، لە سەردەمی حکومەتی عارف دا گیرا بو، بەرگەی ئەشکەنجەی نەگرت بو، هاوڕێکانی خۆی بە گرت دابو، لە بەر ئەوە لە ناو بەعسیەکان دا بە چاوی سوک سەیریان ئەکرد و خۆیشی ئەوەی لێ بوبو بە «عقده». یەکەم گەرای بەعسی لە سلێمانی دا ئەو دای نا و، هەندێ کەسی کرد بە بەعسی. ئێمە بە توندی دژی ئەم هەنگاوەی ڕاوەستاین. من ڕێزم نەئەگرت و نەمئەوانی لە گەڵی ئەبو و، ئەویش حەزی لە چارەی من نەئەکرد و، قینی لە

من بو.

ئەو رۆژەی بەهاتی ١١ ی ئازار خوێندرابەوە من بۆ ئیشـوکـاری گۆڤـارەکـەمـان لە بەغداد بوم. پاش ئەوە بە چەند رۆژێ گەرامەوە سلێمانی. لەو ماوەیەدا ئاژاوەیەک خرا بوە حەوشی سانەوی کچانی سلێمانیەوە.

لە سەر ئەوە حکومەت کوریکی گرت بو بە ناوی: جەمال ئەحمەد و، فەرمانی گرتنی چەند کەسێکیان دەرکرد بو، یەکێکیان من بوم. جەمال و ئەوانەی فەرمانی گرتنیان بۆ دەرچو بو حەرەسی پارەگای گۆڤاری «رزگاری» بون.

رووداوەکە بەم جۆرە بویو: ماڵی جەمال بە تەنیشت سانەوی کچانەوە بو. جەمال لەو ئالوگۆڕانەی بە هۆی ئازارەوە بویو، زۆر ئارەحەت ئەبی، لە گەڵ چەند هاوڕێیەکی دا بۆ سەر گـەرم کـردن لە داخ و خەفەت دا ئەچن بۆ خواردنەوە. بە سەرخۆشی ئەرواتەوە بۆ مـالی خۆیان. لە ریگا توشی تاقمی پولیس ئەبی کە لە بەردەمی سانەوی کچان دا بۆ میـوانی راوەستا بون. پولیـسەکان مقرض یکیان لە گەڵ ئەبی بە ناوی جەمال چاوشین برازای یەکری حاجی قەرەج بو، یەکر لیپرسراوی پێشـمەرگـەکـانی پارتی بو لە سلێمـانی، کـابرایەکی هەلپەرست و خۆ بەرەپێشەوەی سەر بە پارتی بو. جەمال چاوشین و پۆلیسـەکـان، جـەمال ئەحمەد ئەناسن، بۆ ئەوەی سوکایەتی پی بکەن، بانگی ئەکەن بیتە پێشەوە. جەمال ئەحمەد ئەترسی ئازاری بدەن و دەسـتـدرێژی بۆ بکەن. بۆ دیفـاع لە خـۆی نارنجـۆکـێکیـان لی راتەکیشی. پولیسەکان لی ی ئەوروکێن و نارنجۆکەکەی لە دەسی دەرئەهیان، بۆ ئەوەی بە خۆیان دا ئەتەقیتەوە هەلی ئەدەنە ئەو دیو دیوارەکە، کە حەوشی سانەوی کچان بو. کەسی نەکوژرا و کەسی بریندار نەکرد بو.

*

هەمـان تاقم پۆلیس پیش ئەم بەزمە چوبونە سەر «چاپخـانەی ژین» کـە گـۆڤـاری رزگای لی چاپ ئەکرا، هەندی دەزگایان شکاند بو و، هەرچی ورده و پردەیەکیان بەردەس کەوت بو برد بویان لە ناو ئەوانەدا: «کلیشـە» ی ئەو رۆژنامانەی لە سەردەمی «پێشکەوتن» موە لەم چاپخـانەیەدا چاپ کـرا بون، کلیشـەکـان لە داری گـوێز هەلکەنرا بون و، تا ئەوسـا وەکو یادگاری چاپخانەکە هەلگیرا بون. هەروەها چوبونە پارەگای گۆڤارەکەش کتێبخانەکە و فایلەکانیان تالان کرد بو. سەدان کتێبی بە نرخ و وتاری دەستخەتی نوسەرانەکانیان برد بو.

*

پۆلیسـەکان ئەم رووداوەیان بە سەر جەمال ئەحمەددا هێنا. شوکری حەدیثی رووداوەکەی قۆستەوە و زلتری کرد. یەعنی ئەیویست ئەمە بکا بە موناسەبەتیک بۆ چاوشکاندنی جەلالی و، پارتی ئەیویـست بیکا بە مـونـاسـەبەتیک بۆ تۆلە کـردنەوە. هەردولایان ئەیانویست رووداوەکە بە سەر من دا بیهیان. شوکری حەدیثی تۆڵەی لیهدانی یەعسیـەکانی سلێمـانی و پارتی تۆڵەی وتارەکانی رزگاری لە من بکەنەوە.

ئەو زەمـانە تیگەیشـتم ترخی قـسـەکـردن چەند گـرانە. ئەم رووداوە رەوتی ژیانی لە بنەرەتەوە تیک دام و، بو بە سەرەتای دەربەدەری هەتا هەتایەم. لەو ساوە ئیتر ئەمتوانی لە پرسەی هیچ خزمێکم و لە شایی هیچ یەکی لە کەسوکارم دا بەشدار بم و، ئەمتوانی لە هیچ جەژن و خۆشیەک و، لە هیچ لیقەومان و ناخۆشیەک دا لە گەڵیان بم.

جەمـال گـیرا و، فـەرمـانی گـرتن بۆ ئەوانەیش دەرچو کە ئەو رۆژە لە گـەڵ جەمـال

خواردبوبانەوە، فەرمانی گرتن بۆ منیش، بە تۆمەتی دروستکردنی «شبکاتی تخریب» دەرچو. هەمو درابن بە «محکمە الثورە» لە بەغداد.

جەمال حوکم، ئیعدام درا و، هێناپانەوە لە بەر دەرگی سەرای سلێمانی لە سێدارەیان دا و، هاوڕێکانی ئەو و منیشیان بە «ئەبابی» بە ١٠ ساڵ زیندانی حوکم دا. من خۆم نەدا بە دەستەوە، لە بەغداد خۆم شاردەوە.

من لە ژیانی سیاسی و پێشمەرگەیی خۆم دا سەدان کار و کردەوەم دژی حکومەتی عیراق و داوودەزگا سەرکوتکەرەکانی و سەرکردایەتی بارزانی کردوە، لای هەندێ بە کاری شۆرشگێرانە و، لای هەندێ بە جاشایەتی و، لای حکومەت بە خیانەتی نیشتمانی دانەنرێ. لە بەر ئەوە پێویستم بە پاکانە نیە، بەلام لە دور و لە نزیکەوە دەستی من لەم مەسەلەیەدا نەبو.

*

## ناکۆکی ناو بنەماڵەی بارزانی

لەو ماوەیەی ئیمە لە قەسری بوین ناکۆکییەکانی ناو بنەماڵەی بارزانی تەقییەوە چەند روداویان لی کەوتەوە:

- مەلا مستەفا ماوەیەک بو لە ناو کورەکانی دا ئیدریس و مەسعودی پێش خستبو، هەردوکیانی کرد بو بە ئەندامی م س و کاروباری بارەگای بارزانییانی راتەپەراند. سەرەرای ئەوەش مەسعودی دانا بو بە لێپرسراوی دەزگای پاراستن و ئیدریس بە هی مەکتەبی عەسکەری. عوبید و لوقمان کە بە تەمەن گەورەتر و، لە سەردەمی پاشایەتی دا «حەبس و تبعیدلدان» و لە سەردەمی شۆرشی ئەیلول دا شەر و ناخۆشییان دی بو، فەرامۆش کرا بون. عوبید دەسی بە سەر بو لە گوندی وەلزی لە هەسان ناوچەی بالەک. لەو ماوەیەدا عوبید هەلات و چوە ناو حکومەت.

ئەمەش رەنگدانەوەی ناکۆکی ناو ژنەکانی بو. مەلا مستەفا ٣ ژنی هەبو. دوانیان بارزانی و یەکیکیان زیباری بو. لە ژنی یەکەمی: عوبید و لوقمان و صابیر و، لە ژنی دوەمی: ئیدریس و، لە ژنی سێیەمی، کە کچی محمود ئاغای زیباری بو: مەسعود، دلشاد، نیهاد، سیداد، وەجیهی هەبو. ئەم ژنەیان لە لای مەلا مستەفا لە هەمویان لە پێشتر بو. ناکۆکی ناو ژنەکانی کاری لە پاشەرۆژی کورەکانی کرد. لە بەر ئەوەی لە گەل ژنی یەکەمی ناریک بو، عوبید و لوقمان و صابیری پشت گوێ خست و، لە بەر ئەوەی لە گەل ژنە زیبارییەکەی ریک بو، مەسعودی پێش خست.

- شیخ محەممەد خالید و شیخ عوسمان، کە هەردوکیان کوری شیخ ئەحمەد بون، لە ناو خۆیان دا لە سەر ئەوەی کامیان جیگای «خودان» بگریتەوە تیک چو بون. مەلا مستەفا پشتیوانی لە محەممەد خالید ئەکرد و دژی عوسمان بو. حکومەت ویستی دەس بخاتە ناو ئەم ناکۆکییەوە. کەوتنە لەشکرکیشی لە یەکتری. سەرەنجام محەممەد خالید زاڵ بو بە سەر عوسمان دا. عوسمان لیخرا بەلام خۆی و کورەکانی دایانە پاڵ حکومەت.

- هەر لەو ماوەیەدا بارەگای بارزانی یەکێ لە براکانی فاخیر میرگەسوری کوشت. ئەوانیش یەکێکیان لە سەر کوشتەوە. فاخیر گیرا و هەندێ لە براکانی هەلاتن بۆ ناو حکومەت. دوای ماوەیەک فاخیر بەر درا. لە گەل مامجەلال چوین بۆ سەردانی پێشیمانییەکی زۆری دەبری لەو ناوزییەی کرد بوی بۆ ئاشتکردنەوەی باسکی م س و مەلا

مستەفا. فاخیر ئەم ئاگۆزکییەی بە ئاگۆزکی بارزانی و زیباری لێک ئەدایەوە. لە قسەکانی دا وتی: «من چەند هەڵەیەکم کردوە یەکێکیان ئەوە بو مەسعود داوای لی کردم لە گەڵی بچم بۆ پێشوازی ئەمیر ئالمانی خالی و جاشە زیبارییەکان کە ئەیانویست بچن بو سەردانی مەلا مستەفا. من ئەچوم و لۆمەی مەسعودیشم کرد، کە ئەوانە دوژمنی ئێمەن نابی بچی بە پێشوازیانەوە» وەکو خۆی ئەیوت لە سەر ئەمە مەلا مستەفا غەزەبی لی گرت و ئاگۆزکییەکانیان لەوەوە دەستی پی کرد بو.
زۆری نەخایاند ئاگۆزکی نێوان فاخیر و بارەگای بارزانی هەڵی دایەوە. کۆتاییەکەی بەوە هات هەموویان گیران و لە ئاشبەتال دا هەموویان کوشتن. فاخیر خالۆزای مەلا مستەفا بو.

*

سەددام لەو (تنازل) ە گەورەیەی بۆ مەلا مستەفای کرد بو بە تەما بو:
١. کارتی کوردی لە دەس شای ئێران و دوژمنەکانی دەربهێنی و، بە ئازادیی خۆی لە دژی ئێران و، دوژمنانی ناوەوە و دەرەوەی بە کاری بهێنی. لەو کاتەدا ئاگۆزکی ئێران و عیراق لە جاران توندوتیژتر ببو.
٢. ئەو بزوتنەوە چەکدارەی نزیکەی ١٠ ساڵ بو، شاخ و لادێکانی کوردستانی کرد بو بە مەڵبەندی خۆی و، ببو بە کێشەی سیاسی، ئابوری، سپایی گەورە، چەک دابنێ و، بگەڕێتەوە سەر ژیانی ئاسایی ناوشار.
سەددام زۆر زو تی گەیشت لە هەردو ئەماکەی دا بە هەڵە دا چوە. مەلا مستەفا هەر لە سەرەتاوە بۆ جێبەجێ کردنی هەندێ مەبەستی تایبەتی خۆی لە گەڵ بەعس پێک هات بو، نەک بۆ ڕێککەوتنی تەواو و ڕاستەقینە. مەلا مستەفا دەوڵەتێکی لە ناو دەوڵەت دا دروست کرد بو، ئامادە نەبو دەستی لی هەڵبگری لە بەر ئەوە:
١. مەلا مستەفا نەک هەر پەیوەندی لە گەڵ ئێران نەبڕی، بەڵکو بەهانای ئازاری وەکو دەسکەوتێکی گرنگ فرۆشتەوە بە ئێران، بۆ بەهێزکردنی پەیوەندییەکانی لە گەڵ ئێران، ئیسرائیل و ئەمریکا و، هەمو دوژمنەکانی بەعس.
٢. مەلا مستەفا نەک نیازی بڵاوە پی کردنی هێزەکانی و، گەڕانەوە بو ژیانی ئاسایی شاری نەبو، بەڵکو هێزەکانی بە ژمارە زۆرتر و بە چەک پۆشتەتر کرد. «دەزگای پاراستن» ی زیاتر بەهێز کرد.
سەددام بە ئاشکرا درێژەی بە سیاسەتی دۆستایەتی بارزانی دا، بەڵام بە نهێنی کەوتە چنینی پیلانی لە ناو بردنی. تاقمی مەلا کە بۆ ئامۆژی چو بون بو سەردانی، یەکێکیان ڕیکۆردەرێکی مەلغوم لە سکی قایم کرا بو، لە کاتی دانیشتنەکەدا بە ڕیمۆت کۆنترۆڵ تەقێنرایەوە. چەند کەسی کوژران بەڵام مەلا مستەفا بە ڕێکەوت بەر نەکەوت. مەلاکان، پێش ئەوەی لێکۆڵینەوەیان لە گەڵ بکرێ، هەموویان لە هەمان شوێن دا کوژرانەوە.

*

## دەرکردنی فەیلییەکان

بەعس، بێ ئەوەی گوێ بداتە ناڕەزایی سەرکردایەتی بارزانی، ١٨٥ هەزار کوردی فەیلی دەرکرد بۆ ئێران و، ماڵ و دارایی زەوت کردن بە بەهانەی ئەوەی ئەوانە ئێرانین. ڕۆژنامەی «التآخی» لە سەری نوسین، بەڵام پارتی هیچ هەنگاوێکی جیددی ئەنجا بۆ

ریگرتن لەم تاوانە و، ریگرتن لە دووبارە بوونەوەی.

*

پرکردنەوەی بۆشایی خەلیج

عیراق و ئێران لەسەر پرکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کشانەوەی هێزەکانی بەریتانی لە رۆژهەلاتی سوێس، بە تایبەتی لە خەلیج دا دروستی ئەکرد، لە ململانێ دا بوون. ئەمەریکا ئێرانی راسپارد بۆ ئەرکی پاراستنی ئاسایشی خەلیج بگریتە ئەستۆ. شا بە پەلە ئێرانی پڕ چەک ئەکرد و، پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ دەوڵەتانی عەرەبی و شیخ نشینەکانی خەلیج باش ئەکرد، هەوڵی ئەدا لە ریگەی زیاد کردنی ئەوارەی دەسکەوتی ئابووری و بازرگانی سۆڤیەتیشەوە لە ئێران دا، پشتیوانی یا هیچ نەبی بی لایەنی ئەویش بە دەس بهینێ. عیراقیش ئەیویست دەوری سەرەکی هەبی لە خەلیج دا، بە تایبەتی کە دەوڵەت و شیخ نشینەکانی خەلیج جگە لە ئێران هەموویان عەرەبن، عیراق ترسی لە خۆ چەکدار کردنی بە پەلە و قەبەی ئێران هەبو، بۆ ئەوەی تەرازووی خۆی لەگەڵ ئێرانی پشت ئەستوور بە ئەمەریکا راست بکاتەوە، رووی کردە یەکیتی سۆڤیەت.

*

لە ۹ ی نیسانی ۱۹۷۲ دا عیراق و یەکیتی سۆڤیەت «پەیمانی دوستایەتی و هاوکاری» یان بۆ ماوەی ۱۵ ساڵ ئیمزا کرد. کوسیگین بۆ ئیمزا کردنی هاتە بەغداد. تا ئەو کاتە یەکیتی سۆڤیەت پەیمانیکی لەو بابەتەی لە ناو ولاتانی عەرەبی دا تەنیا لەگەڵ میسر بۆ ماوەی ۱۵ ساڵ (۱۹۷۱)، وە لە دنیادا تەنیا لەگەڵ هیند بۆ ماوەی ۲۰ ساڵ (۱۹۷۱) ئیمزا کرد بو.

یەکیتی سۆڤیەت بەرژەوەندی ئابووری، بازرگانی، ستراتیجی گرنگی لە عیراق دا پەیدا کرد بو، دەستی لە پەترۆلی عیراق گیر کرد بو، کەلکی گەورەی لی وەر ئەگرت، هەروەها نزیکەی هەمو چەک و تفاقی جەنگی عیراق لەو ئەکردرا، ژمارەیەکی زۆر پرۆژەی ئابووری لە عیراق دا دەس کەوت بو، پاپۆرە جەنگیەکانی سۆڤیەتی دەرگای خەلیجیان بۆ کرابوەوە، ئەیانتوانی سەردانی مینای ام القصر بکەن. لەبەر ئەوە پشیوی لە ناو عیراق دا بە قازانجی ئەبو. گرژی نیوانی کورد – بەعس بەرژەوەندییەکانی ئەوانیشی ئەخستە مەترسیەوە. حشع و بەعس بەرەو پیکهاتن ئەچون. بەعس ریگەی کاری قانونی ئەدان و بەشداری ئەکردن لە وەزارەت و لەو «جەبهە» یەدا کە خەریکی پیکهینانی بو. بەعس ئەیویست پ د ک یش بەشداری جەبهە بی. باری سەرەکی هەروەها لەسەر مافەکانی گەلی کوردو جووری بەریوەبردنی ولات و جووری پیکهیناتی جەبهە جیاواز بو، لەبەر ئەوە دوور بو پ د ک بەشداری پیکهیناتی جەبهە بی.

*

چەند جاری لە نیوان رۆژنامەی «التاخی» و رۆژنامەکانی بەعس دا: «الثورە» و «الجمهوریە» مشتومری توندوتیژ دروست ئەبو. پارتی و بەعس لە دو نامەی ئالوگۆر کراودا هەندی لە گازاندەکانی خۆیان لە یەکتری و هەندی لە ناکۆکیەکانیان روون کردۆتەوە، ئەو دەم لە کتیبیکی تایبەتی دا بلاو کرایەوە.

بەر لە ئیمزا کردنی پەیمانی ۱۹۷۲ نیوانی بەعس – بارزانی گرژ بوبو. هەروەها گومانیان لە یەکتری پەیدا کردبو. یەکیتی سۆڤیەت بۆ ئەوەی بارزانی قانع بکا: نیوانی

خۆی لەگەڵ عێراق باش بکاتەوە، ناکۆکییەکانی چارەسەر بکا. بەشداری جەبهەی خواستراو بێ. لەپێش ئیمزا کردنی پەیمانی دۆستایەتی و هاوکاری دا نوێنەرایەتییەکی بەسەرۆکایەتی نێچکن. لێپرسراوی کاروباری رۆژهەلاتی ناوەراست لە وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەتی، لەگەڵ هەندی کاربەدەستی سەفارەت لە بەغدا نارده لای بارزانی.

نوێنەرایەتی سۆڤیەتی بۆ بارزانیان روون کردەوە کە ئەوان ئالێن بەعس باشە بەلام رێگەی لە یەک گەیشتن لە گەڵ بەعس باشترە لە رێگەی هاوکاری لەگەڵ تەهران. هەروەها پێ یان راگەیاندن کە ئەوان پەیوەندی بە ئاسایی دائەنێن چونکە سنوری هاوبەشیان لەگەڵ کوردستانی عێراق هەیە، بەلام زۆر رۆیشتن لە پەیوەندی دا باش نییە. هەروەها پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل و ئەمریکاش بە باش نازانن... نوێنەرایەتی سۆڤیەتی ئەیویست وا لە بارزانی بکا، کێشەکانی خۆی لەگەڵ عێراق بە ئاخافتن چارەسەر بکا و، بەشداری جەبهە بێ شان بە شانی حشع.

نوێنەرایەتی سۆڤیەتی گوشاری بۆ کورد ئەهێنا لەگەڵ بەعس رێک بکەوێ، بەلام گوشاری بۆ بەعس نەئەبرد خواستەکانی کورد بسەلمێنێ، ئەمەش ئەوەی ئەگەیاند کە ئەبێ کورد بە مەرجەکانی بەعس رازی بێ، بێ ئەوەی بەعس مەرجەکانی کورد بەجێ بهێنێ. بارزانی خۆی بە پشت ئەستور ئەزانی بە بەلێنەکانی شای ئێران، لەبەر ئەوە گوێ ی نەدایە قسەکانی نێچکن.

لە کاتی ئیمزا کردنی پەیمانەکەدا لە بەغداد کاربەدەستانی سەفارەتی سۆڤیەتی کە نوێنەرانی پارتیان دی بوو، هەروەها کوسیجین و گریشکۆ کە وەزیرە کوردەکانیان دی بوو، داوایان لێ کردبوون: پارتی بێ بەشداری جەبهە بێ و پشتیوانی خۆی لە پەیمانەکە دەربڕی.

*

دوا بە دوای ئیمزا کردنی پەیمانەکەش سەر لە نوێ هەندی لە فەرمانبەرانی سەفارەتی سۆڤیەتی، لەگەڵ عەزیز شەریف سەردانی بارزانیان کرد لە بارەگاکەی خۆی و داوایان لێکرد بروسکەی پشتیوانی بۆ کاربەدەستانی عێراقی لێ بدا. بەلام بارزانی نەک ئامادە نەبو پیرۆزبایییان لێ بکا، بەلکو نارەزایی قولی خۆی دەربڕی، چونکە لای وابو سەرئەنجام ئەو پەیمانە دژی گەلی کورد بەکار ئەهێنێ، لە سۆڤیەت چەکی پێ وەرئەگری و کوردی پێ لەناو ئەبات و بوشی دوبارە کردنەوە کە پارتی لە جەبهەدا بەشدار نابێ. بارزانی بەلێنی لە شا وەرگرت بو، کە پشتیوانی تەواوی بکار هەولی بەدەستهێنانی پشتیوانی ئەمریکاش بدا. بارزانیش ئیمزاکردنی پەیمانەکەی کردە بەهانە بو دوبارە کردنەوەی داوای یارمەتی لە ئەمریکا بەهێز کردنی شوێنی خۆی لە لای ئێران و ئەمریکا.

وەکو راپۆرتی پایک ئەیگێرێتەوە: نیکسۆن و کیسنگەر لەو سەردانەدا کە لە مایسی ۱۹۷۲ دا بۆ تارانیان کرد بەلێنیان دا بە شا، لەگەرانەوەدا بە نیجابی لە مەسەلەی یارمەتیدانی بارزانی بکۆلنەوە. لە راستی پێش دا کە گەرانەوە بو ئەمریکا لە ئاستێکی بەرزدا بە نهێنی لە ١٦ ی حوزەیرانی ٧٢ بریاری یارمەتیدانی بارزانیان دا بە تایبەتی دوای ئەوەی عێراق لە ١ ی حوزەیران دا بریاری «تأمیم» ی نەوتی دا بو. یارمەتییەکەش بریتی بو لە تەرخانکردنی ١٦ ملیون دولار بو کرینی چەک بو بارزانی. جون کونالی یان نارد بو ئەوەی ئەم بریارە بە شا رابگەیێنێ. دیارە شایش بە بارزانی راگەیاندوە. لەبەر ئەوە

بارزانی هەستی بە پشتێکی ئەستوور ئەکرد لە زۆرانبازی دا لەگەڵ بەعس، لە هەڵوێستەکانی دا نەرمی نەئەنواند.

شا هیچ جۆرە دەسکەوتێکی لە ڕێکەوتنی کورد - بەعس دا نەبوو، بەڵکو پێویستی بە کورد بوو لە ململانێ دا لەگەڵ عێراق بۆ ئەوەی خواستە ئەرزی و سیاسیەکانی خۆی بەسەردا بسەپێنێ، لەبەر ئەوە هەوڵی ئەدا هانی بارزانی و بزووتنەوەی کورد بدا بەگژ بەعس دا بچن و، بۆ ئەوەی زانی بەرەنگاری یان بخاتە بەر دریغی نەئەکرد لە گەلێ زۆری یارمەتیدانی «چەک» و «پارە» کە بە لای بارزانیەوە لە ڕیزی پێشەوەی پێویستیەکانی دا ئەهاتن.

پەیوەندی کورد و بەعس تا ئەهات تێوتر ئەبوو، پەیوەندی پارتی و حشع یش تا ئەهات خراپتر ئەبوو تا گەیشتە ڕادەی پێکادانی چەکدار و، پێلبازیی گراوەی نێوان ڕۆژنامەکانی «التاخی» و «طریق الشعب».

ساڵی ١٩٧٣ نوێنەرایەتیەکی سۆڤیەتی بە سەرۆکایەتی ڕۆمان سیف سەردانێکی تایبەتی مەلا مستەفایان کرد لە بارەگاکەی خۆی، سکرتێری حشع عەزیز محەممەد و وەزیری دەوڵەت عەزیز شەریف یشی لەگەڵ چوو بوون. ڕۆمان سیف لەم سەردانەدا بە ڕاشکاوی ئاگاداری بارزانی کرد، کە ئەگەر لەگەڵ بەعس شەڕ بکاتەوە، یەکێتی سۆڤیەتی ناتوانێ پشتیوانی لەو بکا چونکە لە گەڵ عێراق «پەیمانی هاوکاری و دۆستایەتی» ان هەیە، بەڵکو ئەبێ پشتیوانی لە عێراق بکا، لەبەر ئەوە چاکتر وایە لەگەڵ عێراق شەڕ نەکاتەوە، بەشداری جەبهە بێ، پەیوەندی خۆی لەگەڵ حشع چاک بکا، ناکۆکیەکانی خۆی لەگەڵ بەعس بە گفتوگۆی هێمنانە چارەسەر بکا. بارزانی ئەگەر جارەکانی پێشوو بە تەنیا بە گفتی شای ئێران پشت ئەستوور بوو، ئەمجارە بە بەڵێنی ئەمریکاش زیاتر مەغروور بوبوو، لەبەر ئەوە قسەکانی ڕۆمان سیف ی بە هەند نەگرت.

*

مەلا مستەفا لای نوێنەری دەوڵەتانی جیاواز قسەی جیاوازی ئەکرد. بە ئەمریکای ئەوت: «ئەگەر یارمەتیم بدەن کوردستان ئەکەم بە ویلایەتی پەنجاو دووی ئەمریکا» و، بە سۆڤیەتی ئەوت: «ئەگەر یارمەتیم بدەن کوردستان ئەکەم بە قەڵای کۆمۆنیزم». بە ئێرانی ئەوت: «ئێمە هەموومان لە ڕەگەزی ئارین» و، بە عێراقی ئەوت: «من عەبباسیم». بە عەرەبی ئەوت: «من موسوڵمانم ئامادەم پێشمەرگە بنێرم بۆ شەڕی جو» و، بە جولەکەیشی ئەوت: «کورد و جو نەتەوەی حەزرەتی ئیبراهیمن ئەبێ پێکەوە هاوکاری بکەن».

گوایە بەم قسانە تەفرەیان ئەدا. سەرئەنجام هیچ لایەکیشیانی پێ تەفرە نەدرا.

بۆ بەهێزکردنی پەیوەندیەکانی خۆی لە گەڵ ئێران و ئیسرائیل و ئەمریکا، خۆی سەفەری کرد بۆ تاران بۆ بینینی شا و، بۆ تەلئەبیب بۆ بینینی کاربەدەستانی ئیسرائیلی. ئیدریس و د. مەحموودیشی نارد بۆ واشنتۆن. نوێنەرەکانی بارزانی لە گەڵ ڕیشارد هیلمز، سەرۆکی سیا دانیشتن. لەم دانیشتنەدا هیلمز بە ڕاشکاوی پێ ی وت بوون کە ئەو لە بەر خاتری شای ئێران لە گەڵیان کۆ ئەبێتەوە، ئەگینا ئەمریکا نایەوێ پەیوەندی ڕاستەوخۆ و ئاشکرایان لە گەڵ دابمەزرێنێ.

مەلیک حسین کە ئەچێ بۆ ئێران، مەلا مستەفاش ئەچێ بۆ ئەوەی بیبینێ. داوا لە شا ئەکا کە دیدارێکی لە گەڵ مەلیک حسین بۆ ڕێک بخا. شا ئەڵێ: «چ ئیشێکت بە شا

حەسەن هەیە سوال لە سوالکەر ناکری!»
مەبەستی ئەوە بوو حەسەن خۆی هاتوە داوای یارمەتی لە تەهران ئەکا، تۆ ئیچی داوای یارمەتی لێ ئەکەی، هیچی نە بتداتێ. مەلا مستەفا ویستبووی حەسەن بیبنێ بۆ ئەوەی داوای لێ بکا لای ئەمەریکا قسەی بۆ بکا یارمەتی بدەن.

*

یەکێتی سۆڤیەت لە ململانێ ی کوردی - عیراقی دا ئیتر قورسایی خستە پاڵ حکومەتی عیراق و، لە ئازاری ۱۹۷٤ دا کاتێک جەنگی کوردستان هەڵگیرسایەوە، پشتیوانی سیاسی و جەنگی ئاشکرای لە حکومەتی عیراق کرد دژی بزوتنەوەی کورد. هەوڵی دا ناکۆکی عیراقی - ئێرانی بە ئاشتی چارەسەر بکرێ، بەتایبەتی سۆڤیەت لەگەڵ هەردوو دەوڵەت پەیوەندی باشی هەبوو، قسەی لە لای هەردوو لا ئەرۆیشت، دیارە ڕێککەوتنی عیراق - ئێران لەو کاتەدا کە بزوتنەوەی کورد گرەوێکی چارەنوسی لەسەر ناکۆکییەکەیان کرد بوو، جەزرەبەیەکی کوشندەی لێ ئەدا.
لەگەرمەی شەڕەکانی ۱۹۷٤ ی نێوان جەیشی عیراقی و شۆڕشی کورد لەو سەردانەدا کە شای ئێران لە مانگی تشرینی دووەم دا بۆ مۆسکۆی کرد، یەکێک لە بابەتەکانی گفتوگۆی سۆڤیەتی - ئێرانی دا مەسەلەی ناکۆکی عیراقی - ئێرانی بوو، کە لایەنی سۆڤیەتی هێنایە پێشەوە. پودگورنی داوای لە شا کرد بە ئاشتی کێشەکانی لە گەڵ عیراق چارەسەر بکا.

*

لە گەرمەی جەنگی کوردستان دا، هەر کە پەیرەوی بێ چەن و چونی لە سیاسەتی سۆڤیەتی ئەکرد هەم بە چەک و هەم بە ڕێگەی سیاسی و پروپاگەندە بە توندی دژی بزوتنەوەی کورد ڕاوەستا. یەکێتی سۆڤیەت بێجگە لەوەی سەرچاوەی چەکی درێژەپێدانی جەنگی بۆ حکومەتی عیراق دابین کرد، لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی خۆیەوە دژی بزوتنەوەی کورد دوا و پشتیوانی لە حکومەتی عیراق کرد. بەدوای ئەویش دا هەمو دەوڵەتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات و پارتیە کۆمۆنیستەکانی دنیا دژی ڕاوەستان. کە ڕێکەوتنی ٦ ئازاری جەزائیریش لە نێوان سەددام - شادا بوو، ئەگەرچی ئەم ڕێکەوتنە لە ژێر ناوی لابەلاکردنی کێشەکانی سنوردا بوو، بەڵام لە ڕاستی دا سەوداییەک بوو بۆ لەناوبردنی بزوتنەوەی کوردو مەینەتیەکی نەتەوەیی گەورەی بەسەرهێنا. لەگەڵ ئەوەش دا. یەکێتی سۆڤیەت بە خۆشیەوە وەری گرت و، هەر بەگەرمی پێشوازی لێ کردو لە ڕۆژنامەی «طریق الشعب» دا چەن وتاری بۆ لێکدانەوەی لایەنە باشەکانی ئەم ڕێکەوتنە تەرخان کرد.

*

فەسادی مالی و ئیداری لە ناو دەزگاکانی حیزب و پێشمەرگە دا پەرەی سەند. واسیطە و خزمایەتی، نەک توانا و لێوەشاوەیی، گرنگترین پێوانەی دامەزراندن بوون لە دائیرەکان دا. بازرگانی قاچاخ لە گەڵ ئێران بو بە سەرچاوەیەکی گرنگی دەوڵەمەن بونی کاربەدەستەکانی پێشمەرگە. «قونتەرات» ەکانی وەزارەتی کاروباری سەرو و، قونتەراتەکانی تر کاربەدەستەکانی پارتی و پێشمەرگە ئەیان گرت، پارەکانیان وەرئەگرت پرۆژەکان، کە بۆ ئاوا کردنەوەی کوردستان بو، یا هەر نەئەکران، یا ئەگەر بکرانایە زۆر خراپ و پڕ کەموکوڕی بون. زۆر جار خەڵک ئەم گلەییانەیان ئەگەیاندە مەلا مستەفا. ئەویش ئەیوت:

«ئەوانە مانەوە بوون یا کەسی ئیستیفادە بکەن!»

*

مانگی ئازاری ٧٤ گفتوگۆی تهران بەغدا - بارزانی چوو کولانێکی داخراوەوە. بەرپرسیارێتی هەردوولا سەبارەت بە ناوەڕۆک و سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی جیاواز بوو. هەر لایەکیان پرۆژەیەکی ئامادە کرد بوو. هیچ لایەکیان بە پرۆژەی لایەکەی تر رازی نەبوو. ئیدریس و دارا تۆفیق چوون بۆ بەغداد بۆ ئەوەی قسە لە گەڵ سەددام بکەن و، بڵاوکردنەوەی پرۆژەکە دوا بخا. سەددام سوور بوو لە سەر ئەوەی لە کاتی دیاریکراودا، وەکو لە بەیانی ئازاری ١٩٧٠ دا نووسرا بوو، پرۆژەکە بڵاو بکرێتەوە. هەڕەشەی لێ کردن کە ئەگەر شەڕ بکەنەوە بە شەڕ دەرئەنجامیان نەبێت لە گەڵ شا ئەسازێ.

مانگی ئازار دەیان هەزار کەس چوونە ریزی شۆڕشەکەوە. دەزگای پاراستن هانی خەڵکیان ئەدا شارەکان بە جێ بهێڵن. بەعس ڕێگای لێ نەئەگرتن. لای وایە لێشاوی خەڵک ئەبێ بە بارێکی قورس بە سەر جوڵانەوەکەوە. ئەویش هەندێکی دەرکرد.

شەڕ هەڵگیرسایەوە. لێرەدا بە ژمارە لە سەر داوودەزگاکانی شۆڕش و تواناکانی، کە لە کاتی خۆی دا بە یارمەتی دەیان کەسی ئاگادار کۆکراوەتەوە و، لە پێنجەمین ژمارەی کۆمەڵەدا بڵاو کراوەتەوە، ئەنووسمەوە:

### ١. داوودەزگاکانی شۆڕش

- بارەگای بارزانی

پێک هات بوو لە مەلا مستەفا خۆی و، ئیدریس و مەسعود. سەرکردایەتی و سەرپەرشتی هەموو کاروبارەکانی شۆڕشی ئەکرد؛ کاروباری پێشمەرگەیی، سیاسی، راگەیاندن، پارە و پوڵ، پەیوەندییەکانی دەرەوە، کۆکردنەوەی زانیاری و دەنگوباس..

- پدک

مەلا مستەفا سەرۆک و حەبیب محەممەد کەریم سکرتێر و، سەرکردایەتی پارتی پێکهات بوو لە ٢١ ئەندامی کومیتەی ناوەندی. لەوانە ئەوتیان مەکتەبی سیاسی بوون: د. مەحموود، نووری شاوەیس، عەلی عەبدوڵلا، سامی سنجاری، صالح یوسفی و، ئیدریس و مەسعود.

لیژنەکانی لقی ١ ی موصل، لقی ٢ ی هەولێر، لقی ٣ ی کەرکوک، لقی ٤ ی سلێمانی، لقی ٥ ی بەغدا، لقی ٦ ی ئەورووپا، لقی ٧ ی ڕێکخستنی ناو پێشمەرگە.

هەر قەزایەک ١ لیژنەی ناوچە و، هەر هێزێک ١ لیژنەی ناوچە و، هەر ناحیەیەک ١ ڕێکخراوی تێ دا بوو.

ڕێکخستنی لق و ناوچە و ڕێکخراو بە پێ ی دابەشبوونی ئیداری محافظەکانی عیراق ڕێکخرا بوو.

٧ کارگێڕی لیژنەی لق و، ٤٠ کارگێڕی لیژنەی ناوچە و، سەدان کارگێڕی لیژنەی ڕێکخراو؛ کە بە دەفتەر ٤٥ هەزار ئەندامی ڕێکخراو و ٧٠ هەزار پاڵێوراو و لایەنگری ڕێکخراوی هەبوو.

- سوپای شۆڕشگێڕی کوردستان (س ش ک)

مەکتەبی عەسکەری (٧ ئەندام) راستەوخۆ بەسترا بوو بە بارەگای بارزانییەوە.

س ش ک پێک هات بوو لە ١٨ هێز. لەوانە: هێزەکانی بالەک (هەندرین و

زوزک)، شیخان، زاخۆ، ئاکری، سنجین، دەشتی هەولێر، کەرکوک، خەبات، زمناکۆ، کاوە، پیتراتە، حمرین، لەزمر، هەلگورد، رزگاری.

هەر هێزێک پیک، هات بو لە چەند بەتالیونێک و، هەر بەتالیونێک لە ۳ - ٤ لق، هەر لقێک لە ۳ - ٤ پەل و، هەر پەلێک لە ۳ - ٤ دەستە و، هەر دەستەیەک لە ۹ - ۱۲ پێشمەرگە.

جگە لەو ٤ بەتالیونەی بە ناوی زوزک کە لە سەر شێوەی جەیشی عێراقی لە سەرباز و ئەفسەر پێک هێنرا بو و، جگە لەو چەند قوەتەی کە بە ناوی تەلەعفەر و سنجار و کۆسرەت پێکهێنرا بو وە لە لق زۆرتر و لە بەتالیون کەمتر بو. لە سەرانسەری کوردستانی عیراق دا ٦٥ بەتالیون هەبو.

سەرەرای پێشمەرگەی داتیمی کە وەکو جەیشێکی نیزامی ڕێکخرا بو، بو پشتیوانی لەم سوپایە «هیزی یەرگری میللی» دامەزرێنرا بو.

ژمارەیەکی زۆری فەرماندەی هیزەکان و بەتالیونەکان بەرزانی بون. ژمارەیەکی زۆر لەو فەرماندانە نەخوێندەوار یا عەریفی شورطە و جەیش بون.

- دەزگای پاراستن

پاراستن دەزگایەکی جاسوسی بو. کادرەکانی لە لایەن ساواک، موساد، سیاوە مەشق دا درا بون. ئەرکەکانی ئەمیش وەکو ئەرکەکانی هەر دەزگایەکی موخابەرات بو. بەشی جیاجیای هەبو بو کۆکردنەوەی دەنگوباس و هەوالی جۆراوجۆر و، کوشتن و تیکدان. لێپرسراوی یەکەمی ئەم دەزگایە مەسعود بو.

پاراستن جگە لە خەت و تۆرە نهێنیەکانی، نوێنەریکی ئاشکرای بە ڕەسمی لە پارەگای هەمو هیز، بەتالیون، لق، لیژنەی لق، لیژنەی ناوچە، ئەمانەتێک دا هەبو، کە ئەبو چاودێری ڕوداوەکانی دەورووپشتی خۆیان و جموجولی خەلک و پێشمەرگە و لێپرسراوەکان بکەن و، ڕاپۆرتیان لە سەر بنوسن.

پاراستن دەزگایەکی نهێنی بو ژمارەی ڕاستەقینەی نازانری.

- ئەمانەتەکان

بەرامبەر بەو مەجلیسە تەنفیزیەی بەعس دروستی کرد بو سەرکردایەتی شورش چەند ئەمانەتێکی دانا بو، وەکو: ئەمانەتی مالیە، کشتوکاڵ، ناوخۆ، اشغاڵ و اسکان، تەندروستی، عدلیە، اعلام، تربیە.

هەر یەکی لەم ئەمانەتانە سەدان فەرمانبەری هەبو.

## ۲. تواناکانی شۆرش

- توانای مرۆیی

. ٦ هەزار پێشمەرگەی داتیمی

٤٣ هەزار هێزی یەگری میللی

. ٤٧ ئەفسەری جەیش و شورطە بە پلەی جیاواز

۹۸ پزیشک

۷ پزیشکی دان

۷ دەرمانگەر

. ۲۲ مهندس

٦٠ . مامۆستای زانکۆ
٢١٢ . مامۆستای سەرەتایی و ساناوی
٧٠٠ . خوێندکاری زانکۆ و مەعهەد
٤٥٠٠ . قوتابی ناوەندی و دواناوەندی
هەزاران عەریف و برینپێچ و کارمەندی حکومەتی
- دارایی
سەرچاوەکانی دارایی شۆرشەکە بریتی بو لە:
١. پارمەتی ئیرانی و ئەمریکی و ئیسرائیلی و هەندی دەولەتی تر.
٢. ئابوونەی ئەندامان. ئەو پارەیەی لە سەرانسەری کوردستان دا بە ناوی مانگانەوە لە هەمو کەس وەرئەگیرا.
٣. داهاتی فرۆشگاکانی شۆرش.
چەک و تفاقی شەر و داوودەرمان لە دەرەوە ئەهات و بە پارە نەئەکردرا.
بودجەی شۆرش لە ١٩٧٠ - ١٩٧٥ نزیکەی ٤٨ ملیون دیناری عیراقی بو. لە کاتی ئاشبەتال دا ٢٥ ملیون دینار لە خەزینەی بارەگای بارزانی دا مابو.
- راگەیاندن
دەزگایەکی ٨ کیلوواتی رادیو لە مەمی خەلان بو. دو دەزگای پەخشکردنی لە خانەقین و سەرسەنگ دانرا بو. بەرنامەکانی بە کوردی، عەرەبی، تورکمانی، ئینگلیزی و فەرەنسی و چارویار بە هەندی زمانی تریش بلاو ئەکردەوە.
بارەگای هەمو لق و بەتالیون و هێزەکانی پێشمەرگە دەزگایەکی بێتەلی هەبو بۆ پەیوەندی راستەوخۆ لە گەل دەزگاکانی سەرو خۆی.
دەزگای چاپی ئیتەر تایپ و هایدلبیرگ و، دەزگای چنینی تیپ و، سەدان تایپ و رۆنیو. سەدان نوسەر و رۆژنامەوان لە دەزگای راگەیاندن دا کاریان ئەکرد و، دەیان رۆژنامە و گۆڤار و چاپکراو دەرئەچو.
- چەک
جگە لەو تفەنگانەی بە دەس پێشمەرگە و بەرگری میللیەوە بو دەیان هەزار برنەو و کلاشینکۆف و ١٥ ملیون فیشەک و ٥ هەزار گوللە تۆپی ئیحتیات لە دەبو دا بو.
بە سەدان هاوەنی گەری ٢، ٨٢ ملم، ١٢٠ ملم و، تۆپی ٢٥ رەتل، ١٢٢ ملم، ١٣٢ ملم، ١٧٥ ملم.
بە سەدان ١٤٥ ملم، ٣٠ ملم، ٣٣ ملم، ٥٧ ملم ی دژی فرۆکە.
بە سەدان رەشاشی دۆشکا، برنەو، گرینۆف و دیکتاریوف.
بە سەدان ساروخی ستریلای دژی فرۆکە و ساگەری دژی تانک.
بە هەزاران ئاربی جی ٢ و ٧ و لوغمی جۆراوجۆر.
*
لە دوانزە سانگی شەردا (ئازاری ١٩٧٤ - ئازاری ١٩٧٥) مەلا مستەفا ئەم داوودەزگا و هێز و توانایەی لە بەر دەس دا بو. ریککەوتنی شا - صەددام لە جەزائیر کۆتایی بە شەرەکە هێنا. مەلا مستەفا ئەیتوانی یەکی لەم ریگایانە هەلبژیری:
- درێژە بە شۆرش بدا.

– واز لە سەرکردایەتی شۆڕش بهێنی بۆ یەکێ لە کوڕەکانی یا بۆ کەسێکی تر لە سەرکردایەتی پارتی. خۆی بچێتە ئەورووپا یا ئەمەریکا دابنیشێ.

جێگەی داخە مەلا مستەفا هیچ کام لەم دوو ڕێگایەی نەگرت، ڕێگەیەکی تری هەڵبژارد کە خەڵک ناویان لێ نا ئاشبەتاڵ. ڕێگەی بە هیچ کەسێکیش نەدا درێژە بە شۆڕش بدا و، هەڕەشەی لێدانی لێ کردن. ئاشبەتاڵ مەینەتییەکی نەتەوەیی بە سەر کورد هێنا. سەرەتا نزیکەی ۱۷۰ هەزار کەس چوونە ئێران. مەلا مستەفا حەزی نەکرد هەموو کوردی عێراق لە گەڵی بچن بۆ ئێران، چونکە وای ئەزانی ئێران و ئەمەریکا ناچار ئەبن شتێکی وەکوو بانگلادێش لە کوردستان دووبارە بکەنەوە. ئەوە جاری چوارەم بوو مەلا مستەفا کوردستانی عێراق بە جێ بهێڵێ.

ئێران بنەماڵەی بارزانی و هەندێ لە هاوکارە نزیکەکانی مەلا مستەفای لە عەزیمییەی کەرەج لە نزیک تاران نیشتەجێ کرد. ئەوانی تری بە ناو ئێران دا بڵاوکردەوە. هەندێکیشیان چوونە وڵاتانی ئەورووپی و ئەمەریکی بوونە پەنابەری سیاسی. بەشێکیشیان گەڕانەوە عێراق و بە ناوچەکانی جنووب دا بڵاو کرانەوە.

مەلا مستەفا لای ئەمیری طاهیری سەرنووسەری کەیهانی تارانی و، لای محەممەد حەسەنەین هەیکەڵ وتی: ئیتر دەوری ئەو لە ناو جوولانەوەی کوردا تەواو بوە و بە تەمای سەرکردایەتی جوولانەوەی کورد نەماوە. بەڵام ئەم قسەیەی نەبردە سەر. گوایە ئەمەی بۆ تەفرەدانی شا بوو. دوای دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، ئەویش کەوتەوە جوولان. بە موافەقەتی ساواک ئیدریس و مەسعود قیادە موەققەتەیان پێک هێنایەوە. مەلا مستەفا بە سەرۆکی مایەوە. سامی چوە ئەورووپا کەوتە گەڕان بە وڵاتانی ئەورووپی دا بۆ دامەزراندنەوەی ڕێکخراوەکانی پارتی و، ئیدریس لە ئێران کەوتەوە چالاکی و ناردنی کادرەکانیان بۆ تورکیا. مەلا مستەفا و مەسعودیش چوونە ئەمەریکا. مەلا مستەفا نەخۆشی سەرەتانی گرت بوو لە واشنتۆن جێگیر بوو.

ق م لە پێش دا وایان ئیدیعا ئەکرد کە مەلا مستەفا ئیتر دەوری لە سەرۆکایەتی پارتی دا نەماوە، سەرکردایەتی بە کۆمەڵ حیزبەکە بەڕێوە ئەبات و، ئەو ئیتر ڕەمزێکی نەتەوەیی کورد ئەبێ. بەڵام زۆری نەخایاند بە ناوی سەرۆکی پارتیەوە لە ئەمەریکا دەستی کردەوە بە چالاکی و، بە توندی کەوتە دوژمنایەتی یەکێتی، بە تایبەتی مامجەلال. ڕاپۆرتی پایک و نامەکانی مەلا مستەفا بۆ سەرۆک کارتەر و سیناتۆرەکان، نهێنی زۆر گرنگیان لە پەیوەندی ژێر بە ژێری کورد و ئەمەریکادا ئاشکرا کرد، کە تا ئەوسا کەس نەیئەزانی.

مەلا مستەفا وای ئەزانی یەکێتی جێگە بەو و بە بنەماڵەکەی لێژ ئەکا و بۆ دوژمنایەتی ئەو دامەزراوە. لە بەر ئەوە تا خۆی زیندوو بوو نەیهێشت هیچ جۆرە ڕێککەوتنێکی سیاسی یا مەیدانی لە گەڵ یەکێتی سەر بگری. ئەو ڕێککەوتنە مەیدانییەی لە شام لە نێوان مامجەلال و مەسعودا بە شایەتی سورییەکان ئیمزا کرا بوو هەڵوەشاندەوە و، لە ڕۆژانی کارەساتی هەکاری دا فەرمانی دا بە سەرانی قیادە موەققەتە، عەلی عەسکەری و خالید سەعید و شێخ حسێن، بە گەورەترین چەک بکوژن. جەنگی لە ناوبردنی یەکێتی بە میرات بۆ کوڕەکانی بە جێ هێشت.

•

ئێستا کە بە رابوردودا ئەچینەوە پێم وایە، ئەو ئەوسا ئیمە: سەرکردایەتی یەکێتی، هەڵوێستێکی ترمان هەبوایە. سەرەرای هەموو دوژمنایەتییەکی لە گەڵ یەکێتی و، سەرەرای هەموو کارە خراپەکانی، مەلا مستەفا بە گەورەترین سەرکردەی کورد دائەنرا. ئەو ئیمەش لەو رۆژەدا لە باتی ئەوەی هێرشی بکەینە سەر، پەیامی پرسە و سەرەخۆشی مان بۆ بنەماڵەی بارزانی و ئەندام و لایەنگرەکانی پارتی بناردایە و، ئەگەرچی بە دەنگمانەوە نەئەهاتن، بەلام ئیمە ئەوەمان بکردایە بە بۆنەیەک داوایان لی بکەین لاپەرەیەکی تازە بۆ پەیوەندی یەکێتی و پارتی بکەنەوە و، بانگیان بکەین بۆ «ئاشتبوونەوەی نەتەوەیی». بەلام ئیمە ئەمەمان نەکرد چونکە هێشتا لە ژێر تەئسیری رووداوەکانی هەکاری دا کاس و تاسا بووین، بیرمان لە هیچ نەئەکردەوە «تۆڵە» نەبێ. لە ناو ئیمەدا هەبوون ئەم مردنەیان لەو کاتەدا بە «انتقامی الهی» دائەنا.

*

# نیوەی دوەمی ١٩٧٩

## خۆدزینەوە

کەشی کۆمەڵایەتی پەیوەندییەکانی ناو خێزانمان بە دڵ نەبو. ململانێ لەگەڵ حسک، پارەکانی دوێنی مان و نەیارەکانی تازەمان. سەرەرای ئەوەش، ململانێ ی ناو ریزەکانی کۆمەڵە و، لە خۆبایی بونی هەندێ لە سەرکردەکانی، تا ئەهات توندتر ئەبو. بە تەواوی وەڕس ببوم. هەستم ئەکرد خەریکە ئەپەیم، بە تایبەتی ٣ ساڵ زیاتر بو بە بێ ڕیحان و پشودان بە شاخەوە بوم و، هەمو کات و ژیانم بۆ مەسەلەکە تەرخان کرد بو. ویستم ماوەیەک لەو کەشە ناسازە سیاسییە دور بکەومەوە. بریارم دا سەفەرێکی درێژی دەرەوە بکەم. ئیزنم لە مامجەلال و هاوڕێکانم خواست.

## تاران

لەگەڵ ئازاد حەمە غەریب پەری کەوتین بەرەو تاران. ناو ئێران هێشتا شلەژا بو، ململانێ ی دەسەڵات لە نێوان ناوەندەکانی هێز دا لە نێوان باڵی مەزهەبی و باڵی مەدەنیی و، لە ناو دامەزراوی دینیی دا هێشتا بە لادا نەکەوتو بو. سەدان ڕێکخراوی سیاسی گەورە و بچوکی جۆراوجۆر دامەزرا بو، بە سەدان ڕۆژنامە و حەفتەنامە دەر ئەچو. ئەو ڕۆژەی ئێمە گەیشتینە تاران سەرەتای مانگی ئاپار بو، تازە «مطهەری» کوژرا بو. مطهەری یەکێ لە نزیکەکانی ئیمام خومەینی و، بیرکەرەوە و نوسەرێکی بە توانای پەیڕەوی شیعە بو. تاران بۆنی خوێنی لێ ئەهات، سەدان هەزار ئایینپەرستی تەنگەتیلکە ڕژا بونە سەر جادەکان، هوتافیان دژی ئەمریکا، ئیسرائیل، شورەوی، کۆمۆنیزم.. ئەکێشا.

هێشتا یەکێتی لە تاران «نوێنەر» و «دەفتەر» ی نەبو. مامجەلال هەندێ نامەی نوسی بو بۆ فەلەستینییەکان و سورییەکان. دوای سەرکەوتنی شۆرشی ئێران، سەفارەتی ئیسرائیل لە تاران کرا بو بە سەفارەتی ڕێکخراوی ڕزگاری فەلەستین. هانی الحسن نوێنەری فەلەستین بو. من سەری سەفارەتی سوری و سەفارەتی فەلەستینم دا. هەلومەرجی کوردستان و عێراقم بۆ باس کردن و، هەڵوێستی یەکێتی م بۆ ڕون کردنەوە لە ڕوداوەکانی ئێران. ناسیاوەکانی «سازمان انقلابی» م بینی، پشتیوانیەکی بێ ئەندازەیان لە ڕژێمی تازە، بە تایبەتی لە ڕێبازی خومەینی، ئەکرد، بەڵام هێزێکی بچوک و نەناسراو و بێ دەسەڵات بون.

*

## کوچەی عەرەب

کوردە فەیلییەکانی عێراق لە بنچینەدا لە پشتکۆ وە هاتون. خانەقین و مەندەلی و بەدرە و جەسان کەوتونەتە دامێنی چیاکانی پشتکۆ و، لە کۆنەوە ئەم ناوچانە لە ڕوی جوگرافیای بەشەری و ئابوریەوە بە یەکەوە بەستراون، بەڵام ڕێککەوتنی زەهاو ناوچەکەی دابەش کردوە و، کردویەتی بە سنوری عوسمانی و ئێرانی.

لەو کاتەوە کە بەغداد ئاوەدان کراوەتەوە و، بوەتە پایتەخت، دانیشتوانی لورستان،

بە تایبەتی کوردە فەیلییەکان، بۆ زیارەتی پیرۆزگاکانی شیعە، بۆ بازرگانی و، کرێکاری.. هاتوچۆیان کردوە و، لەوێ جێگیر بوون. تەنانەت جارێکیان دەستیان بە سەر بەغدادا گرتوە.

بەعس کوردە فەیلییەکانی بە دوژمن دائەنا و، خستبوویە خانەی «تهدیدات الامن الداخلی»ەوە، لە بەر ئەوەی:

- لە رووی دینییەوە، مەزهەبی دەسەڵاتی سیاسی لە عێراق دا سوننە بوو، ئەوان شیعە بوون.

- لە رووی سیاسییەوە، گومانیان لێ ئەکردن، کە دڵسۆزییان بۆ ئێران بەهێزتر بێ وەک لە دڵسۆزییان بۆ عێراق، بە تایبەتی چونکە هەندێکیان بۆ ئەوەی نەچن بۆ سەربازی، جنسیەی ئێرانییان مابوو.

- لە رووی ئابوورییەوە، دەستیان گرت بوو بە سەر «شورجە»دا کە گرنگترین بازاری بەغداد بوو. بەعسییەکان ئەیانویست ئەم بازارە پڕ قازانجە بدەن بە پیاوەکانی خۆیان.

بەعس بە چەند وەجبە فەیلی لە عێراق دەر کرد. وەجبەی یەکەمیان لە کانوونی دووەمی ١٩٧١ دا دوای رێککەوتنی ئازار دەرکرا بوون. ئەم دەرکردنە درێژەی هەبوو تا ساڵانی دوایی بە تایبەتی دوای هەڵگیرسانی جەنگی عێراق - ئێران. لە تاران و ئیلام و کرماشان.. نیشتەجێ ببوون. ژمارەیان لە ٣٠٠ هەزار کەس تێ ئەپەڕی.

بەعس بۆ راستکردنەوەی هاوسەنگی «تەرازووی مەزهەبی شیعە - سوننە» فەیلییەکانی بە بیانووی «ئێرانی بوون»ەوە دەرکرد، بەڵام زۆربەی فەیلییەکان هیچ پەیوەندییەکیان بە ئێرانەوە نەبوو، خۆیان و چەند پشتیان لە عێراق لە دایک ببوون.

فەیلییەکان بە راستی لێقەوماو بوون. حکومەتی عێراق هەموو ماڵ و دارایی و کەلوپەلی زەوت و، بە سەڵتی و رووتوقووتی دەری کرد بوون بۆ سەر سنووری ئێران، ئێرانیش وەکو هاووڵاتی خۆی تەماشای نەئەکردن، ناوی نا بوون «معاودین» وەکو عێراقی رەفتاری لە گەڵ ئەکردن. لە تاران لە گەڕەکێک کۆبوونەوە ناویان نا بوو: «کوچەی عەرەب».

لە ناو دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی دا دوو فەیلی تێ دا بوو: عەبدولرەزاق میرزا، عادل موراد. عادل زیز بوو رۆیشتە تاران. شەوی سەری ساڵی ٧٤ ئۆتۆمۆبیلێکی «ئەمن» لە باوکی دابوو کوشت بووی. کەسوکاری لە بەغداد دەرکرا بوون، دایکی لە تاران ئەژیا.

بۆ ئاشتکردنەوەی لە تاران چووم بۆ ماڵەکەیان. عادل، وەکو خۆی ئەیووت دڵی لە مامجەلال و د. فوئاد رەنجا بوو، ژیانیشی لە ناوزەنگ پێ خۆش نەبوو. چەندی لە گەڵی خەریک بووم سوودی نەبوو. چوو بەیرووت ماوەیەک تەرجومەی عەرەبی - فارسی بۆ رۆژنامەی «السفیر»ی بەیرووتی ئەکرد. لە مایسی ٧٩ دا لە یەکەمین کۆنگرەی حسک دا هەڵبژێردرا بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و، بوو بە نوێنەریان لە لوبنان و سووریا.

*

## تەقویمی ئێرانی

ئێرانییەکان تەقویمێکیان داهێناوە، ئەگەرچی خۆیان بە هیجری دائەنێن، بەڵام نە لە میلادی باو ئەچێ، نە لە هیجری باو.

- تەقویمی میلادی بە گوێرەی خولانەوەی ئەرز بە دەوری خۆردا دانراوە و، تەقویمی هیجری بە گوێرەی خولانەوەی مانگ بە دەوری ئەرزدا دانراوە.

– تەقویمی میلادی لە دایکبوونی مەسیح و، تەقویمی هیجری کۆچی محەممەدی لە مەککەوە بۆ مەدینە کردوە بە سەرەتای دەس پێ کردنی.

ئێرانییەکان هەردوکیان تێکەڵاو کردوە. خولاتەوەی ئەرزیان بە دەوری خۆر دا کردوە بە بنچینەی تەقویمەکەیان، بەڵام بۆ تەقویمەکەیان لە باتی ساڵی لە دایکبوونی مەسیح، ساڵی کۆچی محەممەدیان کردوە بە سەرەتای دەس پێ کردنی و، لە باتی ڕۆژی کۆچی محەممەد ڕۆژی نەورۆزیان کردوە بە سەرەتای نوێ بوونەوەی ساڵ. ٦ مانگی یەکەم هەمووی ٣١ ڕۆژ و، ٦ مانگی دوەم هەمووی ٣٠ ڕۆژە. لە بەر ئەوە بە تەقویمەکەی خۆیان ئەڵێن: «هیجری شەمسی یا هیجری خۆرشیدی» و بەوی کە «هیجری قەمەری».

محەممەد ڕەزا شا تەقویمی میلادی و هیجری هەڵوەشاندەوە و، تەقویمێکی کەی دانا، جلوسی کۆرشی گەورەی کرد بو بە ساڵی دەس پێ کردن. لە کاتی «قیام» دا دیسان کردیەوە بە «هیجری خۆرشیدی».

ئەم تەقویمە جیاوازانە، بۆ یەکێ کە شارەزا نەبێ، ئەبێتە هۆی سەر لێ تێکچوون.

*

سەفارەتی سوری «پاسپۆرت»ێکی نوێی پێدام بۆ ئەوەی سەفەری پێ بکەم، بەڵام لە بەر ئەوەی نەمئەتوانی «دخولیە»ی ئێرانی بخەمە سەر نەمئەتوانی بە کاری بهێنم و سەفەری پێ بکەم. گەڕامەوە بۆ سنە لەوێ چاوەڕێ بکەم تا چارێ بۆ کێشەکەم ئەدۆزمەوە، لەوێ نامەی یەکێ لە هاوڕێکانم پێ گەیشت داوای لێ کرد بوم بگەڕێمەوە بۆ کوردستان.

چونکە ئێرانی مامجەلال لە گەڵ سەرکردایەتی کومەڵە تێکچوە و، پەیوەندییەکان خەریکە لە یەک ئەترازێن. بێگومان ئەمە هەواڵێکی ناخۆش بو. زۆر ئێمە بزوتنەوە لە یەکێتی جیا بوبوەوە، ئەمەشی بە سەرا بێ، یەکێتی ئەکەوێتە مەترسیەکی گەورەوە.

گەڕامەوە بۆ بارەگاکانی سەرکردایەتی لە نۆزڵە. هاوڕێکانی خۆم و، مامجەلال و سەرانی بزوتنەوە – ئەوانەی لە گەڵ یەکێتی ما بون – بینی. کێشەکە لە سەر جوری دروستکردنەوەی مەکتەبی سیاسی بو. ئەوانەی پێشنیار کرا بون بۆ ئەندامەتی م س لە کۆمەڵە: سالار و فاضیل، لە هێڵی گشتی: د. فوئاد مەعصوم و د. کەمال خۆشناو، لە بزوتنەوەش: جەمال ئاغا و عەلی حەویز.. نوێنەرەکانی کومەڵە وت بویان: «ئێمە عەلی حەویز ناناسین. تازە هاتۆتە دەرەوە. لە بەر ئەوە قەبوڵ ناکەین دابنرێ بە ئەندامی م س». مامجەلالیش بۆی باس کرد بون کە ئەوە تێکۆشەرێکی دێرینە و، لێپرسراوی ڕێکخراوەکانی بزوتنەوە بوە لە کۆیە و.. هەوڵێکی زۆری داوە بۆ ئەوەی بە خۆشی قانعیان بکا کە عەلی قەبوڵ بکەن. نوێنەرەکانی کۆمەڵە سور بون لە سەر هەڵوێستی خۆیان. کۆتاییەکەی بەوە هات بو کۆبونەوەکە تێک چو بو، مامجەلال سوێندی خوارد بو کە ئەگەر عەلی نەکرێ بە ئەندامی م س، ئەو لە ناو یەکێتی دا نامێنێ و، کوردستان بە جێ ئەهێڵێ و، بەهانێکیان لە سەر دەرئەکا. کۆبونەوەکە تێک ئەچێ و بڵاوەی لێ ئەکەن. مامجەلال بە هەمان ناوەڕۆک و، بە تورەبونەوە، نامەیەکی بو سەرکردایەتی کۆمەڵە نوسی بو.

هەوڵێکی زۆرم دا گرێیەکە خاو بکەمەوە. لە گەڵ سەرکردایەتی کۆمەڵە کۆبومەوە. لە سەر کێشەکە زۆر دوایین. هەوڵمان دا چارەیەکی ناوەنجی بدۆزینەوە. مامجەلال بە هیچ جورێ ئامادە نەبو لە بڕیارەکەی خۆی بکشێتەوە. لە ئەنجام دا کەوتینە هەڵسەنگاندنی ئەوەی مامجەلال بۆ یەکێتی پێویستە و مەرجە نارەواکەی لە پێناوی پاراستنی ڕیزەکانی یەکێتی

دا قبوول بکەین، یان مەرجەکەی قبوول نەکەین و پەیوەندی خۆمانی لە گەڵ تێک بدەین؟ مامجەلال گرەوەکەی بردەوە: مەرجەکەی قبوول کرا.

*

## بۆردومان

ئێمە لە ناوزەنگەوە گواستبوومانەوە بۆ تەختاییەکی ڕووت لە نزیک توژەڵە. چادرێکمان هەڵ دا بوو لە ژێری دا دانیشتبووین و، هەندی لە پێشمەرگەکان خەریکی دارهێنان و چێشت لێنان بوون، دوو فڕۆکەی عێراقی بە بەرزی بە ئاسمانی ناوچەکەدا چەند جاری هاتن. دیار بوو فڕۆکەی تێڕوانین (استطلاع) بوون.

بۆ ڕۆژی دوەم ٤ ی حوزەیرانی ٧٩ ئێمە بە ڕێگاوە بووین بە لای کانی زەردا ئەچووین بۆ ماڵیموس لە دەمەو نیوەڕۆدا پۆلی فڕۆکە پەیدا بوون، لە بەرزاییەکەوە چاومان لێ بوو چەند بۆمبایەکی بەردایەوە و دوکەڵ بەرز بووەوە.

ئەنجامی بۆردومانەکە چەند ماڵێکی لە گوندی گزرەشێر ویران کرد بوو. چەند کەسێکی کوشت بوو. هەندی داری گوێزیشی لە کانی زەرد شکاندبوو.

کاتی خۆی هەندی نووسین و کاغەز و بەڵگەی گرنگم دابوو بە ئەبو شەهاب لە جێگایەکی ئەمین دا بۆم هەڵبگری، ئەبو شەهاب ئەوکاتە لێپرسراوی لقی یەکێتی بوو، بنکەکەی لە زەڵی بوو. ئەبو شەهاب کاغەزەکانی لە گزرەشێر هەڵگرت بوو. لە گەڵ بۆردومانەکەدا ئەو ماڵەش بە تەواوی ویران ببوو. شتەکانی منیش تێ دا چوو. یەکێکیان باسێکی درێژ بوو لە سەر عەشیرەتەکانی کورد لە سووریاوە دەستم کرد بوو بە نووسینی. زانیاری زۆری مەیدانیم کۆ کرد بووەوە لە سەر عەشیرەتە کوردەکانی سووریا و، لە سەر عەشیرەتەکانی کوردستانی عێراق بە تایبەتی: برادۆست، هەرکی، سورچی، گەردی، بالەک، ئاکۆ، مەنگوڕ، مامش.. لە زمانی پیاوەکانی ئەم عەشیرەتانەوە.

مەبەستی عێراق لەم بۆردومانە ترساندنی ئاوایییەکانی ئێران بوو، کە تیایان بگەیەنی هەرکوێیەک داڵدەی پێشمەرگەی کوردستانی عێراق بدا بەر هێرش ئەکەوی.

*

## ڕێگای حشیشە

ئەو ماوەیە نەجۆ (نەجمەدین بێوک قەیا) گەیشتە ناوزەنگ. وەجبەیەک چەکی بە ناو تورکیادا هێنا بوو بۆ گوندێکی سەر سنوور لە ورمێ. لەوێشەوە گەیاندیانە کوردستانی عێراق.

نەجۆ ئەگەڕایەوە تورکیا، پێکەوە بەری کەوتین بەرەو ورمێ و لەوێوە بۆ شاپوور و چوینە ناوچەی شکاک. نەجۆ لە گەڵ هەندێکیان ئاسیاوی پەیدا کرد بوو. سەری گوندەکەی سەناری مامەدی مان دا، خۆی لە ماڵ نەبوو، کوڕەکەی لەوێ بوو، گوندەکە قەرەباڵغییەکی زۆری لێ بوو، بە ڕێکەوت تووشی «بێجان جندی» بووم. ویستم خۆمی لێ هەڵە بکەم، بەلام بێجان منی ناسیبووەوە، بە گەرمی چاک و چۆنی مان کرد. پێم وت: «لێرە کەس من ناناسێ، ناشمەوێ کەس بمناسێ، تۆش باسی مەکە». وتی: «باشە». تا ناوچەکەمان بە جێ هێشت کەس نەیزانی. لێم پرسی: «چی ئەکەی لێرە؟». وتی: «من خەڵکی ئێرەم، وەختی خۆی بۆ کوردایەتی شوێن بارزانی کەوتم بۆ سۆڤیەت و، لە گەڵ ئەویش گەڕامەوە بۆ عێراق، ئێستا هاتومەتەوە ناو کەسوکاری خۆم».

چوینە گوندێکی نزیک سنووری تورکیا، لە ماڵی کابرایەک بووین بە میوان ناوی حاجی زنار بوو. دەوڵەمەن و دەسەڵاتدار بوو. وێدەچێ ملا مستەفاشی هەڵواسی بوو. ئەوان ئێمەیان بە سیاسی نەئەناسی، بە قاچاخچی چەکیان ئەزانی. ئێمە پێشتر جارێکی تریش میوانی حاجی زنار بووبوو. حاجی کابرایەکی چاوو دڵ فراوان بوو. بەرخێکی بۆ سەربڕین. تا ڕێگاکەیان تاڵی کردەوە ٣ ڕۆژی پێ چوو. هەر ٣ ڕۆژ میوانی ئەو بووین خزمەتی زۆریان کردین.

حاجی زنار ئێمەی بە پیاوێکی گرنگی قاچاخچێتی، تێکەڵاو لە عیراقی و تورکی و ئێرانی، ئەزانی. زۆرمان هەوڵ دا قانعی بکەین هاوکاریمان بکا بۆ گوێزانەوەی چەک لە دیوی تورکیاوە بۆ گوندەکەی خۆیان. شوێنەکەیان زۆر لە بار بوو. حاجی زنار ملی نەدا، بە پێچەوانەوە ئەو ئەیویست ئێمە قانیع بکا بازرگانی حەشیشەی لە گەڵ بکەین. زۆرمان لە گەڵ وت و ئەمامی زۆرمان خستە بەردەمی. کەڵکی نەبوو، وتی: «ئێوە ئەچن لە لوبنانەوە بە قاچاخ تفەنگ ئەبەن بۆ سووریا و، بە قاچاخ بە ناو سووریادا ئەیبەن بۆ ناو تورکیا و، لە تورکیاوە بە قاچاخ بۆ ئێرەو، لێرەشەوە بۆ عیراق. چەندی لێ قازانج ئەکەن؟ ئەو پارەیە ئەم هەموو زەحمەت و ترسە ئەهێنێ؟ ئێوە . . ١ تفەنگ ئەبەن. ئەبێ بۆ هەر . ١ تفەنگ ولاخێک تەرخان بکەن. کاروانەکەتان ئەبێ بە . ١ ولاخ و ئەبێ . ١ کەسیش بیپارێزێ. ئەگەر کارەکە بە سەلامەتی بڕوا، لە کۆتاییدا لە هەر تفەنگێکی چەند سەد فلسێ قازانج ئەکەن، ئەگەر بشگیرێن، ئەڵێن چەکیان بۆ شۆڕش ئەبرد و ئێعدامتان ئەکەن! لە باتی ئەوە بۆ نایەن لە گەڵ من هاوکاری بکەن هەموو جار باری یەک ولاخ دەرباز ئەکەین و، هەریەکەی چەند ملیۆنێکمان پێ ئەبڕێ، ئەگەر بشگیرێین، چەند ساڵێکمان حوکم ئەدەن!»

ئەو ناوچەیە یەکێ لە شا ڕێگاکانی تێپەڕاندنی حەشیشە بوو بۆ ئەورووپا. لە ئەفغانستان و پاکستان و ئێرانەوە، حەشیشەیان لەم ناوچەیەوە ئەگوێزایەوە بۆ تورکیا و، لەوێشەوە بۆ ئەورووپا و سەرانسەری دنیا. لەم ناوچەیەشدا حەشیشەیان ئەڕواند. ڕۆژێکیان بردینی بۆ سەیری یەکێ لە کێڵگە گەورەکانی خۆیان. تازە گوڵی کرد بوو، دیمەنێکی یەکجار جوانی هەبوو.

گوندەکەمان بە ڕۆژ بە جێ هێشت و شارەزا پێشمان کەوت لە سنوور پەڕینەوە بۆ ناو تورکیا. چووینە گوندێک ئۆتۆمبیلێکمان بە کرێ گرت بۆ باشقەڵا. شەو لە ئوتێلێک دابەزین. بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆیشتین بۆ دیاربەکر و لەوێوە بۆ «سیوەرەک». ماڵی باوکی ئێمە لە سیوەرەک بوو. دۆستێکمان لە «جیلانپینار» هەبوو ناوی ڕەمەزان گاوان بوو. لە نێوان سووریا و تورکیادا قاچاخچێتی ئەکرد و شارەزای ڕێگاکانیان بوو. چوومە لای ئەو. بە شەو تێپەڕینی سنووری بە پارە بۆ ئەگبیر کردم. پاسەوانەکانی سنوور خۆیان منیان پەڕاندەوە. لە دیوی سووریا چوومە شاری سەری کانی «رأس العین». هەمان شەو بە ڕێ کەوتم بەرەو حەلەب بۆ دیمەشق. ئەو کاتە لە سووریا شەماڵ کاروباری یەکێتی ئەکرد.

هەندێ لە سەرکردەکانی حشع لە دیمەشق بوون. چەند جارێ کەریم ئەحمەدم بینی. حازم ئەلئەمامی قیادەی قەومی حیزبی بەعس و سکرتێری قوطری عیراق بوو. لوع بارەکاکەی مابوو.

الحرکە العربیە الاشتراکیە لە سەر پارە لە ناو خۆیان دا تێک چووبوون. ئێبو شەوقی و ئێبو عومەر بە دوو قوڵی، عەبدولئیلاە نەصراوییان دەرکرد بوو. هەر بە هاندانی ئەمان

سورییەکان ویستیان بیانگرن، هەڵات بوو بۆ لوبنان. عومەر مستەفا فلاتەکەی لێ بە کرێ گرت بوو، سوودی لە کرێ کەی وەرنەگرت و، بۆیشی نەپاراست.

*

## سەفەری مامجەلال بۆ تاران

مامجەلال بە دەعوەتی ئێران سەفەری تارانی کرد. سەفەرەکەی ٢٢ ڕۆژ، لە ٧/٢٣ - ٧٩/٨/١٦ ی خایاند. لەم سەفەرەدا ئیمام خومەینی، حسێنعەلی مونتەزیری و، کاربەدەستانی حکومەت: مستەفا چەمران، ئەبولحەسەنی بەنی سەدر، سادقی قوطبزادە، داریوشی فروهەر، موحسینی ڕەفیقدوست.. ی بینی.

مامجەلال لە گفتوگۆکانی دا داوای ئەم شتانەی لێ کرد بوون؛ پشتیوانی لە خەباتی گەلی کورد و، یارمەتی دانی یەکێتی بە: چەک و، پارە و ئازوقە. ڕێگە دانی بۆ هێنانی چەک و تفاقی جەنگ لە سوریا و لیبیاوە. ڕێگە دانی لە بازارەکانی ئێران پێویستیەکانی خۆی بکڕی. کارئاسانی بۆ ئەندام و دەستەکانی بکری لە ناو ئێرانەوە هاتوچۆ بکەن. بریندارەکانی لە نەخۆشخانەکانی ئێران دا تیمار بکرێن.

لە ئێران یەکێتی و ئێرانی ئیسلامی دا چەند جیاوازی بنەڕەتی هەبوو: ئێران دەوڵەتێکی دینی بوو، لە سەر بنچینەی ئیسلامی سیاسی؛ شیعەی جەعفەری، دامەزرا بوو. فرە حیزبایەتی و، فرە ڕۆژنامەیی و فرە نەتەوایەتی لە ژیانی دیموکراسی دا، بە دژی ئیسلام و، بە مایەی فیتنە و ئاشوب دائەنا. کورتیەکەی؛ ئەوان دینی و یەکێتی نەدینی، ئەوان شیعە و یەکێتی سوننی، ئەوان عەجەم و یەکێتی کورد.. کارێکی ئاسان نەبو لە یەک بگەن. گیروگرفتی کوردەکانی ئێرانیش بوو بە سەرباری.

کێشەی کورد خەریک بو ئەبو بە کێشەیەکی ئاڵۆزاوی ئێران، دەنگوباسی هاوکاری پێشمەرگەکانی یەکێتی لە گەڵ حدکا و سازکایان پێ ئەگەیشتەوە. نوێنەرانی حیزبەکانی تر، بۆ ئەوەی دڵی کاربەدەستانی ئێران لە یەکێتی ڕەش بکەن، ئەم هەواڵانەیان بە قەبە کراوی پێ ئەگەیاندن. یەکێ لە باسەکانی ئەو کۆبونەوانە ئەم گلەییانە بو.

لەو کاتەدا بۆ پشتیوانی لە جوڵانەوەی کوردی عیراق، دو مەسەلە گرنگی ژیانییان هەبو، ئەیانتوانی کار لە ڕوداوەکانی ناو عیراق بکەن: یەکەمیان یەکخستنی جوڵانەوەی کورد، بە ئاشتکردنەوەیان یان بە زاڵ کردنی لایەکیان دا بە سەر لاکانی تردا. دوەمیان تێر کردنی لە چەک و تفاقی جەنگ و پێویستیەکانی تری.

سەفەرەکەی مامجەلال هەندێ ئەنجامی ڕواڵەتی بە دەستەوە دا، وەکو مانەوەی نوێنەرێکی یەکێتی بۆ پەیوەندی لە تاران و، ڕێگەدان بە هاتوچۆ کردن لە سنورێکی دیاریکراودا، بەڵام هیچ پشتیوانیەکی کارێگەریان لێ نەکرد و، هیچ یارمەتیەکی ڕاستەقینەیان نەدا. نە خۆیان چەک و تفاقی جەنگیان دایە و، نە هێشتیان لە سوریا و لیبیاوە هیچ بگاتە کوردستان. بەڵکو ناڕاستەوخۆ هانی پارچە پارچە بونی بزوتنەوەکەیان ئەدا: جیگەی هەمو ڕێکخراوە کوردیەکانی عیراقیان وەکو یەک کردەوە و، کارئاسانییان بۆ ئەکردن و، لە سنورێکی دیاریکراودا بە چەک و ئازوقە یارمەتییان ئەدان. خۆیشیان کەوتنە هەوڵی دروستکردن و داتاشینی ڕێکخراوی تازە بۆ کوردەکانی عیراق.

*

## هاتنی سەددام

١٦ ی تەمموزی ٧٩ ئەحمەد حەسەن بەکر وازی هێنا، سەددام حسێن لە جێگەی ئەو بو بە سەرکۆمار، فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی عێراق، سەرۆکی م ق ث و، ئەمین سری قیادەی قطری عێراق.

لەو کاتەدا من لە شام بوم. حازم هەواڵەکەی بۆ باس کردم.

١٧ ی تەمموزی ٧٩ بۆ یەکەمین جار سەددام لە رادیۆ و تەلەفزیۆنی عێراقەوە بە ناوی سەرکۆمار وتاری دا.

سەددام سەرەتای حوکمی بە رشتنی خوێنی تاڵمی لە هاورێکانی دەس پێ کرد. رۆژی ٢٢ ی تەمموز لە هۆڵی خولد لە بەغداد لە کۆبونەوەیەکی فراوانی سەرکردایەتی بەعس و کادرەکانی دا سەددام پەلاماری تاوانبار کردنی بۆ محی حسێن مشهەدی و چەند کەسێکی تر لە هاورێکانی درێژ کرد. تاوانباری کردن بە پیلانگێران و، لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەیان بۆ پێک هێنان. دران بە دادگایەک کە لە سەرانی بەعس پێک هات بو.

لە ٧ ی ئاب دا حوکمی ئیعدامی محی مشهەدی و، غانم عەبدولجەلیل، عەدنان حەمدانی، محەممەد عایش و، پۆلێک کادری پێشکەوتوی بەعس لە رادیۆی بەغداوە خوێندرایەوە. لە سەر شێوەی کۆنی عەرەب، بۆ ئەوەی هەمویان بەشدار بن لە خوێنی کوژراوەکان دا، سەددام نوێنەرانی هەمو شرعبە و فیرقەکانی حزبی بەعسی بانگ کرد و، پێکەوە تەقەیان لە حوکمدراوەکان کرد. وەلید مەحمود سیرەت کە قائیدی فەیلەقی یەک بو، ئەویشیان لە گەڵ ئیعدام کرا.

وەکو ئەیانوت ئەم پیلانەی دژی سەددام چنرا بو بەمجورە ئاشکرا بوە؛

بەعسیەکانی عێراق، هەندێ لە بەعسیەکانی وڵاتانی عەرەبی تریان لە عێراق کۆ کرد بوەوە و، کاری گرنگیشیان بە هەندێکیان سپارد بو لەوانە: عبدالکریم کراسنە کە خەڵکی ئوردون و ئەندامی قیادەی قەومی حزبی بەعس بو.

عبدالکریم کراسنە، حکومەتی عێراق کرد بوی بە سەفیری خۆی لە مەغریب. ئاگاداری هەولی ئەم بەعسیانەی عێراق ئەبێ بۆ گۆرینی سەددام. کابرای سەفیر، ئەگەرچی بەعسی و مووچەخۆری عێراق ئەبێ، بەڵام پەیوەندی لە گەڵ مەلیک حسێن ئەبێ. هەواڵەکە ئەگەیەنێ بە مەلیک. مەلیک، سەددام دەعوەت ئەکا بۆ ئوردون. سەددام بە فرۆکە ئەچێ بۆ عەممان. مەلیک حسێن باسەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە. سەددام ئیتر لە باتی فرۆکە بە تۆتۆمۆبێل ئەگەڕێتەوە بۆ بەغداد. کۆبونەوەیەک ساز ئەکا، پیلانگێرەکانی بەو دەردە برد.

بەڵام هەندێ سەرچاوەی تر ئەیانوت: هیچ پیلانێک لە گۆڕێ نەبوە. ئەم شانۆگەرییە سەددام خۆی رێکی خست بو بۆ ئەوەی هاورێ نارازیەکانی پاکتاو بکا، چونکە ئەوانە لە لاچونی بەکر و هاتنی سەددام رازی نەبون. سەددام ئەیویست هەمو دەنگێکی نارەزایی لە ناو حزبەکەی دا بێدەنگ بکا.

*

## «وەحدە» ی سوریا و عێراق

چەند مانگێ بو گفتوگۆیەکی زۆر بە زۆر لە نێوان نوێنەرانی سوریا و عێراق دا، بۆ یەکخستنی حیزب و جەیش و دەوڵەت، دەستی پێ کرد بو. نوێنەرانی هەردولا چەندین جار لە دیمەشق و بەغدا دانیشتن و، بەکر و سەددام و ئەسەد و خەددامیش لە بەشێکی ئەم

کۆبونەوانەدا بەشدار بون. وەکو سەرەتا پێک هاتن لە سەر ئەوەی؛ حیزبی بەعس و، دامودەزگاکانی جەیش و دەوڵەت، یەک بخەن. بەڵام لە سەر هەندێ مەسەلە ڕێک نەکەوتن، یەکێکیان: جۆری پێکهێنانی دەستەی سەرۆکایەتی دەوڵەتی یەکگرتو بو. سورییەکان ڕەئیان وابو دو کەس بێ، یەک بێ لە سەرکۆماری عێراق و سەرکۆماری سوریا. لایەنی عێراقی ڕەئی وا بو، کە ئەبێ لە ٣ کەس پێک بێ، دوانی عێراق و یەکێکی سوری. لە مەش دیارە مەبەست ئەوە بو: جگە لە بەکر، صەددام حسێن بەشی تێ دا بێ. سورییەکان ئەمەیان قبوڵ نەکرد، لە بەر ئەوە عێراق تەگەرەیەکی تری تێ خست. سورییەکان ڕەئیان وابو، کە دەرامەتی هەردولا تێکەڵاو بکرێ و، بودجەیەکی هاوبەش دابنرێ. لایەنی عێراقی لە بەرامبەر قبوڵ نەکردنی سەرۆکایەتی ٣ قۆڵی دا ئەمەی قبوڵ نەکرد، داوای کرد دەوڵەتی یەکگرتو بودجەیەکی هاوبەشی هەبێ، بەڵام هەر دەوڵەتێش بودجەی جیاوازی خۆی هەبێ. لەو کاتەدا موعارەضەی عێراقی لە سوریا و موعارەضەی سوری لە عێراق بون، کەچی ئەم گفتوگۆیانە لە پشتی سەری ئەوانەوە ئەکرا.

هەردو دەوڵەت خۆیان لێ ی بێدەنگ بون، بەڵام حەفتەنامەی «الوطن العربی» سەر بە عێراق کە لە پاریس دەرئەچو، گۆشەیەکی ئەم گفتوگۆیانەی ئاشکرا کرد و، هەندێ ڕۆژنامەی عەرەبی باسیان کرد. نوسەری ئەمەریکی، بە ڕەچەڵەک عێراقی، مەجید خەددوری گفتوگۆکان و، پەیوەندییەکانی هەردولای بە درێژی لە کتێبە ئینگلیزییەکەی دا دەربارەی ناکۆکی ئێران - عێراق، نوسیوە.

گفتوگۆکان بەردەوام بو، تا بەکر کشایەوە و صەددام جێگەی گرتەوە، ئەوسا صەددام گفتوگۆکانی بڕی بە بیانوی ئەوەی سوریا بەشدار بوە لەو پیلانەدا کە بۆ لابردنی ئەم کراوە. هەوڵەکانی وەحدە تێک چو، زەمینەی ئاشتبونەوە گۆڕا بە دوژمنایەتییەکی لە جاران توندوتیژتر. لە وەڵامی پرسیارێک دا کە بۆچی ئەم گفتوگۆیانە سەری نەگرت؟ طاریق عەزیز بو پاساودانی وتی: «ئەمەنی جیابونەوەی ئەم دو حیزبە درێژترە لە ئەمەنی یەک بونیان»

## کڵکی باریکی*

دوای ڕوخانی شا و، ئەمانی پاسگا و پادگانەکانی تهران لە ناوچەی شنۆ هەندێ لە چەکدارەکان ق م لە تورکیاوە گەڕابویانەوە ناو دێهاتەکانی کوردستانی ئێران. گیراوەکانی ئەمەش؛ ئازاد هەورامی، مەحمود عەبدولڕەحمان (شێخ عەلی)، عەلی ئەحمەد (عەلی شەمە)، حامیدی حاجی غالی، کە لە ڕۆژانی کارەساتی هەکارییەوە بە گیراوی لە لایان مابونەوە و، تا ئەوسا لە ناو دێهاتەکانی تورکیا شارد بویانەوە، هێنا بویانن بۆ ناوچەی شنۆ. لە ژورێک دا لە دێیەک حەپسیان کرد بون. ژورەکە دەلاقەیەکی تێ دا ئەبێ دوانیان پێ دا ئەچن و، دوانیان پێ دا ناچن. لە بەر ئەوەی ناتوانن هەر چواریان هەڵبێن. وا ڕێک ئەکەون ئەوانەی بە دەلاقەکەدا ئەچن خۆیان دەرباز بکەن. ئازاد و مەحمود باریکتر بون لە حامید و عەلی، هەڵدێن و، ئەچن بۆ ماڵی سەید عەزیزی شەمزینی لە گوندی شێخان. سەید عەزیز کەسایەتییەکی دەسەڵاتدار و ناسراوی ناوچەکە و، دۆستی مامجەلال بو. هەردوکیانی بە سەلامەتی ناردەوە بۆ ناوزەنگ.

پاش ماوەیەک خەڵکی سەردەشت تاڵیمی چەکداری ق م یان گرت و، بە گیراوی

تەسلیمی ئێمەیان کردن. لە دزلی پێش چەند کەسێکیان لی گیرا. ق م رازی بوو بە گورینەوەیان لە گەڵ حامید و عەلی و، گیراوەکان گۆردرانەوە. حامید و عەلی پاش پانزە مانگ ئێنجا ئازاد کران.

*

## شەڕی ٣ مانگە لە کوردستانی ئێران

لە ناو کاربەدەستانی تازەی ئێران دا زۆر کەسی تێ دا بوو، باوەڕیان بە کێشەی نەتەوایەتی نەبوو. هەمو جۆرە خواستێکی نەتەوەییان بە فێتی ئیمپریالیزم و دوژمنانی ئیسلام دائەنا. ئەمانە هەندێکیان لە روانگەی دینی و هەندێکیان لە روانگەی نەتەوەییەوە دژی خواستەکانی گەلانی ئێران ئەوەستان و، ئەیانویست بە لولەی تفەنگ بێدەنگیان بکەن. دەسەلاتی ناوەندیی دەولەت لە زۆر شوێنی کوردستان ترازا بوو. سەرانی ئینقیلاب ئەیانویست ئەم دەسەلاتە بە چەکداری سپای پاسداران دابمەزرێننەوە. چەکدارەکانیشیان لە شوێنە دوورەکانی ئێرانەوە ئەهێنا. کەسێکیان ئاشنای زمانی کوردی و، خو و رەوشتی دانیشتوانی ناوچەکە نەبون. سەرەڕای ئەوەش هەمویان شیعەی توندڕەو بون. بە ناوی ئیسلامەتیەوە بە زۆر ئەیانویست خەلک بهێننە ژێر رکێفی خۆیانەوە. دانیشتوانی کوردستان چەکیان کەوت بوە دەس. لە زۆر جێگا بەرەنگاریان ئەکرد و، شەڕ و پێکدادان لە نێوان رێکخراوە سیاسیەکانی کورد و، سپای پاسداران دا ئەقەوما. تا ماوەیەک ئەرتەش خۆی لەم رووداوانە دوورەپەرێز گرت بو.

رووداوێکی لەم بابەتە لە پاوە قەوما. مستەفا چەمران، وەزیری دیفاعی ئەوسای ئێران خۆی چو بۆ پاوە. لەوێ دەوری گیرا. توندڕەوەکانی دەوروبەری ئیمام خومەینی ئەمەیان بە هەل زانی، بۆ ئەوەی ئەویش تێکەلاوی ئەم کێشەیە بکەن و، هەمو داوودەزگا دینی و دەولەتیەکانی ئێران بکەن بە گژ کوردا. ئیمام خومەینی ئەم فەرمانەی دەرکرد:

*

بسم الله الرحمن الرحیم

از اطراف ایران گروههای مختلف ارتش و پاسداران و مردان غیرتمند تقاضا کردماند که من دستور دهم بسوی پاوه رفته و غائلەرا ختم کنند. من از آنان تشکر میکنم و به دولت، ارتش و ژاندارمری اخطار میکنم اگر با توپها و قوای مجهز تا ٢٤ ساعت دیگر حرکت بسوی پاوه نشود من همەرا مسول میدانم. من بعنوان ریاست کل قوا به رئیس ستاد ارتش و ژاندارمری دستور میدهم که فورا با تجهیز کامل عازم منطقه شوند و بتمام پادگانهای ارتش و ژاندارمری دستور میدهم که بی انتظار دستور دیگر و بدون فوت وقت با تمام تجهیزات بسوی پاوه حرکت کنند و به دولت دستور میدهم وسائل حرکت پاسداران را فورا فراهم کند تا دستور ثانوی من مسول این کشتار وحشیانەرا قوای انتظامی میدانم و در صورتی که تخلف از این دستور نمایند با آنان عمل انقلابی میکنم مکررا از منطقه اطلاع میدهند که دولت و ارتش کاری انجام نداده‌است من اگر تا ٢٤ ساعت دیگر عمل مثبت انجام نگیرد سران ارتش و ژاندارمری را مسول میدانم. والسلام

*

خومەینی فەرمانی دا بە هەمو هێزە چەکدارەکانی ئێران بەرەو کوردستان بچن. شەڕ لە سەرانسەری کوردستانی ئێران دا گەرم بو. ١٨ ی ئابی ٧٩ هێزەکانی ئێران شاری

پاوەیان گرت. مستەفا چەمران لە ئابلوقە ڕزگاری بوو. قاسملو داوای یارمەتی لە هەموو حیزبەکانی کوردستانی عێراق کرد یارمەتی حدکا بدەن لەو شەڕەدا. چەند جارێ لە بنوخەلەف لە گەڵ مامجەلال و نوێنەرانی حشع و حسک دانیشت. قاسملو داوای لە پارتی پش کرد کە یارمەتیان بدەن و، بۆ ئەو مەبەستە خۆی چوو بۆ سەردانیان. لەو کاتەدا مەسعود لە تاران ئەبێ، سامی سنجاری و جەوهەر نامیق ئەبینێ، بە قاسملو ئەڵێن کە ناتوانن هیچ یارمەتییەکی بدەن و ناتوانن لە هیچ کۆبوونەوەیەکی چەند قۆڵی دا بەشدار بن، بارودوخی ئەوان، بە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر خێزانیان لە کەرەج و شارەکانی تری تەهرانە، زۆر ناسکە. لە ناکۆکی نێوان حکومەتی ئێران و کوردا ئەوان بێلایەن ئەوەستن.

لەم شەڕانەدا هێزی حشع، حسک، یەکێتی چوون بۆ پشتیوانی حدکا و، پێکەوە لە ٤ ی ئەیلولی ٧٩ دا ڕاگەیاندنێکی هاوبەشیان دەرکرد و، بە ئاشکرا لایەنگیریان لە حدکا و، دژایەتییان لە هێرشەکانی ئێران کرد. هێزەکانی قم، وەکو سامی پێشبینی دابوو، بێلایەن ڕانەوەستان بەڵکو هاوبەشی هێزەکانی ئێران بوون لە پەلاماردانی شارەکانی کوردستان و هێزەکانی حدکا دا، بە تایبەتی لە پاوە، مەریوان، شنۆ..

هێزەکانی ئێران هەموو شارەکانی کوردستانی ئێرانیان گرتەوە و، هێزەکانی حدکا و ڕێکخراوەکانی تر کە تەجروبەی جەنگییان کەم و، بێ دیسیپلین و ناڕێکوپێک بوون بەرگەی هێرشەکەیان نەگرت. چونی پێشمەرگەکانی عێراقیش شتێکی ئەوتۆی لە ڕەوتی شەڕ نەگۆڕی. هەندێ لەم هێزانە بۆ شەڕخۆری و حەوانەوە چوبوون، نەک بۆ شەڕ. هێزەکانی حدکا و سازکا شکان و، سەرکردەکانیان کشانەوە بەرەو ناوچەکانی نزیک بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی لە تۆژەڵە - شێنێ.

مەلا شێخ عیززەدین دەفتەری لە شێنێ و، حدکا دەفتەری سیاسی لە پێش دا لە تۆژەڵە و، دواتر لە ئاشی پشکاوی لە نێوان شێنێ و گزرەشیردا دانا.

*

## دادگاکانی خاڵخاڵی

صادقی خاڵخاڵی یەکێ بوو لە ئاخوندە شیعەکانی نزیک ئیمام خومەینی. سەرۆکایەتی هەندێ لە «دادگاکانی ئینقیلاب» ی ئەکرد. زۆری ئەوانەی ئەبرانە دادگاکەی ئەم حوکمی ئیعدام ئەدران و هەمان ڕۆژ یان هەمان شەو گوللەباران ئەکران. لە کاتی شەڕی ٣ مانگەدا بۆ چاوترساندنی خەڵک ئەمیان ناردە کوردستان. خاڵخاڵی لە چەند جێگایەک دادگای دانا و ژمارەیەک لە دانیشتوانی کوردستانی ئیعدام کرد. وەکو ئەیان گێڕایەوە جارێکیان لە مەهاباد یەکێکی حوکمی ئیعدام دابوو. کابرای حوکمدراو وت بووی: «تۆ منت بە ئیعدام مەحکوم کردوە، بەڵام بە ڕاستی من بێ تاوانم». قازی خاڵخاڵی لە وەڵام دا وت بوی: «ئەگەر تاوانبار بی ئەوا سزای خۆتت وەرگرتوە، خۆ ئەگەر بێ تاوانیش بی، چ باشتر، ئەوە ئەچیتە بەهەشت!»

ئەو کاتە کاربەدەستانی ئێران ئەیان هێشت ڕۆژنامەوانەکان وێنەی دیمەنی جێبەجێ کردنی حوکمی ئیعدام بگرن. ئەمەیان بۆ چاوترساندنی خەڵک بوو، یان هێشتا فێری شاردنەوەی تاوانەکانی پێشێل کردنی مافی مرۆڤ نەبووبون، ئەوە باسێکی ترە. وێنەی دوو دیمەنی «ئیعدامی بە کۆمەڵ» بڵاو بوەوە، لە دنیادا دەنگیان دایەوە. یەکێکیان ئیعدامی کۆمەڵی گەنج لە سنە و، ئەوی تریان هی کۆمەڵێکی تر لە پاوە. دیمەنی حوکمدراوەکان بە

راوەستاوی و چاو و دەس بەستراوی و، ئینجا گوللەباران و، دواییتر بە کەوتریی، لە دڵ و دەروون دا هەستێکی قووڵی مەزڵوومیی ئەچەسپاند.

*

حکومەتی بەعس هەر لە سەرەتاوە کەوتە دوژمنایەتی ڕژێمی تازەی ئێران. ئەم ڕژێمەی بە مەترسی دائەنا بۆ سەر خۆی و ناوچەکە. ئەترسا شەپۆلی ئیسلامی سیاسی عێراق لە گەڵ خۆی ڕاپماڵی و، شیعە کاروباری بەغدادیش بگرێتە دەس. کاربەدەستانی عێراق باوەشیان کردەوە بۆ هەڵاتووەکانی ئێران و کەوتنە یارمەتی دانی دوژمنانی ڕژێمی نوێ. لە ناو دوژمنەکانی ڕژێمی نوێ دا، کوردستان یەکێ بوو لە مەڵبەندە هەرە گرنگەکانی. کاربەدەستانی عێراق، لەو کاتەدا «دەوڵەمەن بوون. «دۆلاری پەترۆڵ» ی مشە و، چەک و جبەخانەی زۆری هەبوو. جگە لە حدکا یارمەتی: پارە، چەک، کارئاسانی.. پێشکەش بەم تاقم و کەسانەش کرد:

- دەفتەری مەلا شێخ عیززەدین، کە بوو بە هێزێکی سیاسی و، لە چەند جێگا بارەگای هەبوو.

- بنەماڵەی شێخ عوسمانی نەقشبەندی، لە ناوچەکانی هەورامان و مەریوان، «سوپای ڕزگاری» ان پێک هێنا.

- بنەماڵەی داود بەگی جاف، کە برایەکیان لە تاران ئیعدام کرا بوو، ئەمانیش هێزێکی چەکداریان لە ناوچەکانی جوانرۆ و ڕەوانسەر دامەزران.

- مەلا شێخ جەلال، لە ناوچەی بانە، کە دواتر «سازمانی خەبات» ی پێک هێنا.

- سمکۆ عەلیار، لە ناوچەی بۆکان.

- عەلی قازی، کوڕی قازی محەممەد، لە ناوچەی سەردەشت - مەهاباد.

عێراق هەزاران پارچە چەکی جۆراوجۆر و، پارەی زۆری پێ دان، هاتوچۆکردنی ئاسان کردن.

سازکا هێشتا هیچ پەیوەندییەکی لە گەڵ حکومەتی عێراق دانەمەزراند بوو.

*

## ناوبژی مامجەلال

مامجەلال دلێری سەید مەجید و مووشیر حەمە غەریبی نارد بۆ تاران. چەند نامەیەکی نووسی بوو بۆ چەند کەسێ لە پێشەواکانی ئێران، لەوانە: ئیمام خومەینی و حسێنی نەوەی، ئایەتوڵڵای حسێن عەلی مونتەزیری و محەممەدی کوڕی، داریوشی فرووهەر، داوای لێ کرد بوون کە شەڕ لە کوردستان دا ڕابگرن و، بە ڕێگای گفتوگۆ کێشەکان چارەسەر بکەن. ئامادەیی خۆی دەربڕی بوو بۆ ناوبژی.

مامجەلال لە ڕۆژانی ٦ - ٧ ی تشرینی یەکەمی ٧٩ لە نەشکۆلان دەستەیەکی ئێرانی بە سەرۆکایەتی فرووهەر دی بوو. پێش ئەوەی ئەمان ببینێ، د. قاسملو و هەندێ لە سەرانی حدکا و، مەلا شێخ عیززەدین و، سەرانی کۆمەڵەی دی بوو.

لەم کۆبوونەوەیەدا دوو مەسەلە باس کرا بوو: جۆری چارەسەری کێشەی کورد لە ئێران دا و، جۆری یارمەتیدانی کوردی عێراق لە خەبات دا دژی ڕژێمی بەعس.

فرووهەر حدکای تاوانبار کرد بوو بە نانەوەی ئاژاوە و شەڕ لە کوردستان دا، وەرگرتنی چەک و پارە لە عێراق و، ناردنی خێزانەکانیان بۆ عێراق. بۆ ئەوەی حکومەتی ئێران شەڕ

راپەگری داوای کرد بۆ مەلا شێخ عەززەدین پەیامێک دەبکا داوای راگرتنی شەر بکا لە پێشمەرگەکانی کوردستان و، بە هیچ جۆری هێرش بۆ سەر ئیمام خومەینی نەکەن، وای دەرخست بۆ کە تەهران ئامادەیە کێشەی کورد بە گفتوگۆ (مزاکەرات) چارەسەر بکا، لە سەر بنچینەی سەلاندنی مافەکانیان، بەلام بە ناوێکی جیاواز لە ناوی خودموختاری.

دەربارەی یەکێتی یش ئامادەیی تەهرانی دەربری بۆ یارمەتی دانی.

مامجەلال دیفاعی لە حدکا کرد بۆ، هۆی ئالۆزانی هەلومەرجی کوردستانی داوە پال رەفتاری پاسداران و، کوشتنی بە کۆمەلی خەلک وەکو رووداوەکەی قارنە و، دادگاکانی خلخالی و، بۆردومانی دێهات و.. بۆی روون کرد بووە کە: حدکا، هێزی سەرەکییە و نەتوانی شەر راپەگری، نەک شێخ عەززەدین و، چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە تەهران دا نیبیتە هۆی بەهێز کردنی خەباتی کوردی عێراق و، خواستەکانی حدکا بریتییە لە:

- ڕێگەدانی قانونیی چالاکی سیاسی حزب.
- بەردانی گیراو و دیلەکانی هەردولا.
- کیشانەوەی پاسدار و، گیرانەوەی هێمنی بۆ کوردستان.

دەربارەی یارمەتیدانی یەکێتی یش، داوای لێ کرد بۆ ڕێگەی بدەن:
- لە تاران «مەکتەب» بکاتەوە.
- ئازوقەو پێویستییەکانی لە بازارەکانی تەهران بکری.
- نەخۆش و بریندارەکانی لە نەخۆشخانەکانی تەهران دا تەداوی بکرێن.
- سەفارەتەکانیان لیزای هاتوچۆی تەهران بە ئەندام و دەستەکانی یەکێتی بدەن.
- ڕێگەی یەکێتی بدەن لە سووریاو لیبیاوە بە ناو ئیران دا چەک بگوێزێتەوە بۆ کوردستان.
- هەندێ لەو چەکانەی لە کاتی ئاشبەتال دا لە کوردی عێراقیان سەندوە بیدەنەوە بە یەکێتی.

لە کاتی هەلگیرسانی شەری ٣ مانگەدا من لە شام خەریکی گەرانەوە بووم بۆ کوردستان. کە گەیشتمە تاران دلێری سەید مەجید، کە نامەکانی مامجەلالی هێنا بو بۆ کاربەدەستانی تەهرانی، هێشتا لە تاران بو. لە تاران گیر نەبووم لە گەل حەمە سەعید چووینە مەهاباد، لەوێ جیپێکمان بە کری گرت بۆ سەردەشت. نەمانزانی لە سەردەشت شەڕە. ملمان پێوە نا رۆیشتین. پێش ئەوەی بگەینە ناو شار لە پادگانەکەوە بە تەقە دایان گرتینەوە. چەند گوللەیەک لە جیپەکەمانی دا. کەسمان بەر نەکەوتین. بە پەلە دابەزین و خۆمان لە چالی کنار جادەکەدا قایم کرد. هالیکۆپتەریش بە ئاسمانەوە ئەفری. شوفێرەکەمان ئێزن دا و، خۆمان بە لاری دا کەوتینە ری بۆ ئێواری گەیشتینە گوندی زێوە. زێوە گوندێکی خۆش و بە سێوە لاسوورە بە ناوبانگ بو. لامان دایە مالێک جێگایان کردینەوە تا بەیانی. بەیانی بەری کەوتین بۆ ناوزەنگ.

*

پۆستەری شەهیدان.

دوای رووخانی شا نیتر تەهران بۆ ئێمە کرابوو. هێشتا حکومەت دەسەلاتی پەیدا نەکرد بووە. هەندێ لە کادرەکانی ئێمە چوونە شارەکانی تەهران. چاپخانەکان هیچ سانسۆرێکیان لە سەر نەبو. هەمو شتێکیان چاپ نەکرد. حەمە سەعید چو بۆ تەهران.

جێگاو ڕێگای پەیدا کرد و، بڵاوکراوەکانی یەکێتی لەوێ چاپ نەکرد. هاوڕێ و کەسوکاری شەهیدەکان بە هەڵپەیانی بوو، هەر کەسە وێنەیەکی دەس کەوت بۆ پۆستەرێکیان بۆ کرد بوو. پۆستەری سەدان شەهید چاپ کرا بوو. زۆر لەم پۆستەرانە نێرانەوە بۆ دێهاتەکانی کوردستانی عێراق هەڵدراسران.

من کە لە سەفەر گەڕامەوە سەیرم کرد دیواری ژوورەکانی بارەگاکەمان بە سەدان پۆستەری پۆشراوە. زۆربەیشیان هی ئەو شەهیدانە بوون کە لە گەڵ خۆمان پێشمەرگە بوون یا ناسیاو بوون. دیمەنێکی سامناکی هەبوو. بە پێشمەرگەکانم وت: «ڕاستە ئەمە بۆ ڕێز لێنان لە شەهیدەکان پێویستە، بەڵام هەرچی بێتە ئەم ژوورەوە، وێنەی ئەم هەمو کوژراوە ببینێ، یەکسەر وورەی ئەڕوخێ».

*

من تازە گەیشت بوومەوە ناوزەنگ، بەفرێکی ئەستوور باری بوو. ڕۆژی ١٨ ی تشرینی یەکەمی ٧٩ جارێکی تر دەستەی نوێنەرایەتی تەهران هاتنەوە بۆ کوردستان. نامەیەکی پەلەی مامجەلالم پێ گەیشت، داوای لێ کرد بووم دەسبەجێ بچم بۆ بنوخەلیفە، بۆ ئەوەی لە گەڵ دەستەی نوێنەرایەتی تەهران بگەڕێمەوە بۆ تاران، بۆ سەرپەرشتی گوێزانەوەی چەک لە دیمەشقەوە بۆ تاران. لە ناو هاوڕێکانی ئەوێ دا هاتوچۆکردن بۆ من ئاسانتر بوو چونکە پاسپۆرتم هەبوو و، بە قانونی هات بوومە ئێرانەوە. مژدەی دابووی کە تەهران موافەقەتی کردوە چەکەکان بە فڕۆکە بگوێزینەوە.

دەسبەجێ بەرەو بنوخەلیفە بە ڕێ کەوتم. هێشتا نوێنەرانی هەردولا لە گەرمەی گفتوگۆدا بوون.

نوێنەرانی تەهران: داریوشی فروهەر، وەزیری کار. سەرتیپ دانشوەر، فەرماندەی ژاندارمەری. سەرتیپ ئازەری فەروغ، فەرماندەی نەیرووی زەمینی. کوڕێکیش بە ناوی کەریمخانی سکرتێری فروهەر بوو.

نوێنەرانی کورد: مەلا شێخ عیززەدینی حوسەینی. فاتیحی شێخولئیسلامی. سەلاحەددینی موهتەدی. ئیبراهیمی عەلی زادە، نوێنەری سازکا و، کوڕێک بە ناوی حەسەنی نوێنەری چریک بوو. لە حدکا کەس نەهات بوو.

منیش چوومە ژوورەکە لە نزیک شێخ عیززەدین دانیشتم. دەمەقاڵێیەکی زۆر گەرم بوو لە نێوان سەلاحەددینی موهتەدی و داریوشی فروهەر دا، هەرلایەکیان ئەوی تری تاوانبار ئەکرد. گفتوگۆکەیان هی شەڕ بوو نەک هی ئاشتبوونەوە. مەلا شێخ عیززەدین لێ ی پرسیم:
«هیچ فارسی ئەزانی؟»

وتم: «بەڵێ!»

وتی: «ئەمە بخوێنەرەوە بزانم ئەزموت چیە؟»

کاغەزێکی دایە دەستم یادداشتێک بوو بە ناوی مەلا شێخ عیززەدینەوە بۆ ئیمام خومەینی و کاربەدەستانی تەهرانی نوسرا بوو. خواستەکانی کوردەیان تێ دا نوسی بوو. دوای ئەوەی خوێندمەوە شێخ عیززەدین پرسی: «ئەزموت چیە؟»

وتم: «ماموستا ئەم یادداشتە هی شەڕە، کە لایەنێکی سەرکەوتو نوسیبێتی، ئەمە ڕێ خوش ناکا بۆ ئاشتی. زۆر توندە. تۆ مەلای و سەرانی شۆڕشی تەهران مەلان، پێویستە بە بەسمەلە دەس پێ بکا و، داواکان بە هەندێ ئایەتی قورئانی پتەو بکەی و، زمانی

یادداشتەکەیش خاو بکرێتەوە»

هەندێ قسەی تریشم کرد. ئەویش یادداشتەکەی بە دڵ نەبوو، بەلام تا ئەو کاتە نەیویست بڕ قسە بکا. بۆ ئەوەی نوێنەرەکانی سازکا و چریک بە «سازشکار» ی دانێن. ئیتر ئەویش کەوتە رونکردنەوەی باری سەرلەبی خۆی. کۆبوونەوەکە بە ئەنجامێکی باش نەگەیشت.

دەستەی نوێنەرایەتی تاران گەڕانەوە. فەوزی راوی و، حەمە سەعید و منیش لە گەڵیان رۆیشتین. پێش ئەوەی بگەینە سەردەشت لە رێگا تاقمی پاسدار هەندێ تەقەیان لێ کردین. پێ ئەچوو ئەوان گفتوگۆی ئاشتییان پێ باش نەبێ. لە سەردەشت چووینە پادگان. لەوێوە بە هەلیکۆپتەر رۆیشتینە سنە و لە سنە فڕۆکەیەکی بچکۆلەیان ئامادە کرد بۆ ئەوە چووینە تاران.

ململانێ ی دەسەلات لە ناو سەرانی شۆرش و سەرانی حکومەت دا بە لادا نەکەوت بوو. بالی دینی نەیویست کاروبار بگرێتە دەست و بالی نەدینی نەیویست شوێنەکانی خۆی لە دەس بدات. نزیکیی لە بالێکیان، بالەکەی تری ئەکرد بە دوژمنی. سەبارەت بە گفتوگۆ لە گەڵ سەرانی کورد و، جۆری چارەسەری کێشەی کورد ناکۆک بوون. هەندێ لە سەرانی بالی دینی ئەیانویست کێشەی کورد بە سەرکوتکردن چارەسەر بکەن و، هەندێک لەوانەی بالی نەدینی ئەیانویست بە گفتوگۆ چارەیەکی بۆ بدۆزنەوە. بەلام هیچ لایەکیان پرۆژە یا بۆچوونێکی دیاریکراویان نەبوو بۆ رەفتار لە گەڵ مەسەلەی کورد.

فرۆهەر لە سەفەرەکەی دا سەرکەوتنی بە دەس نەهێنا بوو. کەوتە بەر هێرشی رەخنەی نەیار و ناحەزەکانی. هەندێ لە رۆژنامەکانی ئەو رۆژانە ناکۆکییەکانی بە ئاشکرا باس ئەکرد.
منیش لە ئوتێلی پارس کەوت بووم، بارەگای حیزبەکەی فرۆهەر: «حیزبی میللەتی ئیران» بە تەنیشت ئوتێلەکەوە بوو. جاروبار ئەچووم بۆ بارەگاکەیان. چەند جاری فرۆهەرم بینی و بیرم ئەخستەوە کە من بۆچی هاتووم. رۆژێکیان وتی سەرێکی دانشوەر بدە. دانشوەر فەرماندەی ژاندارمەری بوو، ئەو زەمانە دەستی زۆر ئەڕۆیشت. چەک و ئازووقە و پارەی لە بەر دەس دا بوو. پارتی لە گەڵ ئەم پەیوەندییان دامەزراند بوو، ئەم یارمەتی ئەدان.

سەری سەرتیپ دانشوەرم دا. فەوزی دانیشوەری ناو نا بوو: «الاعضب» چونکە یەکدەستی هەبوو، بالێکی لە شەڕی عەشایەردا قرتا بوو. بیروراکانی خۆی بۆ رون ئەکردەوە. خۆی بە «پان ئیرانیست» و، کوردی بە ئیرانیی رەسەن و خوێنپاک دائەنا. قینی خۆی لە عەرەب نەئەشاردەوە. ئەیوت: «وەسیەتم کردوە کە مردم ئیسک و پروسکم لە کەناری فورات دا بنێژن چونکە فورات سنووری سروشتیی ئیرانە!»

وتم: «ئێستا من لە گەڵ ئێوە هاتم بۆ ئەوەی کارئاسانیم بۆ بکەن ئەو چەکانەی لە سووریا هەمانە لە رێگای ئیرانەوە بیگوێزمەوە بۆ کوردستان، ئەوە چەند رۆژێکە من لێرە دانیشتووم کەسی لە من ناپرسێتەوە و، وەلامێکم نادەنەوە، تکام وایە رێگایەکم پیشان بدە، بگەڕێمەوە بۆ لای خۆمان یان بمێنمەوە؟ ئەگەر بمێنمەوە چی بکەم؟»

دانشوەر وتی: «ئێوە لە ناوچەکانی سنووردان. حدکا و دوژمنەکانی ئێمە لەو سنوورەوە چەکیان لە عێراقەوە بۆ دێ. تا ئێوە سنوورەکان لە رووی دوژمنەکانی ئێمەدا دانەخەن ئێمە یارمەتیتان نادەین. ئەگەر بەڵێن بدەن کە سنوورەکان دابخەن و، وەکو گرۆهی بارزانی ئێوەش شەڕیان بکەن، من لەو چەکانە زۆر زیاترتان ئەدەمێ کە ئێوە بە ئەمان لە سووریاوە

پەیبانا»

وتم: «ئیستا من بە پێی بەڵێنی خۆتان کە بە ئاغای تاڵەبانیتان دابوو هاتووم بۆ گوێزانەوەی چەک نەک بۆ گفتوگۆی سیاسی. تەهران چوارسەد هەزار سەربازی هەیە سنوورەکانی خۆی پێ لەو تاڵەمانە ناگیرێ، ئێمە هێزێکی پارتیزانیی بچووک چۆن ئەو کارەمان پێ ئەنجام ئەدرێ؟»

تێگەیشتم مانەوەم بێ کەڵکە، بەڵێنەکەیان هیچی لێ سەوز نابێ، منیش گەڕامەوە، وەکو مامە شێخ رەزا ئەڵێ: «ئەمجا بە عاجزی».

ئەگەرچی د. قاسملو بە گەرمی لایەنگری گفتوگۆ بوو، بەڵام لە سەرەتاوە حەزی نەئەکرد، مامجەلال ناوبژیکەر بێ. ئەو دانیشتنانەی مامجەلال رێکی خست بۆ گفتوگۆی تەهرانی - کوردی، نە خۆی بەشداری کرد و، نە نوێنەرێکی دەسەڵاتداری نارد، بەڵکو ژێر بە ژێر هەوڵی ئەدا ئەوی لێ دەربهێنێ و، خۆی و حیزبەکەی بچن بە هێزی سەرەکی گوێ لێ گیراو. حدکا لە بەیروت داوای لە یاسر عەرەفات کرد بوو، کە داوا لە ئیمام خومەینی بکا، شەڕی کوردستان رابگرێ و، کێشەی کورد بە ئاشتی چارەسەر بکا. هەروەها کاربەدەستێکی تەرانیشیان لە سەفاباد فڕاند بوو، دوای ماوەیەک بەریان دابوو بە ریش دا هەواڵیان بۆ کاربەدەستانی تەهران نارد بوو کە حدکا ئامادەیە بۆ موزاکەرات.

*

«هەیئەتی نوماینەدەگی خەلکی کورد»

رۆژی ۲۹ ی تشرینی یەکەمی ۷۹ رادیۆی تاران راگرتنی شەڕی کوردستانی راگەیاند. هەر ڕێکخراوەکان ئەمیان بە هەڵ زانی کادر و پێشمەرگە و ئەندامەکانی خۆیان ناردەوە شارەکان. بارەگای دەفتەری سیاسی حدکا تا ئەو کاتەیش هەر لە ئاشی پشکاوی بوو لە نێوان گوندی شێنی ی عێراق و گوندی گورشەری تەهران دا.

رۆژی ۱ ی تشرینی دووەم کۆبوونەوەیەکی ۳ قۆڵی: یەکێتی، حشع، حدکا لە زەلێ کرا. مامجەلال و د. قاسملو لەم کۆبوونەوەیەدا بەشدار بوون. مامجەلال هەوڵێکی زۆری لە گەڵ نوێنەرانی حدکا دابوو بۆ ئەوەی بە دەستەیەکی یەکگرتوو و، خواستی یەکگرتووەوە بچنە موزاکەراتەوە لە گەڵ نوێنەرانی حکومەتی تەهران.

رۆژی ۱۷ ی تشرینی دووەم، ئیمام خومەینی ئەم پەیامەی بۆ کورد نارد.

*

بسم الله الرحمن الرحيم

سلام بر خواهران و برادران کرد که با وفاداری خود به اسلام و جمهوری اسلامی از توطئه خائنين به کشور جلوگيری کردید. گزارشات هيأت ويژه همانطور بود که متوقع از برادران و خواهران کرد بود، که هرگز خودرا از اسلام و ایران جدا نمی دانند و آنچه بدخواهان به آنان نسبت می دهند چیزی جز افساد و توطئه‌گری نیست. اکنون من باید به شما برادران و خواهران کرد و سایر برادران مطالبی را تذکر دهم:

۱. در این موقع حساس که ملت ما با چپاولگران که در رأس آنها آمریکا مواجه هست و برای احقاق حق خود و به دست آوردن ذخائر هنگفتی که محمد رضا پهلوی به غارت برده و به محاکمه کشیدن این جانی قیام نموده و همه قشرهای ملت با هم در این امر حیاتی متحد و همصدا شده اند و برادران و خواهران کرد ما هرجا هستند باید به طور

اولویت در این امر شرکت کنند و با سایر خواهران و برادران هماهنگ شوند و لازم است از اختلافاتیکه بدخواهان ایجاد می کنند به طور قاطع جلوگیری کنند.

برادران من! امروز هر اختلافی به نفع آمریکا و دیگر أجانب است. آنان هستند که از اختلافات ما بهره گیری می کنند و ما را می خواهند به أسارت بکشند. بپاخیزید و توطئه‌گران را نصیحت کنید و در صورت عدم قبول از خود برانید و از مناطق خود بیرون کنید یا آنانرا گرفته تسلیم مقامات دولتی کنید.

۲. اینجانب و همه ملت از ستمهائیکه به شما برادران کرد در طول حکومت استبدادی شده است و از تبعیض هائی که بر خلاف اسلام بر شما روا داشته‌اند، مطلع هستیم. لیکن باید بدانید که این شما براداران نبودید که مورد ستم و ظلم واقع شدید. سایر برادران ترک و لر و عرب و بلوچ و فارس و ترکمن هم با شما شریک بوده‌اند و همه محروم بودند از آنچه محروم بودید. شما اگر به زاغنشینان و گودنشینان تهران توجه نمائید خواهید دید آنان از همه محروم ترند. اینجانب می دانم که در حکومت موقت هم آنطور که خواست شما و ملت است، رسیدگی نشده، لیکن باید بدانید باز در این امر همه برادران شما شریک می باشند و دولت موقت با کمال جدیت اشتغال به کار سامان دادن بود، لیکن آشفتگیها به قدری زیاد است، که اصلاح محتاج به زمان است. -

و من امیدوارم که برای همه‌ی ملت و برای شما برادران کرد وسائل رفاه حاصل شود. شما برادران می دانید که نوسازی و عمران در محیطی که آشفته است و مردم در امان نیستند، مشکل یا غیر ممکن است. شما برادران غرب کوشش کنید و آرامش خودرا حفظ کنید و بدانید که با ارامش کارها اصلاح می شود و به صلاح شما و به صلاح اسلام و مسلمین است.

۳. از هیأت ویژه می خواهم که به مذاکرات خود با کمال حسن نیت ادامه دهند، و با شخصیتهای مذهبی و سیاسی و ملی و سایر قشرها تماس بگیرند، تا تامین خواستهای آنان که خواست ما نیز هست، به طور دلخواه بشود و آرامش و امن که از بزرگترین نعمتهای الهی است در منطقه برقرار گردد، و شما برادران کرد در کنار سایر برادران به طور رفاه و آسایش زندگی نموده و طمع اجانب برای همیشه از کشورمان قطع شود.

٤. اسلام بزرگ تمام تبعیض هارا محکوم نموده و برای هیچ گروهی ویژگی خاصی قرار نداده و تقوا و تعهد اسلام تنها کرامت انسانها است، و در پناه اسلام و جمهوری اسلامی حق اداره‌ی امور داخلی و محلی و رفع هرگونه تبعیض فرهنگی و اقتصادی و سیاسی متعلق به تمام قشرهای ملت است منجمله برادران کرد، که دولت جمهوری اسلامی موظف و متعهد به تامین آن در اسرع وقت می باشد و مقررات و قوانین مربوط به آن به زودی انشا ءالله تعالی تدوین می شود.

۵. اخیرا باز نظر شریف علماء اعلام و مشایخ عظام و روشنفکران و سایر برادران عزیز در سراسر ایران را به موضع حساس امروز ایران و جبهه‌گیریهای دشمنان میهن و اسلام و در مقابل ملت عزیز و تشبثات همه جانبه‌ی آنان برای سرکوبی نهضت اسلامی و ملت معظم و برای اعاده‌ی همه جانبه بر کشور اسلامی ما جلب می کنیم، آیا در این موقع تقاضای متواضعانه‌ی این خدمتگزار که روزهای آخر عمرش را می گذراند، به جا

نیست!

٦. خواهران و برادران هم میهن در سراسر کشور، من دست خودرا به پیش شما دراز می کنم، و از شما به خاطر خدا و اسلام و کشور عاجزانه می خواهم که تمام توان خودرا برای نجات کشورتان به کار برید. و اسلحه‌های سرد و گرم یعنی قلم و بیان و مسلسل را از نشانه‌گیری به روی یکدیگر منحرف و به سوی دشمنهای انسانیت که در راس آن امریکا است نشانه روید. باری الهی من ماموریت خودرا که نصیحت به ملت است به قدر توان ضعیف خود الهام دادم، و تو ای خدای بزرگ با قدرت لایزال خود قلوب ملت مارا پیوند برادرانه عطا نمود. آنک قریب مجیب. سلام گرم من به ملت عزیز و برادران کرد و رحمت خداوند بر همه. روح الله الموسوی الخمینی

۲٦ آبان ۵۸ - ۲٦ ذیحجه ۹۹

*

قسەکانی ئیمام خومەینی وەکو قسەی هیچ یەکی لە کاربەدەستانی ئیران نەبو. قسەکانی ئەم بە حوکمی شەرعی دائەنرا. کەس نەیئەتوانی بە ئاشکرا دژی راوەستێ. ئەم پەیامەی پێشەوای ئینقیلاب زۆر گرنگ و، مەسەلەی زۆر گرنگی تێ دا بو، لەوانە:

١. سڵاندنی زۆرلێکراوی و چەوساوەیی کورد.

٢. سڵاندنی مافی کورد بۆ بەڕێوەبردنی خۆی لە ناوچەکانی خۆی دا.

١. راگرتنی شەری راگەیاندن و شەری تفەنگ.

٢. گفتوگۆی سیاسی لە گەڵ کەسایەتی دینی و نەتەوەیی و سیاسی کورد بۆ چارەسەرکردنی کیشەکەی.

*

چەند رۆژێ دوای ئەوە، د. قاسملو لە ئاشتی پشکاری وە چوەوە مەهاباد، لە خۆپیشاندانێکی گەورەدا پشتیوانی لە پەیامەکەی ئیمام کرد و، لە قسەکانی دا وتی: «ما بە پیام امام لبیک میگوئیم..» و، ئیتر خۆیان ئامادە کرد بۆ گفتوگۆ.

*

حدکا، لە گەڵ شیخ عیززەدین و سازکا و چریک ریک کەوتن و دەستەیەکی هاوبەشی نوینەرایەتی بە ناوی: «هەیئەتی نوماینەدگی خەلقی کورد» پیک بهینان. لە سەرەتاوە دیاربو گفتوگۆی کورد و ئیران بە ئەنجام ناگات. هیچ لایەکیان باوەری بەوی تر نەبو. چریک، شاخەی کوردستانی دامەزراند بو، چارەسەرکردنی کیشەی کوردی بە لاوە گرنگ نەبو، بەڵکو ئەیویست کەڵک لە کوردستان وەربگری وەکو بنکەیەک بۆ چالاکیەکانی خۆی و، کەڵک لە کیشەی کورد وەربگری وەکو گوشاریک بۆ سەر داوودەزگای ناوەندی لە تاران. سازکاش، باوەریان بەوە نەبو، بە گفتوگۆ لە گەڵ داوودەزگای دینی ئیران بگەنە هیچ جورە چارەسەریکی ئاشتی کیشەی کورد، بەڵکو خۆیان ئەیانوت، لەم گفتوگۆیانەدا بەشداری ئەکەن بۆ «ئیفشاگەری»، واتە بو ریسواکردنی رژێم! حدکا تووشی چەند هیزێکی توندرەو ببو، هەمو ئەرمەیەکی ئەمیان بە «سازشکاری» لە قەڵەم ئەدا و، ئەیانکرد بە کەرەستەی پروپاگاندە دژی.

سەرئەنجام هەیئەتی نومایندەگی خەلقی کورد لە: ٤ ئەندامی حدکا، ٢ ئەندامی سازکا، ٢ ئەندامی چریک، بە سەروکایەتی مەلا شیخ عیززەدین پیک هات. ئەندامیکی

حدکا، قسەکەری رەسمیی «سخنگو» بو.

ئەم هەیئەتە پرۆژەیەکی ۲٦ ماددەییان ئامادە کرد کە بیی بە بنچینەی گفتوگۆ لە گەڵ نوینەرانی دەولەت.

*

## خواستەکانی کورد

خواستەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد لە ئیران دا، لە پایەتی ئەو خواستانە بو کە چەند ساڵ بو کورد لە عیراق دا داوای ئەکرد. بە کورتی ئەمانە بو:

۱. سەلماندنی مافی نەتەوەیی کورد لە سەر بنچینەی ئوتونومی (خودموختاری).

۲. دیاریکردنی سنوری کوردستانی ئیران لە سەر بنچینەی زورایەتی دانیشتوانی ناوچەکە.

۳. هەلبژاردنی «شورا» ی ئوتونومی کوردستان بە دەنگدانی نهینی و راستەوخو، ئەویش بۆ راپەراندنی کاروباری بەریوەبەرایەتی، ئابوری، روشنبیری، کومەلایەتی، ئاسایشی ناوخو.. «هەیئەتی ئیجرائی» داپەزرینی.

٤. کوردی ببیتە زمانی رەسمیی خویندن و بەریوەبەرایەتی.

ئەمە ناوەروکی خواستە نەتەوەییەکانیان بو، جا هەندی جار بە پرۆژەی ۸ ماددەیی و هەندی جار بە ٦ ماددەیی و، هەندی جاری تر بە پرۆژەی ۲٦ ماددەیی دەربیان ئەبری.

*

«هەیئەتی حوسنی نیهەت» کە نوینەری دەولەت بو بۆ گفتوگۆ لە گەڵ سەرانی کورد لە دواهەفتەی مانگی کانونی یەکەمی ۱۹۷۹ دا «طرح خودگردانی» لە روژنامەکانی تاران دا بلاو کردەوە. کوردەکانی ئیران هەروەزو ناویان لی نا «طرح سرگردانی». ئەم پرۆژەیە خواستەکانی کوردی بە دی نەئەهینا، بەلام لە چاو تیگەیشتنی سیاسی حوکمرانەکانی ئیران دا هەنگاویک بو بۆ پیشەوە، ئەوە جاری یەکەم بو «دەسەلاتی ناوەندی» لە تاران ئامادە بی هەندی لە دەسەلاتەکانی خوی بە ئوستانەکان ببەخشی و، جوری، یا کەم و کورتیش بی، لە «نەتەوەییتی» بسەلمینی.

گەورەترین کەموکوری ئەم پرۆژەیە لەوەدا بو دابەشبوونی بەریوەبەرایەتی ناوچە کوردنشینەکانی وەکو خوی هیشت بووەوە، هەموویانی یەک نەخست بو لە یەک ناوچەی بەریوەبەرایەتی دا. بەلام بە گویرەی ئەم پرۆژەیە نەکرا زمانی کوردی لە پاڵ زمانی فارسی دا بۆ کاروباری حکومەتی بەکار بهینری و، روژنامە و بەرنامەی رادیو و تەلەفزیونی پی ئامادە بکری و. ئاسایشی ناوخۆ بە دەزگای ناوچەیی سپەردرا بو.

لە گەڵ دەسپیکردنەوەی شەردا لە کوردستان ئەم پرۆژەیەش مرد.

*

ئیران ولاتیکی فرە نەتەوەیە، کاربەدەستەکانی لە کونەوە ترسیکی زوریان لە پارچە پارچە بونی هەیە و، ئەم ترسەیان کردوە بە بیانوی سەرکوتکردنی بزوتنەوەی نەتەوەکانی ئیران و، خواستە نەتەوەییەکانیان سەبارەت بە بە کارهینانی زمانی نەتەوەیی. لە ئیران دا چەندین نەتەوە و رەگەزی جیاواز هەیە: فارس، ئازەری، کورد، بلوچی، تورکومان، عەرەب.. سەرەرای ئەمانەش هەندی قەومی هن خویان بە هیچ کام لەم نەتەوانە نازانن وەکو لور، گیلەکی.. لە ناو ئەم نەتەوانەدا ئازەری بە ژمارە لە هەموویان زورترن، ئەگەرچی لە

دوای دووەمین جەنگی جیهانی جمهوورییەتی ئازەربایجانیان دروست کرد و، دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران، هەم حیزبی توودە فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانی دروست کردەوە و، هەم حەدکا و نەتەوەپەرستەکانی حیزبێکی تایبەتییان بە ئازەربایجان دروست کرد، بەڵام بزووتنەوەی نەتەوەیی ئازەری، وا بە هێز و تەوژم نەبوو وەکو بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەک:

١. ئەگەرچی ئێران بە ناو بە دەوڵەتی فارس ناسراوە، بەڵام لە کۆنەوە زنجیرەی ئازەرییەکان حوکمی ئێرانیان کردوە؛ سەفەوی، ئەفشار، قاجار.. کە چەند سەدە حوکمڕانی ئێران بوون هەموویان ئازەری بوون، لە ناو ئەوانەدا دوجار حوکمڕانی لە دەس زنجیرەی ئازەری دەرهاتوە؛ جارێکیان سەردەمی زەندیەی زەند، کە بە ڕیچەڵەک کورد بوون، جارێکی تر سەردەمی پەهلەوی، کە بە ڕیچەڵەک خەڵکی شمالی ئێران بوون.

فارس زووتر لەوەی نەتەوەی حوکمڕان بێ، زمانەکەی زمانی ئەدەب و فەرهەنگ و حوکم بوە.

٢. ئازەرییەکان، هەمیشە و بە درێژایی زەمان، لە دەزگای حوکمڕانی دا دەسەڵاتدار و زاڵ بوون، ژمارەیەکی زۆری وەزیر، ئوستاندار، ئەفسەرانی ئەرتەش، ژاندارمەری، ساواک ئازەری بوون. بەشێکی گرنگی بازار و بازرگانی و پیشەسازی سەرانسەری ئێران بە دەس ئەوانەوە بوە. لە دامەزراوی شیعەدا ئازەرییەکان هەمیشە دەسەڵاتدار و خاوەن نفوز بوون.

ئەم هۆیانە وایان کردوە، ئازەری هەست بە چەوسانەوەی نەتەوەیی بەرامبەر بە دەوڵەتی ئێران و، بە چەوسانەوەی مەزهەبی بەرامبەر دامەزراوی دینیی شیعە نەکەن.

لە بەرامبەر ئەمەدا نەتەوە بچووکەکانی تر؛ کورد، بلوچ، تورکمان، عەرەب.. لە ئێران دا، بە مەزهەب سوننی بوون و، لە دلوودەزگای حوکمڕانی دا بێ بەش بوون و، لە بازار و بازرگانی دا دوورێکیان نەبوو.

دوای سەرکەوتنی شۆڕش، هەروەکو کورد داوای مافی نەتەوەیی ئەکرد، بزووتنەوەی نەتەوەیی لە بلوچستان، گومبەدسەحرا، گومبەدکاوس، خوزستان تەقییەوە و، هاودەنگ لە گەڵ کورد ئەوانیش داوای مافەکانی خۆیان ئەکرد. بەڵام جوڵانەوەکانی ئەوان زووتر لە هی کورد دامرکێنرایەوە، چونکە؛

١. ئەو پیشینە مێژوییە درێژەی جوڵانەوەی کورد هەیبوو، ئەوان نەیان بوو.

٢. بە ژمارە لە کورد کەمتر بوون.

٣. هەلکەوتی جوگرافی شوێنەکانیان، لە چاو هی کوردستانی ئێران دا، خراپتر بوو.

## پێکهێنانی حسک

دوای جیابوونەوەیان: «بزووتنەوە» و «کۆمیتەی ئامادە کردن» تا مانگی ئاب، بە کردەوە یەکیان نەگرت بوو. کۆمیتەیەکی هاوبەشیان دروست کرد بۆ سەرپەرشتی کاروبارەکانی ئەکرد. لە ڕۆژانی ٣ - ٦ ی ئابی ٧٩ کۆبوونەوەیەکی فراوانیان بە کادرەکانی بزووتنەوە و کۆمیتەی ئامادە کردن کرد و پاسۆکیشیان بانگ کرد. لەم کۆبوونەوەیەدا ناوی ڕێکخراوەکەیان نا: «حیزبی سۆسیالیستی یەکگرتوی کوردستان؛ حسیک» و، سەرکردایەتی حیزبەکەیان دیاری کرد.

ئەمانە لە ناو خۆیان دا ناتەبا بوون، کاغەزی یەکتریان نەئەخوێندەوە، کەسیان خۆی

لەوی تریان بە کەمتر ئەئەزانی، زۆرجار لە پاشملە گاڵتەیان بە یەکتری ئەکرد. هەر لە بەر ئەوە کە نامەیان بۆ حیزبێکی تر ئەنووسی ٣ کەس ئیمزای ئەکرد و، کە ئەچوون بۆ کۆبوونەوەیەکی هاوبەش لە گەڵ حیزبێکی کەدا زۆربیان ئەچوون. د. مەحمود و رەسوڵ مامەند هەر کەسەیان خۆی بە شایستەی ئەوە ئەزانی کەسی یەکەمی حیزب بێ. بەڵام هێزی راستەقینە هی رەسوڵ بوو. د. مەحمود هێزێکی ئەوتۆی نەخستبووە سەر هێزەکەی رەسوڵ.

*

جیابوونەوەی چەکدارەکانی بزووتنەوە، لەشکرێکی تری لە کوردستان زیاد کرد و، بیری یەکخستنی چەکدارانی هەموو حیزبەکان، لە «یەک لەشکری یەکگرتوو» دا، کە لە سەرەتای دامەزراندنی یەکێتیەوە باس ئەکرا و، ئەمانویست هەموو لایەنەکان بەم بیرە قانیع بکەین، بە یەکجاری داروخا. لەوە بە دواوە کوردستان بەرەو «فرە - لەشکری» رۆیشت. جگە لە پدک کە هەر لە سەرەتاوە لەشکری خۆی هەبو، حیزبەکانی تریش: حسک، پاسۆک، حشع و، دوایی تریش هێزەکانی سەر بە تیهران و، گەل.. هەر یەکەیان میلیشیای تایبەتی خۆی دروست کرد. فرە - لەشکری، هۆی سەرەکی شەری ناوخۆ بوو. راستە ناکۆکیەکان هەمیشە لە سەرچاوەی سیاسیەوە هەڵئەقوڵین، بەڵام ئەگەر ئەم حیزبانە لەشکری تایبەتی خۆیاتیان نەبوایە، ئەیانئەتوانی پەنا بەرنە بەر شەری چەکدار بۆ بەلاداخستنی ناکۆکیەکانیان، کە زۆرجار سیاسی نەبوون.

*

- لەشکرەکەی حسک، کە دوای لەشکرەکەی یەکێتی، لە چاو هەموو لەشکرەکانی ترا بە ژمارە زۆرتر بوو، تەنیا بۆ ئەوەی زۆر بن و بالادەستی پەیدا بکەن. جێگەی هەموو جۆرە کەسێکیان لە ریزەکانی خۆیان دا ئەکردەوە، بێ ئەوەی گوێ بدەنە رابووردوی و، مەبەستی راستەقینەی لە هاتنی بۆ پێشمەرگایەتی.
- لەشکرەکەی حسک بۆ بە پەناگای دالدەدانی هەموو ئەوانەی لە دەس لێپرسینەوەی حیزبی، لە ناو حیزبەکانی ترەوە، رایان ئەکرد.
- سەرکردایەتی حیزبەکە توانای دارایی ژیاندنی لەشکرەکەی نەبوو، چاوپۆشی لێ ئەکردن بۆ دابینکردنی ژیانی خۆیان و پێویستیەکانیان، بە ناوی جیا جیاوە، بە زۆر پارە لە خەلک بسێنن و، راووروت بکەن.
- فەرماندە و پێشمەرگەکانی لەشکرەکە گوێیان لە فەرمان و ئامۆژگاری سەرکردایەتیەکەیان نەئەگرت، ناوی حسکیان وەکو چەترێکی سیاسی بە کار ئەهێنا بۆ ئەوەی بە ئازادی و بێ ترسی لێپرسینەوە، چیبان ئەوێ بیکەن. سەرکردایەتی حیزبەکەیش دەستی بە سەر لەشکرەکەی دا نەئەرۆیشت و، بۆ ئەوەی لە ژێر چەترەکەی دا بێننەوە چاوپۆشی لە خراپەکانیان ئەکرد.

*

حسک لەو شوێنانەی جۆری لە بالادەستی هەبو هێزەکانی یەکێتی دەرئەکرد. سەید کاکە لەم روەوە لە هەمویان زیاتر توندوتیژ بوو. لە چەند جێگای وەکو بیدەلان لە ناوچەی سەرکردایەتی، خۆشناوەتی، دەشتی هەولێر، بناری کۆسرەت.. هێزەکانی یەکێتی دەرکرد و، لە چەند جێگایەک چەکی ئەکردن و، لێ ی ئەکوشتن. هێزە راونراوەکان، هەندێکیان بە چەک کراوی، ئەهاتنەوە بۆ ناوزەنگ.

*

لە پەراوێزی ئەو کۆبونەوانەدا کە لە سەر داوای حدکا ئەکرلو، یەنک و حشع و حسک بەشداریەیان تێ دا ئەکرد، نوێنەرانی یەنک: عەلی عەزیز و فازل کەریم و، نوێنەری حسک: حاجی حاجی برایم ڕۆژی ٤ ی ئەیلولی ٧٩ لە پێنوخەلەف کۆبونەوە. هەردولایان ڕێککەوت بون لە سەر ئەوەی لەمەولا زو زو یەکتری ببینن، هەوڵ بدەن باوەڕکردن بە یەکتری بێنا بکەنەوە، هاوکاری یەکتری بکەن، ناکۆکیەکان بە گفتوگۆی برایانە چارەسەر بکەن و، هەڵوێستیان بەرامبەر ڕژێم یەک بخەن. بڕیاریان دایە هەردولا بلاوکراوەی ناوخۆ بۆ ڕێکخستن و پێشمەرگەکانیان بلاو بکەنەوە بۆ ئەوەی بەم گیانە کار بکەن.

*

شەفیق زاهیر و سەرباز ئەحمەد هەردوکیان کۆیی و هەردوکیان ئەندامی بزوتنەوە بون. لە سەر کێشەیەکی خێزانی لە ناو خۆیان دا ناکۆک بون بە دوای یەکتری دا ئەگەڕان بۆ کوشتن. لە جیابونەوەی بزوتنەوەدا ئەوانیش لە یەکێتی جیا بوبونەوە. هەردوکیان فەرماندەی کەرت بون. پاش ماوەیەک شەفیق گەڕایەوە ناو یەکێتی. شەفیق و سەرباز لە گوندی شرشکە لە بناری کۆسرەت توشی یەک ئەبن و ئەبێ بە شەڕیان. چەند کەسێکیان لە یەکتری کوشت و بریندار کرد. ئەم ڕوداوە هیچ پەیوەندیەکی بە کێشەی سیاسی یەکێتی و حسکەوە نەبو. سەید کاکە کردی بە بیانو و لەشکری کۆ کردەوە چو بۆ دۆلی جافەتی. لە پاخسەمەر ڕۆژی ١١ ی ئابی ٧٩ هەلی کوتایە سەر هێزێکی یەکێتی پێشمەرگەیەکی کوشت و چەند کەسێکی تریشی بریندار کرد. یەکێتی لەو ناوچەیەدا بەهێز بو بە سەید کاکە چار نەئەکرا. لە بەر ئەوە هەر زو لەو ناوچەیە کشایەوە بۆ بەری کۆسرەت و خۆشناوەتی.

دوای جیابونەوەی بزوتنەوە، یەکێتی لە دەشتی هەولێر و خۆشناوەتی لاواز ببو. سەرانی حسک ئەیانویست هەولێر بۆ خۆیان پاوان بکەن و، کادر و پێشمەرگەکانی یەکێتی لێ دەربکەن. شەڕیان بە مەفرەزەکانی یەکێتی ئەفرۆشت. چەکیان ئەکردن و لە ناوچەکە دەریان ئەکردن. چەند جاری ئەم ڕوداوانە دوبارە ئەبونەوە. بۆ ئەوەی یەکێتی لەو ناوچەیەدا هەڵبستێتەوە و، حسک زات نەکا پەلاماریان بدا. کادر و پێشمەرگەکانی هەولێر کۆ کرانەوە و سەید مجید کرا بە لێپرسراویان. سەلاح چاوشین و هێزێکیشیان بۆ پشتیوانی لە گەڵ ناردن. ئەم هێزە تێکەلاو و بێ سەروبەر بو. فەرماندەکانیان کەسیان بە قسەی ئەوی تریانی نەئەکرد بو. هەندێکیان تازە هات بونە شاخ ئەجروبەی پێشمەرگایەتیان نەبو. بە کۆمەڵ لە نازەنین پاڵیان لێ دابوەوە. سەید کاکە هەمو هێزەکانی خۆیانی لە سەر کۆ کردنەوە و، شەوی ٥ ی ئەیلولی ٧٩ لە ناکاو لە نازەنین چوە سەریان. هێزەکەی یەکێتی پەرەوازە کرد. هەندێکیان گیران و هەندێکیان دەرباز بون. دو ڕۆژ دوای ئەوە مەفرەزەیەکی یەکێتی لە ناوەگرد خۆی قایم کرد بو چوە سەر ئەوانیش. هەندێکی لێ کوشتن و هەندێکی لێ بریندار کردن. ئەمە جەزرەبەیەکی کاریگەر بو حسک لە یەکێتی سرەواند. ئەیویست دەس بە سەر ناوچەکەدا بگرێ.

*

حەمەی حاجی مەحمود، ئەوسا فەرماندەی هەرێمی ١ ی شارەزور و هەورامانی

یەکێتی بو، هەلی دەستدرێژییەکانی سەید کاکەی بە دەرفەت زانی، ئەویش لە ۲۳ ی ئەیلول دا هەلی کوتایە سەر بارەگای عوسمانی قالە مندوەر لە بلەکی لە ناوچەی بانە. بارەگاکەی گرت و، چەکدارەکانی هەمو چەک کرد. تەنیا عوسمان و یەک پێشمەرگە دەرباز بون. حەمە ئەم کارەی لە خۆیەوە کرد بو، سەرکردایەتی یەکێتی ئاگادار نەبون. گوایە ئەمەی لە تۆلەی کارەکانی سەید کاکەدا کرد بو، رەنگە بیانوەکەی راست بوبێ، بەلام راستیەکەی ئەوە بو: تەماعی کرد بوە چەکەکانی هێزەکەی عوسمان.

*

هەر لەو ماوەیەدا پەیوەندیەکانیان لە گەل حکومەت دامەزراند بۆ دەستپێکردنی گفتوگۆ. رۆژی ۳۰ ی ئەیلولی ۷۹ وەفدیان بە رێ کەوت بۆ بەغداد.

بە کردەوە ئەو رێککەوتنەی لە گەل حاجی لە بنوخلەف کرا بو، هیچ نرخێکی نەما.

*

## گفتوگۆی حسک – بەعس

سەرەتای مانگی تشرینی یەکەمی ۷۹ دەستەی نوێنەرایەتی حسک کە پێک هات بو لە د. مەحمود و عەدنان موفتی لە قەلادزەوە بران بۆ کەرکوک و، لەوێشەوە بۆ بەغداد. لەم چونەدا سەعدون شاکیر، وەزیری کاروباری ناوەوە و، د. فاضیل بەرراک، بەرێوەبەری گشتی ئاسایش و، دوای ئەوانیش صەددام حسێنیان بینی بو. چەند مانگی بو صەددام ببو بە سەرۆکی کومار.

پێ ناچی هیچ لایەکیان پرۆژەیەکی دیاریکراوی هەبوبێ بۆ چارەسەری کێشەی کورد، چونکە هیچ لایەکیان شتێکی نوسراوی بلاو نەکردەوە، تەنیا قسە و باسی گشتیان کرد بو. صەددام داوای لێ کرد بون دەس هەلبگرن لە خەباتی چەکدار و بگەرێنەوە ژێر بالی حکومەت. بەلام بەلێنی هیچ دەسکەوتێکی سیاسی پێ نەدا بون.

یەکێتی و حشع لەم کارەی حسک پەشۆکان. بە جوتە یاداشتێکیان لە ۱ ی تشرینی دوەمی ۷۹ دا دا بە حسک، یاداشتەکە توند و، بە زمانێکی رەق نوسرا بو، پەشۆکان و توڕەیی هەردو حیزب لە ناوەرۆکی یاداشتەکەدا ئەخوێنرێتەوە. داوایان لە حسک کرد بو دەس لە گفتوگۆی یەکلایەنی هەلبگری و، ناکۆکیەکانی لە گەل یەکێتی بە رێگای گفتوگو چارەسەر بکا و، شان بە شانی ئەوان خەبات بکا بۆ روخاندنی رژێمی دیکتاتوری عیراق.

د. مەحمود لە دوای گەرانەوەی مامجەلالی لە شێنێ دی. د. مەحمود ویست بوی مامجەلال ئیقناع بکا، یەکێتی یش لە گفتوگۆکەدا بەشدار بێ، مامجەلالیش ویست بوی د. مەحمود ئیقناع بکا واز لە گفتوگۆ بهێنێ. جەلالی حاجی حسێن، نوێنەری پاسۆک، لەم دانیشتنەدا بەشدار ببو.

د. مەحمود هەوالەکانی ئەم سەفەرەی بۆ فەوزی راوی، نوێنەری بەعسی سەر بە سوریا و، بۆ نوێنەرانی حشع، بە جیا گێرابوەوە، لای هەریەکێکیان جۆرێ لە بەهانەی هێنا بوەوە بۆ گفتوگۆی بە تەنیای خۆیان لە گەل بەعس و، بەلام ترسی خۆیانی لە یەکێتی کرد بو بە بیانوی سەرەکی.

دوای ئەم سەفەرە، ئیتر د. مەحمود نەچوەوە بۆ بەغداد بەلام پەیوەندیان هەر ئەبری

بوو. لە بەعس نائومێد نەبوبوون و، پروپاگاندەیان بۆ کەلکی ڕێککەوتن ئەکرد. هەندێ لە
پێشمەرگەکانیان، بەم هیوایە، پشتیان لێ کرد بووەوە بێ ترس لە هێرشی بەعس ئەگەڕان.
ڕۆژی ۲۰ ی کانوونی یەکەمی ۷۹ جەیش لە دۆڵی سماقوولی پەلاماری دان. سەید سەلیم،
فەرماندەی هەرێمەکە و، شێخەی بولی، یەکێ لە فەرماندەی کەرتەکانیان و، چەند
پێشمەرگەیەکی کە کوژران. ئیتر ئەمە هیچ هیوایەکی بە گفتوگۆ نەهێشت.

دواتر حسک بە بەیانێکی درێژ سەرنەگرتنی گفتوگۆکەیانی ڕاگەیاند. ئەو هیوایەی
هەیان بوو بە چارەسەری سیاسی نەهاتە دی و، ئەو ڕاهێنەیەی کە لە سەرەتاوە هەیان بوو،
دەربارەی ئامادەیی بەعس بۆ چارەسەری سیاسی هێمنانەی کێشەی کورد و، نائامادەیی
یەکێتی بۆ بە دەنگەوەچوونی، لە تاقیکردنەوەی خۆیان دا ناڕاست دەرچوو. هەرچەندە ئەوان
ئەیانوت: «لەم گفتوگۆیەدا ئەگەر هەموومان، بە تایبەتی حسک و یەکێتی، پێکەوە بووینایە،
بەعس ئەهاتە پێشەوە». بەڵام ئەمە بەهانە بوو بۆ پاساودانی سەرنەگرتنی گفتوگۆکە.

سەرنەگرتنی ئەم گفتوگۆیە هەر لە سەرەتاوە چاوەڕوان ئەکرا. لەو کاتەدا عیراق بە
هێز و جوڵانەوەی کورد لاواز بوو. تەرازووی هێزی سیاسی و چەکدار نابەرامبەرێکی گەورەی
تێ دا بوو. جوڵانەوەی کورد لە ناو خۆی دا ناکۆک و ناتەبا بوو. پشتیوان و پارێزەری
نەبوو. حسک پێش هێزێکی سیاسی چەکداری بچووک بوو، نەیئەتوانی نوێنەرایەتی هەموو
جوڵانەوەی کورد بکا. بەعسیش ئامادە نەبوو، هیچ دەسکەوتێکی سیاسی ڕاستەقینە بە
کورد بدا.

•

## شەفیق و قوڕە بەرازە

ڕۆژی ۱۱ ی ئابی ۱۹۷۹ هێزێکی گەورەی حکومەت هێرشێکی گەورەی ئەرزی و
ئاسمانیان کرد بۆ سەر تاڵمی لە پێشمەرگەکانی یەکێتی لە گوندی قوڕە بەرازە لە دەشتی
کۆیە. لەم شەڕەدا ۱٤ پێشمەرگە کوژران و ٥ یان بە دیل گیران. لە ناو کوژراوەکان دا:
شەفیق زاهیر، مەولود شینە، عارف، محەمەد قادر، ئاوەبر عومەر، ئازاد ڕەفیق نانەوا،
حەمەیز ئیبراهیم، ئەنوەر ئازەنینی، فەرهاد فەتحوڵڵا، جەعفەر سەعید عەباس، سەعید
تەلتەفلی، عومەر ڕەفیق و، دوو پێشمەرگەی سلێمانی ناویان ئەحمەد و شاکیر بوو.

ئەمە جەنگەیەکی کاریگەر بوو لە یەکێتی لە ناوچەی کۆیە، بە تایبەتی لەو کاتەدا
کە بە هۆی جیابوونەوەی حسکەوە، هەرێمەکانی پێشمەرگە پشێوانی تێ کەوت بوو. لە ناو
ئەم پۆلە تێکۆشەرەدا تاڵمی کادری پێشمەرگەیی و ڕێکخراوەییان تێ دا بوو. شەفیق
فەرماندەی پێشمەرگەکانی کۆیە و، ئاوەبر کادری ڕێکخراوەیی کۆمەڵە و حەمەیز کادری
ڕێکخراوەیی بزووتنەوە بوو.

شەفیق چوارەمین کەسی خێزانەکەیان بوو لەم ڕێ یەدا سەر دانێ. زاهیری باوکی و،
توفیقی برای لە شەڕدا کوژرا بوون و، ڕەفیقی برای بەعس لە سێدارەی دا بوو.

شەڕەکە بە ڕێکەوت ڕۆژی پێش دەرچوونی «عەفوی عام» بوو. کاربەدەستانی
ئیستیخبارات ئاگادار بوون «عەفو» بە ڕێگاوەیە. بۆ ئەوەی دیلەکان بەر عەفو نەکەون، لە
ناو سەربازگەکەی کۆیەدا هەر پێنجیان گوللە باران کرد بوون.

•

### کیتلەی سپجن

سەددام بە بۆنەی، ئەوەوە کە تازە ببوو بە سەرکۆماری عیراق لە ساڵی ١٩٧٩ دا چەند «عەفو» یەکی دەرکرد. یەکێکیان «عەفوی عام» بوو لە گیراوەکان. هاوڕێکانی ئێمە کە لە زیندانی ئەبو غرێب بوون لە بەغداد و، هەندێ لەو کەسانەی لە «رەدەعەی ئیعدام» ی زیندانی مووسڵ دا بوون، بە تایبەتی دیلەکانی پێشمەرگە، ئازاد کران. بۆ ئێمە ئەمە هەواڵێکی زۆر خۆش بوو. کۆمەڵی کادری ژیر و تێگەیشتوی تێکۆشەر لە زیندان بەربوون، تین و تاوێکی تازەیان ئەدا بە ڕێکخراوەکە و جوڵانەوەکە.

ڕۆژێکیان لە بن دیواری بە وشکە کەڵەک هەڵچنراوی پارەگاکەمان دا لە بەر بەرۆژکە خۆم هەڵخستبوو، لە پڕ یەکێ سڵاوی کرد، هیچ شتێکی تایبەتی ئەبو سەرنجی من ڕانەکێشی، بە جۆرێکی ئاسایی وەڵامم دایەوە. ئەو چاوەڕوانی پێشوازییەکی گەرمتر بوو، وتی: «کوڕی باش ئەلی ی ناماناسیتەوە؟» سەرم هەڵبڕی و باش لێی ورد بوومەوە، سەیرم کرد عومەری سەید عەلی بوو. هەستام باوەشم پیا کرد و ئەملاو ئەولای یەکتریمان ماچ کرد. سەید عومەر باسی کرد کە هاوڕێیانی تریش بە ڕێگاوەن و، بۆ ئەوەی هەموویان بە سەلامەتی بگەن هەر یەکەیان بە ڕێگایەک دا هاتوە.

هاوڕێیانی زیندان، کە دوایەتر پێیان ئەوتن: «کیتلەی سپجن» یەک یەک و دوو دوو ئەگەیشتن. فەرەیدون عەبدولقادر و پاکیزەی هاوسەری و، دارای شێخ نووری و نەرمینی هاوسەری و ڕوناکی دەزگیرانی مەلا بەختیار و، ئاوات عەبدولغەفور و پرشنگی هاوسەری و، ئەرسەلان و بەخشانی دەزگیرانی، ئەوانەش کە سڵت بوون وەکو: عەلی پچکۆل، جەبار فەرمان، ئەنوەر حەسەن بە تەنیا، گەیشتن. ئەوانە خێزانەکانیان، لە ترسی گرتن، لە گەڵ خۆیان هێنا بوو. ئەمەش یەکەمجار بوو ئافرەت بێتە ناوچەی سەرکردایەتی. تا ئەو کاتە ئاوزەنگ کۆمەڵێکی داخراو بوو بۆ پیاوان، ئیتر ئافرەتیشی تێکەوت.

بڵاوکراوەکانی کۆمەڵە تا ژمارەی چوارەمی و، لە بڵاوکراوەکانی یەکێتی پێش «هەواڵنامە» تا ژمارەی چوارەمی من سەرپەرشتیم کرد بوو. تا خۆم لەوێ بووم نەمئەهێشت لە ڕووی ناوەڕۆکەوە وتاری بێ پێز و، لە ڕووی نووسینەوە وتاری خوارووخێچی تێ دا بڵاو بکرێتەوە. هەندێ لە هاوڕێیانی کۆمەڵە ئەمەیان زۆر پێ ناخۆش بوو، ئەیانویست کۆمەڵە و هەواڵنامە وەکو «نشرەی جەدار» ی قوتابخانەکان بکەین بە مەیدانی خۆ فێرکردنی ئەوان.

ئەو ماوەیەی من سەفەرم کرد بۆ دەرەوە فرسەتیان هێنا بوو، بە ئارەزوی خۆیان لە هەردووکیان دا ئەوەی بە بیر و بە قەڵەمەکانیان دا هات بوو نوسی بوویان.

مەلا بەختیار بە ناوی «باوکی ئاوارە» وە، وتارێکی درێژی لە ژێر سەرناوی: «چەند تێشکێ، بە سەر هەندێ، لایەنی خەباتی کۆمەڵەدا» لە ژمارەی شەشەمی «کۆمەڵە» دا نوسی بوو، باسی بیرەوەرییەکانی خۆی گێرا بووەوە سەبارەت بە ڕێکخستنەوەی کۆمەڵە و، دەس پێ کردنەوەی خەباتی چەکدار. هێرشێکی ناوەختی کرد بوە سەر سەرکردایەتی پێشوی کۆمەڵە، کە دواتیان لە سێدارە درا بوون و، ئەوانی تریشیان تازە بە تازە لە زیندان ئازاد کرا بوون.

هاوڕێیانی تازە - ئازاد کە هاتنە شاخ و، وتارەکەی مەلا بەختیاریان خوێندەوە، زۆر دڵگیر بوون و، بە کۆمەڵ و تاک هاتنە لام بۆ گلەیی. ئەرسەلانیش لە گەڵ گەیشتنی دا، سالار چو بو بە گژی دا. ئەمانە چاوەڕوانی پێشوازییەکی گەرمتر بوون، ڕاستییەکەی

هەندێ لەو برادەرانە وەکو حەزیان لە چارەی بەرپرەکان نەبوو، حەزیشیان نەئەکرد لە ناو کۆمەڵە و پێشمەرگەدا بیانبینن، لایان وابوو جێگەیان پێ لێژ ئەکەن. بۆ چارەکردنی ئەمە، لەو رووەوە گلەییم لە سالار کرد و، لە ژمارەی حەوتەمی «کۆمەڵە» یش دا روونکردنەوەیەکمان نووسی: کە ئەو وتارەی مەلا بەختیار بیرورای تایبەتی خۆیەتی و هی سەرکردایەتی کۆمەڵە نییە.

لە کۆبوونەوە فراوانەکانی پێشوودا بڕیارمان دا بوو: ئەو ئەندامانەی سەرکردایەتی کە لە زیندان دان، لە بەر ئەوەی بە هۆی خەباتی سیاسییەوە گیراون، هەرکاتێ ئازاد کران بێنەوە ناو سەرکردایەتی. کۆبوونەوەی سەرکردایەتی کۆمەڵەمان کرد هەموو ئەم برادەرانەمان بانگ کرد، کە لە کاتی خۆی دا ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە بوون: فەرەیدوون، عومەر، عەلی، ئەلوات و، هەر یەکەیان کارێکی پێ سپێردرا. تا ئەو کاتە من خۆم سەرپەرشتی رێکخراوە نهێنییەکانم ئەکرد، هەمووییم بەرەو رووی سەید عومەر کردەوە. سەید عومەر ئەم کارە گرنگەی پێ کارێکی پچووک بوو، بە نابەدڵی قبووڵی کرد.

ئەوانەی کۆمیتەی هەرێمەکانیان پێک هێنا بوو، حەزیان لە چارەی هاورێیانی زیندان نەئەکرد، دوای گیرانیشیان بڵاوکراوەیەکی ناوخۆیان لە سەر دەر کرد بوو. ئێستاش کە هات بوونە ناو شۆڕشەوە بە لالوتەوە بە خێرهاتنیان کرد بوون.

ئەوانەی لە زیندانیش ئازاد کرا بوون، حەزیان لە چارەی ئەندامانی کۆمیتەی هەرێمەکان نەئەکرد، لایان وابوو، لە کاتێک دا ئەمان ملیان لە ژێر چەقۆی بەعس دا بووە، ئەوان کاریان بۆ شکاندنی ئەمان کردووە.

بە کردەوە ئەم دوو تاقمە بوون بە دوو دەستە:

ئەوانەی لە کۆمیتەی هەرێمەکان بوون، خۆیان بە «خەتی شەهید ئارام» دائەنا و، وایان ئیدیعا ئەکرد درێژە بە خەتی ئەو ئەدەن.

ئەوانیش لە سەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵە بوون، خۆیان بە «خەتی شەهید شەهاب» دائەنا و، وایان ئیدیعا ئەکرد درێژە بە خەتی ئەو ئەدەن.

راستییەکەیشی ئەوە بوو هیچکامیان خەتێکی وای دا نەڕشت بوو ئەمانە شەڕی لە سەر بکەن، ئەو دوو شەهیدە کە دوو کەسایەتی بەرێز و خۆشەویستی ناو کۆمەڵە بوون. ئەمان ناوەکانیان بۆ مەبەستی خۆیان لە ململانێ ی ناوخۆدا بە کار ئەهێنان.

من کە نە لە کۆمیتەی هەرێمەکان و نە لە کێتلەی سیجن بووم و، لە ناکۆکییەکانی ئەوان دا بەشدار نەبووم، هەوڵێکی زۆرم دا بۆ ئەوەی ئەم لە یەک نەگەیشتنەیان چاک بکەم، کەڵکی نەبوو. تا ئەهات ناکۆکییەکانیان، کە زۆرتر شەخسی بوو نەک ئایدیۆلۆجی یا سیاسی، قووڵتر ئەبوو. بە کردەوە بوون بە دوو دەستەی جیاواز.

*

بۆ کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵە هەموو ئەوانەمان بانگ ئەکرد کە پێش گیرانیان ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە بوون. دوای ماوەیەک هەموویان کاروباریان پێ سپێردرا. کەسیان بەو کارە رازی نەبوو کە پێ ی سپێردرا بوو، هەندێکیان بە تەمای ئەندامەتی م س و، هەندێکیان م ع و، هەندێکیان بە تەمای ئەندامەتی سەرکردایەتی یەکێتی بوون، بەشەکەی ئێمە لە سەرکردایەتی یەکێتی دا بە هەموی ٧ جێگا بوو، جێگای ئەو هەمووەی لێ دا نەئەبووەوە.

## کۆنگرەی نۆهەمی پارتی *

دوای ئاشبەتاڵ ساڵی سنجاری بە موافەقەتی مەلا مستەفا، پارتی لە ژێر ناوی قیادە موەقەتە دا ڕێک خستەوە. بۆ ئەو مەبەستە سەفەری ئەورووپای کرد. پاشان گوێزایەوە تورکیا. ئەگەرچی هەموویان لە ژێر سێبەری مەلا مستەفادا کۆبوونەوە بەڵام بە گوێرەی زرووف و زەمانی ئەوسا باسی ڕێکخستنەوەی پارتییان ئەکرد لە سەر بنچینەی مارکسی و، سەرەتا ڕێکخراوەییەکانی: ناوەندییەتی دیموکراتی، سەرکردایەتی بە کۆمەڵ و، ڕەخنە و ڕەخنە لە خۆ گرتن.

تا ئەو کاتە بە هۆی هەڵومەرجی سیاسی ئێران و، دووریی خۆیانەوە لە کوردستان، بنەماڵەی بارزانی نەیان توانی بو ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی کاروباری حیزبەکە و، دانان و لابردنی کادرەکانی بکەن. زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی لایەنگری مەسعود و، هەندێ لە کادرە ناوبجیەکان لایەنگری ئیدریس بون. دوای ڕوخانی شا کە ئیتر بە ئاشکرا و بە کۆمەڵ هاتنەوە ناو مەیدانی کاری سیاسیەوە، پێویستیان بەوە هەبو، هەندێ گۆڕین بە سەر حیزبەکەیان دا بهێنن، لە گەڵ قوناغی تازەدا بگونجێ، سەر لە نوێ دەسەڵاتی بنەماڵەی بارزانی لە ناو حیزبەکەدا قایم بکاتەوە. بۆ ئەمەش پێویستیان بەوە بو کۆنگرە ببەستن.

لە ڕۆژانی ٤ -١١ تشرینی دوەمی ٧٩ لە ئوردوگای زیوەی سەر بە ئوستانی ئازەربایجانی غەربی لە ئێران، بە ئامادە بونی ٣٢٥ کەس، کۆنگرەی نۆهەمی گرت. لە دوای ئازاری ١٩٧٠ ەوە ئەوە یەکەمین کۆنگرەی بو.

لەم کۆنگرەیەدا مەسعود «ڕاپۆرتی سیاسی و عەسکەری و تەنزیمی» خوێندەوە. باسی ڕووداوەکانی دوای ئازاری کرد، بە تایبەتی ئاشبەتاڵ. بەڵام باوکی و بنەماڵەکەی خۆیانی لە هەمو ئیهمالێک بەراندەوە و، ئیهمالی ئاشبەتاڵ و ئەو کارەساتەی بە سەر کورد هات بو، خستە ئەستۆی دەستوپێوەندەکانی مەلا مستەفا و، شا و ئەمەریکا. لە ڕاپۆرتەکەدا ئەڵێ:

«پاش ١٩٧٠ یەعنی پاش ڕێککەوتنەکەی ١١ ی ئازار.. هەمومان توشی غرور بوین و ڕۆژ بە ڕۆژ ڕوحی شۆڕشگێڕایەتیمان لە دەست دا. لە جیاتی ئەوەی سود لەو سەرکەوتنە وەربگرین و ڕێکخستنی پارتی بچەسپێنین لە ناو جەماوەر. دەرگای بەرەڵلایی و فەوزا کرایەوە، وە شتی ئەساسی کە بۆ هەر شۆڕشێک پێویستە لە بیر چو بو. لە سەر نیطاقی پەیوەندی دەرەوە ئیمسان زۆر ئیشتیباهات کرا چ لە ژێر ضغطی ڕوداو وە چ لە ئەزانین، بە تایبەتی لە ساڵی ١٩٧٣ - ١٩٧٤..

«پاش نەکسەی ١٩٧٥ زۆر کەس ڕایان کرد لە مەیدان. پێش ئەو کاتە بە هەمو شت ڕازی بون. بەشدار بون لە هەمو بڕیارەکان باش یا خراپ وە دەوری بالایان هەبو.. بەڵام پاش نەکسە.. بە هەمو جۆرێک هەوڵیان دا مەسئولیەت بخەنە سەر شانی ئەو و بەس.. ئەبێ بۆ تاریخ بڵێین کە بارزانی پاش ساڵی ١٩٧٠ مەسئول نەبوە لە زۆر ئەخطائی کە کراو زۆر شتیش ئەمەومانان کە لە دەوری ئەو بوین لێ ی مەسئولین.. بەڵکو هەمو قیادە مەسئول بوە و ئەمە واقیع و حقیقەتە..»

«ئەسبابی نەکسە نە تەنها پیلانی جەزائیر بو. هەرچەندە ئەم پیلانە هۆیەکی سەرەکی بو، بەڵام ئەسبابی ناوخۆ ئیمسان دەورێکی زۆری هەبو کە پیلانی جەزائیر

سەربگرێت. بێگومان مەبەستی ئیمپریالیستی ئەمریکا و نۆکەرانی لە ناوچە، وە بە تایبەتی ڕژێمی دیکتاتۆری شاهی ڕووخاو و ڕژێمی فاشیستی بەغدا ئەوە بوو کە ناوی کورد بە ڕابەرایەتی بارزانی و پارتی سەر هەڵبداتەوە.

«هەر یەکێک لە ئێوە مەسئولە لە پاراستنی ترائی بارزانی.. ئێمەش وەک یەکێک لە ئێوە مەسئولین لە ترائی ئەو، وە ڕۆیشتن لە سەر ڕێگەی بۆی داناوین، ئەو ڕێگەیەی کە لە هیچ زەمانێک دا مساوەمەی نەکرد لە سەر مالی کورد..»

چەند مانگی بۆ واتەواتی لابردنی سامی هەبوو. بنەماڵەی بارزانی لێ ی ناقایل بوون. لە کاتی هەڵبژاردنی کۆمیتەی ناوەندی دا، بنەماڵەی بارزانی لیستەیەکیان ڕێک خست بوو، بە ناوی ئەوانەی خۆیان ئەیانەویست. زۆری ئەوانەی قیادە موەقەتەی تی دا نەبوو. سامی نەیویست، بۆ ئەوەی جێگەی لە ناو کومیتەی ناوەندی دا بە تەواوی لێژ نەبێ، ئەو دوانزە کەسەی لە سەردەمی قیادەی موەقەتەدا لە گەڵی بوون، لە کومیتەی ناوەندی تازەدا هەڵبژێردرێنەوە. بنەماڵەی بارزانی ئەم مەرجەیان لێ قەبوڵ نەکرد و، ئەوەیان کرد بە بیانو بۆ لادانی ئەو و هەموو ئەوانەی گومانیان لە دڵسۆزیان نەکرد. کۆمیتەیەکی ناوەندی هەڵبژێردرایەوە جێگەی ڕەزامەندی خۆیان بوو. هوشیار زێباری، کە خاڵ و جێگای متمانەی مەسعود بوو، یەکێکیان بوو.

لەم کۆنگرەیەدا:

- کومیتەیەکی ناوەندی هەڵبژێردرا دڵسۆزی بێ چەن و چونی بنەماڵەی بارزانی و، گوێرایەڵی تەواوی فەرمانەکانی بوو.

- هەڵبژاردنی مەسعود و ئیدریس و، ئەو لیستەیەی ئەمان دیاریان کرد بوو بۆ سەرکردایەتی حیزب و، هەڵبژاردنی مەسعود بە سەرۆکی حیزب لە جێگای باوکی، ئەو نەریتەی بە تەواوی چەسپاند کە ئەم حیزبە هی بنەماڵەی بارزانیە.

- سەرکردایەتی حیزب «ترائی بارزانی» کرد بە چرای ڕێبازەکەی. بە پێ ی ئەو «ترائە» ش هەموو کاری حەڵاڵ بوو بۆ خۆبەهێز کردن و دەسگرتن بە سەر مەیدانی کوردایەتی دا. بۆ ئەوەش لە باتی ئەوەی چارەی سیاسی بۆ ئەو دوکێشەیە بدۆزێتەوە کە تووشی ببوو: کێشەی حدکا و، کێشەی یەکێتی. لە کوردستانی ئێران شەڕی حدکای کرد تا پشتیوانی ئێران بە دەس بهێنێ. لە دوژمنایەتی یەکێتی دا پارمەتی بدا. شەڕی یەکێتی کرد بۆ ئەوەی ئەو ملۆزمە لە کوردستانی عیراق نەهێڵێ.

پارتی بە پارمەتی ئێران، سەرلەنوێ هەموو لق و ناوچە و ڕێکخراو و، هێز و بەتالیۆنەکانی، لە ناو شارەکانی ئێران و لە ناوچە سنوورییەکان دا دروست کردەوە. بارەگای مەکتەبی سیاسی و، دەزگا سەرکردەییەکانی و، ئیستگای ڕادیۆکەی، لە گوندی ڕاژان لە نزیک ورمێ دانا. بە ئاشکرا هاوکاری لە گەڵ ئێران ئەکرد دژی کوردەکان.

ئەندامانی پێشوی قیادە موەقەتە هەمو چوون بۆ ئەوروپا و، سامی یش ماوەیەک لە ئێران گیرا، دوای بەربوونی ئەویش چوو بۆ بەریتانیا. خۆی لە ناو کۆڕە تایبەتیەکانی دا، ڕای پیشان ئەدا لە بەر ئەوەی لە سیاسەتی بنەماڵەی بارزانی، بە تایبەتی بەرامبەر بە کوردەکانی ئێران، ڕازی نەبوو بۆیە وازی لێ هێناوە. ڕاستیەکەی ئەوە بوو: ئەوسا بنەماڵەی بارزانی، چارەی سامی نەئەویست.

*

## دەیڤید هیرست لە ناوزەنگ

ڕۆژنامەوانی بەریتانی دەیڤید هیرست پەیامنێری ڕۆژنامەی «گاردیان» لەندەنی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە لە بەیروت دانیشتبوو، سەردانێکی کوردستانی کرد و، بە سەر هەموو لایەنە کوردییەکان دا گەڕا بوو. دەیڤید پێشتریش هات بوو بۆ کوردستان و، زمانی عەرەبی ئەزانی. چو بوو بۆ ووەس بۆ بینینی سەرانی پارتی سامی دی بوو، لەو کاتەدا خەریکی کۆنگرەی نۆیەم بوون. دوای ئەوی چو بوو بۆ دوڵە تو بۆ بینینی سەرانی حسک د. مەحمودی دی بوو.

دەیڤید هات بۆ ناوزەنگ بۆ بینینی سەرانی یەکێتی. بە ڕێکەوت مامجەلال لەوێ نەبوو، چو بوو بۆ بینینی قاسملو، لە بەر ئەوە من بینیم. عەبدولرەزاق فەیلی یش لەوێ بوو. سەردانی بارەگای حشع یشی کرد. لەو ناوە تووشی دو پێشمەرگەی یەکێتی بوبوو. هەندێ پرسیاری لێ کرد بوون دەربارەی چالاکی پێشمەرگە لە ناو شارەکان دا، هەردوکیان باسی ئەوەیان بۆ کرد بوو، کە تازە خۆیان لە چالاکیەکی ناوشاری سلێمانی گەڕاونەتەوە. ڕاستی ئەم هەواڵەی لە د. مەحمود پرسی بوو، یەکسەر بە درۆی خستبوونەوە. شەو لە لای ئێمە مابوەوە. زۆری پرسیار کرد و، منیش پرسیاری زۆرم لێ کرد. ئەوی سەرلەی دەیڤیدی ڕاکێشا بوو، ئەوە بوو: هەموو ئەم حیزبانە دژی یەکتری دوا بوون. سامی دژی یەکێتی و حسک، د. مەحمود دژی یەکێتی و پارتی، منیش دژی پارتی و حسک. پرسیاری سەرەکیی دەربارەی هۆکانی ناکۆکیی ناو حیزبە کوردییەکان بوو. چەندێ هەوڵم دا بۆی ڕون بکەمەوە عەقڵی نەیبڕی.

دەیڤید زنجیرەیەک وتاری لە گاردیان دا لە سەر جوڵانەوەی کورد و، لە سەر گەڕانەکەی، بڵاو کردەوە.

*

## کاری بەرەیی

هەوڵی یەکخستنی موعارەزەی عیراقی کۆنە. سەرەتای حەفتاکان توع (التجمع الوطني العراقي) دامەزرا بوو. بەڵام ئەمیش وەکو حیزبێکی دەرەوەی وڵات لە سەر ئەرز دەورێکی نەبوو. کە یەکێتی بوو بە ئەندامی توع، توع ئەبن و تاوێکی تێ گەڕابوەوە و، بە تەما بوون شۆڕشەکەی کوردستان، لە ڕوی سەرکردایەتی و پێکهاتنی هێز و مەیدانی کارەوە، بیکەن بە شۆڕشێکی عیراقی. ڕادیۆکەی یەکێتی ناوی نرا بوو: «دەنگی شۆڕشی عیراق» و، چالاکیەکانی پێشمەرگەکانی یەکێتی وەکو چالاکی توع بڵاو ئەکرانەوە. سەرکردایەتی توع، سەرکردایەتیەکی مەیدانی بۆ جوڵانەوەکە دانا، ئەگەرچی ئەبو شەوقی (جواد الدوش) و، ئەبو عومەر (عونی قلمچی) لە «الحرکة العربیة الاشتراکیة» و، حازم (عبدالجبار الکبیسی)، صفاء (فوزی راوی) و، ئەبو صلاح (مهدی علیوی) و، هەندێکی تر لە سەرانی بەعس ماوەیەک لە ناوزەنگ بارەگایان دانا، بەڵام ڕاستیەکەی ئەمە شتی ڕوکەش و ڕواڵەت بوو، هیچ کات شۆڕشەکە بە کردەوە لە هیچ ڕویەکەوە نەبو بە شۆڕشی گەلی عیراق.

دوای لێدانی حشع، زۆر لە سەرکردەکانی ڕویان کردە ئەوروپای ڕۆژهەڵات و، سوریا و لوبنان. پاش ئەوەی نائومێد بون لە پێکهاتنەوە لە گەڵ بەعس و گەڕانەوە بۆ

بەغداد، لە کۆبوونەوەیەکی کۆمیتەی ناوەندی دا دروشمی ڕووخاندنی ڕژێمیان هەڵگرت و، کەوتنە داوای پێکهێنانی «بەرەی فراوانی هێزە عێراقییەکان». حشع خۆی بە تەنیا لاواز بوو، لە بەر ئەوە پڕوپاگاندەیەکی زۆری بۆ ئەم بیرە ئەکرد و، لە هەموو کۆبوونەوە و دانیشتنێک دا ئەیان وتەوە. کاربەدەستانی سووریا و یەمەن و سەرانی فەلەستینییەکانیشیان تێ گەیاند بوو. هەندێ لە هێزە نەتەوەپەرستەکانی عێراق، بە تایبەتی بەعسییەکانی عێراقی سەر بە سووریا لەوانە حازم (عبدالجبار الکبیسی)، حەزیان لە چارەی شیوعییەکان نەئەکرد. ئەمانە لە بنچینەدا بە بیروباوەڕی «ئەنتی کۆمونیستی» پەروەردە کرا بوون، هاوکاری ئەوان و کاربەدەستانی عێراقیشی هات بووە پاڵ.

*

## کۆمیتەی ٤ قۆڵی

هەوڵەکانی حشع لە سووریا سەری نەگرت بوو. سەرانی حشع لە کوردستانیش بەردەوام بوون لە سەر هەمان هەوڵ و تەقەلا. لە هەموو کۆبوونەوە دوقۆڵییەکانیان دا لە گەڵ یەکێتی ئەم باسەیان دووبارە ئەکردەوە. سەرەنجام لە ناوەڕاستی مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٧٩ یەکەمین کۆبوونەوەی چوار قۆڵی: یەکێتی، حشع، الحرکە الاشتراکیە العربیە (حاع)، حزب البعث العربی الاشتراکی - قیادە قطر العراق (سەر بە سووریا) کرا و، ڕاگەیاندنێکی هاوبەشیان دەرکرد. بڕیاریان دا لە دیمەشق کۆبوونەوەیەکی تر بکەن. بە نوێنەرایەتی یەکێتی من دانرام کە بچم بۆ بەشداری لە کۆبوونەوەکەی شام دا.

بە کۆمەڵ بە ڕێ کەوتین بۆ تاران بۆ ئەوەی لەوێوە بچین بۆ سووریا. لە حشع: مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی. لە بەعس: ئەبو صەلاح. لە حاع: ئەبو شەوقی و ئەبو عومەر. لە یەکێتی: من.

لە شام بیروڕای حازم جیا بوو لە گەڵ بیروڕای هاوڕێکانی لە کوردستان. کۆبوونەوەکە نەکرا و، کۆمیتەکە کۆ نەبووەوە و، کارەکە سەری نەگرت. لە شام چەند جارێ کەریم ئەحمەدم بینی. هەروەها حازم.

سەری لوبنانم دا. بەیروت لەو کاتەدا بە کردەوە لە ژێر دەسەڵاتی فەلەستینییەکان دا بوو. نایف حەواتمە، سەرکردەی «الجبهە الشعبیە» و، جۆرج حەبەش سەرکردەی «الجبهە الدیمقراطیە»م بینی. بیروڕاکانی یەکێتیم بۆ باسکردن دەربارەی هەلومەرجی ناو عێراق و، هەڵوێستی یەکێتی لە ڕووداوەکانی ئێران. مامجەلال نامەی بۆ هەردووکیان نووسی بوو، من نامەکانم بۆ برد بوون، کەچی هەردووکیان زۆر بە ئاشکرا وایان دەرخست کە باوەڕیان بە مامجەلال نییە. قسە کۆنەکەم بیر کەوتەوە کە ئەڵێ: «بۆ بۆرەبیار خزت بە گۆشت بدەی، ئەڵێ: بە دەردی خوا مردا». پێم سەیر بوو مامجەلال ئەو هەموو چاکەیەی لە گەڵ کرد بوون کەچی ئەوان بەو جۆرە سەیریان ئەکرد و چاکەیان نەدایەوە، جیاوازییەکی ئەوتۆیان لە نێوان یەکێتی و پارتی دا نەئەدی.

*

هەر لەم سەفەرەدا جارێکی تر سەردانی ئەمسام کردەوە. لە کۆنگرەیەک دا بەشدار بووم کە خوێندکارانی کورد لە ئەمسا ئەیانگرت.

*

بەغداد، لە کۆبوونەوەیەکی کۆمیتەی ناوەندی دا دروشمی ڕووخاندنی ڕژێمیان هەڵگرت و، کەوتنە داوای پێکهێنانی «بەرەی فراوانی هێزە عێراقییەکان». حشع خۆی بە تەنیا لاواز بوو، لە بەر ئەوە پروپاگاندەیەکی زۆری بۆ ئەم بیرە ئەکرد و، لە هەمو کۆبوونەوە و دانیشتنێک دا ئەیان وتەوە. کاربەدەستانی سوریا و یەمەن و سەرانی فەلەستینییەکانیشیان تێ گەیاند بوو. هەندێ لە هێزە نەتەوەپەرستەکانی عێراق، بە تایبەتی بەعسییەکانی عێراقی سەر بە سوریا لەوانە حازم (عبدالجبار الکبیسی)، حەزیان لە چارەی شیوعییەکان نەئەکرد. ئەمانە لە بنچینەدا بە بیروباوەری «نەتەوەیی کۆمۆنیستی» پەروەردە کرا بوون. هاوکاری ئەوان و کاربەدەستانی عێراقیشی هات بوە پاڵ.

*

## کۆمیتەی ٤ قۆڵی

هەوڵەکانی حشع لە سوریا سەری نەگرت بوو. سەرانی حشع لە کوردستانیش بەردەوام بوون لە سەر هەمان هەوڵ و تەقەلا. لە هەمو کۆبوونەوە دوولۆلییەکانیان دا لە گەڵ یەکێتی ئەم باسەیان دووبارە ئەکردەوە. سەرەنجام لە ناوەڕاستی مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٧٩ یەکەمین کۆبوونەوەی چوار قۆڵی: یەکێتی، حشع، الحرکة الاشتراکیة العربیة (حاع)، حزب البعث العربي الاشتراکي - قیادة قطر العراق (سەر بە سوریا) کرا و، ڕاگەیاندنێکی هاوبەشیان دەرکرد. بڕیاریان دا لە دیمەشق کۆبوونەوەیەکی تر بکرێ. بە نوێنەرایەتی یەکێتی من دانرام کە بچم بۆ بەشداری لە کۆبوونەوەکەی شام دا.

بە کۆمەڵ بە ڕێ کەوتین بۆ تاران بۆ ئەوەی لەوێوە بچین بۆ سوریا. لە حشع: مەلا ئەحمەدی بانیخێڵانی. لە بەعس: ئەبو سەلاح. لە حاع: ئەبو شەوقی و ئەبو عومەر. لە یەکێتی: من.

لە شام بیروڕای حازم جیا بوو لە گەڵ بیروڕای هاوڕێکانی لە کوردستان. کۆبوونەوەکە نەکرا و، کۆمیتەکە کۆ نەبووەوە و، کارەکە سەری نەگرت. لە شام چەند جارێ کەریم ئەحمەدم بینی. هەروەها حازم.

سەری لوبنانم دا. بەیروت لەو کاتەدا بە کردەوە لە ژێر دەسەڵاتی فەلەستینییەکان دا بوو. نایف حەواتمە، سەرکردەی «الجبهة الشعبیة» و، جۆرج حەبەش سەرکردەی «الجبهة الدیمقراطیة» م بینی. بیروڕاکانی یەکێتی م بۆ باسکردن دەربارەی هەلومەرجی ناو عێراق و، هەڵوێستی یەکێتی لە ڕووداوەکانی ئێران. مامجەلال نامەی بۆ هەردووکیان نووسی بوو، من نامەکانم بۆ برد بوون، کەچی هەردووکیان زۆر بە ئاشکرا ڕایان دەرخست کە باوەڕیان بە مامجەلال نیە. لەسە کۆنەکەم بیر کەوتەوە کە ئەڵێ: «بۆ بۆرەپیاو خۆت بە کوشت بدەی، ئەڵێ: بە دەردی خوا مرد!». بەم سەیرە بوو مامجەلال ئەو هەمو چاکەیەی لە گەڵ کرد بوون کەچی ئەوان بەو جۆرە سەیریان ئەکرد و چاکەیان ئەدایەوە، جیاوازییەکی ئەوتۆیان لە نێوان یەکێتی و پارتی دا نەئەدی.

*

هەر لەم سەفەرەدا جارێکی تر سەردانی نەمسام کردەوە. لە کۆنگرەیەک دا بەشدار بووم کە خوێندکارانی کورد لە نەمسا ئەیانگرت.

*

# سالی ١٩٨٠

له تیرمینالی فڕۆکەوە بۆ چاپەری ستوور

ڕۆژی ١٣ ی شوباتی ٨٠ لە گەڵ عومەری حاجی عەبدوللا، شازاد گەیشتینە فڕۆکەخانەی مێهرئاباد لە تاران. عومەر شێخمووس و هاوسەرەکەیشی هاوزەمان گەیشتن. ئەمان کێشەیان ئەبوو تێ پەڕین و، ئێمەش کەلوپەلەکانی خۆمان بەوان دا نارد. ئێمە چونکە ڤیزای ئێرانمان ئەبوو ڕێگەیان نەداین بڕۆین. گلیان داینەوە خەریک بوو سواری فڕۆکەیەکی ترمان بکەن و ڕەوانەی سووریامان بکەنەوە. د. فوئاد مەعسووم ئەو کاتە نوێنەری یەکێتی بوو لای حکومەتی ئێران. بەڵێنیان داوبوو ڤیزاکەمان لای کاربەدەستانی فڕۆکەخانە بۆ داینێن، بەڵێنەکەیان بە جێ نەهێنا بوو. گیچەڵی زۆریان پێ کردین. بۆ ئەوەی خۆمان گیر بکەین تا کارەکەمان بۆ جێبەجێ ئەبوو ناچار بووین سەرو بلیتی تازە بکڕین. پاش چەند سەعاتی چاوەڕوانی ڕێگەیان داین بچینە ناو تارانەوە.

•

لە ڕێگای مەهاباددوە چوینە گوندی بێوران. ئەو کاتە لە ئێران بێوران و سنووری عیراق دا هێنان و بردنی کەلوپەل لە برەودا بوو. لە بێوران و ناوزەنگ دوو تێرمینالی گەورەی ولاخی لێ بوو، هەر یەکەیان بە سەدان ئێستری تێ دا ڕاگیرا بوو.

ئەوی لێرەدا من بە «تێرمینالی ولاخ» ناوم بردوە، لە کوردی کۆن دا پێیان وتوە: «چاپەری ستوور». نالی لە شیعرنامە بە ناوبانگەکەی دا ئەپرسێ:

سەیرێکی خۆش لە چیمەنی ناو خانەقا بکەا

ئاپا ڕەبیعی ناوە، یا «چاپەری ستوور»؟

ئەم دوو وشەیە ئێستا لە ناو ولاخدار و کاروانچیەکان دا بە کار ئاهێنرێن. چاپەر: تەویلە، بەهاربەند، کە ولاخی تێ دا ڕاگیراوە. ستوور: چوارپێ، ئێستا هەر لە وشەی «سەگ و ستوور» دا بە کار ئەهێنرێ کە بۆ سووکایەتی پێ کردن ئەوترێ.

•

ولاخی بارهەڵگر: ئەسپ، ئێستر، کەر، گا.. لە کوردەواری دا لە زۆر کۆنەوە گرنگیەکی ژیانی هەبوە. بۆ ئێمەیش کە هەموو کات لە ناوچە شاخاویە سەختەکان دا ئەژیاین و هاتوچۆمان ئەکرد، بوو بوو بە بەشێکی زەروری لە پێویستیەکانی ژیانی ڕۆژانە و ڕاپەڕاندنی کارەکانمان. لە بەر ئەوە منیش لە گەڵ ولاخ بوو بووم بە ئاشنا و، شارەزای هەڵسوکەوت و، ڕاگرتن و، پێویستیەکانی بووم.

«ولاخ» لە «ئولاغ»ی مەغۆلی وەرگیراوە. بەم بۆنەیەوە هەندێ وشەی مەغۆلی هاتۆتە ناو زمانی کوردییەوە، لەوانە: یاسا، قۆزناخ، چۆک و بە چۆک دا هاتن، تامغە، تەغار، لەن، نۆکەر، قەیتول، ئوردو، ئیل، .. ئەمە هیچ عەیبێکی تیا نیە. هەموو زمانە زیندووەکانی دنیا وشەی بێگانەیان وەرگرتوە و، لە زمانەکەیان دا تواندویانەتەوە. وەرگرتنی وشە: یان یەکێکی ناسراو لە نووسینەکانی دا وەری ئەگرێ، یان خەڵک لە ئەنجامی زۆر بە

کار هێنان دا لایان ئەبی بە پلو. لە هەردو حالەت دا ئەچێتە فەرهەنگی زمانەوە و، ئەبی بە مولکی ئەو زمانە.

*

## ئەسپ

ئەسپ نێر و ماین مێ، هەمیشە نرخێکی تایبەتی و ڕێزێکی تایبەتی هەبوە و، هەبونی نیشانەی پایەی کۆمەڵایەتی خاوەنەکەی بوە. بە زۆری بۆ سوار بون بە کار هێنراوە. کە کراوە بە هی باربردن ئیتر پێیان وتوە: «بارگیر»، یان «بارگین» و، کە خەسانددویانە پێیان وتوە: «یەختە» یا «یەرمغە».

ئەسپی ڕەسەن، کە دایک و باوکی ناسراو بێ، لە ئەسپی تر کە دایک و باوکی نەناسراو بێ پەسندترە. ڕەگەزی عەرەبی لە هەموان پەسندترە. بە گوێرەی ڕەنگەکانی بە شێ، کوێت، کەحێلە، مرخەنەک ناو ئەبرێن.

ماین «جوانو» ی ئەبێ و، کە بو بە دو ساڵ پێ ی ئەڵێن «دزما». تا ٣ ساڵ هەر بە خێو ئەکرێ، لە بەر ئەوەی ئێسقانی بڕبڕەی پشتی بەرگەی هەڵگرتنی قورسایی ناگرێ، نە باری لێ ئەنێن و نە سواری ئەبن. لە ساڵی چوارەم دا ئەڵێن: «پشتی گرتوە»، ئیتر خەریکی ڕاهێنانی ئەبن بۆ سواری. ڕاهێنانی زانین و شارەزایی و حەوسەڵەی درێژی ئەوێ.

ئەسپ «رەوت» و «نەرمە غار» و «غار» و «لۆقە» ئەکا.

ئەسپ وڵاخێکی «یەک سم» ە، ئەبێ سمی «نال» بکرێ، ئەگینا ژێر سمی برینداز ئەبێ.

ئەسپ «زین» ی لێ ئەکرێ. زین لە چەرم و تەختە و لباد دروست ئەکرێ. کاتی خۆی بە خشڵی زێر و زیو ڕازاندویانەتەوە. بۆ زەوت کردنی لە سوار بون دا «لغاو» ئەکرێتە دەمی.

ئەسپ لە «تەوێلە» دا ئەبەسترێتەوە و، لە «ئاخور» دا «ئالیک» ئەدرێ. پێشینان وتویانە: «لە ئەسپی ئەبو، ئاخور هەڵئەبەستی!» لە بەهاران دا کە بە کۆمەڵ لە لەوەڕگادا بەرەڵلا ئەکرێن، پێ ی ئەڵێن: «رەوە» و، ئەوی خزمەتیان ئەکا «مەهتەر».

لە ئەفسانەی کوردی دا، ئەسپەکەی ڕۆستەم ناوی «ڕەخش» و، هی خەسرەوی پەروێز «شەودیز» و، هی ئیمامی عەلی «دولدول» بوە، لە چاو ئەسپی ئاسایی دا هەریەکەیان هونەرێکی هەبوە.

پێشینان وتویانە: «سواری ئەسپی خەڵک بێ هەر پیادەی».
سالم لە باسی خۆی و ئەسپەکەی دا ئەڵێ:
خانە خۆیم میوان ئەنوازە، وەرنە سەیری پیادەئی
دۆشەکی خۆم خاک و خۆڵ و، سەر ڕاخەری ئەسپم سەما
شیشی سور بێنن وەرن خالیکمان داخ کەن بە جوت
چونکە ژاڵمان کرد: من و ئەسپم، لە بەر سەردی هەوا
ئەمن و بارگیری کوێت هەردو بنوین بەشکم بە خەو
من بیبینم ڕوی خۆراک و، ئەو بیبنی ڕوی کا

*

## کەر

نێرەکەر و ماکەر، یان وەکو پێ یشی ئەلێن: گوێدرێژ، ئەمیش بۆ بارپردن و سواری بەکار هێنراوە، بەلام تەسپ لە ئێستر و، ئێستر لە کەر بەرێزتر بوە. پێشینان وتویانە: «لە ئێستر دابەزی سواری کەر بوە». عەرەب پێیان وتوە: «مرکب الصالحین» چونکە بۆ سوار بون و دابەزین ئاسانە و هیچ هونەرێکی ناوێ.

کەر ولاخێکی «یەک سم» ە، سمی «نال» ئەکرێ. پەندێکی پێشینان ئەلێ: «سم سمی کەرە و، چنگ چنگی مەیاسێ، یاران لەم کارە سەرم ئەماسێ!»

بە بەچکەی کەر و ئێستر ئەلێن: «جاش». راستەیەکەی زولمێکی گەورەیان لێ کردوە چونکە ئەم ناوەیان لە خائینانی جولانەوەی کورد ناوە، لە کاتێک دا جاشی کەر و جاشی ئێستر بە درێژایی مێژو خزمەتی کوردیان کردوە و، کەچی ئەوان زەرەریان لێ داوە.

کەری لای ئێمە چەند رەسەنێکی هەیە بە ناوبانگترینیان: حەساوی، بەغدایی، قوبروسی، لە گەورەیی لەلاکەتیان دا جیاوازن.

کەر بە ئالێکی کەم داتەکەوێ و، بەرگەی ماندوبەتی و برسێتی ئەگرێ.

کەر «جل» و، ئەگەر خۆشەویست بێ «کورتان» ی لێ ئەکرێ. پێشینان وتویانە: «کەرەکە مەمرە بەهارە، کورتانت بۆ دێ لە شارە!» جل لە کۆنە لباد و بەرە و، کورتان لە بەرە و پوش، دروست ئەکرێ.

کەر لە گەڵ مانگا و ئێستر ئەکرێتە «گەور» ەوە.

لە گەڵ ئەوەی کەر، لە لای کورد، بە نمونەی دەبەنگی دائەنرێ، کەچی لە پەندی پێشینان دا جێگەیەکی تایبەتی هەیە. بۆ گەوجێتی ئەلێن: «کەرێکە بە چوار پێ ئەروا» و، بۆ هەلپەرستی و بێ باری ئەلێن: «کەری ناو جۆرگایە، قەپاڵ لە هەردو بەر ئەدا». بۆ پەلگەی پشت گوێ خران ئەلێن: «کەس لێ ی ناپرسێ: کەرت بە چەند؟»

پێشینان وتویانە: «کەرێکم دا بە کەرێ، سندان لە بنا گوێ ی دەرێ»، هەروەها: «کەر لە کوێ کەوتوە و، کورندە لە کوێ دراوە؟»، هەروەها: «کەر بارەکەی تفەنگ بێ گورگ هەر ئەیخوا!»، هەروەها: «کەر بە کاروان لەتلەو نابێ»، هەروەها: «کەرێ بە پارەی بەفر بکردرێ، لە ئاوا ئەخنکێ»، هەروەها: «بە کەر ناوێرێ بە کورتان شەڕە» هەروەها: «کەر تۆ بەرێ دمش ئەبا»، هەروەها: «بە بۆنی کەبابەوە چو، کەریان داخ ئەکرد»، هەروەها: «کەری خزمە و گوێ ی ناڵ ئەکەم».

نالی لە باسی کەرەکەی دا ئەلێ:

هەی کەرێکم بو، چ پەیکەر! ئەیکەری هەوراز و لێژ
سینە پان و، موچە کورت و، شانە بەرز و، گوێ درێژ

لە دوا بەیتی دا ئەلێ:

چەندە پێم خۆش بو زوبانی حاڵی دەیوت «نالیا»
هەردو حەیوانین، ئەتۆ گوێ کورت و ئەمنیش گوێ درێژ

*

## ئێستر

ئێستر، یاوەکو پێی یشی ئەلێن: «قاتر»، نەزۆکە زاووزێ ناکا. لە ئەنجامی «چاکردن» ی ماین دا لە نێرەکەر، پەیدا ئەبێ، بۆیە پێشینان وتویانە: «لە ئێستریان

پرسی: باوکت کێ بە؟ وتی: خاڵم ئەسپە». مەراسیمی ئەم چاکردنە بەزمێکی خۆشە شتێکی لە شایی کەمترە.

جاشی ئێستر ئەبێ ٣ ساڵ لە سەری بوەستێ تا «پشت ئەگرێ». ئەوسا لە گەڵی خەریک ئەبن بۆ ئەوەی فێری بار هەڵگرتن بێ. ئێستر لە ئەسپ و لە کەر بەهێزترە و، بۆ ناوچەی شاخاوی تازا و بە کارە و، زیاتر بەرگەی بار و هەوراز و ماندوێتی ئەگرێ.

ئێستر وڵاخێکی «یەک سم» ە، ئەبێ سمی «ناڵ» بکرێ.

هەندێ ئێستر دوای ڕاهێنانیش لە کاتی بارکردن و سوار بون دا بە ئاسانی مل نادا و هەڵئەلەبزێنێ، «لەقە» و «جوتە» و «لوشکە» ئەهاوێژێ، بەمانە ئەوترێ: «چەموش» و، لە هەندێ ناوچە «شەموس». ئێستری پەسند ئەوەیە: هێمن بێ، کونە لوتەکانی فش و سنگی پان و، قاچەکانی لە یەک دور بێ بۆ ئەوەی لە ڕۆیشتن دا لە یەک نەدەن. ئەو ئێسترانەی قاچیان لە یەک ئەدەن پێیان ئەڵێن: «پەیزەن» و پەسند نین.

بۆ زانینی جوانی و پیری ئێستر سەیری دەموددانی ئەکەن، ئەگەر دانی کەوت بێ، یان سەر «خەری» کانی لوس بوبن، نیشانەی پیر بونە، ئەڵێن: «شیلە» ی پێ نەماوە، ئەگەر دانەکانی تیژ و زبر بێ و گرێچکەکانی سەر دانی مابن، نیشانەی جوانییە ئەڵێن: «شیلە» ی پێ ماوە. هەر لە بەر ئەمەیە پێشینان وتویانە: «ئەسپی خەلاتی تەماشای دەم و دانی ناکرێ».

بەرگی ئێستر «کورتان» ە. کورتان بەرەیەکە لە پوش ئەتاخنرێ، بۆ سواری و بۆ بار لێ ی ئەنێن. کورتان بە «بەرۆک» لە پێشەوەی لە سنگ و، بە «پاڵو» لە پشتەوەی لە بن کلکی و، بە «سەر پاڵو» لە خوارەوەی مورەکەی پشتی و، بە «تەنگە» لە بن ورگی قایم ئەکرێ. «قەیاسە» یش کورتانەکەی پێ توند ئەکرێ. بەرۆک، پاڵو، سەرپاڵو، تەنگە و قەیاسە، لە چەرمی نەرمی پانی وەکو پشتێن یان «کەژۆ» دروست ئەکرێ.

بۆ زەوتکردن و بەستنەوە و ڕاکێشانی «ڕشمە» یا «هەوسار» ئەکەنە ملی.

ئەگێڕنەوە: یەکێ لە شێخەکانی بەرزنجە باندێکی جەردەی هەبوە دەروێشەکانی خۆی پێ ڕوت کردۆتەوە. دەروێشەکان، ئەیانوێراوە بە ئاشکرا بە شێخ بڵێن، لە حەلقەی زیکردا، بەم بۆنەیەوە، وتویانە: «ماینەکەت بردم، ڕشمەکەم بەرۆ! دەروێشی خۆتم ڕوتم مەکەرۆ!»

توورەکەیەک ئەکەن بە کورتانەکەی دا کا و جۆی تێ ئەکەن، لە کاتی برسێتی دا ئەیکەنە ملی سەری تێ ئەنا و ئەیلەوەڕێ، پێ ی ئەڵێن: «جۆرک».

بۆ جوانی «سەرکەللە» ی بۆ ئەکەن کە بە «کوژاکە» و «مورو» و «گوڵنکە» ئەیڕازێننەوە. «زەنگوڵە» ئەکەنە ملی. زەنگوڵە سەرەڕای ئەوەی دەنگێکی خۆش بۆ وڵاخەکە دابین ئەکا، لە کاتی ون بونی دا لە دەشتودەر یارمەتی خاوەنەکەی ئەدا بۆ دۆزینەوەی.

بە «سندم» «پێوەند» ی ئەکەن و، بە «میخ زنجیر» ئەیبەستنەوە.

زۆرجار لە ئەنجامی بار هەڵگرتنی زۆر دا، یان لە ئەنجامی گوێ پێ نەدانی خاوەنەکەی دا، سەر بەراگەی پشتی ئێستر بریندار ئەبێ و، برینەکەی قوڵ ئەبێ، ئەڵێن «ناوکەپۆڕ» بوە. ڕەگێکی ئەستور لە ناو لوتی دا پەیدا ئەبێ ئەڵێن: «کەرسەمە» ی دەرکردوە. ناتوانی باش هەناسە بدا. بە چەقۆیەکی تیژ ئەیبڕن و چاک ئەبێتەوە.

سپێ، گەنە، کەوڵە و کرنو، جرۆجانەوەری تر بە پێستی ئێستر دا ئەنوسێ و، تەپوتۆزی زۆری لێ ئەنیشێ، بە «ڕنەک» کە جۆرێکە لە شانەی لە ئاسن دروستکراو

ئەیکرین و، ئەیخورین، جانەوەرەکانی لێ ئەکەنەوە.
پێشینان وتویانە: «کەر چو بۆ بەغدا بو بە ئێستر»
شێخ رەزا لە باسی ئێسترەکەی دا ئەڵێ:
مهر بە سەد مننەت هەڤاردی ئێسترێکی روت و لوت
دەست و پا سست و سەقەت، ئەندامی هەروەک عەنکەبوت
لە بەیتێکی تری دا ئەڵێ:
شێخ لەتاحی مەیتەرم رۆژێک بە حوججەت لێ ی ئەوی
کلکی دەرهێنا لە بن ئینجا بە ئاسمان گوی ی بزوت

*

گا

گا بۆ نێر و مانگا، یا چێڵ بۆ مێ. یەکێ لە ولاخە بە ترخەکانی ژیانی مرۆڤ بوە. بۆ جوت و گێرە و بارکردن، بە کاریان هێناوە. کە پیریش بوە کوشتویانەتەوە گۆشتەکەیان خواردوە. ئەو سەردەمەی جاف رەوەند بوە، بە زۆری گای لە باتی کەر و ئێستر بۆ بار هەڵگرتن بە کار هێناوە.
گا وەکو مەر و بزن «دو سم» ە، «کاوێژ» ئەکا.
گوێرەکە، یا گۆلک، پاش لە شیر بڕانەوەی نێرەکەی ئەبێ بە «نۆوەن» و مێیەکەی بە «نۆین» و، نێوەن لە سالی سێیەم دا ئەبێ بە «پارێن» و، ئینجا «جوانەگا». گۆلک تا پێ ئەگات چاوەڕێی و ماندوبونێکی زۆری ئەوێ. پێشینان وتویانە: «تا گوێرەکە بە گا ئەکەی، خوێنی خۆت بە ئاو ئەکەی». گا رۆژانە بە کۆمەڵ ئەبرێ بۆ لەوەر، پێ ی ئەڵێن: گاگەڵ، یا گاران. پێشینان وتویانە: «گا لە گاگەڵ بە جێ بمێنێ، شاخی خۆی ئەشکێنێ»، هەروەها: «گای لە گاگەڵ دا نییە و، پێ ی بەڵەر بردوەتێ»، هەروەها: «دو گا لە دولێکا ئەگەر رەنگی یەک نەگرن، خوی یەکتری ئەگرن». ئەوی چاوەڕێی گاران ئەکا پێ ی ئەڵێن: «گاوان».
بۆ بێ ئاگایی ئەڵێن: «لە گوێ ی گادا نوستوە» و، بۆ نەزانی و نەشارەزایی ئەڵێن: «گا بە گونا ئەناسێ» و، بۆ تێکچونی کاروباری ولات بە هۆی خراپیی گەورەی ولاتەوە ئەڵێن: «خەتای گای بنەیە!»

*

حەیوان لە سالێک دا ماوەیەکی دیاریکراو ئارەزوی «جوت گرتن» ی هەیە. لەو ماوەیەدا:
مایین و ماکەر بە «تەڵەب و فاڵ» و، مانگا بە «کەڵ» و، دێڵە سەگ بە «با» و، پشیلە بە «وەرشەمە» و، مەر بە «بەران» و، بزن بە «تەگە» ئەبێ.
بۆ ئەو گیانداره «ناوس» انەی یەک یا دو بەچکەیان ئەبێ «زاین» و، بۆ ئەو گیاندارانەی لە دو بەچکە زیاتریان ئەبێ «تۆرەکین»، بە کار ئەهێنرێ. بۆ نمونە:
مایین، مانگا، مەر، بزن.. ئەزێ. پێشینان وتویانە: «مانگا بە دزی کەڵ ئەگرێ و بە ئاشکرا ئەزێ».
سەگ، بەراز، پشیلە.. ئەتۆرەکێ.
بۆ مرۆڤ «مردن» و، بۆ ئەو گیاندارانەی گۆشتیان ئەخورێ «مردار» و، بۆ ئەوانەی

گزشتیان ناخوری «تۆپین» بە کار ئەهێنری.
پیاو ئەمری. پێشینان وتویانە: «مردن مردنە، لنگە لرتێ چیە!»
مانگا، مەر، بزن، مریشک.. مردار ئەبێتەوە. پێشینان وتویانە: «بۆ جگەری مەریێ مردار ئەکاتەوە».
کەر، سەگ.. ئەتۆپێ. پێشینان وتویانە: «کەری دێز تۆپینی خۆی و زەرەری ساحێبی ئەوێ»، هەروەها: «لە کەری تۆپیو ئەگەرێ نالی بکێشێتەوە»، هەروەها: «سەگ لە قەسابخانە ئەتۆپێ عومری بە زایع ئەچێ».
ئەسپ ئەحیلێنێ، کەر ئەزەڕێنێ، ئیستر ئەپرمێنێ، گا ئەبۆڕێنێ.

## کۆنگرەی چوارەمی حدکا

بە هۆی هەلومەرجی نالەباری ئێرانەوە حدکا لە دامەزراندنیەوە تا سەرکەوتنی شۆرشی ئێران ٣ جار کۆنگرەی گرت بو:
کۆنگرەی یەکەم لە ١٩٤٥ دا.
کۆنگرەی دوەم لە ١٩٦٥ دا لە گوندی سونی لە پشدەر (کوردستانی عیراق) کە ئەوسا لە ژێر دەسەلاتی بارزانی دا بو. ئەم کۆنگرەیە لە پالی ئەوەی ریزەکانی حیزب یەک بخا و، یەکەی یەکگرتوی خەبات لە کوردستانی ئێران دا، ناکۆکیەکانی ناو ریزەکانی تەقاندنەوە و، پارچە پارچەی کردن.
کۆنگرەی سێهەم لە ١٩٧٤ دا لە شاری بەغداد. سەرەرای ناکۆکی شەخسی و سیاسی و ریکخراوەیی، ئەم کۆنگرەیە ریزەکانی دیموکراتی تا رادەیەک یەکخستەوە، کۆمیتەیەکی ناوەندی یەکگرتوی هەلبژارد و، ئۆرگانی ناوەندی حیزبی بلاو کردەوە و، پەیوەندی لە گەل رژێمی بەعس دا ریکخست...
کۆنگرەی چوارەم لە ١٩ی شوباتی ١٩٨٠ دا لە مەهاباد گیرا.
هەلومەرجی بەستنی کۆنگرەی چوارەم لە گەل هی هەمو کۆنگرەکانی تر جیاواز بو.
- شۆرشی ئیسلامی رژێمی شایەتی روخاند بو، بەلام هێشتا بە تەواوی دەسەلاتی خۆی نەچەسپاند بو، بۆ یەکەمین جار ئێران ئازادییەکی بێ وێنەی بە خۆیەوە دی بو.
- کادرەکانی حدکا، دوای دەیان سال دور ولاتی و دەربەدەری، گەراپونەوە کوردستانی ئێران و، بو بون بە هێزێکی دەسەلاتداری گەورەی سیاسی، ریکخراوەیی، چەکدار لە کوردستان دا.
٣١ ئەندام بەشداری کۆنگرە بون، کە نوێنەرایەتی ٣ هەزار ئەندامی حیزبی ئەکرد. بەر لە شۆرش، هەمو کادر و ئەندامەکانی حیزب لە عیراق نەئەگەیشتنە ١٠٠ کەس و، لە ئەوروپا بە پەنابەری دەست ئەژمێردران و، لە ناو ئێران دا لەوەش زور کەمتر بون. ژمارەی ئەندامانی حیزب لە ئەنجامی روخانی رژێمی شا و، دروستبونی بۆشایی دەسەلات لە کوردستانی ئێران دا، کتوپر و لە چەند مانگێکی کەم دا، وا زیادی کرد بو.
حیزب بۆ ئەوەی لە ململانێ ی دەسەلات دا لە گەل کۆمەلە و ریکخراوەکانی تر، ببێتە هێزی هەرە گەورە و زالی کوردستان، هەمو جۆرە کەسێکی، بێ گوێ دانە رابوردوی سیاسی لە ریبەری چەپەوە بۆ ئەو پەری راست، لە ریزەکانی خۆی دا کۆ کرد بوەوە.
کۆنگرە بە راپورتێکی دوروی سکرتێری گشتی حیزب، د. ئەبدورەحمانی قاسملو،

دەستی پێ کرد. چەند ڕۆژێ درێژەی کێشا. هەڵوەرجی ئاڵۆزاوی کوردستان و ئێران و کێشەکانی، لە ناو بیروڕای دانیشتوانی کوردستان و ئەندامانی حدکایش دا ڕەنگی دایەوە. ناکۆکی لە ڕیزەکانی دا لە سەر کێشەی ئاییەتی و، جیاوازی بیروڕا لە شۆڕشی ئیسلامی و، حیزبی تودە و، جۆری پەروەردەکردنی حیزب و، جوولانەوەی کورد.. لە ناو ئەندامەکانی دا ئاشکرا بو. هیچ ڕێکخراوێکی کوردستانی عیراق، بۆ ئەم کۆنگرەیە، بانگ نەکرا بو. بەڵکو لە ڕاپۆرتەکەدا تاوانبار کرا بون بە دەستوەردانە کاروباری ناوخۆی کوردستانی ئێران. کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردرایەوە، کە تێکەڵاو بو لە کەسانی جۆراوجۆری خاوەن بیروباوەڕ و هەڵوێستی جیاواز.

*

لە ڕۆژانی شەڕی کورد و پاسدار دا، یەکی لە تاقمە چەپەکان جاریکیان ویستبویان پردێکی ڕێگای مەهاباد - سەردەشت خراپ بکەن، وەکو بەشێ لە هەوڵی دواخستنی لەشکرکێشی هێزەکانی ئێران. پێشمەرگەکانی حدکا ڕێگەیان نەدا بون و، دەریان کرد بون. ئەوانیش وت بویان: «ئێوە خۆتان داوای دیموکراسی ناکەن، ئەم کارەی ئێوە دژی دیموکراسیە». ئەوانیش وت بویان: «ئێمە دیموکراسی مان بۆ ئێران داوا کردوە، بۆ ئێرە خودموختاریا».

د. قاسملو زۆر جار ئەم نوکتەیەی بە پێکەنینەوە ئەگێڕایەوە. ئەگەرچی خۆی بە هەڵگری بیروباوەڕی دیموکراسی دائەنا و، زۆری باس ئەکرد، زۆرجار ئەیوت: «خراپترین دیموکراسی لە باشترین دیکتاتۆری باشترە»، بەڵام زۆر لە هاوڕێکانی لە ناو دەفتەری سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی دا تاوانی تاکرەوی و سەپاندنی بیروڕاکانی خۆیان بە پاڵ ئەدا و، ئویالی هەندی لەم جیابونەوە و وازهێنانانەیان ئەخستە گەردنی ئەو.

*

کۆبونەوەی سەرکردایەتی یەکێتی

لە ڕۆژانی ۲ - ۱۸ ی مارتی ۱۹۸. کۆبونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی و، کادرە پێشکەوتوەکانی یەکێتی کرا. ئەم کۆبونەوانە چەند خەڵەلێکی گرنگیان لە یەکێتی دا ئاشکرا کرد کە لایەنی ڕێکخراوەیی و سیاسی و ئایدیۆلۆجیان هەبو:

- کەسی یەکەم و، جۆری بەڕێوە بردنی یەکێتی و دەزگا سەرکردەییەکانی.
- جۆری ڕاگرتنی تەبایی سیاسی و ئایدیۆلوجی لە ناو باڵەکانی دا.
- جۆری ڕاگرتنی هاوسەنگی لە نێوان باڵەکانی دا.

یەکێتی لە سەرەتای دامەزراندنی دا «دەستەی دامەزرێنەر» ی هەبو کە پێک هات بو لە ۷ کەس لە دەرەوەی وڵات. ئەم ۷ کەسە نوێنەرایەتی هیچ ڕێکخراوێکیان نەئەکرد، بەڵکو لە سەر بنچینەی لێوەشاوەیی خۆیان دەس پێشکەریان کرد بو بۆ دامەزراندنی یەکێتی و، لە ناوەوەی وڵاتیش دلوا لە چەند کەسێک کرا بو دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی پێک بهێنن، ئەوانیش تا لە شار بون نەیانتوانی بو کۆ ببنەوە، دەستەی دامەزرێنەری وڵات دابمەزرێنن و، ڕەوشتێکی سیاسی، ڕێکخراوەیی، پێشمەرگەیی یەکگرتو بۆ کارکردن لە چوارچێوەی یەکێتی دا دابنێن. وەکو دو ڕێکخراوی جیاواز و دابڕاو لە یەکتری کاریان کرد بو تا هات بونە شاخ. لە شاخیش نەیانتوانی بو ڕەوشتێکی یەکگرتو دابنێن، هەر لایەکیان بۆ خۆی کاری کرد بو، بۆ ئەوەی ناکۆکییەکان دوابخەن سەرکردایەتییەکی

دواتیان بۆ کاروباری سیاسی و پێشمەرگەیی دامەزراند بو، بە تەمای گەڕانەوەی مامجەلال و، بە لاداخستنی ئەو گیروگرفتانە.

تا کۆبونەوەی برادوست یەکیتی و شۆرشەکە سەرکردایەتییەکی یەکگرتوی نەبو. لە پەیڕەوی ناوخۆیش دا باسی جۆری دروستکردنی و دەسەلاتەکانی نەکرا بو، بە جێ هێلرا بو بۆ گەشەکردنی یەکیتی و رووداوەکانی کوردستان. لە کۆبونەوەی برادۆست دا، کە بە ئامادەبونی نوێنەرانی بزوتنەوە و کومەلە و مامجەلال کرا، بریار درا سەرکردایەتی یەکیتی یەک بخری و، سکرتیر هەلبژێردری و مەکتەبی سیاسی لە ۲ نوێنەری بزوتنەوە و ۲ نوێنەری کومەلە، پێک بهێنری. لەم کۆبونەوەیش دا دەسەلاتەکانی ئەو دەزگایانە دیاری نەکرا و، پەیڕەوی ناوخۆ وەکو جاران بێ دەسکاری مایەوە. بە دوای ئەوەدا زنجیرەیەک رووداو قەوما، سەرکردایەتی یەکیتی لە بەر ئەوەی هەمو رەنج و تەقەلای خۆی بۆ هەلساندنەوەی یەکیتی و شۆرشەکە تەرخان کرد بو، نەیتوانی بو لایەنە (فنی) یەکی جۆری پەیوەندییەکانی نێوان بالەکانی یەکیتی و، دەزگا سەرکردەییەکانی: سکرتیر، مەکتەبی سیاسی، کۆمیتەی سەرکردایەتی، لقەکان، بە جۆرێکی گونجاو لە گەل پێویستییەکانی شورش و بزوتنی سەرکردایەتی بالەکانی یەکیتی رێک بخاتەوە.

ئەم کۆبونەوانە ئەو کێشەو گیروگرفتانەیان تەقاندەوە.

کۆبونەوەکان بێ سەر و بەر بون. رۆژانە درێژەیان پێ ئەدرا بێ ئەوەی ئەنجامی باشی هەبی. مامجەلال راپۆرتێکی درێژی نوسی بو، زوری کاتی کۆبونەوەکە بە خوێندنەوە و لێدوانی ئەم راپۆرتەوە گوزرا. زور لە ئەندامانی سەرکردایەتی وەرس بوبون، لە کۆبونەوەدا خەویان ئەهات.

*

عومەرەکان

بە رێکەوت چەند کەسی لەوانەی لە دەزگا سەرکردەییەکانی یەکیتی دا کاریان ئەکرد، ناویان عومەر بو: عومەر مستەفا و عومەر عەزیز لە بزوتنەوە، عومەر عەبدوللا و عومەری سەید عەلی لە کومەلە و، عومەر شێخموس لە خەتی گشتی. بۆ ئەوەی ئەم ناوانە لە یەکتری جیا بکرێنەوە، عومەرمستەفا بە کاکی کاکان و کاک عومەر و، عومەر عەزیز بە حاکم عومەر و، عومەری حاجی عەبدوللا بە ملازم عومەر و، عومەری سەید عەلی بە سەید عومەر و، عومەرشێخموس بە هزمەر ناو ئەبران.

ئەم ناوە لە یەکچوانە هەندێ جار «ئیشکال» و نوکتەی دروست ئەکرد. وەکو ئەمانگێرایە:

جارێکیان، ۳ عومەر پێکەوە چوبون بۆ لیبیا. یەکێ لە لیبیەکان کە بە ریز ناوی چەند عومەری بە دوای یەکا دی بو، وت بوی: بە ۳ عومەر ۱ عەلیمان دەس نەکەوتوە لە گەل خۆیانی بهێنن.

جارێکی تر، ۳ عومەر پێکەوە سەردانی سەفارەتی ئێرانییان کرد بو لە شام. ئەو کاتە ئێران و یەکیتی ناخۆش بو، ئەمان چو بون خۆشی بکەنەوە. یەکێ لە ئێرانییەکان کە ناوەکانی دی بون ۳ عومەر بە دوای یەکا ریز بون، وت بوی: ئەمانەیان ناردوە بۆ باشکردنی پەیوەندی یان بۆ هێرشکردن!

*

نوێنەرانی کۆمەڵە لە مەکتەبی سیاسی دا، وەکو خۆی، سالار و جەعفەر مانەوە. عومەرشیخەموس و کەمال خۆشناو لە باڵی خەتی گشتی، جەمال حەکیم و عەلی حەویز لە باڵی بزوتنەوە دانران. ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لە ناو خۆیان دا نەگونجاو بون. مەکتەبی سیاسی زورتر شێکی رواڵەت بو، هەمو کۆبونەوەیەکی مەکتەبی سیاسی هەمو ئێچندامێکی سەرکردایەتی بەشداری تێ دا ئەکرد کە لەوی بوایە.

نەمانتوانی ناکوکییەکان چارەسەر بکەین. ناکۆکی لە گەڵ رەسوڵ و بزوتنەوە قوڵتر بو، بە تایبەتی دەرگای کوردستانی ئێرانیان بۆ کرا بوەوە، ناکۆکییەکانی ناو کۆمەڵەیش تا ئەهات ناخۆشتر ئەبو.

*

روخانی شا بۆ ئێمە مزگێنیەکی یەکجار خۆش بو؛ لەو ناوچانەیە دەرچوین کە تێ ی کەوت بوین و، قوڵاییەکی ستراتیجی مان بۆ دروست بو کە ئەمان توانی هاتوچوی پێ دا بکەین و، پێویستییەکانی جوڵانەوەکەی لێ دابین بکەین.

*

یەکێتی ریکخراوێکی فیدراڵی بو لە کاروباری سیاسی و پێشمەرگەیی و دارایی و راگەیاندن دا یەکگرتو بو، بەڵام لە کاروباری ریکخراوەیی دا، هەر ۳ ریکخستن سەرکردایەتی و ریکخستنی تایبەتی و داخوازی خۆی هەبو، هەر ریکخستنە سەربەخۆ بو.

تا ئەم کۆبونەوانە تەنها کۆمەڵە و بزوتنەوە ریکخراویان لە ناو ولات دا هەبو، لە دەرەوەیش هەر یەکێتی ریکخراوی هەبو، ریکخستنی کۆمەڵە و بزوتنەوە لە دەرەوە کەم و پچوک و تازە لە سەرەتای دامەزراندن دا بون. لەم کۆبونەوانەدا سامەجەلال هەوڵی دا سەرانسەری دەزگا و ریکخراوەکانی یەکێتی بکاتە دەزگای ۳ قۆڵیچقانە: خەتی گشتی، بزوتنەوە، کۆمەڵە و، لە هەمو دەزگاکان دا ئەم ۳ سەریەیە خۆی بنوێنی:

مەکتەبی سیاسی پێک بێ لە ٦ ئەندام: ۲ خەتی گشتی، ۲ بزوتنەوە، ۲ کۆمەڵە.

کومیتەی سەرکردایەتی پێک بێ لە ۲۱ ئەندام: ۷ خەتی گشتی، ۷ بزوتنەوە، ۷ کۆمەڵە.

لقەکان پێک بێ لە ۳ ئەندام: ۱ خەتی گشتی، ۱ بزوتنەوە، ۱ کۆمەڵە.

لە پێکهێنانی دەزگاکانی راگەیاندن، پێشمەرگەیی، ریکخستن، دارایی دا و، لە پێکهێنانی هەریمەکانی پێشمەرگەیش دا هەمان شێوە پیرەوی بکری.

بێگومان نواندنەوەی ۳ ریکخراوەیی لە مەکتەبی سیاسی و کومیتەی سەرکردایەتی دا شتێکی پێویست بو، بەڵام لە خوار ئەوەوە: دەزگا، لق، هەرێم، تەنانەت ناوچە و کەرتەکان، گیروگرفت و کێشەی زوری دروست ئەکرد و، لە مەیدانی کار پێ کردن دا ئەنجامی خراپی ئەبو:

۱. لە پێ سپاردنی کاردا سەرەتای لێوەشاوی فەرامۆش ئەکراو، سەرەتای دڵسوزیی حیزبایەتی، بەڵ راستتر تاقمگەری، ئەبو بە پێوانە.

۲. لە بەر ئەوەی ئەم ۳ ریکخراوە لە هەمو ناوچەکان دا وەکو یەک کادریان نەبو، بواری بۆ کەسانی هەلپەرست هەڵئەخست، خۆی بە یەکێ لەم ریکخراوانەدا هەڵبواسی و، ریکخراوەکەیش بۆ قەبەکردنی خۆی بیگرێتە خۆی و، بە هەق و بە ناهەق لە سەری هەڵ بداتی.

٣. مونافەسەیەکی ناراستی لە نێوان باڵەکان دا دروست ئەکرد بۆ راکێشانی ئەندام و دۆست و، بۆ زمان دان لە یەکتری لای سکرتێری گشتی.

٤. یەکێتی ویست و کاری لە دەزگاکان دا ئەشێوێنێت و تەگەرەی لە خێرایی راپەڕاندنی کارەکان ئەدا.

ڕێکخستنی جۆری پەیوەندی سکرتێر لە گەڵ مەکتەبی سیاسی و دەزگا سەرکردەییەکان و، هەر ٣ ڕێکخراوە جیاوازەکە، یەکێ لە کێشە قوڵە چارەسەر نەکراوەکان بو. بێگومان یەکێتی پێویستی پێوە هەبو، کەسی یەکەمی هەبێ، کەسی یەکەم بێ هیچ مونافەسەیەک مامجەلال بو، هەمو لایەنەکان هەڵیان بژارد بو، رازی بون ئەو بێ.

لێرەدا چەند مەسەلەیەک ئەهاتە پێشەوە لەوانە:

ئەگەر مامجەلال بە تەنیا خۆی بە خاوەنی ڕێکخراوی خەتی گشتی ئەزانی، ئەوا ئەویش وەکو سکرتێرەکانی بزوتنەوە و کومەڵەی لێ دێ، خۆ ئەگەر سکرتێری گشتی یەکێتییە، نابێ تێتر خۆی بە خاوەنی خەتی گشتی بزانێ.

مامجەلال سکرتێری گشتی بێ، دەسەڵاتەکانی چییە و، چۆن پەیوەندییەکانی خۆی لە گەڵ باڵەکانی یەکێتی ڕێک ئەخا؟

مرۆڤی رۆژهەڵاتیی لە دەرونی خۆی دا حەزی لە تاکڕەوی و ئیستیبدادە، ئیمەی کوردی ئەو زەمانەیش ئەو نمونانەی شارەزای بون، هەمویان لەم بابەتە بون:

- نمونەی کوردی: مەلا مستەفای بارزانی.

- نمونەی عەرەبی: جەمال عەبدولناصر، عەبدولکەریم قاسم، حافظ ئەسەد، ئەحمەد حەسەن بەکر، صەددام حسێن.

- نمونەی جیهانی: ستالین، ماوتسیتونگ، تیتۆ، کاسترۆ...

مام جەلال چاوی لە مان، بە زوری چاوی لە نمونە کوردییەکە ئەکرد. ئەوانەی لە ناو یەکێتی دا کۆبوبونەوە بە هیوای دامەزراندنی شێوەیەکی نوێ بون لە دارشتنی پەیوەندییەکانی ناوخۆ دا، بە تایبەتی ئەو جۆرە پەیوەندییەی مەلا مستەفا لە گەڵ سەرانی پارتی دایمەزراند بو، بە لای ئەمانەوە، یەکێ بو لە هۆ سەرەکییەکانی لاواز کردنی پارتی و دەسەڵاتەکانی و، لە ئەنجام دا ئاشبەتاڵی پارتی و شۆڕش. ئەم دو جۆرە تێشکردنە جیاوازە زوری کاتی ناو سەرکردایەتی بە شتی بێهودەوە ئەکوشت. ئەمانویست شێوەیەکی گونجاو بدۆزینەوە.

مەکتەبی سیاسی و، دەزگا سەرکردەییەکانی ڕێکخستن، پێشمەرگەیی، راگەیاندن، دارایی، پەیوەندییەکان.. هەبون و بە ئەندامانی ٣ ڕێکخراوەکەی کومەڵە، بزوتنەوە، خەتی گشتی، پڕ کرا بونەوە.

من هەمیشە پەیوەندییم لە گەڵ مامجەلال باش بوە. هەمیشە ریزی زۆری بیر و بۆچونەکانی منی ئەگرت، بە درێژایی ئەمەنی درێژی برایەتیمان لە هیچ بۆنە و کات و شوێنێک دا بە گژ من دا نەهات بو. زۆر جار بیر و بۆچونەکانمان دژی بیر و بۆچونی یەکتری بوە بەڵام هەرگیز دەمان لە یەک نەگێڕاوە. لە یەکتری عاجز ئەبوین، زو پێک ئەهاتینەوە.

ئەندامانی سەرکردایەتی هەر هەمویان لە پاشملە گلەییان لە مامجەلال ئەکرد و، رەخنەیان لێ ئەگرت، بەڵام زوری گلەییەکانیان لە سەر شتی بچوک و تایبەتی خۆیان بو،

وەکو: ڕیزی نەگرتون، لە بەر چاوی خەلک لیبان تورە بوە و شکاندونی، حورمەتی ڕەئی نەگرتون و چۆتەوە بە ئۆبان دا.. سەرانی کۆمەلە چەند جاری لە کۆبونەوەی تایبەتی خۆیان دا ئەم باسەیان نەکردەوە و، داوایان لە من نەکرد لە گەلی باس بکەم و، چارەیەکی بۆ بدۆزینەوە. زۆریان ئەیانوت: «ئەرکی قورسی شۆرشەکە لە سەر شانی ئیمەیە، لە هەمو لایەنەکانی کە زیاتر قوربانی ئەدەین، بە ژمارەی کادر و پێشمەرگە لە هەمویان زۆرترین.. بۆچی ئەمە لە مامجەلال قبول بکەین؟» کەچی هەمو جاری کە باسەکەم ئەکردەوە و لە گەلی ئەبو بە ناخۆشیمان، خاوەنی گلەیی و ڕەخنە لە پاتی ئەوەی پشتیوانی لە من بکەن، ئەبون بە ناوبژیکەر لە بەینی من و مامجەلال دا.

من زۆرم بیر لی کرد بوەوە، لە گەل زۆر لە هاوڕیکانم گفتوگۆم کرد بو چارەیەک بۆ ئەم کیشەیە بدۆزینەوە، تەنانەت ئەوانەی خەتی گشتی بش، وەکو عومەر شیخمووس و د. فوئاد مەعصوم، هەمان ڕەئیان هەبو. چەند جاری لە گەل مامجەلال قسەم کرد کە جوری سکرتاریەتەکەی بگۆڕین بە یەکی لەم دو شیوە حوکمڕانییەی لە دنیادا هەیە: شیوەی سەروکایەتی وەکو لە ئەمریکا هەیە، یان شیوەی پارلەمانی وەکو لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا هەیە.

شیوەی سەرۆکایەتی، سەرۆک پارەتیدەرەکانی خۆی بۆ کاروباری پێشمەرگە، ڕاگەیاندن، دارایی، کاروباری پەیوەندی دەرەوە... هەلئەبژیری. ئەمانە کۆبونەوەی دەوریەیان نیە بۆ بڕیاردان لە سەر کاروبار بەلکو سەرۆک هەلیانئەبژیری و سەروک ئەرکەکانیان دیاری ئەکا و، هەر لە بەردەمی ئەویش دا لیپرسراو ئەبن. لە پاتی مەکتەبی سیاسی دەزگایەکی لەو بابەتە بۆ خۆی هەلئەبژیری و، لە هەمان کات دا، لە پاتی کۆنگریس، کۆمیتەی سەرکردایەتی ئەبی، ئیکەلاو لە هەر ۳ ڕیکخراو، کە ناو بەناو کۆبونەوە ئەکا بۆ دانانی سیاسەتی گشتی و لیپرسینەوەی کارەکانی سەرۆک.

شیوەی پارلەمانی، سەرۆکی وەزیران دوای پرس و ڕا لە گەل هاوڕیکانی ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران هەلئەبژیری و، ئەیانخاتە بەردەمی پارلەمان بۆ وەرگرتنی باوەر. ئەنجومەنی وەزیران کۆبونەوەی بەردەوام ئەکەن، بڕیارەکان بە زۆرایەتی ئەدری. بە تاک و بە کۆمەل لە بەردەمی پارلەمان دا لیپرسراون. مامجەلال سەروەزیر و، مەکتەبی سیاسی ئەنجومەنی وەزیران و. کومیتەی سەرکردایەتی پارلەمان، بی.

مامجەلال پێشنیارەکانی پی ناخۆش بو. هیچیانی قبول نەبو. ئەیویست وەکو خۆی بمینیتەوە. وەکو خۆیشی مابوەوە چونکە ئەندامانی م س و سەرکردایەتی نەیانئەویست توشی بەرەنگاری بین لە گەلی. عەبدولرەزاق فەیلی ئەیوت: «پارتی حیزبیکی عەشایەریە بەلام بە تەوسلویی عەسری نیش ئەکا، یەکیتی حیزبیکی عەسریە بەلام بە تەوسلویی عەشائیری نیش ئەکا».

*

یەکیتی و حدکا

ئیرانی مامجەلال و قاسملو و، یەکیتی و حدکا، لە سەرەتاوە بە ڕوالەت باش و خۆش بو، بەلام ڕاستیەکەی بی باوەری و گومان لەم پەیوەندیەدا هەبو. حدکا عیراقی بە پشتیوانیکی گرنگ دائەنا بۆ خۆی، نەیئەویست لە بەر خاتری یەکیتی یان هیچ ڕیکخراویکی تری عیراقی، دوستایەتی بەعس لە دەس بدا. هەر بەم هۆیەوە، هەمو ئەو

کۆبوونەوانەی لە ئەورووپا لە سالانی ڕابوردودا لە نێوان نوێنەرانی یەکێتی و حدکا و، ڕێکخراوە کوردییەکانی تورکیا و سووریا دا کرا بۆ دامەزراندنی «بەرەیەکی هاوبەشی کوردستانی» سەری نەگرت، زۆر جار نوێنەری حدکا تەگەرەی لەم کۆبوونەوانە ئەدا و، بە بیانوی جیاواز نەیئەهێشت بۆ پێشەوە بچی.

دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران، حدکا یەکێتی یان تاوانبار ئەکرد بەوەی دەستی وەرداوەتە ناو کاروباری کوردستانی ئێرانەوە. لە شارەکان دا ڕێکخستنی دروست کردوە و، بە هاندان و یارمەتی یەکێتی بو دوژمنایەتی حدکا، سازکا دامەزراوە. بێگومان ئەمە ڕاست نەبو خۆیشیان ئەیانزانی ڕاست نیە بەڵام کرد بویان بە بیانو و، بە بنێشتە خۆشەی ژێر دانیان، هەر ئەیانوت و ئەیانوتەوە. سازکا لە لایەن یەکێتیەوە دانەمەزرێنرا بو. گوێ ی لە ئامۆژگاری و قسەکانی یەکێتی یش نەئەگرت، بەڵکو یەکێتیان بە ڕێکخراوێکی نەتەوەیی ئامارکسی و، هەندی جار بە «پۆپولیست» دائەنا. بەڵام یەکێتی پەیوەندی باش و دوستانەی لە گەڵ سازکا و سەرکردەکانی و، مەلا شێخ عیزەدین و، هەمو ڕێکخراو و پیاوە ناسراوەکانی کوردستانی ئێران دامەزراند بو. هەروەها لە تارانیش پەیوەندی باشی لە گەڵ هەندی لە سەرکردەکانی شۆڕش و پیاوە ناسراوەکانی تهران دامەزراند بو.

ڕاستیەکەی یەکێتی هەوڵی زۆری دا پەیوەندی باش و دوستانە لە گەڵ حدکا دابمەزرێنی، ئەمەش بێگومان ئەبو بە هۆی دوراندنی دوستایەتی حکومەتی ئێران و، تا ڕادەیەکیش سوریا، کە پێویستییەکی ژیانی بۆ یەکێتی هەبو. یەکێتی لە ناو بازنەی ئابلوقەیەکی بە هێزدا بو. سنوری تورکیای لی گیرا بو، لە سنوری عێراقەوە نەیئەتوانی هاتوچۆ بکا، ڕوخانی شا یەکێتی لەم گەمارۆیە دەرهێنا و، دەرگای جیهانی بۆ کردەوە. دوستایەتی لە گەڵ حدکا ئەبو بە هۆی داخستنەوەی ئەم دەرگایە، بەڵام لە ڕوانگەی قازانجی نەتەوەییەوە لامان وابو، کە لەو سەردەمەدا کێشەی کورد لە ئێران دا، گرنگییەکی کاریگەری پەیدا کردوە، ئەبی هەمو کورد یارمەتیان بدا بۆ ئەوەی ئەو هەلەیان لە دەس نەچی و، مافەکانی خۆیان بە دەس بێنن.

حدکا هەڵوێستیان بەرامبەر یەکێتی دوستانە نەبو، کادر و پێشمەرگەکانیان ڕاسپارد بو، کارئاسانی بۆ یەکێتی نەکەن:

- لە کۆڕ و کۆبونەوەکانی خۆیان دا و، لە لای حیزب و ڕێکخراوەکانی کە، دژی یەکێتی ئەدوان.

- لە هەر جێگایەکی دەستیان بڕویشتایە تەنگیان بە پێشمەرگەکانی یەکێتی هەڵئەچنی و، لە هاتوچۆدا ڕێگەیان پێ ئەگرتن و، چەند جاری بۆ سوکایەتی پێ کردن چەکیان کردن.

- لە هەندی جێگا نوقتەی گومرگیان بەرامبەر نوقتەی گومرگەکانی یەکێتی دانا و، ئاگاداری نوقتەکانی یەکێتییان کرد کە نابی لە خاکی ئێران دا بنکە دابنێن. لەو کاتەدا گومرگ تەنها سەرچاوەی دەرامەت و ژیانی یەکێتی بو.

- کارئاسانییان بۆ قم ئەکرد لە ئەرزی کوردستانی ئێران دا بنکەی چەکدار دابنێن و، چەکدار کۆ بکەنەوە و، بە ئازادی هاتوچۆ بکەن.

- ڕەسوڵ مامەند و بزوتنەوە و، د. مەحموودیان هان دا بۆ جیابونەوە لە یەکێتی و، بە چەک و پارە و کارئاسانی یارمەتیان دان.

چەند جاری مامجەلال نامەی بو د. قاسملو نوسی و، نوینەرانی یەکیتی سەردانیان کرد و، مامجەلال خۆیشی چو بۆ دیدەنییان، ئەمانە پەیوەندی دوقولی باشتر نەکرد، هەتا جەنگی ٣ مانگە دەستی پی کرد و، هیزەکانی ئیران، هیزەکانی حدکا و ریکخراوەکانی تریان لە زوری ناوچەکانی کوردستان راونا بەرەو سنوری عیراق، بۆ نزیک بارەگاکانی یەکیتی.

•

بۆ چاککردنی پەیوەندی دوقولی یەکیتی دەستەیەکی نوینەرایەتی پیک هینا لە: عومەر شیخموس، عومەری حاجی عەبدوللا، جەمال حەکیم، شازاد صائیب و من. لە مانگی نیسانی ١٩٨٠ دا بە کومەلی بە ری کەوتین بۆ سەردەشت. هەر لە سەردەشتەوە ئیتر خزمان کرد بە میوانی حدکا. دوای ئەوەی شەویک لە سەردەشت ماینەوە بۆ روژی دوایی بەری کەوتین بۆ مەهاباد. لە مەهاباد کوشکیکی شاهانە لە نزیک بەنداوی مەهاباد هەبو لەوی دایان بەزاندین.

گفتوگوکانمان دەستی پی کرد. لە لایەن حدکاوە: د. قاسملو، مەلا عەبدوللای حەساکی، مستەفا شەلماشی و چەند کەسیکی کە بەشداری کۆبونەوەکان نەبون.

ئیمە لە قسەکانمان دا ویستمان چەند مەسەلەیەکیان بۆ رون بکەینەوە:

«ئیمە هیچ هۆیەکی راستەقینە نابینین بۆ ئەو ساردییەی لە پەیوەندی دوقولی یەکیتی و حدکا دا هەیە و، هاتوین بۆ ئەوەی هۆکانی بنبر بکەین و، قوناغیکی تازەی دوستایەتی و هاوکاری دەس پی بکەین و، لە لای ئیمەوە سنوریک بۆ ئەو دوستایەتیە نیە بە جی ی ئەهیلین ئیوە دیاری بکەن»

وتمان: «ئیستا کورد لە ئیران دا هەلیکی میژویی بۆ هەلکەوتوە، ناوونابانگی حکومەتی ئیران بە تایبەتی دوای داگیر کردنی سەفارەتی ئەمەریکی لە دنیادا زور خراپ بوە. حکومەتی ئیران داپراوە لە دنیا. زوری ناوچەکانی کوردستانی ئیران و شارە گرنگەکانی ئازادن و، دەسەلاتی حکومەتی تارانیان تی دا نەماوە، عیراق زور بە توندی دژی رژیمی تازەی ئیرانە، ئەتوانری کەلکی لی وەربگیری. کورد ئەگەر حکومەتیکی کاتیی تایبەت بە خوی دابمەزرینی و، هەلبژاردنیکی گشتی بکا بۆ پیکهینانی ئەنجومەنی کوردستان و، داوودەزگای راگەیاندن (دەزگای رادیو، تەلەفزیون، روژنامە) و جەنگی (لەشکری نیزامی) دابمەزرینی، ئیمە ئامادەین شورش لە کوردستانی عیراق رابگرین و، هەمو توانای خزمان هی پیشمەرگەیی و سیاسی و ریکخراوەیی و راگەیاندن، ئەوی لە شاخ و ئەوی لە شار هەمانە، تەرخان بکەین بۆ خزمەتی ئەو هەنگاوە، بی ئەوەی چاوەروانی هیچ پاداش و دەسکەوتیک بین.»

د. قاسملو زور جار باوەری جیددی خوی لە قالبی گالتەدا دەرئەبری، بە پیکەنینەوە وتی: «دیارە نەتانەوی کیشە و گیروگرفتەکانی خوتان لە کوردستانی عیراقەوە بهیننە ناو کوردستانی ئیرانەوە!»

ئەم پیشنیارەیان پەسند نەکرد، گیانی «ئیرانی بون» لە بیری سەرانی حدکا دا بەهیزتر بو لە گیانی «کورد بون». حدکا خویان بە تاکە پیشرەوی بزوتنەوەی کورد دائەنا لە کوردستانی ئیران دا، ئەیانویست ئیمەش ئەوەیان بۆ بسەلمینین.

چوینە سەر باسەکانی تر. هەولیکی زورمان دا بەدگومانیەکانیان دەربارەی

پارمەتیدانی سازگا دژی ئەوان و دەس وەردانە کاروباری کوردستانی ئێران بڕەوێننەوە. بۆ هاوکاری دوقولی چەند سەرەتایەکیان دانا کە ئێستر سالانی دوایی لە سەری ڕۆیشتین.

*

سەفەری مامجەلال بۆ دەرەوە.

مامجەلال لە مایسی ۱۹۸۰ دا چو بۆ تاران. زیاتر لە مانگی مایەوە. لەو ماوەیەدا گەورە کاربەدەستانی ئێرانی بینی. هەر لە تارانەوە ئاگاداری کرد بون کە هەندێ کاری پێویست هاتونەتە پێشەوە، ئەبێ بچێ بۆ شام بەلام زۆری پێ ناچێ ئەگەڕێتەوە. لەو ماوەیەدا کاربەدەستانی سپای پاسداران بیروڕایان بەرامبەر مامجەلال خراپ بو. مامجەلال سیانزە مانگ لە شام گیری خوارد نەیتوانی بگەڕێتەوە.

*

ناوبڕی

هەرێمی ۷ ی بالەک یەکێ لە هەرێمە چالاکەکانی یەکێتی بو. ناوچەکەیان بە تەواوی ڕاگوێزرا بو، هیچ ئاوەدانییەکی تێ دا نەبو. زۆر لە پێشمەرگەکان بۆ حەسانەوە یا تەداوی یا کاروباری پێویستی خۆیان ئەچون بۆ کوردستانی ئێران.

ئەحمەد سوزراو، فەرماندەی کەرتی گەلالەی هەرێمی ۷ چو بو بۆ ئێران. چەکدارەکانی پارتی کە لە ناوچەی خانە بارەگایان هەبو، لە گەڵ کوڕەکەی دا، گرت بویان. ئەحمەد هیچ خراپەیەکی بەرامبەر پارتی نەکردبو، هیچ تاوانێکیشی نەبو، جگە لەوەی پێشمەرگەی یەکێتی بو. لە ڕێگای ئەمرئەوەوە هەوڵیان دابو، بەری بدەن، سودی نەبو. پێشمەرگەکانی هەرێمەکە بە موافەقەتی ئێمە چونە سەر هێزێکی پارتی لە نزیک سەرچەمە لە ناوچەی گەلالە ۲٤ کەسیان لێ گرتن. هەرلەوێ هەندێکیان بەردا بون و، ۱۵ کەسیان لێ گل دابونەوە و، بە گیراوی ڕەوانەی لای ئێمەیان کردن لە ناوزەنگ. پارتی پارەیان لێ هەستا و، گلەییان گەیاند بوە لای حشع. هەر لەو ماوەیەدا لە دزلی یش لە لای مەریوان شەڕێک لە نێوان حدکا و پارتی دا بو، چەند پارتییەک گیرا بون. ئەم دو ڕوداوە هیچ پەیوەندییەکیان لە گەڵ یەک نەبو. لە دو ناوچەی دور لە یەکتری و، لە گەڵ دو هێزی جیاواز بو.

حشع کەوتە بەینەوە. لەو لاوە لە گەڵ حدکا و، لەم لاوە لە گەڵ ئێمە.

پاش گفتوگۆیەکی زۆر لە سەر ئەوە ڕێک کەوتین؛ ئێمە گیراوەکانی پارتی بەر بدەین. پارتی یش گیراوەکانی یەکێتی بەر بدەن. گیراوەکانی پارتی ۱۵ کەس بون، گیراوەکانی یەکێتی ۳ کەس بون. ئەحمەد سوزراو و کوڕەکەی و، عەبدولواحید باجەلان کە ئەویش هەر لە ناو ئێران دا گیرا بو.

ڕۆژی ۲۹ ی حوزەیرانی ۱۹۸۰ ئێمە هەمو گیراوەکانمان نارد بو لای حشع، تا ئەوان ڕەوانەی لای سەرکردایەتی پارتییان بکەن و، گیراوەکانی ئێمەش وەربگرنەوە و ڕەوانەی لای ئێمەی بکەن.

گیراوەکانی پارتی گەیشتنەوە لای سەرکردایەتی خۆیان، بەلام گیراوەکانی ئێمە هەرگیز نەگەیشتنەوە لای یەکێتی. ئەحمەد و کوڕەکەیان پاش چەند حەفتە بێئەوبەرە بەر دابو، بەو مەرجەی تەسلیمی عیراق ببنەوە، ئەوی تریشیان بەر نەدا بە تۆمەتێکی درۆ کە

گوایه ویستویەتی سەرۆکی پارتی بکوژێ. حشع، ئەم پەیمانشکێنییەی پارتی بە «رووحی ریاضی» وەرگرت، بە سوکایەتی دانەنا بۆ هەولەکەی و، هیچ نارەزاییەکی لە سەر دەرنەبری.
ئەمە نموونەیەک بو لەو ناوێزییانەی حشع لە نێوان یەکێتی و پارتی دا تەلعاسی ئەدا.

*

## «علاقاتی امی»

یەکێ لە رەخنەکانی عومەری سەید عەلی و، هاوڕیکانی تری کە تازە لە زیندان ئازاد ببوون، لە هەمو کۆبونەوەیەک دا دووبارەیان ئەکردەوە، ئەوە بو کەوا: ئیمە علاقاتی امی مان لەبیرکراوش کردوە و، هیچ هەولێکمان نەداوە بۆ دروست کردنی پەیوەندی لە گەل حیزبە شیوعییەکانی دنیا، بە تایبەتی حیزبی شیوعی سۆڤیەتی و، چینی کرێکارانی ولاتانی سەرمایەداری و، خەباتی رزگاریخوازی گەلانی دنیای سێیەم. لەم بارەیەوە زۆر ئەدوان. باسی هەوڵە سەرنەکەوتووەکانی خۆمان و، گۆڕانی دنیامان ئەکرد.
سەید عومەر ئەو ماوەیەی لە زیندان بو، دەنگوباسی جولانەوەکانی ئەفەریقای بە وردی چاودیری کرد بو. ناوی زۆر لە سەرکردە و رێکخراوەکانی لە بەر بو. زۆرجار بەخیلیم پی ئەبرد و، هەندێ جار لە قسەکانی من تورە ئەبو، بە تایبەتی کە بە گاڵتەوە باسی «٣ جزگاکە» م لی ئەپرسی. لە سەر دامەزراندنی «علاقاتی امی» زۆریان پێ داگرت. بۆ ئەو مەبەستە خۆیان هەندێ لە سەرانی حشع یان بینی و، منیش بۆ ئەو مەبەستە سەردانم کردن و، دواتر لە حوزەیرانی .٨ دا نامەیەکی رەسمیمان بو پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی نوسی و، بە ریگای حشع دا بۆمان ناردن. بەلام نە لە حیزبی شیوعی سۆڤیەتی و نە لە هی عیراقی هەرگیز وەلامان وەرنەگرتەوە.
هەندێ لە برادەرانی دەرەوە جیگایەکیان دۆزی بوەوە «زەمالەی سۆڤیەتی» یان بە پارە لی ئەکری. سەید عومەر و هاوریکانی هەرایەکی ئەوتۆیان بە «علاقاتی امی» نەما.

**

## کتیبەکەی سەید عەزیز

سەید عەزیزی شەمزینی ئەوەی شیخ عوبەیدوللای نەهری یەکێ بو لەوانەی لە یەکێتی سۆڤیەت خوێند بوی. ئەگەرچی لە (کلیەی عسکری) عیراق دەرچو بو، بەلام بنەماڵەکەیان لە تیهران دانیشتن. لە ناکۆکییەکانی ١٩٦٤ دا سەید عەزیز ئەندامی م س بو. مەلا مستەفا ماوەیەک دەسبەسەر داینا و، دوایی تەسلیمی ئیرانی کرد. ئیران وازیان لی هینا لە گوندی شیخان لە نزیک شنۆ دانیشت. سەید عەزیز دۆستی مامجەلال بو. زۆر جار نامەی بۆ ئەنارد. یەکەمین جەنەرەیتەری کارەبا کە رادیۆکەمانی پی خرایە کار ئەم بۆی کڕین و بە دیاری بۆی ناردبن.
سەید عەزیز لە یەکیتی سۆڤیەت دکتورای تەواو کرد بو، نامەی دکتوراکەی لە سەر جولانەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کورد نوسی بو. کتیبەکەی کردە عەرەبی و بەشی زۆری لە سەرەتای شەستەکان دا بە زنجیرە لە خەبات دا بلاو کردەوە. کتیبەکەی بە پی ی پروگرامی مارکسی نوسرا بو. پر بو لە زانیاری تازە دەربارەی ریکخراوە کوردییەکان و شۆرشەکانی کورد و لیکۆلینەوەی باش و بەنرخی تی دا بو دەربارەی میژووی نوی ی کورد.
لە یەکێ لەو سەفەرانەدا کە بۆ لەندەنی کرد بو ئەسلی روسی کتیبەکە و مسودەکانی بە

عەرەبی هێنا بۆ دابوی بە شازاد لە بەیروت یا لە هەر جێگایەکی تر چاپی بکا. کتێبەکە لە بەیروت مایەوە و چاپ نەکرا. لە یەکی لەو سەفەرانەدا کە بۆ بەیروتم کرد. کۆپیەیەکی کتێبەکەم لە گەڵ خۆم هێنایەوە کوردستان. دەزگای راگەیاندن بە عەرەبی چاپی کرد و، فەرید ئەسەسەرد کردی بە کوردی و، بە کوردیش چاپ کرا.

بۆ شارەزایی مێژوی کورد ئەندامانی کۆمەڵە ئەبو ئەم کتێبەی د. عەزیز شەمزینی و «کورد و کوردستان»ەکەی د. ئەورەحمانی قاسملو و، هەندی لە کتێبەکانی د. کەماڵ مەزهەر بە تایبەتی «کوردستان لە سالانی شەری یەکەم» دا بخوێننەوە.

*

## دامەزراندنی رادیۆ

دەزگایەکی رادیۆمان هەبو لە براداسەوە لە گەڵ خۆمان بۆ نزکان و لەوێوە بۆ قەندیل و لە قەندیلەوە هێنا بومانەوە ناوزەنگ. باری ئەستریک بو. لە گەڵ خۆمان ئەمان گێرا بی ئەوەی بتوانین بە گەری بخەین. بە کار خستنی پێویستی: بە جێگایەکی ئەمین هەبو، دەزگاکە و ئاریەڵ و ماتۆر و ستودیۆی تۆمارکردنی قسەی لی دابنری. هەروەها پێویستی بە تەکنیکار هەبو بۆ کار پی کردنی.

طلعت گلی، ئەندازیاریکی کەرکوکی و، ئەندامی یەکێتی لە کوێت کاری تەکرد. کاتی خۆی ئەو دەزگای رادیۆکەی هەلبژارد بو. لە کوێتەوە بە نهێنی هاتە ناوزەنگ. دوای گەران بە ناوچەکەدا شوێنیکی هەلبژارد پێیان ئەوت «گردی کوپان» بۆ دانانی داوودەزگای رادیۆ. دارستان گردەکەی داپۆشی بو، کانیەکیشی لی بو.

شێرکۆ حسین کرا بە فەرمانەدەی کەرتی پاراستنی رادیۆ و، لە شوێنی دیاریکراو خانوی دروست کرد. هیمن سەراوی و مام عەلی بارمەتیهان ئەدا. پارەگایەکی ریکوپێکیان دامەزراند. چەند رۆژی بۆ تاقیکردنەوە کاری پی کرا و، دەرکەوت باش کار ئەکا.

وەکو نیشانەی بایەخدان بە ئیستگای رادیۆ بەریوەبەر و کادری نوسین و تەکنیکی، بە جیا لە دەزگای راگەیاندن، بۆ ئەرخان کرا. فەرەیدون عەبدولقادر کرا بە لیپرسراوی و، ئەرسەلان بایز بە یاریدەدەری. وتاری کردنەوەی رادیۆ بە عەرەبی فەرەیدون نوسی و، خۆی خوێندیەوە. دوای ئەمە بە چەند رۆژی فەرەیدون سەفەری کرد بۆ شام. ئیستگەکە درایە دەس ئەرسەلان سەرپەرشتی بکا.

تاقمی رادیۆ تا ئەمات فەرمالغ ئەبو. زۆری ئەوانەی خۆیان بە نوسەر و شاعیر و ئەدیب ئەزانی، کە ئەمانە ریزی پیشمەرگایەتی، لە دەزگای رادیۆ کۆ ئەبونەوە.

لەو کاتەدا فاضیل ئەندامی م س یەکێتی و، لیپرسراوی دەزگای راگەیاندن بو. ئەمەی بە کەمکردنەوەی دەسەلاتی خۆی دائەنا. بەلام پێشتر جاریک رادیۆکە لە سەرەتای نیسانی ۷۹ دا خرا بوە کار. دوای چەند حەفتەیەک لە بەریوەبردنی دا سەرکەوتو ئەبو بو لە بەر ئەوە دای خست بو. جگە لەوەش فەرەیدون و ئەرسەلان کەسیان ئامادە ئەبون لە بەردەستی فاضیل دا کار بکەن. خۆیان لەو بەزلتر و شایستەتر دائەنا.

*

## نەخۆشخانە

تەنیا پزیشکی لە ناو هیزەکەمان دا بو. د.خدر مەعصوم بو. ئەویش چوبو بۆ خزشناوەتی خەریکی کاروباری سیاسی بو. هاوینی ۷۸ د. جەعفەری شفیعی هات بۆ

قەندیل. خەوەتێکی کرد بە تیمارگا. نەخۆشی تێ دا ئەدی. لە پایزدا د. خدریش هاتەوە لای ئێمە و، کە چوینە ناوزەنگ چاوگە خانوەکیان تەرخان کرد بۆ نەخۆشخانە. بەلام د. خدر زۆرتر کاری ڕێکخراوەیی ئەکرد وەک لە پزیشکی چونکە لێپرسراوی لقی یەکێتی بو. بەر لە روخانی شا د. جەعفەر بۆ کاری سیاسی گەڕابوەوە بۆ ئێران. هەر لەو ماوەیەدا د. بەختیار خالید هاتە ریزی پێشمەرگایەتیەوە. لە بەری قەرەداخ بو بە پێشمەرگە. بەختیار گەنجێکی تازە پێگەیشتو بو لە موسل دەرچو بو، ئەندامی کۆمەڵە و، لە دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی خوێندکارانی کوردستان بو. زورتر لەوەی پزیشکی بکا ئەویش خەریکی پێشمەرگایەتی بو لە چونەوەیەک دا بۆ سلێمانی لە بەهاری ٧٩/١/٣١ دا کەوتە بۆسەوە کوژرا.

روخانی شا بۆ ئێمە بو بە خەیر. نەخۆش و بریندارەکانمان ئەنارد بۆ ئێران. هەندێکیان لە لای پزیشکە کوردەکانی ئێران تەداوی ئەکران و، هەندێکیان ئەچونە «بیمارستان» ە حکومەتیەکانی تەوریز و تاران.

چالاکی پێشمەرگە و، شەڕ لە گەڵ هێزەکانی حکومەت دا زۆر بوبو. لە ئەنجامی ئەوەش دا بریندارمان زۆر بو ئەبو جێگایەکیان بۆ تەرخان بکری. د. شادمان مستی لە یوگوسلاڤیاوە هاتەوە. شادمان هەمو کاتی خۆی بۆ نەخۆشخانە تەرخان کرد. هاوینی ٨٠ لە توژەڵە نەخۆشخانەیەکی هاوینەی لە خەوەتێکی گەورەدا دامەزراند. هەروەها ڕێوشوێنی دروستکردنی نەخۆشخانەیەکی گەورەمان لە ئەشکەوتێکی قوڵی نێوان شینێ و زەڵێ لە سەر کانیەکی خۆش و لە ناو رەز و باخ دا دانا. شوێنەکە ناوی «قوڵە هەرمێ» و نەخۆشخانەکە ناو نرا «نەخۆشخانەی شەهید د. بەختیار». ژوری پزیشک و ژوری کەوتنی نەخۆش و، دەرمانگا و، ژوری ئەشپەمە و ژوری نەشتەرگاریمان تێ دا دروست کرد. شادمان نەخۆشخانەکەی بەڕێوە ئەبرد. لە گەڵ هەڵگیرسانی شەڕدا لە گەڵ ئێران هەندێ پزیشکی کە هاتنە دەرەوە. هەندێکیان ماوەیەکی کورت ئەمانەوە، ئەڕۆیشتن بۆ ئێران و، لەوێوە ئەچون بۆ ئەوروپا.

نەخۆشخانەکە دوای ئەوەی ڕێگەی ئێرانمان لێ بەسترا بو بە ناوەندێکی گرنگی تەداوی زاماری پێشمەرگە بەردەوام ١٠ بریندارێ تێ دا بو.

*

ناوچەکە زۆر قەرەباڵغ بوبو. بە سەدان کادر و پێشمەرگە و خوێندەوار لە توژەڵە و ناوزەنگ و تۆزکان .. کۆبوبونەوە. د. شادمان هەندێ جار قسەی خۆشی ئەکرد. وتی: «هەمو ئەو تەنگوچەڵمانەی لە پایتەختی ولاتە پیشەسازیە پێشکەوتوەکان دا هەیە لێرەش هەیە. لەوێ تەنگوچەڵمەی بێکاری هەیە، لێرەش هەیە. لەوێ تەنگوچەڵمەی خانو هەیە، لێرەش هەیە. لەوێ تەنگوچەڵمەی گرانی و ئاوسانی دراو هەیە، لێرەش هەیە...»

ڕاستی ئەکرد هەموی هەبو، بەلام هی ئێمە لە جۆرێکی تر بون.

*

بۆردومان

پێش نیوەڕوی ٩ ی تەموزی ٨٠ لە توژەڵە لە ژێر سێبەری دارگوێزێکی گەورەدا لە گەڵ عومەر شێخموس، جەمال ئاغا، سالار، عومەر دانیشت بوین کاروباری رۆژانەمان ئەنجام ئەدا لە پڕ پۆلێ فڕۆکەی عێراقی پەیدا بون چەند بۆمبایەکی گەورەیان بەردایەوە. ناوچەکە

پڕ بو لە دووکەڵی ڕەش و تەپوتۆز و بۆگەنی باروت. بە دوای ئەوەیش دا چەند فڕۆکەیەک کەوتنە پەلامار تەقەیان لە خەوەت و بن بەرد و ئەوای بن شاخەکە ئەکرد.

لە دامێنی ئاوزەنگ دا بازاڕێکی گەورەی لی بو کەلوپەلی عێراق و ئێرانی لی دا ئەفرۆشرا بە زووری لە کەپردا بون، ئاگر درا بو سوتا. بە سەدان ماتۆڕ و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن سوتا. بایی چەندین ملیون دینار زەرەر لە دوکاندارەکان کەوت.

دەزگای ڕاگەیاندنی یەکێتی لە دامێنی تۆژەڵە دا بو بە تەواوی خاپور بو، هەمو دەزگاکانیان شکا و سوتا و، یەکی لە کادرەکانیان: بورهانی شێخ مستەفای قەرەداخی، کوژرا و، چەند کەسێکیان برینداربو.

لە سەرچاوەی تۆژەڵەیش کە بنکەکانی ئێمەی لی بو، کادرێکی سکرتاریەتی مامجەلال: محەمەد ئەبوبەکر، کوژرا و چەند کەسی بریندار بون، لەوانە: سەید مەجید ئەندامی م ع و، مهران فوئاد مستی ئەندامی دەزگای دارایی و، پێشڕەو سەید ئیبراهیم لە سکرتاریەت، حەمە سەعید و هاوڕێ جەبار لە بنکەکەی من.

پێشمەرگەکانی دەزگای ڕاگەیاندن هاواریان لی هەستا بو داوای یارمەتیان ئەکرد. هەر کە هێرشەکە کەمی خاو بوەوە چوین بۆ بارەگای ڕاگەیاندن. ساغەکان چوبونە شاخ و، کوژراو و هەندی لە بریندارەکان لەو ناوەدا بون. تێکرا ٩ کەس بریندار بو بۆ تەداوی هەمومان ڕەوانەی سەردەشت کردن.

چەند مەفرەزەیەک بنکەیان لە تۆژەڵە بو بۆ پاراستنی مامجەلال سەر بە سکرتاریەت بون، فەرماندەکانیان: بەکر پیرۆت، مەلا وسوی خەندەکە، شێخەکۆل، بو. بۆ ئێوارە تەرمی هەردو پێشمەرگەی یەکێتی: بورهان و محەمەدمان لە سەرچاوەی تۆژەڵە بە خاک سپارد. مەلا وسوم بانگ کرد تەلقینیان دا بدا. مەلا وسو وتی: «تەلقین نازانم». وتم: «تۆ چۆن مەلایەکی تەلقین نازانی!» وتی: «بە منالی وەهابیان ناو ناوم ئەگینا من مەلا نیما». حەشع بارەگاکانیان لە تۆژەڵە بو، بەڵام بە ڕێکەوت زەرەر لەوان نەکەوت بو. ئەوانیش لە شاردنەوەیان دا بەشدار بون.

ئەو ڕۆژەی ئەم ڕوداوەی تی دا قەوما ڕیپۆرتەرێکی تەلەفزیۆنی فەرەنسی لە ناوچەکە بو. بەر لە بۆردومانەکە وێنەی بازار و بنکەکان و ئاوایەکانی زەڵی، شێنی، سونی و، کاتی بۆردومانەکەش وێنەی فڕۆکەکان و، دوای بۆردومانەکەش وێنەی بازاری سوتاو و ئاوایی وێرانی گرت بو. بەرنامەیەکی ڕێکوپێکی لی دروست کرد بو بۆ تەلەفزیۆن و، لە پاریس پیشانیان دابو. کەندال، کە دوایی بو بە سەرۆکی ئینستیتوتی کورد لە پاریس، لەو کاتەدا بە پێی ی ڕاسپاردەی د. قاسملو، نوێنەرایەتی حدکای لە فەرەنسا ئەکرد. نامەیەکی درێژی بو تەلەفزیۆنی فەرەنسی نوسی بو، ڕاپۆرتەکەی کابرای بە درۆ خستبوەوە و، نوسی بوی کە ئەو ڕوداوە هەمووی لە کوردستانی ئێران دا بوەوە و، پەیامنێرەکەی ئەوان بە درۆ باسی کوردستانی عێراق ئەکا.

سەیرەکە لەوەدا بو: کەندال خۆی کوردی تورکیا بو، نوێنەرایەتی کوردی ئێرانی ئەکرد و، دژی کوردی عێراق کاری ئەکرد!

*

پاش چەند ڕۆژی کەسوکاری محەمەد لە کۆیەوە و، کەسوکاری بورهان لە سلێمانیەوە هاتن بۆ گوێزانەوەی تەرمەکان. لەحمی شێخ ئەنوەری قەرەداخی هات بو بۆ

بردنەوەی بورهان. ئەمەی ئاسەواری گەرەک و سەردەمی خوێندنم بوو، ئەویش وەکو من زانستی سیاسی لە زانکۆی بەغداد خوێند بوو. ئەندامی کۆمەڵە و تێکۆشەرێکی ناوشار بوو. زۆر لە مێژ بوو ئەمبینی بوو. دوای ئەم سەفەرەی بە ماوەیەک بەعس گرتی و، تا ئێستاش بێ سەر و شوێنە.

*

## زیندان

سەردەمێک جێگەیەکی ئەمینمان ئەبوو گیراوی تێ دا گل بدەینەوە، لە بەر ئەوە ئەوانەی ئەگیران، ئەوەی تاوانی جاسوسیی لە سەر ساغ بوایەتەوە ئەکوژرا و، دیلەکان، وەکو دوایی لە بلاوکراوەکان دا بۆ بۆ بە باو دوای ئەوەی دڕیبازی شۆڕشیان بۆ ڕوون ئەکرایەوە! ، بەر ئەدران.

لە گەڵ زیاد بوونی چالاکییەکانی پێشمەرگەدا، تا ئەحات ژمارەی گیراوەکان زۆرتر ئەبوون. ئەبوو شوێنێکیان بۆ تەرخان بکرێ و، تاقمێکیان لێ بکرێ بە مەسئول. ئەمانویست زیندان بکەین بە دەزگایەکی شارستانی و، جۆری ڕەفتاری ئێمە لە گەڵ ئی بەعس جیاواز بێ. ئەو مافانەی ڕاگەیاندنی جیهانیی مافی مرۆڤ و، یاسا ناودەوڵەتییەکان بۆ گیراویان سەلماندوە، ئێمەش جێبەجێیان بکەین.

عەلی شامار، کادری کۆمەڵە، کە لە پێشمەرگەکانی مەفرەزەکانی سەرەتا بوو، هەڵبژێردرا بە لێپرسراوی زیندان و، کەرتێکی پێشمەرگەی بۆ تەرخان کرا. عەلی لە دامێنی دۆڵەکەدا خانوویەکی بۆ بارەگای پێشمەرگەکانی و، خانوویەکیشی بۆ زیندان دروست کرد.

گیراوەکان دوو جۆر بوون: جۆرێکیان دیل وەکو، سەرباز، جەیشی شەعبی، بەعسی، جاش، ئەمن و ئیستیخبارات.. کە لە شەڕو بۆسەدا ئەگیران. ئەوانی تر لە سەر تاوانی ناسیاسی وەکو کوشتن، دزی.. گیرا بوون.

لێدان و سوکایەتی پێ کردن بە توندی قەدەغە بوو، هەر پێشمەرگەیەک کارێکی لەو بابەتەی بکردایە بە توندی سزا ئەدرا.

خواردنیان وەکو خواردنی هەموو بارەگاکانی پێشمەرگە بوو.

لە نەخۆشی و ناساغی دا، وەکو پێشمەرگە، لە نەخۆشخانەی شۆڕش دا تیمار ئەکران.

کەسوکاریان بۆیان هەبوو هەر کاتێکی بیانویستایە بە ئازادی سەردانیان بکەن، خواردن و کەلوپەلیان بۆ بهێنن یا بۆ بنێرن.

بۆیان هەبوو داوا و سکاڵا و شکات بۆ دەزگا سەرکردەیییەکانی یەکێتی بنێرن.

کەسانی شارەزا و قانونی لێکۆڵینەوەیان لە گەڵ ئەکردن و، دادگایەک کە پێک هات بوو لە ٣ کەس: دوو ئەندامی م س و، یەکێکی حقوقی، حوکمی ئەدان و، مەکتەبی سیاسی لە کۆبوونەوەی خۆی دا دوا بڕیاری لە سەر حوکمەکە ئەدا.

حکومەتی بەعس، هیچ کاتێ ئامادە نەبوو، گیراو هەر پلەو پایەیەکی لە بەعس یا لە جەیش یا لە دائیرەکانی دەوڵەت دا هەبوایە، بگۆڕێتەوە. لە بەر ئەوە زۆر لە گیراوەکان بە تایبەتی سەرباز، مانەوەیان کەڵکێکی ئەوتۆی نەبوو، زوو بەر ئەدران. هەزاران کەسی عەرەب، سەر بە داودەزگای جیا جیا، گیراون و بە بێ هیچ بەرامبەرێک ئازاد کراون.

*

## دروستکردنی خانووی تازە

هاوڕێیانی زیندان، کە زۆربەیان هاوسەرەکانیان لە گەڵ خۆیان هێنا بوو، هەروەها کاری سیاسی، ڕێکخراوەیی، ڕاگەیاندنیان پێ سپێردرا بوو، ئەویش ئەوانیش جگە بۆ خۆیان خۆش بکەن. لە شێنێ، قولە هەرمێ، زەڵێ، ناوزەنگ، تۆژەڵە.. چەندین خانووی نوێ یان بۆ دەزگاکانی پێشمەرگە، ڕاگەیاندن، دارایی، ناوەندی کۆمەڵە، ڕێکخستنی بزوتنەوە دروست کرد. ناوچەکە ئاوەدان بووەوە، نزیکەی ۱.۷.. کەسی لێ تەنیا.

ناوەندی کومەڵە ڕیزە خانوویەکی خۆشی دروست کرد. دەزگای ڕێکخستن و دەزگای ڕاگەیاندنی تێ دا بوو، شوێنێک بۆ کتێبخانە تەرخان کرا بوو، هۆڵێکیش بە ناوی «هۆڵی شەهید شەهاب» دروست کرا جێگەی کۆبوونەوەی ۳ کەسی تێ دا ئەبووەوە.

بۆ هاوینەکەی، منیش لە سەرو هەمان خانووی کە زستانی ڕابوردو لێ ی بووم، بە چەند مەترێک لە پاڵ تاشە بەردێکی گەورەدا خانوویەکی ٤ ژووریم دروست کرد. ئەگەرچی بنایەکی خەڵکی داوداوامان هێنا بوو دیوارەکانی بۆ داتەنابین، بەڵام کرێکارییەکەی خۆمان ئەمان کرد. خانووەکەی من خۆشتر بوو لە زۆری خانووەکان، حەمام و شوێنی چێشت لێ نانی تێ دا بوو. دواییتر بەردەسەکەیم تەخت کرد و، حەوزێکی گەورەی جوانم تێ دا دروستکرد و، چوار دەورەکەیم کرد بە گوڵ و ڕەز و باخ.

بەختیاری برام و حەمە جەزایش چەند خانوویەکیان لە نزیک خانووەکەی من بۆ ژیانی خۆیان دروست کرد.

جگە لە بارەگای داوودەزگاکانی یەکێتی، حشع، پاسۆک، مەفرەزەیەکی بەعسی سەر بە سووریا، هەندی ڕێکخراوی عەرەبی – عێراقی و، ئێرانی لەو ناوەدا خانوویان کرد.

لەم کارانەدا ئەوەی سەرنجی ڕاکێشا دۆزینەوەی هەندی کەرەستەی کۆن بوو، کە دەریان ئەخست ئەم ناوچەیە لە کۆنەوە ئاوەدان بووە لە ناو دۆزراوەکان دا:

– لە زەینی سوور لە کاتی هەڵکەندنی بناغەی خانووەکان دا چەند گۆڕێکیان دۆزییەوە. گۆزەکان هی موسوڵمان نەبوون، چونکە ڕووەو قیبلە نەنێژرا بوون و، ملوانکە و متوموورو یان لە گەڵ خرا بووە چاڵ. ئێسکەکانیان تێکەڵاوی گڵ ببوو پوا بوو.

– لە ناوزەنگ لە شوێنی هۆڵی شەهاب، دا دو گۆزەی گەورە و ساغ و، لە تۆژەڵەیش لەو شوێنەی کە ناوی: «گردی کوڕان» بوو ئێستگەی ڕادیۆی لێ بوو، لە نێوان تۆژەڵە و ناوزەنگ دا، چەندین گۆزە و، چەند داروێکی سەردەمی ئەسکەندەری گەورە دۆزرایەوە.

گۆزە بۆ چەند مەبەست بە کار هاتوە: یەکێکیان وەکو تابوت بۆ هەڵگرتنی ئێسک و پروسکی مردو. ئەوی تریان بۆ هەڵگرتن و شاردنەوەی دانەوێڵە و خواردەمەنی و، گەنجینە لە چاوی دوژمن.

زەردەشتیەکان کە یەکێکیان لێ مردوە، تەرمەکەیان بردوتە شوێنێکی بەرز دایان ناوە، تا قەل و داڵ گۆشتەکەی خواردوە و، ئێسکی خۆر ئێسکەکانی خاوێن کردۆتەوە، ئەوسا ئێسقانەکانیان کۆ کردۆتەوە و خستویانەتە گۆزەیەکەوە، گۆزەکەیان لە ئەرزدا ناشتوە.

ئەبی کوردستان چەندی لەم شوێنەوارە دێرینە بە نرخانە تێ دا بێ، کە ڕابوردوی

ناوچەکە و کوردیان ڕوون نەکردووە، بەڵام بەمجۆرە ئەوتا بێ.

*

## گرتنی بیگانە

شۆڕشی ئەیلول هەر لە سەرەتاوە لە دنیادا دەنگی دایەوە و، ڕۆژنامەوانی بە ناوبانگی دنیا سەردانیان کرد و، وتار و لیدوان و کتێبیان لە سەر نووسی. شۆڕشی حوزەیران، لە بەر چەند هۆیەک، لەم ئیمتیازە گرنگە بێ بەش بوو:

١. عیراق «تعتیم اعلامی» خستبووە سەر چالاکییەکانی شۆڕش. بە هیچ جۆری لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی خۆی دا: ڕۆژنامە، ڕادیۆ، تەلەفزیۆن.. باسی نەدەکرد و، نەیدەهێشت دەنگی بۆ دنیا دەرچێ.

٢. پەیوەندی عیراق لە گەڵ دەوڵەتانی دەرەوە باش و، داهاتی نەوت گەشانەوەیەکی زۆری دابوو بە پەیوەندی ئابووری و بازرگانی عیراق و دەوڵەتانی تر و، زۆر لەم دەوڵەتانە لە ناو خۆیان دا پێشبڕکێیان بوو کامیان باشترین سەودای بازرگانی لە گەڵ عیراق بە دەس بهێنێ. لە بەر ئەوە گیروگرفتی ناوخۆی عیراقیان پشت گوێ ئەخست، بە تایبەتی کە عیراق لە گەڵ ئێران کەوتە شەڕەوە.

٣. شێوەی چەوتی ڕاگەیاندنی یەکێتی.

یەکی لەو تاکتیکە تازانەی لەم شۆڕشەدا داهێنرا، بۆ ئەوەی لە ئابلۆقەی ئیعلامی دەرچێ و دەنگی بە دنیا بگات، گرتنی کارکەرانی بیگانە بوو. گرتنی ئەمانە لە لایەن دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ئەو وڵاتانەوە باس ئەکرا و، لە دنیادا دەنگی ئەدایەوە و، بەم ڕێگایە سەرنجیان ڕائەکێشرا بۆ هەبوونی جوڵانەوەیەکی سیاسی - چەکدار دژی بەعس لە کوردستانی عیراق دا.

سەرەتا چەند کارکەرێکی فەرەنسی گیرا لە قەندیل کاریان ئەکرد. بە دوای ئەوان دا پۆلۆنی و، ئەڵمانی و، یۆگوسلاڤی و ڕووس..

ئەم کارە لە لایەن دەوڵەتانی ئەورووپیەوە بە کاری تیرۆریستی دائەنرا و، ئەنجامەکەی:

- عیراق گوێ ی نەئەدایە و، خۆی نە ئەکرد بە خاوەنی. بە هیچ جۆری ئامادە نەبوو گفتوگۆی لە سەر بکا بۆ گۆڕینەوەیان بە گیراو و دیلەکانی ئیمە و، بە هیچ جۆری ئامادە نەبوو پارە بدا بۆ بەردانیان.

- دەوڵەتەکانی خۆیشیان دوو جۆر بوون: ئەوانەی ئەورووپای ڕۆژهەڵات، یەکێتی سۆڤیەت، پۆلۆنیا، یۆگوسلاڤیا.. هاووڵاتییەکانی خۆیان فەرامۆش ئەکرد و، لە سەریان هەڵئەئەدانی و بە تەنگیانەوە نەئەهاتن. دووەمیان، وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا، ئەمەیان بە کارێکی تیرۆریستی دائەنا، بەڵام ئەکەوتنە گفتوگۆی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بۆ پاراستنی ژیان و بەردانیان.

ئەم کارە بۆ ئیمە لە چەند سەرەوە سوودی هەبوو:

١. ڕۆژنامەکانی ئەو وڵاتانە باسی گیراوەکانیان ئەکرد و، هەواڵی هەبوونی جوڵانەوەی کوردیان ڕائەگەیاند.

٢. لە هەندی وڵات ئەبوو بە هۆی دامەزراندنی پەیوەندی ڕاستەوخۆ لە گەڵ نوێنەرانی

یەکیتی. د. کەمال فوئاد چەند ساڵ لە ئەڵمانیا نەیتوانی بو پەیوەندییان لە گەڵ دابمەزرینی، بەم هۆیەوە پەیوەندییان لە گەڵ دامەزراند.
٣. لە هەندی وڵات ئەمو بە هۆی هەندی دەسکەوتی مـــاددی: ناردنی دەرمـــان، تەداوی بریندار، دانی پارە..
ئەم کارە هەندی لە هەڤاڵانی ئەورووپای سەغڵەت کرد بو، وابان ئەزانی جیگەیان پی لیژ ئەکا. لە باتی ئەوەی هەوڵ بدەن بە چاکترین شیوە کەڵکی لی وەربگرن، گوشاریان بۆ سەرکردایەتی یەکیتی ئەهینا واز لەم تاکتیکە بهینی، تەنانەت گەیشتە رادەی هەرەشەی وازهینان لە یەکیتی. بەڵام ئەم تاکتیکە بو بو بە باو. هیزەکانی تریش پەنایان ئەبردە بەری لەوانە: حسک و پارتی. ئەگەر ئیمەش وازمان لی بهینایە ئەوان دریژەیان پی ئەدا.

*

هاوینی ٩٨. لە بەری قەرەداخ ٩ کەسی سۆشیالیستی لە کاتی راوەماسی دا گیران. هەریمی ٥ ی قەرەداخ ویستیان بە پەلە بیانبەرینەوە بەری شارباژیر بۆ ئەوەی بیانگەیەننە بارەگاکانی سەرکردایەتی. جەیشی عیراق یەکی لە گەورەترین لەشکرکیشییەکانی کرد بۆ سەریان و، هەمو ئەو ریگایانەی ئەوان گومانیان لی ئەکرد بە هەلیکۆپتەر لی ی دابەزین و، گرتیان. لە شوینیک دا پیشمەرگەکانیان دۆزیبوەوە. بو بە شەریکی قورس. ٦ کەس لە پیشمەرگەکان کوژران لەوانە: گۆران، کە یەکی لە باشترین فەرماندەی کەرتەکانی هەریمی ٥ بو و، ١٧ پیشمەرگە و دوان لە سۆشیالیستەکانیش بریندار بون.
مستەفا چاورەش، فەرماندەی هەریمەکە، بۆ ئەوەی هیرشەکەیان لە کۆڵ بیتەوە سۆشیالیستەکانی بەردا بو.
یەکی لە بریندارەکان شاهۆ (حەمەی تەلە) بو. شاهۆ شاخەوانیکی کەم هاوتا و، شمشالژەنیکی شارەزا بو. لەم شەرەدا گوللەیەک لە سەری و گوللەیەک لە دەستی دابو. برینەکەی سەری لە زمان و، گوللەکەی دەستیشی پەنجەکانی لە کار خست بو، تا ماوەیەکی زۆر قسەی بۆ نەئەکرا و، تا کۆژراشی زمانی بە تەواوی بەر نەبو. چەند پەنجەیەکی دەستیشی سەقەت بوبو. لە گەرمەی شەر و هیرشی هەلیکۆپتەردا بە برینداری لە بن دەوەنیک دا ئەبی، خوینی لەشی چۆراوگەی بەست بو. لەو کاتەدا ماریک لە نزیکی پەیدا ئەبی، دەس ئەکا بە لستنەوەی خوینەکەی. شاهۆ هۆشی لە لای خۆی ئەبی بەڵام نە زمانی ئەبی هاوار لە هاوریکانی بکا و، نە دەستی بەرد ئەگری لە مارەکەی بگری. مارەکە تا تیر بوبو چۆراوگەی خوینەکەی لست بوەوە و، دوای ئەوە بی ئەوەی پیوەی بدا رۆیشت بو. بیگومان هەلویستیکی دژوار بوە دیمەنەکەی هەرگیز لە بیر شاهۆ نەئەچوەوە.

*

«گروهی حەوت نەفەر»
چوار مانگ دوای گرتنی چوارەمین کونگرەی حدکا، ٧ ئەندامی کومیتەی ناوەندی بەیانیکی دریژیان بلاوکردەوە، جیابونەوەی خۆیان لە حیزب راگەیاند، بە بیانوی جیاوازی هەڵویستیان لە حکومەتی ئیسلامی ئیران و، هاوکاری سەرکردایەتی حدکا لە گەڵ رژیمی بەعس. ناویان لە خۆیان نا بو: «پیرەوانی کونگرەی چوارەم».
لە ناو پیرەوانی کونگرەی چوارەم دا چەند کەسیکیان تی دابو تازە هات بونە ریزی حدکاوە، بەڵام ٣ کەسیان لە ناودارە کونەکان بون: غەنی بلوریان، کە زیاتر لە ٢ ساڵ لە

شاخەکە. هەندێ چەکداری یەکێتیمان لە نزیک قەڵای سەرچک دی بوو. کردیان بە هەڵڵا وتیان: «فەرموو ئەوە مەساعەتی ئێوە وازمان لێ ناهێنن!» بوو بە شەڕ. گەمارۆی چەند پێشمەرگەیەکیان دا گرتیانن. دەرکەوت معلومزەییەک بوون لە گەڵ مەحمود گەرمیانی لە شارەزوور بوون. ئاگایان لە بەزم و رەزمی گرتنی من نەبوو، بۆ حەوانەوە و پشوودان ئەچوون بۆ شارباژێڕ و، بە رێکەوت بە سەر ئەم شەڕەدا کەوت بوون.

*

مامجەلال لە دەرەوە بوو، عومەر شێخ موس، عومەر مستەفا، کەمال خۆشناو، جەمال حەکیم، جەعفەر، ملازم عومەر، فەرەیدون.. لە بارەگاکانی سەرکردایەتی بوون.

مەکتەبی سیاسی بەیانێکی لە سەر گرتنی من دەرکرد بوو بە رادیۆ خوێند بوویانەوە، هەڕەشەی قورسیان لە حسک کرد بوو و، لە هەمان کات دا داوایان لە حشع کرد بوو، بە تایبەتی لەو کاتەدا عەزیز محەممەدیش لە کوردستان بوو، هەوڵی بەردانم بدەن. جەمال تاهیر، کە ئەوسا بەرپرسی رێکخستنە نهێنییەکانی ناوشارەکان بوو، نامەیەکی بۆ عەلی بەگی باوکی تاهیر نوسی بوو، هەڕەشەی لێ کرد بوون کە ئەگەر من شتێکم لێ بێ، بنەماڵەکەیان لە رەگوریشە دەرئەهێنێ. عەلی بەگ ماوەیەکی درێژ ئەفسەری شورطە بوو. هەڕەشەکەی بە جیددی وەرگرت بوو. نامەکەی برد بوو بۆ کاربەدەستانی «ئەمن»ی سلێمانی. مەلا بەختیار و سالاریش زۆری هێزەکانی شارباژێڕ، هەورامان، شارەزوور، گەرمیانیان کۆ کردبووەوە لە نامەو نامەنوسین دا بوون لە گەڵ ملازم تاهیر و، هەڕەشە و گوڕەشەیان بۆ ئەناردن.

*

هێزەکەی حسک و لێپرسراوکانیان سەریان لێ شێوا بوو نەیانئەزانی چی بکەن و، چی لە من بکەن. لە ناو هێزەکانی یەکێتی پش جیهان بە خۆیان نەئەگرت. چونە دوڵە سوور و بە ناو نۆردوگای شانەدەری دا چوون بۆ کێوی سورێن. لە شانەدەری لایان دابە ماڵی جەلالی حاجی کاکەلی. جەلال هاوڕێ ی کۆمەڵە بوو، زۆری پێ ناخۆش بوو منی بەو حالە دی، هیچیشی پێ نەئەکرا. چونە ئەشکەوتی دەرە گولان لە شاخی سورێن.

سورێن دیوێکی ئێران و دیوێکی عێراق بوو. بە پێ ی پەیمانی زەهاوی ئێرانی - عوسمانی ئەم کێوە کرا بوو بە سنوری هەردو دەوڵەت و. لە پەیمانەکەدا ناوی قەڵای زەلم و گەردنەی چەقان هاتوە، وەکو ناوچەی سنور، هەردوکیان لەم سەر و ئەوسەری کێوی سورێن دان.

چەند سەرچاوەیەکی ئاو لە بناری سورێن دایە لەوانە: چەمی چەقان، کە لە یەکگرتنی چەمەکانی جوەمەرسی، عەرەبسوار، کەولۆس دروست ئەبێ و، چەمی شەڵم، چەمی ریشێن، چەمی شەرسەر. ئەم چەمانە ئەڕژێنە شارەزوورەوە. قسەیەکی کۆن هەیە، بۆ ئەوەی منال دەمی تەتەڵە بکا پێ ی دوبارە ئەکەنەوە، ئەڵێ: «چوومە چەمی چەقان، چەقەڵ چەڵتوکی ئەچەقان!» سەرچاوەی شەڵم ئاوەکەی گەرمە وەکو ئەڵێن ماسییەکانی کوێر بوون.

سورێن چەندین ئەشکەوت و کەوڕگی لێ یە، لەوانە: دەرە گولان، هەزار ئەستون، قوڕی سولتان، دەرە کۆزە. لە دوڵی خورنەوەزان و وشکەناویش چەند ئەشکەوتێکی تری لێ یە. کانی و ئاو لە هیچیان نزیک نەبوو. دەرە گولان بەرامبەر سەید صادق بوو.

ئاوایییەکانی سورێن و بنارەکەی: چەرتان، کولیتان، زەنگیسەر، خرنوک، سیامیرە، کانی سێف، وەڵەست، بەرئەشکەوتان، تونەقاج، قەڵبەزە، تازە دێ، بەردەبەڵ، جوەمەرسی،

بوریدەر، نەوی، بانی بنوک، چنارە، دەرەگولان، میری سور، ریشین، عامورە، بانی شار، قایندیە.. هەمو راگویزرا بون. گوندی «دزلی» کە لە دیوی ئیران بە سورینەوە بو، بنکەی سەرەکی پارتی لی بو. نادر هەورامی بەرپرسی بنکەکە بو. هەندی لە پیشمەرگەکانی حسک هاتوچۆیان ئەکردن.

ئەو ماوەیە منیان بە مەحمودی حەمە تاتە سپارد بو ئیشکم لی بگری. غەفور (دەرسیم) یاریدەری مەحمود بو. مەحمود برایەکی خوی لە گەڵ بو، گاڵتەی بە حسک ئەکرد، هەمیشە شەرە دەنوکیان بو. بەفر سورینی گرت بو. هەوا زور سارد بو. رایەخ و پیخەفیان نەبو. لە بن تاشە بەردیک دا لە سەر ئەرز بە دیار ئاگری دوکەڵاویەوە هەڵتروشکا بوین.

زورجار غەفور و کەریم ئەیانداییەوە بە چاوما کە ئەوان پەروازەی دەستی منن و، من وام لی کردون ناچارین تەسلیمی رژیم ببنەوە و، دوایی ببنەوە شاخ و لە داخی من بچن بە حسک و، لە ژیانی سیاسی و پیشمەرگایەتی دوا بکەون. هەردوکیان راستیان ئەکرد، بەلام من هیچ دوژمنایەتییەکی تایبەتیم لە گەڵ کەسیان نەبو، حەزم ئەکرد ئەمانیش پیش بکەون و، ببن بە کادری خوشناو و سەرکەوتو. لە بەر ئەوەی ئامۆژگاری سودی نەبو لیم پرسی بونەوە و، بەلام ئەوان بەرگەی لیپرسینەوەیان نەگرت بو

•

ئەو کاتەی لە شارباژیر بوم جاریک بە دو قزلی لە گەڵ کەریم دانیشتم هەندی ئامۆژگاری بکەم. پیم وت: «تۆ لە سایەی شورشەوە لە کەریمی دادەمەنەوە بوی بە دکتور چالاک، لە کاتیکا نە دکتوری و نە چالاکی. هیچ کلیە یا مەعهەدیکی طبیت نەخویندوە و، هەمو بەهانەیەکیش بە زلار لە خەو هەلت ئەستان. هیچ نەبی شورش ئەو چاکەیەی بە سەر تۆ و غەفور لگاو و خولەی جگەرەوە هەیە کردونی بە د. چالاک و دەرسیم و ئەمەز. لە بەر ئەوە حورمەتی شورشەکە بگرن، ئەگەر باکی ناوبانگی کۆمەڵە و یەکیەتیتان نیە، باکی ناوبانگی ناوەکانی خوتان هەبی!»

کەریم کوریکی وریا و لەبلەبان بو. هەرگیز بو قسە دانەنیشا. دوای ئەوە بە ماوەیەک تەسلیم بوەوە. پاش ماوەیەک نامەی ستاری سەعید خلفلی بو هینابن. لای ئیمە نەمابوو چو بو لای حسک. ئیتر نەمبینیەوە تا لیرە یەکمان گرتەوە.

•

کەریم بە ناوی گەیاندنی بەریدی سینیەوە لە سورینەوە بە ناو ئیران دا گەرابوەوە بو دەراوی دولەتو. غەفور چارەبار قسەی خوشی ئەکرد. لە ناو خزیان دا باسی زەلامیکیان ئەکرد بە خراپە. یەکیکیان وتی: «حیزب دەری کردوە». غەفور هەلی دایە، وتی: «بوچی ئەم حیزبەی ئیمەش خەلک دەرئەکات؟»

•

عەلی بەگی باوکی تاهیر هات بو دەرە گولان. راسپاردەی د. فاضل بەرواک ی پی بو، کە ئەوسا بەرپرسیاری «ئەمنی عام» بو. بە باوکی تاهیردا جوابی بو نارد بون کە منیان تەسلیم بکەن، یان ئەگەر ئەوە بە باش نازانن کاریکی وا بکەن بکەومە کەمینیکی ئەوانەوە و، بە زیندویەتی بمگرن، بەرامبەر بەوە بەلێنیان دابونی چەردەیەکی باش پارەیان بدەنی. شتی وەها لە مولازم تاهیر ئەئەوشایەوە. قادر جەباری مەسەلەکەی بو باس کردم. کردم بە

گاڵتە لە گەڵی وتم: «تا چەند ساڵی تر خزمەتی یەکێتی بکەم بایی ئەو پارەیە خزمەتم پێ ناکرێ. منیان تەسلیم بکەن و پارەکە وەربگرن و بیکەن بە دوو بەشەوە، بەشێکی بۆ خۆتان و بەشێکی بۆ یەکێتی!»

شەوڵناو ئاریەجیەکیان تا بوو بە ماڵی عەلی بەگەوە لە سلێمانی. تایەر بە گلەییەوە رووداوەکەی بۆ گێڕامەوە. ئەو بە هاوڕێکانی منی ئەزانی. بەڵام بە راستی ئەوان نەبوون، «ئەمنی سلێمانی» بۆ خۆشکردنی ئاگری ئاکۆکییەکە، ئەمەیان کرد بوو.

چەند جارێ مەحموود باسی راکردنی لە گەڵ کردم. ئەیوت: «ئەگەر بەڵێنم بدەیتێ شتی کۆنم لە گەڵ حساب نەکەن و ریزم بگرن و، بمکەن بە فەرماندەی کەرت، لە گەڵت دێم.» لەو کاتەدا کەولی من پارەی زۆری ئەکرد باوەڕم پێ نەئەکرد لە گەڵی بڕۆم، گوێم نەئەدایە قسەکانی. خەلیفەی عەبدوڵڵا مارف، کە خۆی بە یەکێتییەکی تۆراو دائەنا، ئەویش چەند جارێ ئەو باسەی لە گەڵ کردم، هەلێکی لە بارمان بۆ هەڵ نەئەکەوت. رۆژێکیان دابەزی بووین بۆ ناو کەلاوەکانی قاینەجە. قادر جەباری مان لە گەڵ بوو، دنیا تەمومژێکی چڕ بوو چاو چاوی نەئەبینی بە خەلیفەم وت: «ئەمڕۆ فرسەتە با بڕۆین!» خەلیفە ملی نەدا وتی: «ئەترسم بگەینە سەر جادەکە و تەمومژ بڕەوێتەوە و بمانگرن. خەلک وا ئەزانی بە ئەنقەست تەسلیمم کردوی» هەلەکەمان لە دەس چوو.

چەند ئێوارەیەک بۆ شەو دایان بەزاندم بۆ گیلەک، شەهرەسەر.. دوای ئەوە ئێستر بردمیانە ئەشکەوتی «هەزار ئەستوون». حشع لەم ئەشکەوتەدا بنکەیەکیان دانا بوو. لە گەڵ ئەوان بوون بە یەک ماڵ.

*

دانیشتوانی ئەشکەوتەکە تێکەڵاو بوو لە: مەفرەزەیەکی حشع، کابرایەکی گیراو بە تاوانی جاسوسی، مەفرەزەیەکی حسک کە پاسەوانییان لە من و حەمەی حاجی سابیر و فەرەج ئەکرد. هەروەها یەکدوو عەرەبی عێراقی کە لەو هەرایەدا لە گەڵ حسک بوون. پاشماوەی هێزەکەی حسک لە ناو دۆڵەکەدا بەرامبەر بە شارەزوور دامەزرا بوون. فەرەج، نامەی مەلا بەختیاری بۆ هێنا بوون، ریگەیان نەدا بوو بگەڕێتەوە گرتبوویان.

پاش چەند رۆژێ حەمەیان بەر دا. من و فەرەج مابووین.

*

کاوەی شێخ لەتیف و ناسر حەفید «ناڵە» هاتن بۆ ئەشکەوتەکە. لە گەڵ بەرپرسەکانی حسک قسەیان کرد بوو، قسەکانیان جێگەی نەگرت بوو، ئیزنیان لێ وەرگرت بوو بێن لە لای من بێنەوە تا چارەنووسی من بە لایەک دا نەکەوێ. کاوە پیاوێکی قسە خۆش و نوکتەباز بوو. زۆری حەز لە راگرتنی کەو و راو ئەکرد و، نیشانچییەکی دەستراست بوو. بەڵام نەخۆش بوو، بە شرینقە خەوی لێ ئەکەوت، زۆر کەم ئەنوست و، زۆر کەم خواردنی ئەخوارد. هەلومەرجی ژیان لە ئەشکەوتەکەدا ناخۆش بوو. زۆری لە گەڵ خەریک بووم بگەڕێتەوە، بە قسەی نەئەکردم و بۆ پارێزگاری من مابووەوە. مەترسی هەبوو یەکێ لە پێشمەرگەکانی حسک، بۆ پارە، تفەنگێکم پێوە بنێ و بڕوا تەسلیم ببێتەوە.

چەند جارێ هەڵم بۆ هەلکەوت هەڵێم لە بەر ئەو دوام خست پێم جوان نەبوو تووشی گێچەڵی بکەم. لە گەڵ خۆی باسم کرد پێکەوە بڕۆین ئەیوت لە گەڵتان دەرناچم. راستیشی ئەکرد نەیئەتوانی بە پێ بڕوا بە وڵاخ هاتوچۆی ئەکرد.

✱

حەشع، بە تایبەتی عەزیز محەممەد، لە سەر داوای سەرکردایەتی یەکیتی، هەولی زۆریان لە گەڵ سەرکردایەتی حسک دابو بۆ بەردانم. سەرکردایەتی حسک لە سەرەتادا هەندێ بروبیانوویان هێنا بووەوە و، هەندێ مەرجی سیاسییان دانا بو. سەرەنجام لە ڕۆژی ٨١/١/٢٣ دا بڕیاریان دا بو من بەر بدەن. بە نامە ئاگاداری حشعیان کرد بو، نامەیشیان بۆ هاوڕێکانی خۆیان نوسی بو داوایان لێ کرد بون: «بە بێ قەید و شەرت» بەرم بدەن و، تەسلیمی نوێنەری حشعم بکەن. مەکتەبی سیاسی یەکیتی جەمال حەکیم و، حشع قادر ڕەشید و عەلی کلاشینکۆفیان لە ناوزەنگەوە نارد بو بۆ ئەم مەبەستە.

ڕۆژێکیان لە ئەشکەوتەکە داپانبەزاندین بۆ دەشتاییەکەی بەردەمی. جەمال حەکیم، کە ئەوسا ئەندامی م س - یەکیتی و، داوای شێخ جەلالی حەفید، کە فەرماندەی هەریم بو، لە گەڵ تاقمی پێشمەرگە لەوانە: شێخ عومەری حاجی شێخ کەریم، هات بون. نامەی سەرکردایەتی حسکیان بۆ تاهیر و هاوڕێکانی هێنا بو من تەسلیمی ئەوان بکەن.

لێپرسراوەکانی حسک ئامادە نەبون بڕیارەکەی مەکتەبی سیاسی حیزبەکەیان جێبەجێ بکەن. داوایان لە جەمال ئاغا کرد بو: بۆ ئەوەی من بەر بدەن ..١ تفەنگیان بداتێ. چەندێ لە گەڵیان ئەڵێن، کەڵکی نابێ. جەمال ئاغا بە ناچاری داواکەی قەبوڵ کرد بون، وت بوی: «ئێمە تفەنگی کەڵەکە کراومان نیە لە عەمبار دا، ئەبێ بچین لە ناو هێزەکان دا کۆی بکەینەوە»

ئەم داوایەی حسکم پێ سوکایەتیەکی زۆر گەورە بو، خۆمم لە بەر چاو کەوت بو، چونکە یەکێ بو لە نزمترین شێوەکانی «ئیبتیزاز». ئەم داوایەی ئەوان زیاتر لەوەی لە هی حیزبی سیاسی بچێ، لە هی مافیا ئەچو.

✱

ئێوەڕۆیەکیان ملازم تاهیر هاتە لام. چەند سەعاتێ مایەوە قسە و باسی گشتی مان نەکرد. پێش ئەوەی هەستێ بڕوا، وتی: «ئەو برادەرانەی ئێوە ئەوەندە هاتوچۆی ئەم ناوانەیان کردوە هەمووشتێکمان ئەزانن، هێزێکی گەورەیان لە چەمی گەڵاڵ کۆ کردۆتەوە، ڕەنگە پەلامارمان بدەن لە بەر ئەوە بڕیارمان داوە بگوازینەوە بۆ جێگایەکی تر. سبەینێ دێین بە دواتا». لە ناو هێزەکەی حسک دا چەند کەسێک هەبون بەردەوام هەواڵ و دەنگوباسیان بۆ ئەهێنام. یەکێکیان خەبەری بۆ هێنا بوم کە لەگەڵ ناڵە هەورامی ڕێک کەوتون لە نزیک بانی شار بنکەیەکی هاوبەشی پارتی و حسک دابنێن و، منیش ببەن بۆ ئەوێ بۆ ئەوەی، هێزەکانی هەردو حیزب پێکەوە ئیشکم لێ بگرن. کاوەش ئەم هەواڵەی بیست بو.

کە تاهیر ڕۆیشت بە کاوەم وت: «گوێت لە قسەکانی کاک تاهیر بو؟»

وتی: «بەڵێ!»

وتم: «ئەڵێی چی؟»

وتی: «تۆ خۆت چی بە چاک ئەزانی بیکە!»

وتم: «ئەگەر ببەن بۆ لای پارتی، ئیتر هیچ هیوایەکم نامێنێ. لە بەر ئەوە پێم باشە ئەمشەو فرسەت بهێنین بڕۆین»

وتی: «تۆ بڕۆ، هەرچی چەکیشت ئەوێ بیبە! بەڵام من بڕ ناکەم و نامەوێ دوات بخەم»

وتم: «ئەترسم تووشی کێشە بی لە گەڵ حەسەک»
وتی: «گوێ مەدەرێ، لام وایە تووشی کێشە نابم، ئەگەر تووشیش بووم، تۆ لەو لای مشوورم بخۆ!»
ئیتر دڵنیا بووم شێخ کاوە لێم زۆر نابێ ئەتوانم بە ئازادی بجوولێم.
پێشتر لە بەردەمی ئەشکەوتەکەدا زۆر جار راوەستا بووم، سەرنجی سەرەوەی و ڕێگاکانی ئەملا و ئەولایم دابوو. زۆر جار بیرم لێ کرد بووەوە ئەگەر بڕۆم لە کوێوە بڕۆم. بڕیارم دا بە ڕێگا ئاسایییەکان دا نەڕۆم. شەوێ بە تاریکی بە لای ئەشکەوتەکەدا ڕاستە و ڕاست بە شاخەکەدا هەڵبگەڕێم و بە بناری سووریندا بەرەو شانەدەری بڕۆم.
فەرەجم ئاگادار کرد خۆی ئامادە بکا. کاوە وتی: «ئەوەکو تووشی تەقە بێن چەکی پێشمەرگەکانی من بێنن» من نەمئەویست کاوە ئیحراج بکەم چەکم لێ وەرنەگرتن، بەڵام هەندێ ئارنجۆکم لێ وەرگرتن. کاوە بە زۆر دەمانچەکەی خۆی دامێ. لە گەڵ فەرەج وا ڕێک کەوتم کە من دەرچووم ئەویش بە دوای من دا بێت بۆ شوێنی چاوەڕوانی. دەوروبەری سەعات ١٠ ی شەو لە کاتی گۆڕینی ئێشکگرەکەدا بە ناوی مێزکردنەوە لە دەرگای ئەشکەوتەکە دەرچووم. دنیا زۆر تاریک بوو. چاو چاوی نەئەبینی. بەردە لوتەکانی بەردەمی ئەشکەوتەکە لە زەلام ئەچوون. پاسەوانەکە لە بەر دەرگای ئەشکەوتەکەدا ڕاوەستا بوو. چومە پەنا بەردێک و بە بێ ڕاوەستان ڕووم کردە لای سەرووی ئەشکەوتەکە. چاوەڕوانی فەرەج بووم دوای ئاوی ئەویش هات و، دو چەکداری شێخ کاوەش بۆ پارێزگاری بە دوامان دا هاتن زۆر بە خێرایی بە شاخەکەدا هەڵگەڕاین، لە ماوەیەکی کورت دا ماوەیەکی باش دوور کەوتینەوە. چەکدارەکانی شێخ کاوەمان ئیزن دا. دە دەقیقەیەکی پێ چو کابرای پاسەوان کە زانی ئیمە دیار نەماوین و، گومانی کرد بو ڕامان کردبێ، ڕیزێک تەقەی کرد بۆ هوشیار کردنەوەی هاوڕێکانی. گوێ مان لە تەقەکان بو بەڵام ئیمە ئەوەندە دوور کەوتبووینەوە مەترسی ئەوانمان لە سەر نەما بو.
بە بناری سووریندا ڕۆیشتین بە سەرووی ئوردوگای شانەدەری دا لە جادەمان دا و پەڕینەوە بەری چەمی گەڵاڵ. تاریکایی شەو و ماندوێتی سەری لێ تێکدا بووین شوور بووینەوە بۆ لای کانی سپیکەی پەرخ، تاریک و ڕوونی بەیانی ئاڵاری ڕاستمان دۆزییەوە بە شاخەکەدا هەڵگەڕاینەوە بە لای ماینەوڵ دا بۆ چەمی گەڵاڵ.
ڕۆژ بوبووەوە، بەڵام ئیمە ئەوەندە خۆمان ڕەتاند بو هەردووکمان پرزەمان لێ برا بو، منیش ئەوەندە هەڵ ئەنگوت بووم و شەقم لە بەرد هەڵ دا بو، نینۆکەکانی هەردوو کەلەموستی پێم شکا بوون، ئەبێشمانئەویرا بۆ پشوودان لا بدەین. بە نزیک هوزخواجادا درێژەمان بە ڕۆیشتن دا. ماوەیەکی باشمان لە دۆڵەکە بڕی بو. فەرەج چو بۆ دێ یەکی ئەو نزیکانە وڵاخ پەیدا بکا. منیش پاڵم دابو بە بەردێکەوە دانیشت بووم، لە دوورەوە زەلامێکم بەدی کرد جلی پێشمەرگەی لە بەردا بو. چومە ئەدیو چاودێری بکەم، زوانیم ئەبەرد کەلاری بو. هەستام و بانگم کرد. بۆ ئەبەرد شتێکی چاوەڕێ نەکراو بو من لەو بن بەردەدا ببینێ. لە خۆشی دا پێ ی ئەرزی نەئەگرت. دوای ماچومووچ بە ڕاکردن بەرەو پەرخ بە ڕێ کەوت مژدە بدا بە پێشمەرگەکان. پێشمەرگەکان بە بیستنی هەواڵەکە کردیان بە تەقەی خۆشی و زۆریان بەرەو پیرم هاتن. هەندێ لە دانیشتوانی ئاوایی ئەیانزانی بو بۆچی کتوپڕ کردویانە بە تەقە. ژنێک لە ژنی دراوسێکەیانی پرسی بو: «ئەوانە بۆچی تەقە ئەکەن؟» لە وەڵام دا وت بوی:

«وەفێن مەنسولیکی زلیان بەلمسە بووا».
دوای ۳۲ رۆژ دەلی گەیشتمەوە ناو هاوڕیکانم.

*

حەمەی حاجی سابیر ماڵەکەی لە پەرخ بو، چومە ماڵی ئەوان. جەمال ئاغا خەریکی کۆکردنەوەی چەک بو بۆ حیسێک، ئەم ئەرکە زەحمەتەی لە کوڵ بومەوە. پاش دانیشتان و گفتوگۆ، زۆری هێزەکەمان ریگە دا بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان و، نامەیەکیشم بۆ کاک تاهیر و هاوڕیکانی نارد، دڵنیام کردن لەوەی یەکیتی نیازی شەڕی نیە و، ئەوان بە ئازادی و دڵنیایی ئەتوانن لە هەر جێیەکی خۆیان ئەیانەوی جوڵە بکەن. بەلام ئەو کارەی ئەمان کرد بویان ئەوەندە دزێو بو، تا چەندین ساڵ زاتیان نەئەکرد بێنە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکیتیەوە.

ئەگەر ئەم رووداوە ئەیتوانی لەوانە بو رەوتی ژیانی من بە جۆرێکی تر بڕوێشتایە، چونکە دوای ئەمە ئیتر لە سەفەری ئەورووپا و لە ژنهێنان پەشیمان بومەوە. ئەمە جاری دوهەم بو بە هۆی کیشەی سیاسیەوە هەلی ژنهێنانم لە کیس چو. جاری یەکەمیان بەر لە بەهاری ئازاری ۷۰ لە گەل کچێک، کە بە ئارەزوی دڵی خۆم هەڵبژارد بو، ریک کەوت بوم بیخوازم، بە هۆی رووداوەکانی دوای ئازارەوە وازم لێ هێنا. ئەمجارەیش بە هۆی ئەم رووداوەوە.

پاش چەند رۆژێ مانەوە لە شارباژێر گەرامەوە ناوزەنگ.

*

## کاروباری کۆمەلە

### رەوشتی هاوڕێ ی کۆمەلە

لە خەباتی ژێر زەمینیی سیاسی - چەکداردا هەندێ جار کەسانێ وا پەیدا ئەبون کە لە ژیانی گشتی دا خاوەنی پایەی بەرزی کۆمەلایەتی و دەسەلاتی حوکمرانی و سامان و دارایی نەبون، بەلام بە هۆی خەباتەوە دەسەلات و چەکدار و پارەیان ئەکەوتە بەر دەست. بێگومان ئەمەیش «نەفسیەت»ی ئەگۆری و، ئەگەر پێگەیاندنی راست و پەروەردەکردنی دروست و، ئامۆژگاری و چاودێریی بەردەوامی لە گەل نەبی کابرا بەرەو گەندەڵی «فەساد» ئەخلیسکێنێ. ڕێکخراوە تێکۆشەرەکە ئەبێ بە جۆرێ لە باندی مافیا و، کابرای تێکۆشەر بە سەرۆکی باند یان بە «میری شۆڕش».

لە شۆڕشی کوردا نمونەی ئەمانە زۆرە.

کۆمەلە ڕێکخراوێکی «عقائدی» بو. بیروباوەر ئەندامەکانی بە یەکەوە بەست بون. من و زۆری کە لە هاوڕیکانم لامان وابو کە تێکۆشەری کۆمەلە ناتوانی لە هەمان کات دا دو ژیانی هەبی: ژیانێکی تایبەتی و ژیانێکی سیاسی. لامان وابو هەردوکی بە جۆرێک تێکەلاون کە لە یەک جیا ناکرێنەوە.

یەکێ لە ژیانی تایبەتی دا دز بی ناتوانی لە ژیانی گشتی دا پاک بی و، لە ژیانی تایبەتی دا درۆزن بەلام لە ژیانی گشتی دا راستگۆ بی... بۆ پێگەیاندنی ئەندامەکانی کۆمەلە:

١. چاودێری و ئامۆژگاری بەردەوام هەبو. هەر یەکێکیان هەڵەیەک یان موخالەفەیەکی بکردایە بانگ ئەکرا بۆ لێپرسینەوە و سزادان.
٢. بەردەوام بڵاوکراوەی ناوخۆ بۆ ریزەکانی ڕێکخستن دەرئەچو.
٣. دەورەی پێگەیاندنی کادر ئەکرایەوە.
یەکێ لەو بڵاوکراوانەی ئەمەو بە وردی پەیرەوی بکرایە ئەمە بو:

*

## ڕەوشتی هاوڕێ ی کۆمەڵە

### هاوڕێ ی تێکۆشەرا

هاوڕێ ی کۆمەڵە بە چی لە خەڵکی جیا ئەکرێتەوە؟ بە چی دا ئەناسرێتەوە؟ ئەبی جیاوازیی چی بی لە گەڵ یەکێکی تر؟ ئاخۆ رەنگ و ڕوی جیاوازە؟ جلوبەرگێکی تر لە بەر ئەکا؟ شاخ و باڵی هەیە؟ باڵای بەرزە؟ یا چی..؟

هاوڕێ ی کۆمەڵە مرۆڤێکی نائاسایی نیە. هاوڕێ ی کۆمەڵە ئادەمیزادێکی ئاسایە وەکو هەمو خەڵکی تر، بەڵام ئەبی بە کردار و رەفتار و وتاری لە خەڵکی کە جوی بکرێتەوە.

هاوڕێ ی کۆمەڵە پەیوەستە لە کاری سیاسی و ڕێکخراوەیی و پێشمەرگەیی دا لونەی ئیلتیزام و گوێڕایەڵی بی بەرامبەر بە لێپرسراو یا فەرماندەکەی و، لە جێبەجێ کردنی بی قەید و شەرتی فرمان و بڕیار و ئامۆژگاری دەزگا دەسەڵاتدارەکانی سەروی خۆی دا.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبی لە ژیانی ڕۆژانەی دا لونەی مرۆڤێکی لونەیی بی، لە قسە و گفتوگۆی دا، لە هەڵسوکەوت و کردەوەکانی دا، بە گوێرەی هەلومەرجی ئەو کات و شوێنە نوێنەرەوەی بیروباوەڕی بەرزی کۆمەڵە و ڕێباز و سیاسەتەکەی بی.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبی لە شەڕا لونەی ئازایەتی و لە خۆ بوردن و لە خۆ بڕان بی، لە حەسانەوە و پشودان دا هاوڕێکانی لە بیر بی و، بە پێشیان بخا، لە ناخۆشی دا بە تەنگیانەوە بی و مشوریان بخوا، لە ڕاپەڕاندنی ئیشوکاردا ڕوح سوک و لەش سوک بی، لە گفتوگۆدا هێمن و لە سەر خۆ و بە ئەدەب بی.

هاوڕێ ی کۆمەڵە لە کاتی دەزگیر بون دا ئەبی لونەی خۆڕاگری و نتەی بی و، لە ژێر باری ئەشکەنجە و ئازاردا لونەی دان بە خۆدا گرتن بی و، زیان بە هاوڕێکانی نەگەیەنی.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبی لەمەڕی ژیانی بە کۆمەڵ و گوێجان بی، ئەبی بزانی چۆن لە گەڵ خەڵکی ترا ئەژی، لە مەقەرێزییەک یا لە کەرتێک دا، لە ماڵێک دا یان لە پارەگایەک دا لە گەڵ پێشمەرگە و خەڵکی ترا نیش ئەکا و هەڵ ئەکا و ئەگونجێ و بناغەی دۆستایەتی و هاوخەباتی و هاوسەنگەریێان لە گەڵ دائەمەزرێنی.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبی لە شکان و تێکەوتن و تەنگانەدا ورە بەر نەدات، لە ماندوبون و برسێتی و تینویتی و بی دەرامەتی و بی پارەیی دا خۆگر بی، لە بی هێزی و بی دەسەڵاتی دا بە زات بی. لە سەرکەوتن دا بایی نەبێت و لە کاتی دەسەڵاتداری دا لە خۆی نەگۆڕێت و لە زاڵ بون دا زوڵم نەکات.

هاوڕێ ی کۆمەڵە لە هەر ناوچەیەکا بو ئەبی حورمەتی عورف و عادەتی

دانیشتوانی ناوچەکە، حورمەتی خو و رەوشت و نەریتی دیرینەیان بگری، حورمەتی ریش سپی و پیاوماقولاتی ناوچەکە بگری، حورمەتی دین و کەسانی دیندار بگری، حورمەتی مزگەوت و گۆرستان و شوینە پیروزەکانیان بگری.

هاوری ی کۆمەلە ئەبی لە گەل خەلکا رەفتاری باش بی، بە چاوی سوک تەماشایان نەکات. گوی لە رەخنەکانیان بگری چەندە بی کەلک و سادەش بن. گوی شل بکا بو داوا و پیشنیارەکانیان، بە سنگیکی فراوانەوە ئامۆژگاریان لی قەبول بکات. بە دەنگ داوا و گیروگرفتەکانیانەوە بچی، بەرپەری ئەوی و هیمنی و پشوودریژییەوە هەولی چارەسەرکردنیان بدا.

هاوری ی کۆمەلە ئەبی لە بەرامبەر دوژمنانی گەلەکەمان دا ئازا و نەترس بی، دل رەق و بی بەزەیی بی، چاوپوشییان لی نەکات. کۆمەلانی خەلکی خۆش بویت و لە گەل مەینەتی و ئیش و ئازارەکانیان دا بژی.

هاوری ی کۆمەلە ئەبی دەس پاک بی، هیچ بە زۆر لە کەس نەسینی، چاو نەبریتە مالی خەلک، مالی گەل و شۆرش بە فیرو نەدات.

هاوری ی کۆمەلە ئەبی داوین پاک بی، چاو نەبریتە ناموسی کەس و شەرەفی خەلک بە هی خۆی بزانی، وەکو شەرەفی خۆی بیپاریزی.

هاوری ی کۆمەلە ئەبی دەم پاک بی، جنیو بە کەس نەدا، بوختان و قسەی ناراست نەداتە پال کەس، لە پاش ملە بە خراپی زەمی کەس نەکات.

هاوری ی کۆمەلە ئەبی فەرق و جیاوازی لە بەینی هاوریکانیا بە هۆی خزمایەتی و ناسیاوی و برادەرایەتیەوە نەکات. مەگەر سەبارەت بە ئازایەتی زیاتر و گوریایەلی و دلسوزی و لە خۆبردنی زیاترەوە.

هاوری ی کۆمەلە ئەبی راستگۆ و سەر راست بی، هیمن و ژیر بی، رەوشت بەرز و بە وەفا بی، سادە و روح سوک بی، ئەبی دژی خۆپەرستی و خۆهەلکیشان بی، دژی خۆبادان و کەش و فش و خۆ بە زل زانین بی، دژی لە خۆبایی بون و لوت بەرزی و بە خۆوە نازین بی، دژی درۆ و فشە و قسەی بێ‌شال بی، دژی لە خۆرازی بون و کەس بە هیچ نەزانین بی.

هاوری ی کۆمەلە ئەبی هەمیشە ئەوەی لە بیر بی کە خەباتی کۆمەلە لە ناوەروک دا خەباتیکی سیاسی چینایەتی و نیشتمانیە، ئەبی بی وەرس بون و ماندو بون کاری سیاسی لە هیچ بوار و کاتیک دا پشت گوی نەخات. بە کردار و رەفتار و وتاری چاک نەک بە زۆر و بە ترساندن جی ی خۆی لە ناو دەوروپشتەکەی دا بکاتەوە و حورمەتی خۆیان بە سەرا بسەپینی و هەولی دۆزینەوەی ئاسیاو و دۆست و هاوری ی نوی بدات.

هاوری ی کۆمەلە ئەبی ئەخلاقی بەرجەستە بی، پەیرەوی ئەم سەرەتایانە بکات، بەم گیانە خۆی و هاوریکانی پەروەردە بکات، بەم شیوەیە بژی و کار بکات.

ئەوانەی وەها نین هاوری ی راستەقینەی کۆمەلە نین.

*

ئەم ئامۆژگاریانە بۆ ئەوەی لە گیرفان دا جیگەی ببیتەوە لە قەوارەی پاکەتی جگەرەدا چاپ کرا بو. هەمو هاوریەکی کۆمەلە دانەیەکی ئەدرایە و. ئەبو جیبەجی ی بکا. ئەگەر جیبەجی ی نەکردایە یا لی ی دەرچوایە بە گویرەی سەرپیچیەکەی سزا ئەدرا.

سزادان: چەک کردن، لابردن لە سەر کار، گرتن و دەس بەسەر دانان و، لە هەندێ حالەت دا ئیعدام.

ئەوانەی موخالەفەیان ئەکرد هەتا پلەیان بەرزتر بوایە سزاکەیان قورستر ئەبو. ئەو کاتە وشەی «ترۆ» بلاو بوەوە. ئەم وشەیەمان لە شیعرەکەی «مەحوی» وەرگرت بو کە ئەلێ:

دنیا ئیاترۆیە مەوەستە تیا بڕۆ!

کێ مایەوە هەتا سەر ئەوەی تیا ترۆ؟

لەرتەیەکی ئیعدام، ئیعدامی ڕێوار چارشێن بو.

ڕێوار، فەرماندەی مەفرەزە بو لە تیپی قەرەداغ. هاتوچۆی مالی کابرایەکی کرد بو. ئەو سەردەمە پێشمەرگە گەڕۆک بون. بۆ خواردن و نوستن لە مالان دائەمەزران. ئەم کابرایە مالەکەی کرد بو بە بنکەی پێشمەرگە. بە دلسۆزی و دلپاکی خزمەتی ئەکردن. ڕێوار ژنەکەی لێ هەلگێرا بوەوە و هەلی گرت بو بیبا بۆ ئێران. ژنەکە ۳ منالی بە جێ هێشت بو. ئەم ڕوداوە لەو کاتەدا زۆر بە خراپی دەنگی دایەوە. دوای گەڕانێکی زۆر ژنەکە و پێشمەرگەکە لە دێیەکی دۆلی جافەتی دۆزرانەوە. بۆ ئەوەی بەدگومانی لە نێوان پێشمەرگە و مالی جوتیاران دا دروست نەبی و، بۆ ئەوەی جارێکی کە هیچ پێشمەرگەیەک زات نەکا بەدڕەوشتی وەها دوبارە بکاتەوە، م س بڕیاری ئیعدامی کوڕەکەی دا و، ئیعدام کرا.

یەکەمین کۆنفرەنس

ئەو ماوەیەی من گیرا بوم، کادرەکانی کۆمەلە لە بارەگاکانی سەرکردایەتی زنجیرەیەک سیمناری فیکری و سیاسیان گرت بو. ناکۆکییەکانی ناو ڕیزەکانیان قولتر و ئاشکراتر بوبو. ئەمەیش زۆری کادرەکانی توڕە کرد بو. بیری گرتنی کۆنفرەنسیان لە لا گەلالە بو. کە گەیشتمەوە ناوزەنگ چەند کۆبونەوەیەکمان کرد و بڕیارمان دا کۆنفرەنس ببەستین. کەوتینە خۆ ئامادە کردن. لە مانگی مایس دا نوێنەرەکان تاڵم تاڵم گەیشتن.

*

سرودی ئینتەرناسیونال

لە ناو ئێمەدا ئازاد هەورامی دەستی مۆسیقای هەبو. هەندێ ئالەتی موسیقای ئەزانی و، سەری لە دانانی ئاواز دەرئەچو. لە هەمان کات دا لەوانە بو باوەڕێکی قولی بە مارکسیزم هەبو، ڕوالەتە ئاشکراکانی لە بابەتی «چەکوش و داس» و «ئەستێرە» و «سرودی ئینتەرناسیونال» ی.. بە لاوە زۆر گرنگ بو. ئەیویست کۆنفرەنسەکە بەم سرودە دەس پێ بکا و، لێ بڕا بو تاقمێک فێر بکا بیلێن. تاقمی لە پێشمەرگە کۆنەکانی هەلبژارد بو، هەندێکیان سەریان لێ ی دەرئەئەچو، لە بەر خاتری ئازادیش دلیان ئەهات بو داواکەی ڕەت بکەنەوە.

ئازاد سرودەکەی بۆ چاپ کرد بون و، یەکی دانەیەکی دابونی بۆ ئەوەی لە بەری بکەن. خۆیشی ڕۆژانە لە گەلیان دائەنیشت و لە گەلی ئەوتن. ئاخر ڕۆژ کە ڕۆستەم ئەمینی لێ ی ئەپرسی: «سرودەکەت لە بەر کردوە؟» ئەلێ: «بەلێ!» ئەلێ: «ئادەی بۆم بلێ!» ڕۆستەم دەس ئەئەیتە بنا گوێ ی لە سەر ئاوازی یەکێ لە گۆرانیەکانی سەید محەمەدی صەفایی ئەلێ: ئەی ئینتەرناسیونال.. وەی وەی ئینتەرناسیونال...

ئازاد زۆری پێ ناخۆش ئەبی و زۆر توڕە ئەبی.

## یەکەمین کۆنفرەنسی کۆمەڵە

لە ژێر دروشمی: لە پێناوی پتەوکردنی ڕیزەکانی کۆمەڵە و ڕاپەراندنی جەماوەری گەلەکەمان دا» لە مانگی ئایاری ساڵی ١٩٨١ دا لە مالیمەوس یەکەمین کونفرەنس بە ئامادەبوونی ١٨٥ ئەندام، بەسترا. ئەندامانی کونفرەنس نوێنەرایەتی نزیکەی ٨ هەزار ئەندام و لایەنگری ڕێکخراویان ئەکرد، لە ناو پێشمەرگە و لە ناو شارەکان و لە دەرەوەی وڵات.

ئەندامانی کۆنفرەنس خەڵکی بەشی هەرەزۆری شار و شارۆچکە و ئوردوگا و ناوچە دێهاتیەکانی کوردستانیان تێ دا بو.

لە ڕوی تەمەنیانەوە: ٤٩ ئەندامی لە بەینی ٢ - ٢٤ و، ٧٤ ئەندامی لە بەینی ٢٥ - ٣٠. سال و، ١١ ئەندامی لە بەینی ٣١ - ٣٥ ساڵ و، ٤١ ئەندامی لە بەینی ٣٦ - ٤٠. ساڵ و، ١٠. ئەندامیشی بەرەوژوری ٤٠. ساڵ بون.

لە ڕوی کار و پیشەوە: ٤٤ ئەندامی کرێکار و، ١٧ ئەندامی پیشەگەر و، ٦٥ ئەندامی مووچەخۆری بچوک و فەرمانبەر و، ٩ ئەندامی پیشەگەری گەورە و، ٥٠. ئەندامی خوێندکاری زانکۆ و پێشمەرگە بون. لەوانە ٥ یان ئافرەت بون.

لە سەرەتادا من ڕاپۆرتێکی درێژم خوێندەوە باسی دامەزرانی کۆمەڵە و، قۆناغەکانی گۆڕان و گەشەکردنیم کرد لە سەرەتاوە تا ئەو کاتە. کۆمیتەی سەرکردایەتی ڕێکخستنی ناوخۆ و، کومیتەی ڕاپەرین و، ڕێکخراوی شەهید جوامێر (بەغداد) و، ڕێکخراوی شەهید لەیلا (ئاڵمانیا) و، ڕێکخراوی بادینان، ڕاپۆرتی درێژیان ئامادە کرد بو. خوێندرانەوە و گفتوگۆیان لە سەر کرا.

بەشێکی کاتی کۆنفرەنس بۆ پیاچونەوەی ڕابوردوی کۆمەڵە و، بەشێکی بۆ دانانی ڕێوشوێنی کاری قۆناغی داهاتو تەرخان کرا بو. یەکێ لە کارە گرنگەکانی ئەم کۆنفرەنسە دانانی «پەیڕەوی ناوخۆ» بو. گفتوگۆ و باسەکان تێکڕا ٨٠. سەعاتیان خایاند و، بە هەڵبژاردنی سەرکردایەتی تازەی کۆمەڵە کۆتایی هات.

*

ئەوانەی ناودێر کرا بون بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵە لە ٢٠. کەس زیاتر بون. بۆ ئەوەی ئەندامانی کۆنفرەنس، پێش دەنگدان، بە چاکی بیانناسن: دو کەس ڕەخنەیان لێ ئەگرت و، یەک کەس پەسنی ئەدا. بۆ ئەوەی بێن بە ئەندامی سەرکردایەتی بڕیار درا ئەبێ لە نیوەی دەنگەکانی ئەندامانی کۆنفرەنس زیاتر بهێنن. بۆ ئەوەی کاروباری کۆنفرەنس بە ڕێکوپێکی بڕوا، من خۆم دەنگم ئەدا، ستایشی کەسم نەکرد و ڕەخنەیشم لە هیچ کەس نەگرت، هیچ لیستەیەکیشم ئامادە نەکرد بو.

ئەندامانی کۆمەڵە، لە هەندێ لەو هاوڕێیانە بە داخ بون، چونکە:

١. ملمڵانێیەکی نائەهلیان دەس پێ کرد بو لە سەر پلە و پایە بە تایبەتی لە گەڵ ئەوانەی لە زیندان بەر بوبون، ئاژاوەیەکی زلد و پشێوییەکی قوڵیان خست بوە ناو ڕیزەکانی ڕێکخستنەوە، دەستەگەرییان تێ دا دروست ئەکردن.

٢. لە بیروباوەڕدا توندڕەو بون و، ئەیانویست کۆمەڵە بە لای توندوتیژی دا بەرن.

٣. ڕەفتاریان لە گەڵ پێشمەرگە و کادرەکان باش نەبو، هەندێکیان بە لوتبەرزی و غەرایبیەوە لە گەڵیان ئەجوڵانەوە.

لە ئەنجامی دەنگدان دا سالار و جەعفەر دەرئەچون و، عومەر و مەلا بەختیار بە

دەنگێکی کەم دەرچوون. دوای بڵاوکردنەوەی ئەنجامی هەڵبژاردن بە ڕیز، سالار، مەلا بەختیار، جەعفەر، «لازم عومەر.. قسەیان کرد و، هێرشیان کردە سەر ئەنجامانی کۆنفرەنسەکە. لێ گەڕاین قسەی خۆیان بکەن، چەند کەسی لێیان ڕاپەڕین ویستیان بە توندی وەڵامیان بدەنەوە، بەڵام بۆ ئەوەی وەزعەکە نەشێوێ، من ڕێگەم نەدان.

*

دوای کۆنفرەنس ئەم هاوڕێیانە تووڕە بوون و، هەڕەشەیان کرد کە شۆڕش و کۆمەڵە بە جێ ئەهێڵن و، ئەچن بۆ دەرەوە. من چەند جاری سەردانم کردن و، زۆرم لە گەڵ وتن بۆ ئەوەی دڵیان بهێنمەوە جێگەی خۆی و، بێننەوە کار بکەن. بەڵێنم بە سالار و جەعفەر دا کە هەر لە م س یەکێتی دا بیانهێڵینەوە. قسەکانم سوودی نەبوو. سوور بوون لە سەر هەڵوێستی خۆیان. مەلا بەختیار لە هەموویان زیاتر خۆی بە دڵشکاو ئەزانی و، نارەزایی دەرئەبڕی. گەیشتە ئەنم بە مەلا بەختیارم وت: «کاتی خۆی کە من بووم بە کۆمەڵە و، دوایتر بە یەکێتی و، دەستمان کردەوە بە شۆڕش، نەمئەبیست بۆ کابرایەک هەیە ناوی مەلا بەختیارە، ئێستایش ئەگەر نەمبینیتەوە زۆر باشە، ئەبەشرێی خواحافیزت بێ، بە بێ تۆیش کۆمەڵە و یەکێتی و شۆڕش بەردەوام ئەبیّ!»

بە کۆمەڵ چوون بۆ تاران. لەو ڕۆژانەدا مامجەلال گەڕابووە تاران. قسەی لە گەڵ کرد بوون بگەڕێنەوە کوردستان و قانیعی کرد بوون. بەڵام ئەمان لە هەوڵی ژێر بە ژێری خۆیان نەکەوتن و، ئەو داخەیان لە دڵ دەرنەچوو. جەعفەر نامیلکەیەکی چاپ کرد بوو بە ناوی «مانگ گیران» ەوە. دەرنەچوونی خۆی و هاوڕێکانی بە گیرانی مانگ شوبهاند بوو.

*

## حدک و پدک

نوێنەرانی شورای شارەکان لە مەهاباد کۆبوونەوەیەکیان کرد بۆ گفتوگۆ لە گەڵ کاربەدەستانی ڕژێمی نوێ. داواکانیان لە ٨ ماددەدا کۆ کرد بووەوە. لە ماددەی یەکەمین دا داوای سەلماندنی مافی ئازادی بڕیاردانی چارەنووسی کوردیان کرد بوو، لە ماددەی هەشتەمین دا داوای دەرکردنی سەرانی قیادە موەققەتەیان کرد بوو لە ئێران. لەم کۆبوونەوانەدا نوێنەرانی زۆر لە ڕێکخراوە سیاسییەکانی کوردستانی ئێران بەشدار بوون. هەموویان، جگە لە نوێنەرانی دیموکرات، سوور بوون لە سەر ئەوەی حکومەتی ئێران ئەم دەربکا لە ئێران.

لەو نامیلکەیەدا کە سەبارەت بە قیادەی موەققەتە دەریان کرد هەڵوێستی خۆیان بەم جۆرە ئەگێڕنەوە:

«پاش زیاتر لە یەک ساڵ ڕاپەڕین و قوربانی دانی گەلانی ئێران لە ٢٦ ی ڕێبەندانی ١٣٥٧ دا شۆڕشی خەڵکی ئێران یەکەم قۆناخی سەرکەوتنی بڕی و یەکێک لە کۆنەپەرستترین و دڕندەترین ڕژێمەکانی سەر بە ئیمپریالیزمی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا تێکەوە پێچا. ئەو سەرکەوتنە ئەگەر بۆ خەڵکی ئێران مایەی جەژن و شادمانی بوو، بۆ بەڕێوەبەرانی دەزگای یەکڕیکەوتنی بنەماڵەی بارزانی زەمینەیەکی گوڕچڕ بڕ و دڵ تەزێن بوو. چونکە ئەوانە هیچ پەیوەندییەکی دۆستانەیان لە گەڵ گەلانی ئێران دا نەبوو و، جاری نەشیان توانی بوو لە گەڵ کاربەدەستانی تازە بە سەرداکەوتوی حکومەتی خومەینی ڕێک کەون. شەپۆلی قین و تووڕەیی و نارەزایی بەرامبەر بە قیادەی موەققەت سەرتاپای ئێرانی داگرت

بوو. زۆربەی حیزب و ڕێکخراوەکانی کوردستان و سەرتاسەری ئێران داوایان دەکرد ئەواوی ئەفرادی قیادەی مووەققەت لە ئێران دەربکرێن. سەرەند و بێ بەندی هەموو باس و خواستێکی سیاسی دەهاتە سەر قیادە و ئەو تاقمەیان لە زۆربەی جینایەتەکانی کۆن و تازەی کاربەدەستانی ئێران دەرهەق بە کۆمەلانی خەلک دا بە بەشدار دەزانی.

ئەگەرچی حیزبی دێموکراتی کوردستان زیاتر لە تەواوی ڕێکخراوە ئێرانییەکان شارەزای ئاکار و کردەوەی دژی گەلیی سەروکایەتی ئەو تاقمە بوو، هەرچەند حیزبی ئێمە پتر لە هەمووان کوتەکی خۆفرۆشی و بەکرێگیراوی ئەوانەی وێ کەوت بوو، بەلام لە بەر هەستی مەسئولییەت بەرامبەر بە چارەنووسی گەلی کورد و هەزاران مالی لێقەوماوی کوردی عێراقی کە لە ئێران دا ئاوارە و سەرگەردان بوون هیچ کاتێک فکری ئولە ئەستاندنەوەی ئەبوو هەموو کاتێک لەو باوەڕەدا بوو کە پاداشی جینایەت و خەیانەتی ئەو تاقمە دەبێ بە ڕەفتاری باش لە گەل کوردە عێراقییە دەربەدەرەکان بداتەوە. هەر بۆیەش لە هەموو جێگایەک دژی ئەو داوایە ڕاوەستا کە کوردە پەنابەرە عێراقییەکان لە ئێران دەربکرێن.

بە دوای سەرکەوتنی شۆڕش دا کاتێک نوێنەرانی دەولەتی کاتیی موهەندیس بازرگان هاتنە مەهاباد تاڵە نوێنەری حیزبی ئێمە لەو کۆبوونەوەدا زۆر دژی بەندی هەشتی داخوازەکان بوو کە داوای دەکرد ئەفرادی قیادەی مووەققەت لە ئێران دەربکرێن، دوایەش کە ئەو بەندە بە زۆربەی دەنگ پەسند کرا حیزبی ئێمە چەندین جار بە ڕەسمی ئەو داخوازەی بە شتێکی غەیرە ئوسولی دانا و ڕەتی کردەوە. کۆمەلانی خەلکی کوردستانی ئێران شاهیدێکی زیندوون کە حیزبی ئێمە لە سەر ئەو سیاسەتە چەندی لە پێ گوێرا و چۆن لە لایەن زۆربەی ڕێکخراوە سیاسییەکانی ئێرانەوە پەلاماری توندی تەبلیغاتی کرایە سەر.

بەلام حیزبی ئێمە دیسان لە سەر ئەو سیاسەتە مەسئولانەیەی خۆی ڕۆیشت و ئەوەندەی لە توانایشی دا هەبوو خەلکی کوردستانی بۆ کۆمەگ بە پەنابەرانی کوردی عێراق هان دا. هەزاران مالی عێراقی کە لە ناوچەکانی دوورەدەستی ئێران سەرگەردان بوون بە موافەقەتی حیزبی ئێمە گەڕانەوە کوردستان و بە تەشویقی ئێمە لە کوردستان دا جێگا و ڕێگایان بۆ دابین کرا و حاوانەوە.

لە کونفرانسی گەلان لە تارانیش کە نوێنەری زۆر لە حیزب و ڕێکخراوە سیاسییە ناوچەیی و سەرتاسەرییەکانی ئێرانی تێ دا بوو، تەنیا ڕێکخراوێک کە دژی هێرش کردن بۆ سەر قیادەی مووەققەت ڕاوەستا حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بوو. لە بڕیارنامەی کونفرانس دا بە زۆربەی دەنگ بڕیارێک لە دژی قیادەی مووەققەت پەسند کرا، بەلام هەر لەوێ دا بە سەراحەت گوتراوە کە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران موخالیف بووە.

بە کورتی لە گەل ئەوەی زۆربەی هێزە سیاسییەکانی ئێران و بە تایبەتی کوردستان بە توندی لە دژی قیادەی مووەققەت کاریان دەکرد، حیزبی ئێمە هیچ وەخت هەلوێستی دوژمنانەی بەرامبەریان نەگرت و هەر لەو باوەڕەدا بوو کە ئەوانە وەک میوانێک دەبێ چاویان لێ بکرێ و بە پێ ی توانا یارمەتی خێزانە لێقەوماوەکانیان بدرێ.»

سەرکردایەتی حدکا لەم ڕاپۆرتەدا دەوری خۆیان باس ئەکا لە چەند مەسەلەی گرنگ دا بەرامبەر قم:

- ڕازی نەبوون بە ئاوانبار کردنی سیاسی قم.
- ڕازی نەبوون بە دەرکردنی سەرکردەکانیان.

– هێنانەوەی هەزاران خێزانی ئەندامەکانی قم بۆ کوردستان، کە دوایی‌تر بوون بە چەکهەڵگری لەشکری بارزانی بۆ شەڕی حدکا و. یەکێتی.

بێگومان ئەم هەڵوێستەی حدکا سەبارەت بە هەست کردن نەبوو بە مەسئولییەت. وەکو لەم راپۆرتەدا بۆ پاساودانی ئەم هەڵوێستەیان نووسیویانە، بەڵکو بۆ هێشتنەوەی قم بوو وەکو ملوزمی گیانی یەکێتی. حدکا نەیدەویست یەکێتی لە پەژارەی قم ئاسوودە بێ. بەڵام قم بوون بە هێزی پارمەتیدەری ئێران بۆ تێکشکاندنی حدکا و دەرکردنی لە زۆری ناوچەکانی کوردستانی ئێران.

قم لە حدکا بوون بە مارەکەی شێخ هۆمەر!

*

لە فۆلکلۆری کوردی دا ئەگێڕنەوە: شێخ هۆمەر بە لای شمشاڵێکی چڕ و پڕدا رائەبوری. شمشاڵەکە ئاگری گرت بوو دوکەڵی لێ بەرز ئەبووەوە. شێخ هۆمەر ئەروانی ئاگر زۆری بۆ مارێک هێناوە کە لە ناو تولێکێک دا گیری خواردوە، خەریکە لە گەڵ پووش و پاوانی شمشاڵەکەدا بسووتێ. مار لە تاو گڕ و دوکەڵ ئەفیشکێنێ و، هەڵئەپەڕێتەوە، بەڵام هیچ ڕێگایەکی ناپێ دەرباز بێ. شێخ هۆمەر بەزەیی بە مارەکەدا دێتەوە. گالۆکێکی درێژی پێ ئەبێ بە سەر ئاگرەکەدا بۆی راپەڵ ئەکا. مارەکە خۆی لە گالۆکەوە ئەپێچێ و لە ئاگرەکە تێ ئەپەڕێ، بەڵام هەرکە ئەگاتە شێخ هۆمەر خۆی لە ملی ئەئاڵێنێ و ئەیەوێ پاداشتی چاکەی شێخ هۆمەر بە گەستنی بداتەوە.

*

## لاک

لە سەرەتای شوباتی ١٩٨١ دا لە تاران ڕێکخراوێکی تازە بە ناوی: «لەشکری ئیسلامی کورد» کە بۆ گاڵتە پێ کردن ناویان لێ نا بوو: «لاک» دامەزرا.

ئەم ڕێکخراوە تازەیە هیچ بەرنامەیەکی سیاسی نەبوو، دامەزرێنەرەکانی: مەلا حسێن ماریوانی، شێخ قادری سۆزتکە، عەبباس شاهین، کە لە تاران دائەنیشتن لە ناو خۆیان دا کۆک نەبوون.

مەلا حسێنی ماریوانی و شێخ قادری سۆزتکە لە دوای ئاشبەتاڵەوە لە ئێران دانیشت بوون. مەلا حسێن، خەڵکی ناوچەی تەلەعفەر، کابرایەکی کۆنەپەرست و دواکەوتوی لە کوردستان داپڕاو و، شێخ قادریش، خەڵکی گوندی سۆزتکەی ناوچەی قەڵاسێوکە، قولە دەرەبەگێکی زالم و نەخوێندەوار بوو. بەڵام عەبباس شاهین، کابرایەکی زیرەک و لێزان بوو، سەردەمێک لە گەڵ «حرکة اخوان المسلمین» لە موسڵ کاری کرد بوو، لە ٧٤ دا ببوو بە پێشمەرگە و، لە سەرەتای دامەزراندنی یەکێتی دا هاتە قامیشلی لە گەڵ یەکێتی کاری ئەکرد. خۆی وا دەرئەخست ڕێکخراوێکی لە ناو ئەفسەرانی جەیش دا هەیە. بەم ئیدیعایانە ماوەیەک دەستی مام جەلالی بڕی هەندێ پارەی لێ کێشایەوە و، سەردانی سعودیەی کرد و، دوایی‌تر کە وازی لە یەکێتی هێنا هاوکاری لە گەڵ دەزگای موخابەراتی سوری و لیبی ئەکرد و، خۆی گەیاندە کاربەدەستانی ئێرانی.. ئەمانە هەر یەکەیان بۆ مەبەستێ، بەڵام هەموویان لە ژێر چەتری ئێران دا و، بە ئامۆژگاری ئەوان یەک کەوت بوون.

*

لەشکرەکەیان نموونەی لەشکری بەکرێگیراو بوو. ئێران چەک و پارە و پەناگای، وەک

بەشێک لە سپای پاسداران، بۆ داین کرد بوون. هەرکەس ئەبو بە چەکهەڵگری ئەوان:
١. پارەی مانگانەیان بە رێکوپێکی ئەدایە.
٢. چەکی جوان و تازەیان ئەدایە.
٣. ئەیتوانی ماڵ و خێزانەکەی بیبات بۆ ئێران و، خۆیشی بە ئازادی بە سەرانسەری ئێران دا بگەڕێ و بسووڕێتەوە.
٤. شەڕی ڕژێم نەکا.

*

ئەم «ئیمتیاز»انە لەو کاتەدا کە بە هەزاران کەس لە جەبهەی عێراق هەڵات بوون، لە دێهاتەکان دا بێ دەرامەت و بێشوکار دانیشت بوون، هەروەها بۆ هەندێ لە دانیشتوانی دێهات کە ئەیتوانی لە گوندەکەی خۆی دا بمێنێتەوە و، هەمو ئەو دەسکەوتانەشی هەبێ و، بە ناو خزمەتی دین و نیشتمان ئەکا، وای کرد لە ماوەیەکی کورت دا ژمارە بەسیج و، هێزێکی زۆر پێکەوە بنێن. هیچ بیروباوەڕێکی دینی یا نەدینی نەبو کە ئەمانە پێکەوە کۆ بکاتەوە، ئەوەی کۆی کرد بوونەوە دەسکەوتی ماددی و، مەبەستی تایبەتی بو. لە ناو هێزەکەیان دا کەسانی جۆراوجۆر کۆ ببوەوە. پارتی پێش دەستی تێ خست بوو و، هەندێ کەسی خۆی نارد بوە ناویانەوە. یەکێتی پێش هەندێ لە کادرەکانی خۆی نارده ناویانەوە.
گۆرانیبێژێکی سووری هەبو ناوی محەممەد شێخۆ بو. لە گەڵ تاشهەتال دا ئەویش چو بو بۆ ئێران. لەم بەزمەدا ئەویش چو بوە ناو لاکەوە. مەلا حسێن دژی گۆرانی و مۆسیقا بو. ئەویش بە چاولێکەری ئیمام خومەینی لای وابو حەرامە، نابێ کەس گۆرانی بڵێ یا گوێ ی لێ بگرێ. ڕۆژێکیان لە بارەگای لاک لە تاران لە سەر ئەم کێشەیە مەلا حسێن و محەممەد شێخۆ ئەبێ بە مشتومڕیان. محەممەد ئەڵێ: «تۆ قورئانی خۆت بخوێنە، منیش تەمبوری خۆم لێ ئەدەم، بزانە خەڵک لە کامان کۆ ئەبێتەوە؟» مەلا حسێن ئەڵێ: «ئەڵێی ئەم زەمانە تایبەی فسق و فجورن، دیارە لە تۆ کۆ ئەبنەوە!»

*

سەرەتا کە ویستیان دەس بکەن بە کارکردن خۆیان چەند کەسێکیان نارد بۆ ناوزەنگ بۆ گفتوگۆ لە گەڵ مەکتەبی سیاسی و، لە سەر چەند مەسەلەیەک پێک هات بوون. هەروەها ئێرانیش داوای لە یەکێتی کرد بو کارئاسانییان بۆ بکا، بەرامبەر بەوەی ئێران کارئاسانی بۆ یەکێتی بکا.
کە نێوانی ئێران و یەکێتی تێک چو، ئەمە کاری لە نێوانی لاک و یەکێتی یش کرد. لاک پەلێنیان دابو:
١. دەس نەخەنە ناو کاروباری خەڵکەوە.
٢. دوژمنانی یەکێتی و کەسانی گومانلێکراو لە ڕیزەکانی خۆیان دا وەرنەگرن.
٣. یارمەتی یەکێتی بدەن بۆ گوێزانەوەی چەک.

*

## گەل

هەر لەو ماوەیەدا سامی سنجاری پێش حیزبێکی تازەی دامەزراند بە ناوی: «حزب الشعب الدیمقراطی الکردستانی».
زۆری ئەم حیزبانە هیچ زەمینەیەکی فیکری یا کۆمەڵایەتییان نەبو. لە سایەی

جەنگی عێراق - ئێران و، ناکۆکیی یەکێتی - پارتی دا دروست ئەکران.

سامی لە بنەماڵەیەکی دەروێشتوی سنجارە. بە ڕەچەڵەک یەزیدی بون و موسوڵمان بون. لە سەردەمی پاشایەتی دا بە «بەعسە» نێردراوە بۆ بەریتانیا و، لەوێ هەندەسەی خوێندوە. هەر لەوێ ئێکەڵاوی حشع بو. دوای ١٤ تەمموزی ٥٨ یەکێ لە توندڕەوەکانی حشع بو. تاوانبار کرا بو بە هاوبەشی لە ڕوداوەکانی ١٩٥٩ ی موسڵ دا. کە ئینقیلابی ٨ ی شوباتی ٦٣ بو، وازی لە حشع هێنا و، هەڵات بۆ ماڵومە کە ئەوسا بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی لێ بو. لە ئێستگەکەی شۆڕش دا لە گەڕدەڕمش کەوتە کار.

لە ناکۆکی ئێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی دا، بە لای لای سەرکەوتودا دای شکاند و، لە هاوینی ٦٦ دا بو بە ئەندامی مەکتەبی تەنفیزی و، لە کۆنگرەی حەوتەم دا هەڵبژێردرا بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی. دوای خوێندنەوەی بەیانی ئازاری ٧٠ بو بە وەزیری ئیعماری شیمال.

سامی ئەو کاتەی وەزیر بو هەوڵی دابو دەستەیەک ڕوشنبیر و خوێندەوار بە تایبەتی ئەوانەی خۆیان بە چەپ دائەنا و، ئەوانەی لە ناو حیزبی شیوعیەوە هات بون، لە خۆی کۆ بکاتەوە. دوای هەڵگیرسانەوەی شەڕی کوردستانیش لە گەڵ ئەوانە پەیوەندی باش و نزیکی ڕاگرت بو.

دوای ئاشبەتاڵ سامی چو بۆ ئێران و، مانگی کانونی یەکەمی ١٩٧٥ بە ئاگاداری و یارمەتی ساواک ق م ی پێک هێنا و، خۆی بو بە سکرتێری و، بۆ ئەو مەبەستە سەفەری ئەورووپای کرد.

*

سامی لە ساڵانی ١٩٧٥ - ١٩٧٩ دا سکرتێری قیادە مووەققەتەی پارتی بو، لە کۆنگرەی نۆهەمی پارتی دا خۆی هەڵنەبژاردەوە. ماوەیەک خۆی وا پیشان دا کە دەستی لە کاری سیاسی هەڵگرتوە. دوای ماوەیەک ئێران گرتی. قسەی جیاواز لە سەر گرتنەکەی هەبو. هەندێک ئەیانوت: بنەماڵەی بارزانی بە گرتنی داوە و، هەندێکی تر ئەیانوت: بە تۆمەتی جاسوسی گیراوە. دوای چەند مانگێ بەربو ڕۆیشتە لەندەن. لەوێ کەوتەوە جموجۆڵ. پەیوەندی لە گەڵ هەندێ لە هاوکارەکانی سەردەمی قیادە مووەققەتە، بە تایبەتی ئەوانەی لە ئەورووپا بون، تازە کردەوە و، سەردانی سوریای کرد.

لە تەمموزی ٨١ دا سامی هاوڕێ و هاوکارەکانی خۆی کۆ کردەوە بۆ کۆنگرەی دامەزراندنی حیزبێکی تازە بە ناوی: «پارتی دیموکراتی گەلی کوردستان». سامی حیزبەکەی بە ژمارە کەم بو، بنکەی جەماوەریی و هێزی پێشمەرگەی نەبو. تاقمی ڕۆشنبیری لێ کۆ بوبوەوە، لە گەڵ تاقمی سەربازی هەڵاتو. لەو زەمانەدا کە ژمارەیەکی زۆر گەنجی کورد لە سەربازی هەڵات بون، هەمو لایەک ئەیتوانی هەندێکیان بۆ لای خۆی ڕابکێشێ. بەڵام لە کاری خۆی دا بایەخی بە دو شت ئەدا: ڕاگەیاندن و، پەیوەندی دەرەوە.

لە شام جەریدەیەکی کوردی - عەرەبی لە ژێر ناوی: «گەل - الشعب» دا دەرئەکرد، لە چاو جەریدەی زۆر لە حیزبەکانی کەدا بە ڕواڵەت جوانتر و بە ناوەڕۆک دەوڵەمەندتر بو. چەند نامیلکەیەکیشی بڵاو کردەوە.

سامی دۆستایەتی لە گەڵ سوریا، لیبیا، ئێران دامەزراند. حیزبەکەی وەکو دوکانێکی سیاسی لێ کرد بو بۆ داوای یارمەتی لە دەوڵەتان، تەنانەت لە حیزبە

کوردیەکان. تەنها یەک چار سامی یەک ملیون دۆلاری لە لیبیا بۆ یارمەتی حیزبەکەی وەرگرت. وەکو ئەمانوت لە ناو خۆیان دا لە سەر ئەم پارەیە تیکچوون و، هەندیکیان بە یەکجاری لی ی دوور کەوتنەوە.

*

### تیکچوونی یەکیتی و تهران

ململانی ی دەسەلات لە تهران دا لە نیوان بالی دینیی میزمیسەر و بالی دینیی پانتۆل لە پی گەیشت بوو پرپە. مامجەلال لە حوزەیرانی ۸۱ دا گەیشتەوە تاران. بەنی صەدر، سەرۆک کۆماری تهران، مستەفا چەمران، وەزیری دیفاع، فەلاحی سەرۆکی ستادی ئەرتەشی بینی.

وەجبەیەکی گەورەی چەکی قورس، ناوقیی و، سووک بە فرۆکە و بە پاپور گەیشت بوو تهران بۆ یەکیتی. تهران بەلینی پیشەکی بە سوریا و لیبیا دابو ئەم چەکانە تەسلیم بە یەکیتی بکا. دەستی بە سەردا گرت و، تەنها پارچەیەکیشی نەدا بە یەکیتی.

بەنی صەدر، بەلینی بە مامجەلال دابو، کە پەیوەندی تیران لە گەڵ یەکیتی چاک بکا و، چەکە گیراوەکان بداتەوە و، هەولی چارەسەرکردنی ناشتیبانەی کیشەی کوردەکانی تهران بدا. فەلاحی یش هەمان بەلینی دا بو. . . ۳۰ کلاشینکۆفیان دابویە لە گەڵ خۆی بیهینیتەوە. گەیشتنەوەی مامجەلال و ئەو بەلینە خۆشانەی پیبان دابو، هەمومانی دلخۆش کرد. لامان وابو «دەوری رەحمەت» مان لی نەکریتەوە. بەلام دوای ماوەیەکی کەم ناکۆکیەکان تەقینەوە، بەنی صەدر بە سواری فرۆکە هەلات بۆ پاریس و، فەلاحی لە هالیکۆپتەردا تەقینرایەوە و، ئەو بالەی دەستی بە سەر کاروباردا گرت بە ئاشکرا کەوتە دوژمنایەتی یەکیتی.

*

بالی دینیی کە بەرەو زاڵ بوون ئەچوو، هەلویستی بەرامبەر یەکیتی دوژمنانە بو. دەستیان بە سەر چەکەکان دا گرت. چەند جاری لەم بارەیەوە قسەیان لە گەڵ کرا بی سود بو. کابرایەکی سەرهەنگ کرا بو بە فەرماندەی هیزەکانی «شیمال غەرب» ناوی صەمادی شیرازی بو. داوای وەفدیکی «نیزامی» و، لیپرسراوی ناوچەی پینجوینی یەکیتی کرد. ئیمەش، ملازم عومەر، ئازاد هەورامی، بەکری حاجی صەفەرمان نارد.

دوای ئەوەی قسە و گفتوگۆیان کرد بو، صەمادی شیرازی بە راشکاوی پی ی وت بون: «ئازاد کردنی عیراق، لە پاککردنەوەی ئیرەوە دەس پی ئەکات - کۆبونەوەکە لە ورمی بو، مەبەستی پاککردنەوەی ناوچەی ورمی بو - ئەبی ئیوەش هیزەکانتان وەکو ئەطرادی بارزانی بهیننە بۆ ئیرە، پیکەوە تا سەر سنووری عیراق لە هیزەکانی ضیدی ئینقیلاب - مەبەستی هیزەکانی حدکا و سازکا بو - پاک بکەینەوە، کە گەیشتینە سەر سنووری عیراق، لەو چەکانەی هیناوتانە زۆر زیاترتان ئەدەمی! تا ئەوە نەکەن جاریکی کە باسی چەک مەکەن»

هەر بەم تیگەیشتنە یەکی لە دروشمەکانی ئیران لەو زەمانەدا: «راه قدس از کربلا میگذرد» بو. گوایە ئەگەر رژیمی عیراق برووخیان و کەربەلا بگرن ریگەی رزگارکردنی

قودس لە تهرانیش ئەگیرێتەوە.

وەفدەکەی بەرزەوە بە هالیکۆپتەر ڕەوانە کرد بۆ بۆ مەهاباد. بە نائومێدی گەڕانەوە لامان. داواکانی سەرهەنگ صەمەدی شیرازی ڕوون و ئاشکرا بوو، بەلام بە ئیمە جێبەجێ نەئەکرا.

*

سوریا وەفدێکی گەورەی بە سەرۆکایەتی عەبدولحەلیم خەددام نارد بۆ گفتوگۆ لە گەڵ کاربەدەستانی تهران. یەکێ لەو باسانەی ئەم وەفدە لە گەڵ تهرانی کرد بوو، چاککردنی پەیوەندی یەکێتی - تهران و، ڕێگەدان بە ناردنی چەک بوو. حازم (عبدالجبار الکبیسی) پێش لە گەڵ ئەم وەفدە هات بوو. تهرانیەکان وت بویان: «ئێوە چۆن چەک ئەدەن بە ئەمانە ئەمانە هەم کوردن و هەم سونیین بۆ هەردولامان خەتەرن!» ئەیانزانی بۆ خەددام سونیە.

وەفدێکی تهرانی لە گەڵ حازم هاتن بۆ ناوزەنگ بۆ هەڵسەنگاندنی هەلومەرجی ناوچەکە و، پەیوەندی یەکێتی و حدکا. ئەمانە لە سەردەشتەوە بە پێ هاتن بۆ ناوزەنگ، زۆربەیان جلی پاسداریان لە بەر کرد بوو، چەکیان پێ بوو، بە درێژایی ڕێگا لە چەند جێگا بە بیانوی نوێژکردن و پشودانەوە بۆ چاو هەڵبەستن خزیان دوا خست بوو، بۆ ئەوەی کێشەیەک لە گەڵ حدکا دروست بکەن. دوای گەڕانەوەی وەفدەکە تهران بڕیاری دا پەیوەندی لە گەڵ یەکێتی ببڕێ.

*

ڕاگرتنی هاوسەنگی لە دوستایەتی دا لە گەڵ حدکا و بزوتنەوەی کورد لە لایەک و، دوستایەتی لە گەڵ حکومەتی تهران لە لایەکی تر کارێکی لە کردن نەهاتوو بو. مامجەلال ئەیویست ئەم هاوسەنگیە ڕابگری. بەلام زۆری نەئەخایاند ئاشکرا ئەبو. هەردولا تهران و حدکا ئەکەوتنە تەنگ هەڵچنین بە یەکێتی. ڕاستیەکەی زۆر جار پێشمەرگەی کوردستانی عیراق لە شەڕەکان دا بەشدار ئەبون بی ئەوەی پێیان وترا بێ، خۆیان لە بەر سەختی هەلومەرجی کوردەستانی عیراق بۆ پشودان و گەڕان و سوڕان ئەچونە دێوی تهران و، تێکەڵاوی ئەو شەڕانە ئەبون. لە لایەکەوە سەرکردایەتی حدکا و ڕێکخراوەکانی تر مەمنونیان ئەبون، لە لایەکی ترەوە گیروگرفتی سیاسی گەورەیان بۆ یەکیتی لە لای حکومەتی تهران دروست ئەکرد.

دوای هەڵاتنی بەنی صەدر، تهران لە پڕ پەلاماری هەمو ئەوانەی دا کە بە ئەندام و پێشمەرگەی یەکێتی ناسرا بون و گرتنی. مرحسین عەلی ئەکبەر، عەبدوررەزاق میرزا، عەلی حەریز، لاوکۆ و تاڵبی پێشمەرگەی برینداد کە لە نەخۆشخانەکان دا بون و، هەندێ پێشمەرگە کە بۆ کڕینی کەلوپەل لە بازاڕی شارەکانی تهران بون. ئەمانەی گیرا بون هەمویان ئیجازەی ڕەسمیی دەولەتیان پێ بو. مرحسین نوێنەری یەکێتی بو لای تهران و، عەبدوررەزاق لە سەفارەتی سوری کاری ئەکرد. ئەم کارە لە کاری حکومەت ئەئەچو. بەلام ئەوان سەفارەتی ئەمریکایان داگیر و، هەمو دیپلۆمات و فەرمانبەرەکانیان گرت بو. شتی وا چاوەڕوان نەکراو نەبو. چەند مانگی لە زیندان دا مانەوە، حکومەتی سوری لە سەری هەڵدانی، ئینجا بەر دران. بەلام پەیوەندی تهران یەکێتی و تهران پچڕا.

*

# پشێوانی هەلومەرجی کوردستان

هاوینی ساڵی ١٩٨١ هەلومەرجی کوردستان ئاڵۆزا بوو. جەنگی عێراق زۆرتر خەریکی شەڕی ئێران بوو. دەسەڵاتی بە سەر زۆربەی دێهاتەکانی کوردستان دا نەما بوو. لاوانی کورد بە کۆمەڵ لە دەس سەربازی هەڵئەهاتن و، ڕوویان ئەکردە لادێکان. دەیان هەزار سەربازی هەڵاتوو لە دێهاتەکان دا کۆ بووبوونەوە و، هەر حیزبە هەوڵی ئەدا زۆرترین ژمارەیان بە لای خۆی دا ڕابکێشێ و، بیانهێنێتە ڕیزی پێشمەرگەکانییەوە. هەر حیزبە بەشی خۆی گەلێ ڕاکێشا بوو، هێزی چەکداری لێ دروست کرد بوون. جەرد و جولد، هیچکامیان کێشەی یەکخستنی میلیشیای حیزبەکانیان چارەسەر نەکرد بوو، هەر حیزبە هەوڵی ئەدا خۆی زۆرترین ژمارەی چەکداری هەبێ و، لەو ڕێگایەشەوە دەس بگرێ بە سەر مەیدانی کار و چالاکی دا.

هاوینی ساڵی ١٩٨١ پێنج هێزی چەکدار کە سەر بە پێنج حیزبی جیاواز بوون، بە ناوی پێشمەرگەوە لە دێهاتەکانی کوردستان دا، بە تایبەتی لە ناوچەکانی سلێمانی، هەولێر، گەرمیان.. دا تەراتێنیان ئەکرد. ئەگەرچی چوار لەم حیزبانە: پدک، حسک، حشع، پاسۆک، لە چوارچێوەی سیاسی «جود» ا کۆببوونەوە، بەڵام هێزەکانیان سەربەخۆ و لە یەکتری جیاواز بوون، هەریەکەیان سەرکردایەتی و، فەرماندەیەتی تایبەتی خۆیان هەبوو، کەسیان گوێ ی لە فەرمان و ئامۆژگاری ئەوی تریان نەئەگرت.

چەکداری حیزبەکان، بە ئارەزووی خۆیان و بێ هیچ لێپرسینەوەیەک، خەڵکیان ئەگرت و ئەکوشت و بەر ئەدا، پارەیان ئەسەند و، پارەمەتیان کۆ ئەکردەوە، سەرانەیان وەرئەگرت. بێگاریان بە دانیشتوانی دێهاتەکان ئەکرد و، زۆر جار لێیان ئەدان و سوکایەتییان پێ ئەکردن. دانیشتوانی دێهات خەریک بوو پێشمەرگەیان لە بەر چاو ئەکەوت و، لە شۆڕش ئەبێزران. سەرکردایەتی هیچ لایەکیشیان مشووری چاکردنی ئەم بەرەڵڵایی و بێ سەروبەرییەی نەئەخوارد و، چاوپۆشی لە خراپەکانی چەکدارەکانی ئەکرد.

ئێمە لە سەرکردایەتی یەکێتی دا زۆر جار باسی ئەم هەلومەرجە نالەبارەمان ئەکرد. یەکێ لە ژمارەکانی «ژیانی ڕێکخراوەیی» کۆمەڵەمان بۆ جۆری ڕەفتار لە گەڵ خەڵک تەرخان کرد و، هەوڵمان ئەدا کادر و پێشمەرگەکانمان بە جۆرێ پەروەردە بکەین، کە ڕەفتاریان جیاواز بێ لە هی حیزبەکانی تر. بە تایبەتی چونکە تا ئەوسایش یەکێتی هێزی هەرە گەورە و دەسەڵاتدار بوو. بڕیارمان دا لە ئاوایییەکانی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش دا خەڵک هان بدەین بە هەڵبژاردنی ئازاد چەند کەسێ لە خۆیان بۆ «ئەنجومەنی ئاوایی» هەڵبژێرن. ئەنجومەنی ئاوایی، تا بۆی بکرێ خۆی کێشەکانی ناو ئاوایی چارەسەر بکا، ئەوان پێشوازی لە پێشمەرگە بکەن و، بۆ حەوانەوە و خواردن لە ماڵەکان دا دایانبمەزرێنن و، ئەگەر کارێکیان هەبوو بە خەڵکی ئاوایی لە ڕێگای ئەوانەوە جێبەجێی بکەن. لامان وابوو ئیتر کاتی ئەوە هاتووە خەڵک کەمێ کەمێک لە کۆ بوونی دەسەڵاتی بەدەس وەربگرێ بۆ حوکمڕانی خۆی و، لایەلا کردنی کێشە ناوخۆییەکانیان و، ڕێبوون لە پێشمەرگە کە دەس وەربدەنە کاروباری ناوخۆ و ژیانی تایبەتییانەوە.

لە چەند جێگا دەسمان کرد بە جێبەجێ کردنی ئەم تەجروبەیە و، ئەنجامی باش و سەرکەوتووی هەبوو، خەڵک بە گەرمی پێشوازییان کرد و، بە چاکی جێبەجێیان کرد.

لایەنەکانی جود، هەریەکەیان، بە جۆرێ هەڵوێستی لەم تەجروبەیە گرت:

- حسک که له ناو لایەنەکانی جودا لە هەموویان زیاتر لە سەر ئەرزی کوردستان چەکداری هەبوو، هەر لە سەرەتاوە کەوتە دوژمنایەتی ئەنجومەنی ئاوایی. ئەوان تەک هەر ڕێزی ئەندامانی ئەنجومەنەکەیان نەئەگرت، بەڵکو ئەنجومەنەکانیان هەڵئەوەشاندەوە و، لە ئەندامەکانیان ئەدان و، لە چەند جێگا بۆ ئەوەی سووکیان بکەن لە حەوزی مزگەوتەکانیان هەڵ ئەکێشان و، چەکیان ئەکردن و، جەزایان لێ ئەسەندن.

حسک بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی دەربخا کە یەکێتی تەنیا هێزی دەسەڵاتدار و دەسڕۆیشتووی کوردستان نییە، لە هەر جێیەکی بۆی بکرایە بڕیارەکانی یەکێتی هەڵئەوەشاندەوە، بۆ نموونە: کە یەکێتی ڕاوی کەو و کێوی قەدەغە کرد، ئەو ڕاوی ئازاد کرد و هانی خەڵکی ئەدا گوێ لە قسەی کادرەکانی یەکێتی نەگرن و، ڕاو بکەن. کە یەکێتی داربڕین و خەڵوز کردنی قەدەغە کرد، ئەو هانی خەڵکی ئەدا گوێ لە قسەی کادرەکانی یەکێتی نەگرن، دار ببڕن و خەڵوز بکەن.

- حشع کە هێزی چەکداری لە حسک کەمتر و، لە ناو دێهاتەکان دا کەمتر گوێیان لێ ئەگیرا، لەو کۆبوونەوە دووقۆڵییانەی لە نێوان سەرکردایەتی یەکێتی و ئەوان دا ئەکرا، وایان دەرئەخست کە ئەوان وەکو سەرەتا دژی ئەم ئەجرووبەیە نین، بەڵام یەکێتی بۆ بەهێزکردنی خۆی بە تەنیا کردوویەتی بێ ئەوەی حساب بۆ لایەنەکانی تر بکا. وایان پێشنیار ئەکرد لە هەموو ئاواییەک دا ئەنجومەن پێک بێ لە نوێنەرانی حیزبەکان؛ یەکێتی و، لایەنەکانی جود. چەندی بۆمان ڕوون ئەکردنەوە کە «ئەنجومەنی ئاوایی» شتێکی جیاوازە لە «حکومەتی ئیئتیلافی» و «بەرەی یەکگرتووی حیزبەکان» و، ئەمە بۆ کەمکردنەوەی دەستێوەردانی چەکدار و کادری حیزبەکانە، لەوانە هی یەکێتی، لە کاروباری ناوخۆی دێهاتەکان، نەیانئەویست بیسەلمێنن. سوور بوون لە سەر هەڵوێستی خۆیان، ئەیانویست لەو ڕێگایەوە جێگا پێیەک لە ناو دانیشتوانی دێهاتەکان دا بۆ خۆیان بکەنەوە، لە کاتێک دا لە زۆربەی دێهاتی کوردستان دا ئەندام یا دۆستی حشعی تێ دا نەبوو. ئەمەیان کرد بوو بە بیانوو ئەوانیش دانیان بە ئەنجومەنەکان دا نەئەنا و، ڕێزیان نەئەگرتن.

- پارتی لەو کاتەدا هێزیان لە ناو کوردستانی عێراق دا نەبوو، بە تایبەتی لەو ناوچانەدا کە یەکێتی لێ بوو. هەندێ مەفرەزەیان جارجار ئەگەیشتنە شارەزوور، هەورامان، ڕوستی.. پاش ماوەیەک ئەگەڕانەوە بۆ ئێران.

- پاسۆک، حیزبێکی چەکدار یا سیاسی ئەوتۆی نەبوو، بتوانێ کار لە ڕەوتی ڕووداوەکان بکا، بەڵام ئەمیش وەکو حسک هەڵوێستی دوژمنانە بوو لە ئەنجومەنی ئاوایی.

*

یەکەمین شەڕی جود - یەکێتی

هاوزەمان لە گەڵ گرژبوونی پەیوەندی ئێران - یەکێتی دا، تا ئەهات گرژی و ئاڵۆزان لە پەیوەندی نێوان چەکدارەکانی جود - یەکێتی دا لە سەرانسەری کوردستان دا زیادی ئەکرد. چوار براکەی جود لە ناو خۆیان دا ناکۆک بوون، بگرە لە سەر هیچ شتێ ڕێک نەبوون یەک مەسەلە نەبێ، ئەویش: بەرەنگاربوونی مەترسی یەکێتی، بوو.

لەو ماوەیە دا زیاتر لە ١٠ جار پێکدادانی خوێناوی بچووک و گەورە لە نێوان لایەنەکانی جود و، هێزەکانی یەکێتی دا ڕووی دابوو. زۆربەشی لە سەر چەک فڕاندن لە ناو یەکێتییەوە بۆ لای ئەوان و بە پێچەوانەوە، پارە وەرگرتن، ڕەفتار لە گەڵ ئەنجومەنی

ئاوایی، خەڵک گرتن، بە واتایەکی تر حوکمڕانی ناوچەکان. لە ناو ئەم ڕووداوانەدا هەندێکیان مەترسی دار بوون.

*

## پاسۆک و یەکێتی

پاش نیوەڕۆیەک، هەوا خۆش و، کۆمەڵێکی تێکەڵاو لە کوردی هەر چوار پارچەکە: محەمەدی موحتەدی لە تاران، یوسف زێزانی لە سوریا، خەجۆ و چەند کەسێکی تری کوردستانی تورکیا، لە سەربانی یەکێ لە خانووەکانی ناوزەنگ لە بەر هەتاو دانیشتبوین دەمەتەقێمان ئەکرد. ئازاد مستەفا پەیدا بوو، لای دایە لای ئێمە. بە خێرهاتنمان کرد و، لە گەڵ دانیشتووەکان بە یەکترم ناساندن. بە گاڵتەوەپێمان وت: «هەر ئێوە کوردستانی نین، ئێمەی کوردی چوار پارچە کۆبوینەتەوە!»

دانیشتووەکان شتێکی ئەوتۆیان لە سەر پاسۆک نەئەزانی. کەوتنە پرسیاری جۆراوجۆر لە ئازاد. یەکێ لەو پرسیارانەی محەمەدی موحتەدی کردی ئەوە بوو: «لە ناو ڕێکخراوەکانی کوردستانی عێراق دا خۆتان لە کام ڕێکخراو لە هەموویان بە نزیکتر ئەزانن؟» ئازاد یەکسەر وتی: «کۆمەڵە»

*

ڕۆژی ٢٢ ی حوزەیرانی ٨١ چەند پێشمەرگەیەکی هەرێمی ٣ ی شارباژێر لە گوندی مامەخەلان لە گەڵ چەند پێشمەرگەیەکی پاسۆک دەمیان لە یەک ئەگیرێ و بە تفەنگ لە یەکتری ڕاسا بوون. لە پاسۆک دوو کەس: فارس و بیستون و، لە یەکێتی عومەری حاجی عەبدوڵڵای گڵنکی، کە فەرماندەی مەفرەزە بوو لە کەرتی ١ ی هەرێمی ٣ ئەکوژرێن.

بۆ ڕۆژی دوایی تاقمی پێشمەرگەی تێکەڵاوی یەکێتی، کە هەندێکیان تازە لە ناو شاری سلێمانی گەڕا بوونەوە و، هەندێکیان چوو بوون بۆ بەڕێ کردنەوەی کەسوکاریان بۆ سلێمانی، بە سواری ئۆتۆمبیلێک لە سیتەکەوە ئەچن بۆ گەرەدێ، بێ ئەوەی ئاگایان لە ڕووداوەکەی ڕۆژی ڕابوردوو بێ. لەوێ هەموو چەکدارەکانی پاسۆک لە گەرەدێ کۆبوونەتەوە. پێشمەرگەکانی یەکێتی ئەچنە ناو پێشمەرگەکانی پاسۆکەوە. ئەوانەی پاسۆک ئەیانەوێ چەکیان بکەن و، ئەیانتەقێنە بەر دەسڕێژ. هەندێکیان ئەکوژرێن و، هەندێکیان بریندار ئەبن. ئەچنە سەر بریندارەکان ئەوانیش تەواو ئەکەن.

لەم ڕووداوەدا شەش کەس کوژران لەوانە: جەمال عەزیز فەرماندەی کەرتی ٥ ی هەرێمی ٣ ی شارباژێر. وەستا قابیلی بەرگدرو. وەستا ڕەحیمی بەنا. هەرسێکیان ئەندامی کۆمەڵە و جەمال و قابیلیش ئەندامی یەکەم کۆنفرانس بوون. جەمال مامۆستا و باوکی چەند منالی بوو، لە کارەساتی هەکاری دا لە سەر دارای ڕێکخستن هات بوە دەرەوە، بەشداری دەورەی کادران بوو لە قەندیل. تا ئەو کاتە پاسۆک هێشتا شەش کەسی لە هێزەکانی عێراق نەکوشت بوو، بە هەموو ڕێکخراوەکەیشیان لە شەڕی هێزەکانی عێراق دا هێشتا یەک کوژراوی نەبوو.

بۆ ئێمە ئەم ڕووداوە جێگای سەرسوڕمان بوو. چونکە هیچ کارێکی دوژمنانەمان بەرامبەر نەکرد بوون، بگرە بە ڕێزێکی تایبەتیەوە ڕەفتارمان لە گەڵ کرد بوون.

*

لە سەرەتادا پاسۆک لە شاخ مەفرەزەیەک و، جەلالی حاجی حسێن مەسئولیان بو. نێوانی لە گەڵ یەکێتی خۆش بو. پرۆگرام و پەیڕەوی ناوخۆی حیزبەکەیان و هەمو بلاوکراوەکانیان ئێمە بۆ مان چاپ کرد بون و، بۆ ژیانی خۆیان و پێشمەرگەکانیان و چەک و تفاقی شەر وەکو پێشمەرگەکانی یەکێتی رەفتارمان لە گەڵ ئەکردن. لە کاتی روداوەکانی هەکاری دا جەلال لە گەڵ ئێمە لە قەندیل بو. دوایی کرا بە فەرماندەی پێشمەرگەکانی پێنجوێن. ئەگەرچی ئەمە نارەزایی لە ناو زۆری پێشمەرگەکانی ناوچەکەدا دروست کرد، بە تایبەتی لای حەمەصدیق خانی میشیاو کە تازە هات بوە شاخ و، لە سەر ئەمە وازی لە یەکێتی هێنا. لە گەڵ ئەوەش دا بۆ ئەوەی جەلال وەکو تەجروبەیەکی تازەی دانانی فەرماندەی پێشمەرگە لە حیزبێکی تر جێگیر بێ، گوێ نەدرایە گلەییەکانی حەمە صدیق خان. لە جیابونەوەی رەسول مامەند و د. مەحمودا جەلال ماوەیەک لە گەڵیان رۆیشت، بەلام لە گەڵ ئەوان تێکەلاو نەبو، زلۆ زو خۆی لێ جیا کردەوە.

دوای عەفوەکەی ١٩٧٨ ئازاد مستەفا لە زیندان دەرچو. ئەویش هاتە شاخ. ئەو کاتە لە شێنی بارەگایەکی پچوکیان هەبو. دوای ئەویش بە ماوەیەک، بە تایبەتی لە گەڵ دەس پێ کردنی شەری عیراق - ئێران دا، چەند ئەفسەرێکی گەنج هاتنە دەرێ. پاسۆک لە ناوخۆیان دا کێشەیان هەبو. حیزبەکەیان هێشتا کەسی یەکەمی نەبو هەمویان گوێ ی لێ بگرن. هەولێکی زۆریان لە گەڵ د. جەمال نەبەز دابو، بیبێتە سکرتێریان قبولی نەکرد بو. هەروەها هەولێکی زۆریان لە گەڵ فەتاح ئاغا دابو، ئەویش بە دەنگیانەوە نەهات بو. جەلال لە گەڵ ئازاد و هەندێکی کەیان ناکۆک بو. هەلوێستێکی یەکگرتویان نەبو لە ناکۆکی یەکێتی و پارتی. ناوچەی چالاکی و جموجۆلیان لە ژێر دەسەلاتی یەکێتی دا بو، بەلام هەندێکیان بە دل لە گەڵ بنەمالەی بارزانی بون. ئێمە بەم کەین و بەینەمان نەئەزانی. تا جارێک جەلال هات بۆ خواحافیزی لێمان. لە پاسۆک تۆرا بو. ئەو کاتە هۆکانی بۆ باس نەکردین. هەرئەوەندەی درکاند وتی: «من لە گەڵ ئەو برادەرانە ئیتر ناتوانم کار بکەم ئەرۆم بۆ دەرەوە دائەنیشم» چو بۆ شام و لەوێ دانیشت وازی لە پاسۆک هێنا.

*

چەند جارێک و لە چەند دانیشتنێک دا ئێمە پێشنیارمان بۆ کردن کە هەندێ لە ئەفسەرەکانیان لە باتی ئەوەی کاتی خۆیان بە مەفرەزەیەکی چەند کەسییەوە بە فیڕۆ بە سەر بەرن، بێن بێن بە فەرماندەی هەرێمەکانی یەکێتی، لە سەر بیروباوەری پاسۆک بمێننەوە و لە ناو هەرێمەکەش دا چەند پێشمەرگەی تریان پێ راهێنێکیشری بیکەن. لەو کاتەدا کۆمەلە، بزوتنەوە، خەتی گشتی لە ناو پێشمەرگەکانی یەکێتی دا بە تێکەلاوی کاریان ئەکرد، ئەیانتوانی ئەوانیش بێن بە لایەنی چوارەم. ئەمانویست لە دو لاوە کەلکیان لێ وەربگرین: یەکێکیان، وەکو تەجروبەی پێکەوە کارکردنی بیروباوەری سیاسی جیاجیا لە ناو یەک هێزی چەکداری یەکگرتودا. دوەمیان، بۆ گەشە پێ دانی هێزەکانی پێشمەرگە. ئەمانە گەلێ کوردپەروەر و، دەرچوی کولیەی عەسکەری بون و، لە شەرەکانی ٧٤ دا بەشدار بون. بەو پێیە شارەزای کاروباری عەسکەری و پێشمەرگایەتی بون. ئەوان گالتەیان بەم قسانە ئەهات.

*

دوای روداوەکەی گەرەدێ هێزەکەی پاسوک کشایەوە ناوچەیەکی دوری سنوری

ئێران. لە کوردستانی عێراق دا ئێران. ئازاد کەوتە نووسینی بەیان و وتار. لە بواری موهاتەراتی سیاسی دا، زۆری هەمو ئەوانەی پێش خۆی دا، هەژاری موکریانی بە تۆزی پێ یا نەئەگەیشت.

*

## حسک و یەکێتی

مەلا بەختیار چو بو بۆ ناوچەکانی دولی جافەتی بۆ گەڕان و بە سەر کردنەوەی پێشمەرگە. جەمال فەرماندەی هەرێمی ٤ ی یەکێتی و، شێرکۆی شێخ عەلیش فەرماندەی پێشمەرگەکانی حسک بو لە هەمان هەرێم. شێرکۆ لە شێخەکانی سەرگەڵو بو.

هەواڵمان بۆ هات کە ڕۆژی ٢٣ ی ئابی ٨١ لە بنکەی حسک لە کانیە ڕەشەی نزیک گوندی سێکانیان لە دولی جافەتی شەڕێکی قورس ڕوی داوە. لە حسک ٦ کەس کوژراوە لەوانە: شێرکۆ و بێستونی برای و ٥ پێش بریندار و، لە یەکێتی ٧ کوژراوە لەوانە: جەمالی عەلی باپیر و سمایل گەورەدێی و ٧ پێش بریندار بوە.

جەمال وەرزشکار بو. لە ڕاکردنی ١٠٠ مەتری دا یەکەمی سلێمانی بو لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلول دا چوە ڕیزی پێشمەرگایەتیەوە. ماوەیەکی درێژ لە گەڵ عەریف مەجید شوان پێشمەرگە بو. پاشان چو بۆ هەمەدان و لە گەڵ ئەولن گەڕایەوە. ساڵی ٦٩ لە دەورەیەکی تایبەتی دا بو بە (مفوضی شرطە) و، بو بە یەکی لە یاریکەرەکانی تیپی پۆلیس. لە ٧٤ دا چوەوە ڕیزی پێشمەرگایەتی و کرایە سەرلق. جەمال هاوڕێی کۆمەڵە بو. لە دەسپێکردنەوەی شۆڕشی حوزەیران دا چوە ناوچەی جافەتی و، یەکی لە مەفرەزە سەرەتاییەکانی پێشمەرگەی پێک هێنا. دوایی کرایە فەرماندەی کەرت و ئینجا فەرماندەی هەرێم. هەتا بڵێی ی لە ڕوێشتن دا گورجوگۆڵ و بە توانا بو. لە شەڕدا ئازا و وریا بو، یەکی بو لەوانەی لە هەکاری گەڕایەوە.

بەم بۆنەیەوە حسک بەیانێکی دەرکرد هێرشێکی توندی کرد بوە سەر یەکێتی و، تاوانی هەڵگیرسانی شەڕی براکوژی و، غەدر و خیانەتی دایە پاڵی، یەکێتی یش بەیانێکی دەرکرد هێرشێکی توندی کرد بوە سەر حسک.

شێرکۆ و بێستونی برای بە دەستی یەکێتی کوژران، ئاراسی برایشی، کە پێشمەرگەی یەکێتی بو، لە کارەساتی هەکاری دا بە دەستی پارتی کوژرا بو، جەمالیش بە دەستی شەهرزادی برای شێرکۆ کوژرا. ئەمە قوڵایی پڕ لە ناسۆری شەڕی ناوخۆی دەرئەخست.

ڕوداوەکەیان بە دو جۆری جیاواز ئەگێڕایەوە:

- ئەوانەی حسک ئەیانوت: جەمال بە فیتی مەلا بەختیار بە ناوی میوانیەوە چوە بۆ سەردانی شێرکۆ بۆ ئەوەی لە پەنای دۆستایەتی دا بە فێڵ بیکوژێ.
- مەلا بەختیار ئەمەی ئینکار ئەکرد، ئەیوت: جەمال چوە بۆ سەردانی شێرکۆ بۆ ئەوەی هەندی کێشەی نێوان حسک و یەکێتی بە لادا بخەن و، لەوێ بوە بە شەڕیان و ئەو کارەساتە قەوماوە.

جەمال پێشمەرگەیەکی وریا بو. ئەگەر لە کوشتنی شێرکۆ بوایە پێویستی بە فێڵ و میوانداری نەبو، ئەیتوانی بە جۆرێکی وەها شێرکۆ بکوژێ کە خۆی تێ دا نەکوژرێ. ئیتیهامەکەی حسک و ئینکارەکەی مەلا بەختیار هەر کامێکیان ڕاست بێ، ئەم ڕوداوە

تالەبانی بو بە هێزی شەڕیکی خوێناوی ئیقلیمگیر لە نێوان حسک - یەکێتی دا و، دوایتر لە نێوان هەمو لایەنەکانی جود - یەکێتی دا.

پێشمەرگەکانی هەریمەکە دوای ئەم رووداوە کە فەرمانەکەیان و، هەندێ لە کادرەکانی هەریمەکەیانی تی دا کوژرا بو، وە شەڕیکی خوێناویان لە گەڵ حسک دا بو بە جێ مابو، خەمبار و سەر لێ شێواو بون، مەلا بەختیاریش بە جێ ی هێشت بون، گەرابوەوە بارەگای سەرکردایەتی.

*

## حشع و یەکێتی

ئامێر مەفرەزەیەکی جاش بە ناوی عەبدوللا ماویلی، هات بوە ریزی حشع. حشع وەری گرت و لە ناو هێزەکانی خۆی دا لە ناوچەی دەرگەلە کاری پێ سپارد. ئەم کارە بو بە هۆی تورە بونی پێشمەرگەکانی بالەکایەتی و، هەرەشە لێ کردنی، گلەیی گەیشتەوە سەرکردایەتی کە حشع عەولا ماویلی وەرگرتوە. عەولا ماویلی، پێشتر پێشمەرگە بوبو، لە کاتێک دا لە گەڵ تاڵمی پێشمەرگەی یەکێتی پیکەوە نەهێن بۆ خۆزهاراستن و حەوانە، پێشمەرگەکانی یەکێتی لە کاتی نوستن دا گرت بو. دوای چەککردن و پەلهەستان تەسلیمی عیراقی کرد بون. پاش ئازار و ئەشکەنجەیەکی زور حوکمی ئیعدام دران و لە موسل هەڵیانواسین. ئەم پێشمەرگە گیراوانە لە «ردەهەی ئیعدام» ی زیندانی موسڵەوە، پێش ئەوەی لە سێدارە بدرێن، نامەیەکیان بۆ مامجەلال و سەرکردایەتی نوسی بو. نامەکەمان بە لیدوانیکی مامجەلالەوە لە ژمارەی چوارەمی مارتی ۱۹۷۹ ی «هەوالنامە» دا بەمجۆرە بلاو کرد بوەوە:

سێ ئەستێرەی تری ئاسمانی خەباتمان رادەکشێن

وا لە خوارەوە نامەکەی هەڤالانی قارەمان: وەستا رەسولی خەیات و کاک حەسەنی شەبولوکی و کاک رەقیبی روستایی، کورتومت وەک خۆی بلاو دەکەینەوە کە نمونەیەکی گیانی فیداکاری و خۆبەخت کردن لە پێناوی کورد و کوردستان و ی ن ک دا خۆی تیدا دەنوێنێت. منیش بەلێن ئەدەم کە لە ژمارەی داهاتودا ئاواتەکەیان بهێنمە دی و وتاریکی شایستەیان لە سەر بنوسم. هەروەک بە ناوی ی ن ک و هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە بەلێن بۆ ئەو ۳ قارەمانە و سەدان قارەمانی شەهیدی تری ئەکەینەوە کە تا سەرکەوتن یا مردن بۆ ئولەسەندنیان، بۆ هێنانەدی ئامانج و داخوازی یەکانی کۆمەلانی خەلکەکەیان کە گیانی پاکیان لە پێناودا بەخت کردوە، دریژە بە خەباتی پیرۆز بدەین و ئالا شەکاوەکەی شۆرش و ی ن ک هەر لە سەر سەر راگرین. جەلال تالەبانی

*

بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان
یەکێتی نیشتمانی کوردستان
بۆ هەڤالانی سەرکردایەتی
سلاویکی شۆرشگێرانەی گەرم

لەو کاتەی کە لە ژێر پەتی سێدارە راوەستاوین چاوەروانی مردن ئەکەین لە پێناوی مالی گەلی کوردمان، ئەو گەلەی کاروانی خەباتی سورە بە خوێنی هەزاران شەهیدی قارەمان وە ئێمەش شانازی ئەکەین بەو ریگەیەی کە لە پێناوی شەهید بوین، بەلام ئێمە داوا

لە ئێوە و هەموو پ م ئەکەین کەوا هەر کاتێک گەلی کورد گەیشتە ئاواتی خۆی لە بیرمان نەکەن وە منداڵ و دایک و باوکی هیچ شەهیدێک لە بیر نەکەن وە خوێنی ئێمە ئەکەوێتە سەرشانی ئێوە بۆ تۆڵە سەندن لەو دوژمنانەی وەک سەگزی حاجی خورشید، محەمەد ئەمین رەشاشچی، عەبدوڵڵا ماوەیلی، ئەنوەر شێخ ، مستەفا روستایی. پێویستە ئێوە تۆڵەمان بسێنن. تکایە دەستی یارمەتی بۆ کەسوکارمان درێژ کەن. تکا ئەکەم مام جەلال مەقالەیەکمان دەربارە بنوسی بۆ ئەوەی کەسوکارمان زیاتر شانازی بە خۆیانەوە بکەن.

ئیتر بۆ پێشەوە لە ژێر ئاڵای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.

سەرکەوتن بۆ کورد و کوردستان. مردن و سەرشۆڕی بۆ دوژمنانی گەلەکەمان

شەهیدان:

رەسول عومەر خەیات  حسێن عومەر شێوەڵوکی  رەقیب عوسمان روستایی

رۆژی ١٩٧٩/٢/٢٠

*

ئەو کاتەی ئەم نامەیەمان بڵاو کردەوە، عەولا ماوەیلی هێشتا ئامیر «مەفرەزە خاصە»ی جاش بو. عەولا ماوەیلی دوای ئەوەی بوو بە جاش چەند پێشمەرگەی تریشی راو کرد بو، وەکو ئەیانوت: هەندێ پێشمەرگەی گیراوی لە هالیکۆپتەرەوە فڕێ دابوە خوارێ.

هاتنی عەولا بۆ لای حشع و، سوڕانەوەی بە بەرچاوی پێشمەرگەکانی بالەکایەتی و، هاوڕێ و ناسیاوەکانی وەستا رەسول و حسێن و رەقیب، تورە بونێکی زۆری لە ناودا دروست کرد بون. ئەم گلەییە گەیشتە سەرکردایەتی و، هەڕەشەیان کرد بو کە ئەگەر لەو ناوچەیە دوری نەخەنەوە بۆ ناوچەیەکی تر، لە تۆڵەی خوێنی هاوڕێکانیان دا، ئەیکوژن.

بۆ ئەوەی ئەم گرژییە برەوێتەوە، مامجەلال داوای لە حشع کرد بو لەو ناوچەیە دوری بخەنەوە و بیگوێزنەوە بۆ شوێنێکی تر. حشع بانگیان کرد بۆ لای خۆیان بۆ ناوزەنگ، بەلام دوای چەند رۆژێ رێگایان دا بو بڕواتەوە بۆ بارەگاکەی خۆیان لە وەرتێ. رۆژی ٤ ی ئەیلول پێشمەرگەکانی یەکێتی لە دەرگەڵە تۆشی ئەبن. کەوت بونە دوای، خۆی لە ماڵێک دا قایم کرد بو، دەوری ماڵەکەیان دابو، داوایان لێ کرد بو بێتە دەرەوە. ترسا بو بیکوژن خۆی لە ماڵەکەدا حاسی کرد بو. بویو بە تەقە. ئەم بەزمە ماوەیەکی خایاند بو سەرەنجام کوشت بویان.

لێپرسراوەکانی حشع لە ناوچەکەدا لەمە زۆر تورە ئەبن. یەکێتی کی بە و ئەوان کەن، تا بتوانن دەستدرێژیان بکەنە سەر و، هاوڕێ ی حزب بکوژن. ئەوانیش بیریان لە تۆڵە کرد بوەوە، بەلام نەک لەوانەی کە ئەو کارەیان ئەنجام دابو، بەلکو وەکو خێڵە دواکەوتوەکانی کورد، لە هەر یەکێتییەکی کە بەر دەستیان بکەوێ.

رۆژێک دوای ئەم رووداوە، فەرماندەی بەتالیونێکیان بە ناوی عەلی حەمە عەزیز، کە بە عەلی کلاشینکۆف ناسرا بو، لە گوندی قەڵبیان ئەبێ، چەند پێشمەرگەیەکی یەکێتیش کە خەڵکی ناوچەکە بون لە هەمان گوند ئەبن. بۆ گفتوگۆ ئەنێری بە دویان. ئەوانیش: وەسمان یەگی گەرموانی، فەرماندەی کەرت، لە گەڵ کادرێک بە ناوی حەمە لاو و چوار پێشمەرگەی کە، بێ سڵ کردنەوە ئەچن بۆ مزگەوتەکە کە عەلی لێ ئەبێ. عەلی لە ناو مزگەوتەکەدا دەسبەجێ هەر شەشی کوشت بون.

وەسمان بەگ، جوتیارێکی هەژاری خەڵکی گەرمیان و، پیاوێکی بەڕێزی ناوچەکە بوو. لە شۆڕشی ئەیلول دا پێشمەرگە بوو. لەم شۆڕشەیش دا هەر لە سەرەتاوە دەستی داوەوە چەک و بووبوو بە پێشمەرگە. کە یەکەم تاقمی حشع گەیشتنە ناوزەنگ، ئەوسا کە ئەم بارەگایەکی بچووکی لە کەوڕگێک دا بە وشکە کەلەک لە ناوزەنگ دروست کرد بوو، سەرکردایەتی یەکێتی ئەشکەوتەکەیان پێ چۆڵ کرد بۆ ئەوەی فاتیح ڕەسوڵ و مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی و شیوعیە تازە ڕاکردووەکان وەکو نوایەکی زستانە بچنە ناوی.

لەو کاتەدا کە وەسمان بەگ کوژرا بە ئیجازە بۆ سەردانی منداڵەکانی چووبووە ناوچەکە.

ئەم دەستدرێژییە ناڕەوایە پێشمەرگەکانی یەکێتی لە بالەکایەتی وروژاند. ئەوانیش کۆبوونەوە چوونە سەر بارەگای بەتالیۆنەکەی حشع لە وەرتێ. شیوعیەکان دایانە چیای کاروخ و، دامەزران. لە شاخەکە گەمارۆیان دان. حشع ئاگاداری مامجەلالیان کرد، ئەویش فەرمانی دا کە دەستبەجێ دەوری شیوعیەکان بەر بدەن و، هەر کەسە بچێتەوە جێگای پێشووی خۆی.

شەڕەکە کوژایەوە، بەڵام گڕی ئەرموی بووەوە.

*

وەکو ئەمان بیستمەوە لە ناو حشع دا لە سەرەتاوە دوو بیروڕای جیاواز هەبوو بەرامبەر ناکۆکی پارتی - یەکێتی، دوایێتریش لەو بەڵگانەدا کە دەس یەکێتی کەوتن، هەندێ لە مەحضەرەکانی کۆبوونەوەکانیان ئەم هەواڵەیان سەلماند:

١. هەندێکیان لایان وابوو کە پارتی خەتەر نییە بۆ سەر حشع، چونکە حیزبێکی خێڵەکی ناسراوە بە کۆنەپەرستی و نۆکەرایەتی ئێران و ئیمپریالیزم، بەڵام یەکێتی خەتەرە چونکە بە ناوی مارکسیزم و پێشکەوتنخوازییەوە لاوانی کورد فریو ئەدا و، لە جەماوەری حشع ئەخوا. لە بەر ئەوە لەو ناکۆکییەکەدا چاکتر وایە لایەنی پارتی بگرن.

٢. هەندێکی تریان لایان وابوو ناکۆکییەکانی نێوان لایەنەکانی جود - یەکێتی ناکۆکی نێوان باڵەکانی بزووتنەوەی نەتەوەیی بورجوازی کوردە، چەندی بە یەکەوە خەریک بن زووتر یەکتری لاواز ئەکەن و، هەڵوێستی حشعی پێ بەهێز ئەبێ، لە بەر ئەوە چاکتر وایە کە حشع خۆی لەو ناکۆکییانەوە نەگلێنێ و لێ بگەڕێ یەکتری بخۆن.

سەرەنجام بیروڕای ئەوانەی یەکەم سەری گرت کە بە لای پارتی دا دایشکێنن. وەکو ئەیانوت: لە سەرەتاوە مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی لەم باوەڕەدا بوو، دواتریش کەریم ئەحمەد چووە سەر باوەڕەکەی ئەو.

*

کە پێشمەرگەکانی حشع بارەگای بەتالیۆنەکەیان چۆڵ کرد بوو، پێشمەرگەکانی یەکێتی هەندێ کاغەز و دەفتەریان لە ناو بارەگاکە دەرهێنابوو دوایێتر بۆ منیان هێنا. یەکێکیان دەفتەرێک بوو بە عەرەبی ناوی پێشمەرگەکانی بەتالیۆنەکە و، ساڵ و شوێنی لە دایکبوون و پلەی پێشمەرگایەتییان و هەندێ زانیاری لەو بابەتانەی تێ دا نووسرا بوو. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ئەوە بوو: لە تەنیشت ناوی زۆریانەوە لە خانەیەک دا نووسرا بوو «متعهد».
من وامزانی مەبەستیان لە «متعهد» لوتنەراتچی و «مقاول» ە. سەرم سوڕما بوو لەوەی ئەو هەموو لوتنەراتچییە لە حشع کۆ بوبێتەوە. لە چەند کەسێکم پرسی. یەکێ لە هاوڕێکانم شارەزا بوو وتی: «مەبەستیان لە - متعهد  ئەوەیە کە پاکانەی بۆ بەعس نووسیوە و بەڵێنی

پی داون ریزی حشع بە جی بهیلی!»

*

لەشکرکیشیەکەی سەید کاکە

سەید کاکە زۆر جار لای سەرکردایەتی حیزبەکەی خۆی هەلکیشا بو کە ئەگەر ئەوان لی ی بگەرین یەکیتی لە کوردستان دا تەواو ئەکا. ئەوانیش باوەریان پی کرد بو. کە روداوەکەی شیرکۆز بو، فەرمانیان دا بە سەید کاکە، بچیتە سەر هیزەکانی یەکیتی. سەید کاکە، کە خوی هەمیشە بە دوای بیانودا ئەگەرا بۆ پەلاماردانی یەکیتی، هەلی بۆ هەلکەوت. لەو کاتەدا لە دەوروبەری وەرتی و مەلەکان بو. کەوتە کوکردنەوەی پیشمەرگەکانی حسک. لە قسەکانی دا کە بۆ داتهیشتواتی دیهاتەکانی کرد بو، وت بوی: «ئیمە چوار حیزبین و ئەوان تەنیا یەک حیزبن. بریارمان داوە جاشەکانی شەستوشەش یەکینەوە بە تەویلەکانی یەکرمجزەدا!»

سەید کاکە رۆژی ۲۳ ی ئابی ۸۱ لە خورشناوەتیەوە کەوتە کیوماڵ بە دوای پیشمەرگە و کادرەکانی یەکیتی دا. هەر پیشمەرگەیەکی بەر دەس کەوت چەکی کرد و. هەر تالەمیکی بینی چوە سەری. لە چەوە و دولی نازەنین و دۆلی سماقولی زیاتر لە . ۵ کادر و پیشمەرگەی بە تاک و بە کۆمەل چەک کرد و هەندیکی کوشت و هەندیکی زامار کرد.

*

بۆلی و کۆمەلە

رۆژی ۲ ی ئەیلول سەید کاکە دەوری مەفرەزەیەکی یەکیتی گرت لە گوندی سیوژەی بناری کوسرەت. پیشمەرگەیەکی کوشت و دوانی بریندار کرد. یەکیکیان فەقی بایزی لیپرسراوی مەفرەزەکە بو، ئەوانی تریشی گرت. یەکی لە گیراوەکان ئەنوەر بۆلی بو. سەید کاکە لی ی پرسی بو سەر بە چ ریکخستنیکە وت بوی: «کۆمەلە». سەید کاکە بە گۆچان تی ی بەر بوبو. هەتا توانی بوی لی ی دابو. زۆریشی جنیو پی دا بو، وت بوی: «تیوە هەمو شوانن، بۆلی و کۆمەلە کوجا مەرحەبا؟». بۆلی تیرەیەکی پچوک بون لە بیتوین ئەژیان. خۆیان بە بەشی لە تاکۆ دائەنا. تاژەلدار و نیوە رەوەند بون. کاتی خۆی لە نیوان لەندیل و دەشتی کۆیەدا گەرمیان و کویستانیان کردوە.

هەرکەس ئەم قسەیەی بکردایە، نەشەبو سەید کاکە قسەی وەها بکا، چونکە ئەویش بە هەمزەکاری شوان بوە و، پلەی خویندەواری خۆی و رادەی تیگەیشتنی لە هی ئەنوەر بەرزتر نەبو. لە کاتیک دا ئەم خۆی بە سەرکردەی حیزبیکی سوسیالیستی ئەزانی، ئەنوەر ئەندامیکی سادەی کۆمەلە بو. بۆ بەدبەختی کورد، بە هۆی هەلومەرجی ناتاسایی جولانەوەی کوردەوە زۆر جار لە ناو هەمو حیزبەکان دا کەسانی لە بابەتی سەید کاکە ئەگەیشتنە ناوەندی بریاردانی سیاسی.

*

فەخرەدین

لە مزگەوتەکەی گوندی ئاومالی دەشتی کۆیە دەوری چەند پیشمەرگەیەکی یەکیتی گرت. پیشمەرگەکان دەستیان کردەوە. یەکیکیان کوژرا ناوی فەخرەدین و، دەرچوی کلیەی علومی زانکۆی موسل بو. کادری ریکخراوەیی کۆمەلە بو.

*

## حاجی قادری مالومە

سەید کاکە لە دۆڵی جافەتی چوو بوو سەرگەڵو، هەڵەدن، یاخسەمەر، چۆخماخ مالومە.. لە چەند شوێنی تەق و تۆقێ لە گەڵ پێشمەرگەکانی یەکێتی دامەزراند بوو. ئازاری دەستەکانی یەکێتی دابوو. هێزەکانی یەکێتی لە وێ کە تازە فەرماندەکەیان و، چەند فەرماندەی کەرتێکیان کوژرا بوو، خەمبار و سەرگەردان بوون، کە بیست بوویان هێزەکانی حسک هاتوونە سەریان، پاش تەقوتۆقێکی کەم کشا بوونەوە دۆڵی سەفرە و زەروون.

حاجی قادری مالومە کە بە ناوی: «دیگەڵ» ناوبانگی دەرکرد، یەکێ بوو لە پیاوە ناسراوەکانی ناوچەکە. پیاوێکی کوردپەروەر و بەرێز و، تەمەنی سەرو ٦٠ ساڵ و، لە شۆڕشی ئەیلول دا ماوەیەکی درێژ پێشمەرگایەتی کرد بوو. مامە عەزەی برایشی سەرەتای دەس پێکردنەوەی شۆڕشی نوێ پێشمەرگەی یەکێتی بوو، لە هێرشی جەیش دا کوژرا بوو. حاجی قادر بە خۆی دا راتەپەڕیو لە رووی هەمو کەسێک دا قسە بکا. هەندێ مشتومڕی لە گەڵ سەید کاکە کرد بوو. سەید کاکە بۆ شکاندنی حاجی قادر لە بەر چاوی خەڵک، لە حەوزی مزگەوتەکەی مالومەی هەڵکێشا بوو.

*

## دلشاد تۆفیق

لە گوندی شارستێنی دۆڵی جافەتی، کە دوا قوربانی لەشکرکێشیەکەی بوو دلشاد تۆفیق کوژرا. دلشاد نەوەی شاعیری کوردپەروەر: حاجی باڵی یەنگیجە و، خوێندکاری زانکۆ بوو دەستی لە خوێندن هەڵگرتبوو. ماوەیەک لە قەندیل و ماوەیەک لە ناوزەنگ لە گەڵ من پێشمەرگە بوو. گەنجێکی ژیر و بێدەنگ و ئازا بوو. کادری رێکخراوەیی کۆمەڵە بوو.

*

## د. مەجید

هەر لە درێژەی ئەم لەشکرکێشیەدا رۆژی ٦ ی ئەیلول تاقمێکی تری هێزەکەی سەید کاکە جارێکی تر چوونە سەر هێزێکی یەکێتی لە چیوەی سەرو پێشمەرگەیەکیان کوشت بە ناوی هاشم و دوانیشیان برینداد کرد یەکێکیان د. مەجید عەبدوڵڵا بوو. د. مەجید تازە خوێندنی پزیشکی تەواو کرد بوو. هاوڕێ ی کۆمەڵە و، گەنجێکی روح سووک و رووناکبیر و رووخۆش بوو. بۆ خزمەتی پێشمەرگە و خەڵک لە گەڵ پێشمەرگەکانی دەشتی هەولێر مابوەوە. گوللەیەک لە کەللەی سەری دابوو توشی بێهۆشی و شەللەلی کرد. هاوڕێکانی بە برینداری دەربازیان کرد بوو. ماوەیەک لە چیا و ماوەیەک لە گوندی وەری شارد بوویانەوە. پاشان بۆ تەداوی نێردرا بۆ سوید. بەڵام هەرگیز چاک نەبوەوە و نیتر نەیتوانی پزیشکی بکا.

*

هێزەکەی سەید کاکە زۆرتر نەبو لە هێزەکانی یەکێتی، بەڵام هێزەکانی یەکێتی وەکو جاران بە بێ ترسی دەستدرێژی حسک بە تاقمی بچووک و لە یەک دابڕاو بە ناوچەکانی چالاکی خۆیان دا نەسووڕانەوە. سەرکردایەتی یەکێتی هیچ جۆرە بڕیارێکی نەبو بۆ شەڕی حسک، حشع و پاسۆک. هەر لە بەر ئەوە ئاگاداری پێشمەرگەکانیش نەکرا بوو

وریایی خۆیان بکەن و، کۆ ببنەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی سەید کاکە. سەید کاکە نەیتوانی غافڵگیریان بکا و، دەستی کتوپڕیان لێ بوەشێنی و، بە جێیان بهێڵێ.

*

ئەم هەواڵانە کە گەیشتەوە ئێمە زۆر ناڕەحەتی کردین. ئەم لەشکرکێشیە لە سنووری تژڵە دەرچوو بوو، بوبوو بە شەڕی دەربەراندن. سەید کاکە لە نامەیەکیش دا کە بۆ مەکتەبی سیاسی خۆیاتی نارد بوو، داوای لێ کرد بوو هێزێک بنێرنە سەر مامەندە بۆ ئەوەی ئێمەش لە شینێ، زەڵێ، ناوزەنگ، تۆژەڵە.. دەربکەن. وتیان: وئەگەر وا بڕوا ئەمی کوردستانی بۆ بە جێ بهێڵین.» بۆ هەڵگیرساندنی یار و دوژمنەکە کۆبوونەوەیەک کرا ئەندامانی م س و زۆری سەرکردایەتی بەشدار بوون.

لە پێشەوە ڕەخنەی زۆرمان لە مەلا بەختیار گرت لە سەر کارەکانی ئەو دواییەی و، لە سەر بە جێ هێشتنی پێشمەرگەکان و ناوچەکە. داوامان لێ کرد سەر لەنوێ بچێتەوە بۆ سەرپەرشتی و ڕێکخستنەوەی هێزەکانی هەرێمی چوار. هەرچی لە گەڵی مان وت، کەڵکی نەبوو، ئامادە نەبوو بچێتەوە بۆ ناوچەکە. بڕیارمان دا:

١. مستەفا چاوڕەش بچێ بۆ کۆکردنەوە و ڕێکخستنەوەی هێزەکانی هەرێمەکانی ٣ و ٤ و، تێبینی بۆ سەید کاکە و هێزەکانی حسک بهێنی بەری مەرگە و دۆڵی جافەتی بە جێ بهێڵن بەرەو کوسرەت و، لەوێش گوشاریان بۆ بهێنن تا ئەیانکەینەوە بە خۆشناوەتی دا.

٢. من، هێزێک لە گەڵ خۆم بەرم بە ناوچەی سەنگوراپەتی دا بەرەو دۆڵی خانەقا و، دەس بگرین بە سەر ناوچەکانی وەرتێ، دۆڵی مەلەکان و، دۆڵی بالیسان دا. لەوێ لە گەڵ هێزەکەی مستەفا یەک بگرینەوە، هێزەکانی حسک بخەینە «ناو کەماشە» وە.

٣. مولازم عومەریش، ئەگەر پێویستی کرد، بە دوای من دا هێزێک بهێنێ لە قەلاتوکان دابمەزرێ بۆ پاراستنی ڕێگاکانی پشتەوەمان لە کۆمتان - دۆڵی خانەقا.

لەو کاتەدا بەشێکی هێزەکانی هەرێمی ٧ ی بالەک و هەرێمی ١٤ ی ئاکۆ لە سەرکردایەتی بوون. هەموویانم ئاگادار کرد خۆیان بۆ جوولان کۆ بکەنەوە. سەید کەریم لە باتی م ع هات. چەند مەفرەزەیەکی گەرمیان لەوێ بوون ئەوانیشمان ئاگادار کرد خۆیان ئامادە بکەن.

مستەفا لە سەردەشت بۆ ئاگادارمان کرد بە ڕێ بکەوێ بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی.

*

ڕووداوەکانی لەلیبان و کاروخ، لە نێوان حشع و یەکێتی دا تازە قەوما بوو. هەردولا بڕیاریان دابوو کە پەیوەندییەکانیان لە ناوچەکەدا ئاسایی بکەنەوە. یەکێتی ئەم کارەی بە من و، حشع بە مەلا ئەحمەدی بانیخیلانی سپارد بوو.

بەیانی ڕۆژی ٨ ی ئەیلولی ٨١ هێزەکەمان کەوتە ڕێ، مەلا ئەحمەدیش لە گەڵ ئێمە هات، بەڵام لە ڕێگا سڵی لێ ئەکردین. لە قەلاتوکان لامان دا. لە کاتی نان خواردن دا عەلی حەمەی شاسوار، کە ئەوسا گەنجێکی تازە پێگەیشتو بوو، تفەنگەکەی لە سەر پێی ئەبێ، گوللەیەکی لە دەس دەرچوو ڕانی پێشمەرگەیەکی مەفرەزەکەی خۆیاتی پێکا. ناوی هیدایەت و خەڵکی ئاوایی بنەکەی گەرمیان بوو. د. شالاو لە گەڵ هێزەکە بوو. گەیشتە سەری. دەمارە گەورەکەی ڕانی توشی ئەزیف بوبوو. چەندی خەریک بو ئەزیفەکەی

بوەستینی و، چەند کەسێکیش خوێنیان دابە، کەلکی نەبو. هەمان ڕۆژ مرد و، لەوێ ناشتمان. ئەمە ڕووداوێکی ناخۆش بو، هێشتا هیچمان نەکرد بو یەکێکمان بە خۆرایی کوژرا.

گۆڕستانێکی زۆر گەورە لە قەلاتوکان بو. گەورەیی گۆڕستانەکە لە گەڵ کەمیی ژمارەی دانیشتوانی قەلاتوکان و ئاوایییەکانی دەوروبەری دا نەدەگونجا. هەندێ لە گۆڕەکان هەڵبەسترا بون. نیگاری گوڵ و خەنجەر و مەلێکی لە بابەتی کەڵەشێر لە سەر کێلەکانی هەڵکەنرا بو. نوسینیان لە سەر نەبو، یان من نەمبینی. نەمزانی هی چی سەردەمێکە.

ڕۆژی دوایی کەوتینە ڕێ گەیشتینە دولی خانەقا. پێشمەرگەکانی دەشتی هەولێر و خۆشناوەتی کە لە ناوچەکەدا مابونەوە تا ئەو کاتە خۆیان حەشار دابو، بە هۆکی تۆزێ دڵزرانەوە و خۆیان دەرخست. د. مەجیدیش، کە چەند ڕۆژ بو بە برینداری حەشاریان دابو، لە دارەمەیتێک دا گەیشتە دولی خانەقا. سەرەڕای سەختی برینەکەی و پەرێشانی حالی، وورەی زۆر بەرز بو. لە گەڵ مەلا ئەحمەد چەند جاری دانیشتین و، نوێنەرانی هەردولامان دانا و، ئەو چەکانەی لە یەکتریان گرت بو وەرمانگرتەوە و دامانەوە بە یەکتری. ئەمو نێوانی هێزەکانی هەردولا لە ناوچەکەدا بگەڕێتەوە دوخی جارانی.

بەلام وەکو دوایی بۆمان دەرکەوت ئەمە بۆ خاوکردنەوەی ئێمە بو، چونکە سەرکردایەتی جود بڕیاری دابو: یەکێتی تەمێ بکا.

*

هێزەکمان بە ڕێ کەوت بەرەو مەلەکان. بەیانی زو بو گەیشتین. پیاوەکانیان کە بە هاتنی ئێمەیان زانی بو هەمویان لە ترسان خۆیان لە چیا شارد بوەوە. ئەو ڕۆژە هەینی بو، لە بەر ئەوەی پیاوەکانیان ئاوایییەکەیان بە جێ هێشت بو، نوێژی هەینی تێ دا نەکرا. هێزەکمان زۆر بو هەموی لە مەلەکان جێیان نەئەبوەوە، لە بەر ئەوە دابەشمان کردن بە درێژایی دولەکە لە گوندەکانی: کەندول، بلەی سەرو، بلەی خوارو، ئالانە.. دابەزین.

کادرەکانی یەکێتی، هەواڵی ناڕاستیان لە سەر ژمارە و شوێنی هێزەکانی حسک هەبو. پێیان وت بوین کە دولەکە چولە و، هێزی حسکی تێ دا نەماوە. بەلام کە هێزەکانی ئێمە چون بۆ بلێ، لە چیاکانی پشتەوە: سەری جوانەگا، دارە هێشک، گەلی بیجان، کە بەشێکی زنجیرەی چیای کورەکە.. بویان دامەزرا بون، دایانە بەر دەسڕێژی گوللە. یەکێکیان لێ کوشتین و چەند کەسێکیشمان بریندار بون.

هێزێکمان ناردە سەریان. شوێنەکانیان زۆر قایم بو. خەلکی ناوچەکەش بە نهێنی هاوکارییان ئەکردن. بەرەنگارییەکی سەختیان کرد. سەرەنجام هەڵکەندران و بلاوەیان لێ کرد و خۆیان شاردەوە. بۆ ئەوەی نەتوانن بێنەوە ناو گوندەکان بە درێژایی دولەکە لە ناو هەمو گوندەکان دا بنکەمان دانا و، لەو شوێنانەش کە ئەیانتوانی هاتوچوی لێوە بکەن بۆسە و ڕەبیەمان دانا.

زنجیرەیەک چیای زۆر سەخت کەوتوتە نێوان دولی شاور و دولی مەلەکان و دولی بالیسانەوە، چەند کوێرە ڕێگایەکی هەیە بۆ هاتوچو بارێک و بەرز و ڕک و ڕژدن، خۆیان پێیان ئەڵێن: «دەرە»، وەکو: دەرە هەرتەل، دەرە زیوە کە ڕێگایە بو دولی شاور و، دەرە شێر کە ڕێگایە بو سەرچاوەی مەلەکان و، ڕێگای سەرپاری خەتێ. هەمو ئەم شوێنانەمان بە پێشمەرگە تەنی، چونکە چاوەڕوانی گەڕانەوەی سەید کاکەمان ئەکرد کە لە دولی جافەتیەوە

رلو نرا بو بەرەو کوسرەت و، ئێمە بە یەکێ لەم ڕێگایانە دا لێ بوین بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە بارەگای سەرکردایەتیمان لە «دۆڵی دۆڵە تو».

ڕۆژانەیش مەفرەزەکانمان ئەچوون بۆ گەڕانی گوندەکانی دۆڵی بالیسان.

هەمان ڕۆژی گەیشتنە مەلەکان، دوای ئەوەی تێگەیشتن ئیازی هیچ دەستدرێژی و کارێکی خراپمان نیە بۆ ئێوارەکەی، هەمو ئەوانەی هەلات بون هاتنەوە ناو ماڵەکانی خۆیان. دوا بە دوای یەک هەندێ لە پێشمەرگە و مەفرەزەکانی حسک، کە خەڵکی ناوچەکە بون ئەوانیش لە مەکۆکانیان ئەهاتنە دەرێ و، ئەهاتنە ناو یەکیتیەوە. هەندێ لەوانە پێشمەرگەی باش و ڕێکوپێکیان لێ دەرچو، تا سەر لە گەڵ یەکیتی مانەوە.

*

## دیموکرات

یەکێ لە پێشمەرگەکانی دەستەکەی خۆم ناوی جەماڵ بو. هاوڕێ ی کۆمەڵە بو. بەرپرسی کاروباری لوجستیکی مەفرەزەکەمان بو. سەرپەرشتی خواردن و دابەشکردنی ئەکرد. کابرایەکی مەلەکی دارێکی هەرمێ و دو بن دار گوێزی بۆ خواردنی خۆمان بەرەو ڕو کرد بوینەوە. جاروبار گوێز و هەرمێیمان لێ ئەکردە و ئەمانخوارد. جەماڵ سەرپەرشتی چنین و ڕنین و دابەشکردنی ئەکرد. لە باتی ئەوەی بلێ: وەکو یەک بە سەرتان دا دابەش ئەکەم، ئەوەندە وت بوی: بە دیموکراتی دابەشی ئەکەین، ناویان نا: «جەماڵ دیموکرات» دوای ئەوە ئیتر ئەم ناوەی بە سەردا دابڕا و، هەتا ئێستایش هەروای پێ ئەڵێن.

*

## قەل

لەو سەردەمەدا دەزگای بێتەل مان نەبو، تەنیا هۆی پەیوەندی مان چەند دانەیەک هۆکی تۆکی بو. بۆ ئەوەی لە گەڵ یەک پەیوەندی بکەین ئەبو بچینە سەر لوتکەی بەرزاییەکان. ئەو مەفرەزانەی لە بوسەی سەر ڕێگاکان دا دامنابون هەمویان هۆکی تۆکیان پێ بو، بۆ ئەوەی ئەگەر شتێ هاتە پێشەوە بە تایبەتی شوێنەکانیان ئەبروانی بە سەر دۆڵی بالیسان دا ئاگادارم بکەن.

شاخەوان فەرماندەی ئەوانە بو کە لە سەر باری خەتێ و، فاروقی عەلی مەولودیش هی ئەوانەی لە سەر دەرە شێر بون. بۆ ئەوەی بە ئاسانی لە پەیوەندییەکانمان تێ نەگەن، هەندێ لە ناوەکانمان گۆڕی بو، لەوانە: وشەی «قەل» مان بۆ حسک دانا بو.

لە پڕ شاخەوان بە هۆکی تۆکی هاواری کرد: «ئەری وەڵلا ئەوە قەلەکانن! ئەوە قەلەکان لە ئوتومبێل دابەزین. ئەوە قەلەکان خەریکن بە سەر باری خەتێ دا هەڵئەگەڕێن. ئەوە قەلەکان بەرەو لای ئێمە دێن...» بەمجۆرە، بە بێ پسانەوە، درێژەی ئەدا بە قسەکانی ئەتوت مونەبیهد بەدریە و لە سەر ڕوداوەکانی تۆپخۆرین ئەدوێ. فاروقی عەلی مەولودیش هەمان قسەی شاخەوانی بە هۆکی تۆکییەکانی تر ئەگەیاند. چەندێ هەوڵم دا شاخەوان بە بێدەنگی چاودێری قەلەکان بکا، تا ئەگەنە ژێر ئاگری ئەوان، کەڵکی نەبو.

تومەز قەلەکان سەید کاکە و هێزەکەی بون و، ئەیانویست لە ڕێگای سەرباری خەتێ بێنە دۆڵی مەلەکان و بگەڕێنەوە بەرەو سەرکردایەتی، لەم هات و هاوارەی شاخەوان هوشیار بونەوە. ئەوانیش بە هۆکی تۆکی قسەکانیان گوێ لێ بوبو، زانی بویان بوسەیان بۆ دانراوە. بە هەمان ئوتومبێلی پێ ی هات بون، سوار بون و گەڕانەوە بۆ دواوە بەرەو چیای هەوری،

واته بەرامبەر بەو چاپەی هێزەکانی ئێمە بۆی دامەزرا بوون.

ئێتر ئێمە لە کۆڵی ئەبوینەوە. هێزەکانمان نیشتنە سەریان. لە لای چەپ و لە لای سەردۆڵەوە بە هەوری دا بویان سەرکەوتن. سەید کاکە بە هۆکی تۆکی لەسەی لە گەڵ عەوڵا سور کرد بو داوای لی کرد بو دەرباز بکا. شوێنێکی بۆ دیاری کرد بو بچیتە ئەوی تا بە تراکتۆر بیگوێزێتەوە. سەید کاکە هەندی لەوانەی لە گەڵی بوون خەریکی کردن بە شەڕی هێزەکانی یەکەیتیەوە، خۆیشی بە دزیەوە مەیدانی بە جی هێشت بو بەرەو ئەو شوێنەی عەوڵا سور بۆی دیاری کرد بو.

هیچ کەسی لە فەرماندەکانی پێشمەرگە بە ئەندازەی سەید کاکە لە خۆ دەربازکردن دا زیرەک نەبو، شەڕەکەی داتەمزراند، گەرمی ئەکرد، تاکەی لە پێشمەرگەکانی تێوە ئەگلاند، خۆیشی بە بێدەنگی ئەکشایەوە بۆ شوێنێکی سەلامەت. لە چەندین شەڕدا ئەم تاکتیکەی بە کار هێنا بو. لە «شەڕی دەشتیو» یش دا وەها دەرباز بوبو.

*

شێر و ڕێوی

ئەم شەرە زیاتر لەوەی شەرە تفەنگ بی، شەرە قسە بو.

کە باسی ئازایەتیەکانی خۆی ئەکرد، سەید کاکە قۆڵی هەڵئەمالی و، گێڕانەوەکانی تێکەڵاو ئەکرد بە هاژوهوژ و فیشاڵ و خۆ هەڵکێشان، بەلام قسە و نوکتە و هەڕەشەکانی خۆش بوون، زۆر جار لە ناخۆشی دا پیاوی ئەهێنایە پێکەنین.

سەید کاکە هەمو فەرمانە ناسراوەکانی یەکێتی ئەناسی و، لە گەڵ هەندێکیان دوست و ناسیاو بو. لەم شەڕەدا بە هۆکی تۆکی قسەی لە گەڵ هەندێکیان ئەکرد، لە سەرەتادا کە هێشتا مەترسی لە سەر ئەبو جنێوی پی ئەدان و گەفی لی ئەکردن. لەقەناسەیەکی پی بو، هەڕەشەی لی ئەکردن بە لەقەناسەکەی، مێشکیان ئەپژێنی! سەید کەریم و قادر خەیات و عەزیزی داود پیاوی زۆر ئازا بون هەڕەشەکانی سەید کاکەیان بە لەشە وەرئەگرت و گاڵتەیان پی ئەکرد. خەریک بون ئەگەیشتنە سەری.

لە چەند لاوە بە هۆکی تۆکی بانگیان ئەکرد: «سەید ڕێوی لە کوی ی!؟»

سەید کاکە ئەیزانی ئێتر خەریکە مەترسی لی نزیک ئەبێتەوە وتی: «شێر کە پیر بو ئەبێتە مەسخەرەی سەگان!» یەکێکی کە پی ی وت: «سەید ڕێوی! تۆ قەت شێر نەبوی، هەر ڕێوی بویت و، هەمو جار خەڵکی لە شەرەوە ئەگلێنی و خۆیشت هەڵدی ی!» قادر خەیات گۆرانیەکی خۆشی بە ناوی: «هۆ ڕێوی - ڕێوی...» بۆ ڕێکخست بو، بە ئاوازێکی خۆش لە هۆکی تۆکیەکەدا بۆی ئەوت.

ماوەیەک سەید کاکە دەنگی نەما. زۆریان گاڵتە بە خۆی و بە لەقەناسەکەی ئەکرد. ئەیانویست شوێنەکەی بدۆزنەوە بەلام ئەو دەنگی لە خۆی بڕی بو. تومەز خەریکی خۆدەربازکردن بو. سەید کەریم چەند جاری بانگی کرد: «سەید ڕێوی لەقەناسەکەت دەنگی نەما چی لی هات!؟»

سەید کاکە گەیشتە لێنی، وتی: «چو بە .... دایکتا!»

سەیرە کورد لە ناو گیانداران دا، جگە لە شێر و پڵنگ، ئەوانی کەی بە لاوە سوکە. سەید کاکە بە ناوی ڕێوی زۆر تورە ئەبو. ئەیئەزانی ڕۆمێل سەرکردەی هێزەکانی ئەڵمانیا لە سەروی ئەفەریقا، کە هێزەکانی بەریتانیای بە سەرکردایەتی مۆنتۆگۆمەری بە گیر هێنا

بو. له بەر زیرەکی له بەربوەبردنی شەرەکەدا ناویان نا بو: ریوی بیابان.
ئیتر بە یەکجاری نە دەنگی ئەنتاسەکەی و نە دەنگی خوی له هوکی تورکی دا نەما. بۆ روژی دوایی بیستمان که عەولا سور له ریگای سەرکەپکانەوە تی ی پەراند بو.

*

له هەوری یەکیٚ له هیزەکەی سەید کاکە کوژرا، ناوی حەسەن وەرتی بو، تەرمەکەی بە جی مابو. پیشمەرگەیەکیشیان بە بریندازی گیرا ئازادمان کرد. بەلام سەید کاکە خوی دەرباز بو و، ئەوانی تریشیان بە تاقمی پچوک بلاوەیان لی کرد.
جموجولی ئاشکرای چەکدارەکانی حسک نەما و، ناوچەکە کەوتە ژیر دەسەلاتی هیزەکانی یەکیتییەوە.

*

بۆ روژی دوایی، بۆ هەلسەنگاندنی هەلومەرجی ناوچەکە و، دانانی بەرنامەی کاری داهاتو، لە بیراوا کوبوینەوە. پەیوەستی ئەوە نەمابو هیزەکان هەمویان لەو ناوچانەدا بە کوکراوەیی بمیننەوە. هیزەکان ریگا دران هەریەکەیان بچیتەوە ناوچەی چالاکی خوی. لەویوە نامەیەکم بە ریگای ناوشار نارد بۆ فەرماندەی پیشمەرگەکانی بنکەی ئەملاتوکان. ئاگادارم کرد کە سەید کاکە لەو ریگایەوە ئەگەریتەوە بوسەیەکی باشی بو بنینەوە.-محەمەدی حاجی عەبدوللا فەرماندەی پیشمەرگەکان بو، بە چاکی بوسەیان دامەزرا بون، بەلام کە سەید کاکە گەیشت بوە نزیکی، بە هەندی قسەی لوس فریوی دابو، ریگەی پی دابون بە سەلامەتی تی پەرن.
کوسرەت بوشایی تی دا دروست بو. ناوچەیەکی گرنگیش بو بۆ پیکەوە بەستنی ناوچەکانی هەردو بەری زیٚ. شەمال کە ئەو کاتە فەرماندەی پیشمەرگەکانی دەستەکەی خوم بو، حەزی کرد بچی بۆ کوسرەت. تاقمیک لە پیشمەرگەکانی خومم بۆ جیا کردەوە و، لە گەلٚ هەندی پیشمەرگەی تر بە ری مان کرد و، فەرماندەیی هیزەکەی ئەوی مان پی سپارد.

*

## گەلەکومەکیٚ ی چوار قزلی جود

پەیوەندی یەکیتی و لایەنەکانی جود چو بوە قوناغیکی ترسناکەوە. لە نیوان یەکیتی و پارتی دا لە سەرەتاوە حالەتی شەر بەردەوام بو. دوای ئەو روداوانەش شەر لە نیوان یەکیتی و حسک دا هەلگیرسا بو. بە هوی روداوەکانی دەرگەلە و قەلبیان و کاروخەوە پەیوەندی یەکیتی لە گەلٚ حشع بەش گرژ بو بو، لە گەلٚ پاسوکیش لە روداوەکەی مامەخەلان و گەرمەی تیکچو بو. بە واتەیەکی تر هەر چوار براکەی جود لە سەنگەردا بون لە یەکیتی. سەرکردایەتی ئەم حیزبانە بە نهینی لە ناو خویان دا ریک کەوت بون گەلەکومەکییەکی پیشمەرگەیی بکەن، یەکیتی لە مەیدان دەربەرینن، یا هیچ نەبی تەمیٚ ی بکەن.
ئیمە هیشتا بەمەمان نەزانی بو. من بەرەو دوا گەرامەوە بۆ مەلەکان و، دوای چەند روژی چومە دولی خانەقا بە نیازی ئەوەی بە یەکجاری بگەریمەوە بۆ ناوزەنگ لە بەر ئەوە هیزەکم کەم کرد بووەوە. هەر ٤٠ کەسیکم لە گەلٚ بو. چەند روژی لە گوندەکانی دولەکەدا مابینەوە. روژانە شیوعییەکان تاقمیک و دوان و سیان بە ناوی کرینی ئازوقە و کەلوپەلٚ و پیویستی ترەوە بە لای ئیمەدا ئەهاتن، وەکو پیشمەرگەکان چاودیریان کرد بون، لەم سەر

به کەسی نەرویشتن، بەلام لەو سەر بە زوری نەهاتنەوە. گورمانیان وابو هیزیکی بیگانە، وردە وردە و بە شینەیی، ئەگویزنەوە بو شوینەکانی پشتی ئیمە.

*

## چاوەش

سەکتەی سیاسی چەند جاری بە رادیو پەیامی مەجلوریان بو ئەناردم، کەوا عەولا سور ریگای کورمەتانی بەستوە، هەرکەس لەویوە ئەروا، ریگای پی ئەگری و لیکولینەوەیان لە گەل ئەکا. چەند پیشمەرگەیەکیشی چەک کرد بو. داوایان لی ئەکردم هیزیک بنیرمە سەری لە ریگاکە دوری بخەمەوە.

جاریکیان تالەی هونەرمەندی هەولیری لەویوە تی پەری بون. سەید کاکەش لەوی ئەبی. یەکی لە هونەرمەندەکان کەمان، یا تالەتیکی موسیقی تری، پی ئەبی. سەید کاکە لی ی ئەپرسی: «بو کوی ئەچی؟» ئەلی: «ئەچم بو ناوزەنگ» سەید کاکە ئەلی: «مامجەلال کەسی بە دەستەوە نەماوە خەریکە چاوەش کۆ بکاتەوە!»

*

سوار ئاغا، عەولا سوری بانگ کرد بو لە سەر دەرباز کردنی سەید کاکە سەرزەنشتی کرد بو. بوی باس کرد بو کە یەکیتی و حسک لە شەردان، پارەمەلیدانی ئەوان واتە دوژمنایەتی یەکیتی. چەند جاری قسەی لە گەل کرد بو کە بان بگەریتەوە ناو یەکیتی بان ناوچەکە بە جی بهیلی و بچی بو سەرکردایەتی حسک. چەند روژی ئەم مشتومرەیان بەردەوام ئەبی. مەلا عوسمانی پلنگان، عەزیز صدیق، رەئوف سلیمان و مامەندی حاجی صدیق لە هەندی لەم دانیشتنانەدا بەشدار ئەبن. زور لە فەرماندەی کەرتەکانی هەریمەکەش کە خەلکی ناوچەکە و هەندیکیان خزمی خوی بون هەر لە گەلی خەریک ئەبن. ئەم هەولانە نەک هەر هیچی سودی نابی، بەلکو بەرپەری بی باکی و بی منەتیەوە سور ئەبی لە سەر هەلویستی خوی و، پیمان ئەلی: «چیتان پی ئەکری بیکەن!» ئورمەز ئاگادار بو کە هیزیکی گەورەی جود بە ریگاوەیە.

*

## کزلاتی فاتە

«خانەقا» گوندیکی بچوک بو، دولەکەیش بە ناوی ئەم گوندەوە ناو نرا بو دولی خانەقا. جادەیەکی قیری بە ناودا تی ئەپەری سەنگەسەری ئەبەست بە جادەی هاملتونەوە. لەسەر و ئەویەری جادەکە گوندەکانی: بەرگردکە، سەرنەوس، بن نەوس، گزجار، رزیکەریان، چوم ریخن.. هتد. ریگایەک لەم جادەیەوە ئەبرەوە ئەچو بو قەسری، یەکی لە پیچەکانی ناوی: «کزلاتی فاتە» بو.

لە گەل پیشمەرگەکانی بالەکایەتی ئیرانم زور خوش بو هەندی جار گالتەوگەپم لە گەل ئەکردن. عەزیزی داود پیاویکی لەزشمە و قسە خوش بو، لە لاسایی کردنەوەدا زور وریا بو. ئەگەر لە ولاتیکی کە بوایە ئەیتوانی ببی بە ئاکتەریکی گەورە. روژیکیان وتم: «عەزە گیان ئەم فاتەیە چیە؟» وتی: «فاتە خەلکی سلیمانی بوە. ئەو زەمانەی بارەگای بارزانی لیرە بو هاتوە لەو شوینەدا کەتیکی کردوە. لەوساوە ئەم ناوەیان لەم شوینە ناوە!»

ئەویەرمان چیای مامە روت و پشتمان چیای درە بی بو. کاتی خوی «شیخ ئەحمی ماریلیان» لەم خانەقایەدا ئیرشادی کردوە و، گورەکەیشی هەر لەو نزیکانە زیارەتگای ئەهلی

مراز بو. شێخ ئەمی زۆری ژن هێناوە. حاجی قادری کۆیی هێرشی زۆری کردوتە سەری و، لە چەندین شیعری دا ناوی هێناوە و هەجوی کردوە.

*

شەوەکەی ئێمە لە بەرگردکە لە مالی شێخ ئەحمەدسان بوین. خێزانێکی هەژار بەلام تەبیعەت دەولەمەن بون، کوردپەروەر و تێگەیشتو بون. ژنێکی خوشیان لە ئەوەی دومی خانوەکەیان دا بۆ میوان تەرخان کرد بو ئێمە لەوی دا بوین. پێش ئەوەی دنیا تاریک بێ، هەرچی ریبوار و کاروانچیەک ئەگەیشت، ئەیوت هێزێکی زۆری پارتی لە سەر جادەکە کۆبونەتەوە. تا ئەوسا ئێمە نەمانزانی بو هێزی پارتی دابەزی بێ. کەوتینە پەیجوری راستی هەوالەکە. دەرکەوت هەوالەکە راست بو.

شەوەکەی بو بە وەیشومەیەکی زور بەهێز. رەشەبایەکی وا هەلی کرد مالەکەی ئەهەژاند و، بارانێکی بە خوروم دایکرد و، هەوا ساردی کرد بو. هەمومان چاوەری بوین ها ئێستا ها تاریکی تر خومان بکەن بە ناو گوندا و بێی بە شەری ئەنبەتەن، چونکە باوەرمان نەئەکرد لەو چۆلەدا بەرگەی ئەو وەیشومەیە بگرن، بەلام دیارە مروڤ هەندی جار لە داردەرون قایمترە.

*

بۆ روژی دوایی هەندی لە هێزەکانی هەرێمی ٧ ی بالەکم کۆ کردەوە و، لە گوندی «کەلیت» ەوە بە بناری کاروخ دا بۆ سەرگەلی و ئینجا بۆ زارگەلی کەومالێکی وردمان کرد. نە لە دور و نە لە نزیک هیچ نیشانەیەکی هەبونی هێزی پارتی مان هەست پێ نەکرد. هێزەکانیان شەوی پێشو پاشەکشەیان کرد بو بۆ دەوروبەری پشت ئاشان.

لە چەند سەرچاوەی جیاوازەوە هەوالم بۆ هات بو، ئیتر گومانم نەمابو لەوەی بەو نزیکانە هێزەکانی جەود پەلامارمان ئەدەن. لە بەر ئەوە ئیتر مانەوەم لە دولی خانەقا بە چاک نەزانی. پێشم باش نەبو بگەرێمەوە بۆ ناوزەنگ. بە ناو وەرتی دا لە زێی ئەستیروکانەوە چوم بۆ دولی شاور. لە وەرتێ بە دەم رێگاوە لە ناکاو بۆ چاکوچونی چوم بۆ سەردانی بارەگای حیزبی شیوعی. زور گەیر ئەبوین رویشتین. پێشمەرگەکانی لە کەلم بون چاویان هەلفست بو. وتیان لە زورەکانی کەدا خەلکی تری لێ بو کە نەیانئەویست ئێمە بیانبینن. دوایی دەرکەوت هەندی لە هێزەکانی پارتی بون بە دزیەوە هێنا بویانن پشتمان لێ بگرن. بەلام هێشتا ژمارەیان بایی ئەوە نەبو پەلامارمان بدەن.

*

شەو گەیشتینە پلنگان. چوینە مالی مەلا عوسمان. مەلا عوسمان پیاوێکی کوردپەروەر بو لە کونەوە بەشداری جولانەوەی کورد و، دوستی یەکێتی بو. هێشتا ئەحەسابوینەوە هەوالیان بۆ هێنام کە ئەمرو عەبدوللا سور سەری سوارناخا و هەندی لە فەرماندەی کەرتەکانی هەرێمەکەی دابو، پێ ی وت بون کە: «هێزێکی گەورەی جەود لەو روژانەدا دێتە خواری بۆ دەرکردنی یەکێتی لە ناوچەکە. ئەم چونکە خوی بە خزمیان ئەزانی لە پێشەوە هاتوە پێیان بلێ: ئەگەر ئەمان هاوکاریان بکەن ئەوا باشە، ئەگینا ئەمانیش دەرئەکەن» ترسی ئەوەم هەبو پێش وەخت و، پێش کوبونەوەی هێزەکانی یەکێتی، دەسکێشی هێزەکانی جەود بکا بۆ ناوچەکە. لەو کاتەدا هێزێکی ئەوتوم لە بەر دەس دا نەبو بەری هێرشی جودی پێ بگرم. هێزەکانم نارده چوار دەوری.

*

بەیانی ڕۆژی ٨/ ی تشرینی یەکەمی ٨١ هەواڵم بۆ نارد کە: «یان بێتەوە ڕیزی یەکێتی، یان بێلایەن لە ماڵی خۆی دابنیشێ بەو مەرجەی هاوکاری جوند نەکا ئێمەش دەستی لێ نەدەین، یان دەسبەجێ ناوچەکە چۆڵ بکا» بەڵام ئەویش هەر کە بە هاتنی ئێمەی زانی بۆ هەر شەوی چوو بوو شاخی بەرمکە لە پشتی دولە ڕەقە، هێزەکانی خۆی بە چەند ڕیزی دامەزراند بوو.

*

قادر خەیات دۆستی عەولا سور بو بەیانی زو چو قسەی لە گەڵ بکا. قسەکانی منی پێ بڵێ. تەقەیان لێ کرد گوللەیەک لە ڕانی دا و، لە شوێنێکی کراوەدا بە بریندارێ تا بە لاداخستنی شەڕەکە کەوت بو خوێنی لە بەر ئەرۆیشت نەیئەتوانی سەر دەربێنێ.

دو لە خزمەکانی عەبدوڵلا سور، کە فەرماندەی کەرت بون لە هەریمەکەی: حاجی ئاغا حامید و خالصی حەقی ئاغا، هاتنە ناو یەکێتیەوە. هەمان پەیامەکەی بەیانیم بە ئەوانیش دا بۆ نارد. بەڵام پێیان وتن ئەم پەیامە تا ئەو کاتە بڕ ئەکا کە لێمان نەکوژراوە، ئەگەر لێمان بکوژێ ئیتر لە کوڵی نابینەوە.

خۆم لە گەڵ سوار ئاغا چومە بەرزاییەک بەرامبەر بەرمکە هەمو شاخەکەمان ئەبینی. شوانێک هاتە لای سوار ئاغا ڕاسپاردەی عەولا سوری بۆ هێنا بو. بە شوانەم وت: «ئەتوانی نامە یا ڕاسپاردەی منی پێ بگەیەنی؟» وتی: «بەڵێ» وتم: «نامەیەکی بۆ ئەنوسم بۆی بەە» نامەیەکی کورتم بۆ نوسی هەواڵەکەی بەیانیم تێ دا دوبارە کردەوە و بۆم نوسی: «تا شەر و پێکادان نەبوە لە یەک گەیشتن ئاسانە. ئەگەر بو بە شەر و لێمان کوژرا ئەوسا ڕازی لێ نابینەوە.» سوار ئاغاش نامەیەکی بۆ نوسی. شوانەکە نامەکانی برد و ڕۆیشت. نازانم پێ ی گەیاند یا نە. زوری نەخایاند لە بەردەمی دولە ڕەقە دا بو بە تەقە.

*

محەمەدی برای عەولا سور پێشمەرگە نەبو. تا ئەو کاتەش تێکەڵاوی شەر نەبو. کە تەقە گەرم بو کوژراو و بریندار کەوتن. یەکێ لە هێزێ تورکییەکان ئاگاداری کردم: «محەمەد تفەنگی پێ یە و، خەریکە بە بەرمکەدا هەڵئەگەڕێ تەقەی لێ بکەین؟» وتم: «تەقەی لێ مەکەن!» لام وابو براکەی لە تەنگانەدایە ئەچێ بۆ یارمەتیدانی. ئەرکی برایەتی بە جێ ئەهێنێ. بەڵام محەمەد ترسابو داخی عەولا سور بەو بڕێژن، دایبە شاخ خۆی دەرباز بکا نەک یارمەتی براکەی بدا. محەمەد بەشداری شەر نەبو. دوای ئەوە چوە لای حسک لە جێگەی براکەی بو بە فەرماندەی هەریم و. ماوەیەکیش لای هەماسی بابز بو بە جاش.

*

کابرایەکی مەردار لە دولە ڕەقە بو ناوی حاجی پڵنگ بو. ئەوە یەکەم جار بو ناوی وەها ببیستم. ئاژەڵەکەی گل دابوەوە نەی برد بو بۆ شاخ. لە گەرمەی شەڕەکە دا ئەیویست بەرەڵلایان بکا بۆ ئەوەی لە گەڵ بەردانی ئەوان دا بۆ ئاو خواردنەوە، گەمارۆ دراوەکان خۆیان دەرباز بکەن. ئەمە تاکتیکێکی زیرەکانە بو.

*

دو کەس لە پێشمەرگەکانی ناوچەکە کوژرا بون: یەکێکیان، فەقێ مستەفای حاجی

خدری دولە رەلە، برازای عومەری حاجی برایم بو. کادریکی جوتیاری هەلکەوتوی کومەلە و، ئەندامی کونفرەنسی یەکەم بو، لە ناوچەکەدا زور خوشەویست بو، خوی و مامی و کەسوکارەکانیشی لە شەرە کەدا بون. ئەوی تریان ناوی باپیر بو برازای کویخا مینەی نزوە بو. جگە لەم دوانە پیشمەرگەیەکی گەرمیانیش کوژرا بو، لە بەر خوشەویستی هەر بە ئاموزا بانگیان ئەکرد.

۳ پیشمەرگە کوژرا بون و قادر خەباتیش بریندار بو. ئاگاداری ئەو هێزەم کرد کە لە دەوری ئەوان دام نا بو، پەلاماری سەرچاوەی ئەو تەقانە بدەن. هەلمەتیکی کتوپریان بو بردن، زوری ئەخاباند کیپان کرد. هەندیکیان کوژران، یەکیکیان مستەفا کەلهێنەیی بو. ئەوانی تریان گیران. سامان کە بە بیرمکەدا هەلگەرا، بە هوکی تورکی ریگاکانیان بو دیاری ئەکرد، ئەویش پاشماوەی هێزەکەی دوژمنەوە، عەولا سوریشیان لە گەل بو. ئەوانیش گیران.

کە چومە شوینی شەرەکە، خزمەکانی لەتی مستەفا بە ژن و پیاو و منالەوە وروژا بون، چەکدارەکانیان ئەم بەر و ئەوبەری تفنگەکەیان لە پیشمەرگەکانی یەکیتی گرت بو. ژن و منالیش لە گیراوەکان و حەرەسەکانیان وروکا بون بە بەرد و تەلا تیپیان بەربوبون. ئەیانویست هەمو گیراوەکان بکوژن. چەندی خەریک بوم خاویان بکەمەوە، کەلکی نەبو، کەوتنە جنیودان و میل راکیشان لە منیش. خەریک بو ببی بە شەری خویەخو. لەم هەرایەدا عەولا سور کوژرا و ئاژاوەکە کوژایەوە. دیمەنیکی راستەقینەی شەری پشت شکینی براکوژی. زوری پیشمەرگەکانی هەردولا ئاکو و، خەلکی هەمان دول و هەندیکیان خزمی یەکتری بون.

*

عەولا سور، رەنگی سور نەبو، بەلکو کابرایەکی رەشتالەی رەقەلە بو، وەکو ئەیانوت: شاخەوانیکی زور وریا و، تفەنگچییەکی دەسراست و، پیشمەرگەیەکی ئازا بو. لە ناخی دلەوە پیم ناخوش بو بکوژری، بەلام چون بو رزگارکردنی ژیانی مروڤی لە مردن جاری وا هەیە دکتور خوشەویستترین ئەندامی لەشی نەخوشەکە ئەبری، نەخوشەکەیش خوی بە ناچاری رازی ئەبی، یان بو کوژاندنەوەی ئاژاوەی خوینای نیوان دو بنەمالە یەکی ئەکری بە قوربانی، کوشتنی ئەویش ناچارییەکی لەو بابەتە بو.

بیگومان عەولا سور وەکو هەمو شەهیدەکانی کەی شەری ناوخو قوربانیەکی بی گوناه بو.

*

## ئاکویەتی

ئاکویەتی بەو ناوچەیە ئەلین کە عەشیرەتی ئاکوی تی دا ئەژی. ئاکو لە لای روژهەلاتیەوە لە گەل مەنگور و، لە لای روژئاوایەوە لە گەل خوشناو و، لە لای سەروویەوە لە گەل بالەک و، لە لای خوارویەوە لە گەل سن، رەمەک و پیران (۳ تیرەن لە بلباس)، هاوسنورە. لە روی ئیداریەوە بەستراوە بە قەزاکانی رانیە و پشدەرەوە. لە قەزای رانیە بەشیکە لە ناحیەی سەرکەز و، لە قەزای پشدەریش بەشیکە لە ناحیەی ناودەشت کە مەرکەزەکەی سەنگەسەرە.

لە روی خیلەکیەوە لە چەند بەش پیک هاتون:

باشناغایی، بنەمالەی فەرمانرەوای عەشیرەتەکەن، لە گوندی سەرکەپکانی رانیە

دانیشتوون.

ناوەشتی، بەو ئێڵانەن کە لە ناوچەی ناوەشتی پشدەر دا دانیشتوون و، لە چەند تیرەیەک پێک هاتوون: شاروشی، کە لە داوێنی قەندیل دا لە ٨ گوندا ئەژیان.

ڕەشێکەری، ئەوانیش ئەبن بە ٣ هۆزەوە: بارەیی، خەیلە، مەندەمەرە. مەندەمەرە، لە چەند گوندێک دا: گرتک، دوگۆمان، جەلک، مەمک، پیرانە ڕەشە، ماخۆیزنان.. ئەژیان لە نێوان چیای زێڕنەکێو و ئاوی گارفێن دا. بەم ناوچەیە ئەڵێن پشدەرە ڕەقە و، بە ئاکۆزی ئەم ناوچەیەشیان ئەوت؛ ئاکۆ ڕەشکە. ئاوایییەکانیان کەم ئاو و کەم دەرامەتە و ناخۆشە. بە ئاژەڵداری ئەژیان و بە هاوینان ئەچوون بۆ کوێستانەکانی قەندیل. عەباسی بایزی بالو سەرۆکایەتی ئەکردن. لە سەرەتای دەس پێ کردنەوەی شۆڕشەوە عەباس بوبو بە جاشێکی دڕ لە ناوچەکەدا.

ئاکۆزی بەردەر، ئەوانەن کە لە دۆلەرەقە، دۆلی پلنگان، دۆلی شاوردا ئەژیان.

بۆلی، لە دەشتی بیتوێن و، بابۆلی، لە بناری کۆسرەت ئەژیان و، بۆ هاوین ئەچوون بۆ حاجی هۆمەران

*

عەشیرەتی ئاکۆ لە سەردەمی شۆڕشەکانی شێخ مەحمودا دوبەش بون: بەشێکیان لایەنی شێخ مەحمودیان گرتوە و، بەشێکیان لایەنی ئینگلیزیان گرتوە لە دژی شێخ مەحمود و تورک بون.

عەباسی مامەند ئاغا، کە لە بەر خۆشەویستی پیان وتوە کاکەعباس، پیاوێکی کوردپەروەر بوە، لە سەردەمی پاشایەتی دا هاوکاری لە گەڵ سەرانی پارتی و حشع کردوە، دوای گەڕانەوەی مەلا مستەفا بۆ عیراق یەکێ لە لایەنگرە نزیکەکانی بو، لە کۆکردنەوەی خێڵەکانی ناوچەکە و، هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلول دا دەورێکی کاریگەری هەبو. جەماعەتی مەکتەبی سیاسی دوای گەڕانەوەیان لە ئێران لە لای ئەم دەس بە سەر دانرا بون و، بە ئاگاداری ئەم هەڵاتن. لە ساڵەکانی دوایی دا ئەوانی لە گەڵ مەلا مستەفا خۆش نەبو. توشی نەخۆشییەکی سەخت بو، هەتا لی ی پرس نەکرد، مەلا مستەفا ڕێگەی نەدا بچی بۆ تەداوی، کە گەیاندیانە نەخۆشخانە لە بەغداد مرد (١٩٦٦). لە پاش خۆی چەند کوڕێکی بە جی هێشت بو: بایز، سوارە، مامەند، هەمزە، کوردە و ئاکۆ.. ئەم برایانە دایکیان و، عەشیرەتەکانی دایکیان جیاواز بو، لە بەر ئەوە لە ناو خۆیان دا کۆک نەبون.

مەلا مستەفا ڕێزی منداڵەکانی عەباس ئاغای نەئەگرت و، ئەوانیش وەکو باوکیان پی نەئەکرا. لە ئاکۆکی مەلایی و جەلالی دا بە لای جەلالی دا داشکان و، بە هۆی ئەمەوە توشی تالانکران و دەربەدەری بون. لە سەرەتای دەس پێ کردنەوەی شۆڕشی حوزەیران دا بایزئاغا بو بە پێشمەرگە و، لە گەڵ ئەو ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ناوچەکە بون بە پێشمەرگە. لە هێرشەکانی سەرەتای ٧٨ دا کە ناوچەکەیان داگیر کرا و، زۆری خێزانەکانیان گیران، زۆریان تەسلیم بونەوە. بایز ئاغایش ڕویشتەوە. پاش چەند ڕۆژی لە ڕوداوێکی ئۆتۆمۆبیل دا مرد.

*

ناوچەکە، یەکێکە لە ناوچە شاخاوییە هەرە عاسییەکانی کوردستانی عیراق. شاخەکانی زێڕنە کێو، مامەروت، دەرمێ، کاروخ، کورەک، هەندرین، کێوەڕەش، ماکوک،

بیرمکە و، لایەکی گوندەکانی دۆلی خانەقا بو کە سەر بە قەزای چومان و، لایەکی گوندەکانی دۆڵ ئاکۆ و دۆلی مەلەکان بو کە سەر بە قەزای رەواندز و، لایەکی گوندەکانی دۆلی شاوور و دۆلە رەقە بو کە سەر بە قەزای رانیە بون.

دوای ئاشبەتاڵ هەندێ جادەی قیر و هەندێکی خاکی تی دا کراوەتەوە، بەلام هەر نەیتوانیوە شوێنەکانی بە تەواوی بە یەکەوە ببەستی. لە لەشکرکێشیەکانی ۷۷ دا جەیش دەستی بە سەر شوێنە گرنگەکان دا گرت بو، «رەبیە» ی تی دا دانا بو. دوای هەلگیرسانی جەنگی عیراق - ئیران زۆری چۆڵ کرد بو. دانیشتوانی ناوچەکە بە گشتی کوردپەروەر و دۆستی شۆرش بون و، یەکێتی نفوزی باش و بەهێزی هەبو لە ناویان دا. گەلی پێشمەرگە و فەرماندەی لە ناو خەلکی ناوچەکەدا هەبو. دۆست و لایەنگریشی زۆر بو.

*

ناوچەکە وەکو مەلبەند کەوتوتە نێوان چەند چیایەکی بەرز و بە یەکەوە بەستراوەوە: کێوەرەش، بیرمکە، کاروخ، ساکۆک و، ناو مەلبەندەکەیش چەند دۆلێکی تی دایە: دۆلە رەقە، دۆلی پلنگان، دۆلی شاوور و، لە ناو ئەم دۆلانەیش دا چەند گوندێکی تی دا بو: سێدیرە، گۆیچکەلان، شەکەلە، ناوەزەنان، گولان، کەرەک، بیردێ، بەردانگە، نۆرە، دیرە..

ناوچەکە شاخاوی و، زەویوزاری کشتوکالیان کەم بو، هەندێ باخی هەنار و میوە، هەندێ دانەویلە و سەوزە و، بەرهەمی سەرەکیپان ئاژەلداری و توتن بو. توتنی ئەم ناوچەیە پی ی ئەلێن: «توتنی شاوور»، وەکو توتنی شوێنەکانی تر ناکری بە چەرداخ دا، بەلکو لە شەبەشی داری ئەدەن و، بۆ وشک بونەوە لە سەر ئەرز دایئەنێن. جۆری توتنەکەیان باش و بۆندارە. بە زۆری لە بازاری قاچاخ دا ئەفرۆشری و، تەسلیمی دائیرەی حکومەتی ناکەن.

*

من لە گولان دامەزرام. گولان: ناوە بو چەند گوند، بۆ چەند شاخ و، بۆ یەکی لە مانگەکانی سالی کوردی و، بۆ ئەو شۆرشە «وەهمی» یەی پارتی دوای ئاشبەتاڵ هەلی گیرساندۆتەوە.

هەوالەکانی بۆم ئەهات وایان ئەگەیاند لەشکرکێشی جود نزیک بوتەوە. نامەم بۆ م س نوسی، رووداوەکەم بۆ گیرانەوە و، هەندێ بانگەوازم نوسی بو کە بە مەجبوری لە رادیۆ بیخوێننەوە داوام لە هێزەکانی ناوچەکە کرد بو کۆ ببنەوە. داوام لە مەلازم عومەر کرد هێزێک بهێنێتە لەلاتوکان و، نامەیەکیشم بۆ سەید کەریم نوسی، کە بە بێ دواکەوتن خۆی و هێزەکەی لە گەلی بو بگەرێنەوە دۆلی شاوور.

*

نیوە لەم کەین و بەینەدا بوین بەیانیی رۆژی ۲۵ ی تشرینی دوەمی ۸۱ هێزی هاوبەشی جود پەلاماری دۆلی خانەقا و وەرتی یان دا. ناوچەکەیان گرت. هێزەکانیان گەیشتنە زێنی ئەستێروکان و، لە لای رۆژهەلاتی سەری ئەحمەدە و، لە لای رۆژئاوای سەری هەلەموتیان گرت و، رەبیەیان تی دا دامەزراند.

نزیکەی ۵۰ پێشمەرگەی یەکێتییان بە تاک و بە کۆمەڵ چەک کرد بو، لەوانە: حاجی ئەحمەدی بۆلی، کە پیاوێکی بە سالاچو و، براگەورەی بولبیەکان بو. چەند سالی لەوەوبەر کورێکی پێشمەرگەی کوژرا بو، ئەمجارەش خۆی و کورەکەی و چەند خزمێکی

بەر چەک کردن کەوت بون. زلەی ئەم پێشمەرگانە بە ژمارەی کەم لە بارەگا بچوک و بڵاوەکانی ناو وەرتی دا بون. بارەگای حشع بەش لە ناو وەرتی دا بو. پێشمەرگەکانی حشع چاوساغی هێزەکانی جودیان کرد بو بۆ سەر بارەگاکانی یەکێتی و، ئەوان داوایان لێ کرد بون لە سەر شەرەفی حیزبی شیوعی چەک دابنێن و تەسلیم بن. مستەفا ناوپەردانی خۆی و کەرتەکەی کە لە ماسەروت گەمەیان خوارد بو، لە نیمە دابڕا بون. ناتومێد بون بە کۆمەڵ تەسلیمی بەعس بونەوە.

بۆ ئەوەی هێزەکانی جود نەتوانن پێشڕەوی زیاتر بکەن، بە هاوکاری کەرتەکانی هەریمی ۷ ی بالەک و ۱٤ ی ئاکۆ هەندی سەرشاخ و جێگای گرنگمان قایم کرد، بە هیوای گەیشتنی هێزەکانی یەکێتی، «کوڕلان» م کرد بە بنکەی فەرماندەیی.

هەندی وشەی جوگرافی

زین: ئەو ڕارەوەی کە بە بە بەرزایی دا بە نێوان دو ڕیزە شاخی بەرزدا تێ ئەپەڕێ، وەکو: زینی ماخویزنان، زینی ئەستێروکان، زینی ڕات، زینی سەران. لە هەندی شوێنی تر بۆتە زینو، زینۆ، وەکو: زینوی شێخ، زینوی خەلان. زین، لە زینی ولاخ وەرگیراوە کە لە چەرم دروست ئەکری و، ئەخرێتە سەر پشتی ولاخ، لە کاتی سواری دا لە سەری دائەنیشتن (لە پەهلەوی و لە فارسی دا: زین).

چەقەڵ: بەرزاییەکی قوتی بەردەلان، وەکو: چەقەڵی ڕێگران، چەقەڵی گزرانان. سەیر ئەوەیە لەم ناوچەیەدا «گزوران» بە واتای ڕێگر بە کار ئەهێنن.

ئەستەروک: بچوککراوەی: ئەستێر، ئەستێڵ، واتە حەوزی ئاو کە بۆ کۆکردنەوەی ئاوی کانیەکی بچوک دروست ئەکری.

گەلی، یان گەلی: ئەو شوێنە تەسک و تەنگەبەرەی کەوتوتە نێوان دو چیای گەورەوە، وەکو: سەرگەلی، زارگەلی، گەلی بەدران، گەلی بیجان، گەلی عەلی بەگ. لە هەندی شوێن بۆتە گەڵو، وەکو: سەرگەڵو، بەرگەڵو. لە هەندی شوێنی تر بە گەرو ماوەتەوە، وەکو: گەروی مەلەبەڵ، گەروی عومەرئاغا، گەروی بیشە، گەروان (گەرووان).

گەلی، گەلو، گەرو: هەرسێک لە یەک ڕیشەن، لە کوردی دا: گەرو، قورگ، ئەوگ (لە پەهلەوی دا: گەروک. لە فارسی دا: گلو).

ناوی هەندی لە شاخەکانی

کاروخ: زەینەفۆن لە «ئاناباسیس» دا کە باسی گەڕانەوەی دەهەزار سەربازی یۆنانی ئەکا بە ناو کوردستان دا ناوی دانیشتوانی ئەوسای کوردستان بە کاردوخ ئەبا. بەڵی ی لە نێوان ئەم دو ناوەدا هیچ پەیوەندییەک نیە.

هەڵەسورت: شوێنی سەخت و عاسی. یەکێکە لە لوتکەکانی کاروخ. ئەو شوێنە عاسیەی حەسەن صەباح کرد بوی بە مەلبەندی خۆی ناوی «ئەلەموت»، کە هەمان مەعنای هەڵەسورتی هەیە و، عەرەب بە هەڵە کردویانە بە «ئەلموت».

کزەک: کەچەڵ، سەری بێ مو.

بۆت (بۆتێ، گزرە بۆت، کانی بۆت): بەچکە، هەروەها بودەڵە، ئەو گلێنەیەی زیر و زیوی تێ دا تویندراوەتەوە.

*

ڕادیوی پارتی ئەم پێشڕەویەی وەکو مژدەی سەرکەوتنێکی گەورە بڵاو کردەوە،

رادیۆی یەکێتی بەش کەوتە بڵاوکردنەوەی بانگەواز و ئاگاداری بۆ هێزەکانی خۆی. هێزەکانی دەشتی هەولێر، خۆشناوەتی، کۆسرەت کە لەگەڵ سەید کەریم چوو بوون بۆ «جەولە» گەیشتنەوە لای من لە گۆلان. لەگەڵ خۆیان دوو کارگەری ئەڵمانیشیان هێنا بوو کە تازە گیرا بوون.

لەو ماوەیەدا چەند جاری کارگەری ئەڵمانی کە لە عێراق کاریان ئەکرد، گیرا بوون. حکومەتی ئەڵمانی کەساڵ ئوردیان هەڵپێچا بوو، ئەویش سەرکردایەتی یەکێتی تەنگاو کرد بوو. مامجەلال لەگەڵیان ڕێک کەوت بوو کە ئیتر ئەڵمانی نەگیرێن. ئەڵمانییەکان زۆر ماندوو بوون، هەندێ قسەم لەگەڵ کردن و، وتم پێشمەرگەکان ئێوەیان بە هەڵە هانیوە لە زمانی یەکتری تێ نەگەیشتوون، بۆ هەرچییەک ئەتانەوێ بڕۆن ئازادن. ناردمن بۆ سەرکەیکان دوای پشوودان نارد بۆیانەوە رانیە.

*

کەوتینە کۆکردنەوەی دەنگوباسی هێزەکانی جوود و، ئۆزینی شوێنەکانیان. هێزێکی بێ سەروبەر و یەک نەگرتوو بوو. وەکو «ماڵی فرە ژن و، ئاشی فرە وەستا و، گوندی فرە کوێخا» ئەوانیش «هێزێکی فرە سەرکردە» بوون: محەممەدی مەلا قادر فەرماندەی هێزی پارتی و، سەید کاکە فەرماندەی هێزی حسک و، ئەبو عائید فەرماندەی هێزی حشع و، کەریم سەلام فەرماندەی مەفرەزەکەی پاسۆک. کەسیان کاغەزی ئەوی تریانی ئەئەخوێندەوە. شوێنە لاوازەکانمان دۆزینەوە. محەممەدی مەلا قادر، کە لێپرسراوی هێزەکەی پارتی و، وەکو سەرگەورەی هەمو هێزەکانی جوود بوو، کابرایەکی کوێرەوشەی چاو کتوکوێر بوو. ئەبە ڕۆژ و نە بەشەو بە باشی بەرپێی خۆی نەئەبینی. لە دوای ئاشبەتالەوە ئەوە یەکەم جار بوو بگەڕێتەوە کوردستان. لە خۆی ڕاتنەندی پێشڕەوی زیاتر بکا بۆ ناو قووڵایی کوردستان. ئەترسا ڕێگای گەڕانەوەی ئێرانی لێ بەستری. هەمیشان لە وەرتێ دایان کوتا.

*

ئەخشەی دەرکردنی جوودمان دانا. هەوا ساردی کرد بوو. هێزەکانی جوود بە شەو هەندێ جێگای گرنگیان چۆڵ ئەکرد و، بەیانیان زوو ئەیانگرتەوە، لەو شوێنە گرنگانە: هەڵمەوت لە چیای کاروخ و سەری ئەحمەدە لە چیای بێرمکە لەم بەر و ئەوبەری زێی ئەستێروکان.

هێزێک لەگەڵ حەسەن کوێستانی و رەحمان سەیدە لە سا و سێوەکەوە بە کاروخ دا هەڵبگەڕێن و شوور ببنەوە بۆ ناو وەرتێ و کەلیتە.

هێزێک لەگەڵ شەماڵ و ئەحمەد مەولود هەڵمەوت بگرن و دابەزن بۆ مەکێ.

هێزێک لەگەڵ سەید کەریم و عەلی ئەبی پەلاماری زێی ئەستێرۆکان بدەن.

هێزێکی هەرێمی ١٤ ی ئاکۆ سەری ئەحمەدە بگرن.

ملازم عومەریش کە لە قەلاتۆکان بوو شەر بە هێزەکانی پشتەوەیان بفرۆشێ.

سەرەتای مانگی کانونی یەکەم دەستمان کرد بە جێبەجێ کردنی.

حەسەن و هێزەکەی لە کاروخ دابەزین بەرەو وەرتێ. حاجی برای حەسەن کوێستانی لە پشتی وەرتێ کوژرا.

حاجی یەکێ بوو لە پێشمەرگە کۆنەکانی یەکێتی لە ناوچەی گەڵالە. گەنجێکی تازە پێگەیشتوی زیرەک و وریا بوو. لە پێشمەرگایەتیەوە پێگەیشت بوو تا بووبوو بە فەرماندەی

کەرتی گەلالە لە هەریمی ٧ ی پالەک.
لەو قـزڵەوە تەنگیـان بە هیزەکانی جەود هەڵچنی بو. سـەعید کاکەی فەرماندەی ئەو قوڵە، کە زانی بوی ئێستان بۆ هاتوە و، مەترسیـان کەوتوتە سەر، بە پێشمەرگەکانی وت بو: «بکشێنەوە!» یەکێکیان وت بوی: «ئەگەر ئێرە چۆڵ بکەین ناوچەکەمان لێ ئەگرن.» وت بوی: «جا با بیگرن ئێرە چی لێ یە؟ نە بیرە نەفتی لێ یە و، نە مارەیی دایکم لە سەر داناوە، لەم شاخە تا لە شاخێکی ترا» قسەکەیشی راست بو، ئەمە یەکێ بو لە سەرەتا بنەرەتییەکانی جەنگی پارتیزانی کە بە سەلیقە فێری ببو.
عەلی نەبی گەیشتە زینی ئەستێروکان. تەنیا رێگا لە رانیەوە بە دۆڵی پڵنگان دا بە زینی ئەستێروکان دا ئەچو بۆ سەرگەڵو. یەکێ لەو فەرماندانەی گەیشت بوە سەر زینی ئەستێروکان وەکو مژدەی گەیشتنیـان بە هۆرکی تورکی بە منی وت: «دەبابەکە گەیشتە سەر زینی ئەستێروکان» رادیوی پارتی بە درێژ ئەوەندەی باسی هاوکاری یەکێتی و بەعس کرد بو، شیوعیەکان بە هۆرکی تورکی کە گوێیان لە وە ببو، دەبابە گەیشتە زینی ئەستێروکان، باوەڕیان کرد بو، ئەوەندەی تر ورەیان بەردا بو. یەکێکیـان هاواری لێ هەستـا بە هۆرکی تورکی وتی: «شەرم ناکەن دەبابەتان هێناوە!» برادەرەکەی ئیمە لە «دەبابە» مەبەستی عەلی نەبی بو، کە پیاوێکی کەتەی چوارشانە، بەڵام لە سەرکەوتنی شاخ دا زۆر گورج و گۆڵ و، لە هەڵمەت دا ئازا و چاونەترس بو. دوای شەڕێکی کەم جەود شکان. هێزەکانی جەود کشانەوە ناو وەرتی. دەوری وەرتی مان دا.
ئێوارەی ٢ ی کانونی یەکەمی ٨١ بو، ئەمانویست بۆ بەسەربردنی شەو بچینە وەرتی. بە هۆرکی تورکی ویستمان قسە لە گەڵ لێپرسراوێکی حشع بکەین. شەمال چەند جاری بانگی کردن، یەکێکیان وەڵامی دایەوە. پێیان وتن: «رێگای سۆزلەتمان بە چۆڵی بۆ بە جێ هێشتون، هەموتان ئەتوانن لەوێوە برۆن و وەرتی بە جێ بهێڵن.» لە پێش دا وایان ئەزانی فێڵیان لێ ئەکەین، دوایی کە زانییـان بە راستمانە هەمو هێزەکانی جەود لە رێگای سۆزلەتەوە کشانەوە دۆڵی خانەقا و، بەرەو پشتاشان بە رێ کەوتن. ئێمەش دابەزین هەندێکمان بۆ ناو وەرتی و هەندێکمان بۆ دۆڵی خانەقا.
نۆتیلی سیاحی
شیوعیەکان بە دەزگای بێتەل مەکتەبی ئیقلیمیان لە ناوزەنگ ئاگادار کرد بو، کە وەزعیـان خراپە و، داوایان لێ کرد بون: هەوڵی راگرتنی شەر بدەن لە گەڵ یەکێتی. مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی و مامجەلال، پێکەوە بانگەوازێکی هاوبەشیـان دەرکرد و، داوایان لە هێـزەکـانی هەردولا کـرد بو دەسـبەجێ شـەر رابگرن و، هەر لایە لە شـوێـنی خـۆی دا هەڵوێسـتی دیفـاعی وەربگری. هەمـان ئێـوارە چەند جـاری لە رادیوی یەکێـتی دا خوێندرایەوە. لە کاتی بیستنی ئەم بانگەوازەدا، شەر بە فازانجی ئیمە بە لادا کەوت بو، بەڵام من هێشتا لە کوێستانی مەکۆ بوم لە پشتی وەرتی. دنیا بەفر و هەوا زۆر سارد بو. حەمە سەعید کە گوێ ی لە بانگەوازەکە بو، وتی: «ئەم کابرایە - مەبەستی مامجەلال بو - زۆر سەیرە وا ئەزانی لە نۆتیلی سیاحی دانیشتوین هەر کەس لە ژورەکەی خۆی نەبەتە دەرەوە! ئیمە خەریکە رەق ئەبینەوە»
مەکۆ، کوێسـتانێکی تەخت و بەرین و بەر کـراوەیە کەوتۆتە بناری کـاروخ و رووبەرووی قەندیلە. دەبان کانی سارد و سازگاری لێ هەڵئەقوڵێ و، سەدان دارگوێزی گەورەی

لی بو. شوێنێکی خۆش و دڵرفێنە. بۆ گوندی توریستی لە بارە.

*

ئەمجارەش سەید کاکە لە پێش ئەوانی کەدا هەڵات بو. بە ڕێگاوە بووبو بەرەو پشتئاشان، هەندی کاروانچی پێی گەیشت بو. کاروانچییەکان سەید کاکەیان بە شپرزەیی دی بو لێیان پرسی بو: «خاڵە سەید چی قەوماوە؟» وت بوی: «چوزانم مامجەلال وا ئەزانی حوکمی زاڵی لە گیرفانی من دایە، هەرچی منال و تاڵی سلێمانی هەیە ناردویەتیە سەرم!»

*

دەوروپشتی خۆمان قایم کرد. هێزێکمان نارد بۆ زارگەلی و هێزێک بۆ دۆڵی خانەقا و، هێزێک بۆ سەران. «قلوەتی مەرگە» مان نارد بچی بۆ سەران کە گەیشت بونە ئەوێ بیست بویان هێزێکی جود گەیشتۆتە گەڕەوان. هێزەکەی یەکێتی زێڕوی عەبدوڵلا زێڕوی و، هێزەکەی جود عەریف عەلی فەرماندەیان بو. عەریف عەلی کە بیست بوی هێزێکی یەکێتی گەیشتۆتە سەران دەستبەجی کشا بووەوە وای زانی بو ئەچی بۆ سەر ئەو. زێڕوش کە زانی بوی هێزێکی جود گەیشتوتە گەڕەوان دەستبەجی کشا بووەوە وای زانی بو ئەچی بۆ سەر ئەو. هەردوکیان وەکو ئەڵێن: «دزاودز کەوت بون» لە ترسی هێرشی یەکتری کشا بونەوە بۆ دواوە.

ماوەیەک لە وەرتی ماینەوە. ڕاگرتنی شەر هیچ جۆرە ڕێککەوتنێکی سیاسی بە دودا نەهات. بار و دۆخی ژیانی هێزەکانی جود لە پشتئاشان و دەوروبەری زۆر ناخۆش بو. پشتئاشان هیچ ئاوەدانییەکی تێ دا نەبو تیا بحەوێنەوە. هێزەکانی پارتی نەیانئەتوانی لە قەندیلەوە بگەڕێنەوە بۆ ئێران. شیوعییەکان، نەیانتوانیبو هێزەکانی پارتی لە کوڵ خۆیان بکەنەوە، بۆ ئەوەی خۆیان ئازادی گەڕانەوەیان هەبی بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی. بەفر ڕێگاکانی قەندیلی بەست بو. داوایان لێ کردین ڕێگا لە کشانەوەیان نەگرین. ڕێگامان دان. هێزەکانی پارتی لە کەلەکی باڵەییانەوە بەرەو ڕۆژئاوای ڕێگای هامیلتۆن و، لەوێوە چونەوە بۆ ئێران. بە ڕوێشتنی ئەوان گرێیەکی کێشەکە کرایەوە. هێزەکانی حشع، حسک، پاسوک نەیانتوانی بە ئازادی بە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی دا هاتوچۆ بکەن.

شەری ئیستلیەمگیری ئەمجارەی جود - یەکێتی برایەوە، بەڵام هۆکانی هەڵگیرسانەوەی هەر ما بون.

*

لە گەڵ هێزەکەی قەلاتوکان یەکمان گرتەوە. مەلازم عومەر و هاوڕێکانی هاتن بۆ لامان لە وەرتی.

ئەبو عابدی لێپرسراوی حشع داوای کرد بو بۆ ڕێکخستنی هەندی کاروبار یەکتری ببینین. لە سەر جادەی خانەقا لە گەڵ ئەبو عابد یەکتریمان بینی. هەندی قسە و باسمان کرد دەربارەی شەرەکان. وتی: «وەرتی، وەرطە بو!» یەکی لە کارەکانی ئەوە بو ئەیویست هەندی لە هێزەکانیان بە ناو هێزەکانی یەکێتی دا بە سەلامەتی بنێری بۆ ڕوستی. هێزەکەیان بە ڕێ کرد و، ئێمەش چی پێویست بو لە نامە و ڕاسپاردە بۆمان ئامادە کردن.

وەرتێ

گەورەترین گوندی ناوچەکە وەرتی بو. بە هۆی تەنگیی دۆڵەکە و، قوڵی ڕوبارەکەوە گوندێکی درێژ بو، چەند گەڕەک: سۆڵەتە، بەرۆژ، سوڵ و، پێنج بەرمباب و، پێنج مزگەوتی

تی دا بو.

پیاوەکانی وەرتی فۆرمی کوردی رەسەن بوون. هەمیشە پۆزەوانەیان هەڵکێشا بوو، خەنجەرەکیان بە قەدەوە و، تفەنگەکیان بە شانەوە بوو. تەنانەت کە ئەچوون بۆ مزگەوتیش بەو جۆرە ئەچوون. یەکێ لە پێشمەرگەکان ئەیوت: «ئەمانە لە کوردی ئەتڵەسی ئەچن» مەبەستی لە نیگاری ئەو کوردە بوو کە لە سەر پشتی ئەتڵەسی عیراق کرا بوو.

یەکێتی لە ناو وەرتییەکان دا پێکهێنەکی جەماوەریی فراوانتری هەبوو لە چاو حیزبەکانی کەدا. زیاتر لە سەد کەسیان پێشمەرگە بوون. ئەندام و پێشمەرگەی حیزبەکانی تریشی تی دا بوو. هۆی ئەم دابەشبوونە سیاسییە لەم شوێنە شاخاوییە دابڕاوەدا بیروباوەڕی سیاسی نەبوو، بەڵکوو ناکۆکی شەخسی و ململانێ ی نێوان بنەماڵەکانی بوو. لەوەدا ڕەنگی دابووەوە.

### تەگبیرەکەی مام مزرتک

مام مزرتک لە لای وەرتییەکان کەسایەتییەکی زیرەک و زانا و، زۆر بەڕێز بوو. بە تەگبیر و رای ژیرانە ناوی دەرکردوە. زۆر نوکتە و قسە و تەگبیر لە زمانی ئەوەوە ئەگێڕنەوە. شانازیی ئەکەن کە پیاوێکی وایان تی دا هەڵکەوتوە. یەکێ لەو قسانەی ئەیگێڕنەوە ئەم تەگبیرە بوو:

«میری سۆران چەند کەسی ئەکاتە سەر دانیشتوانی وەرتی بۆ مەڕەوانە و باجی تری لەو بابەتە. پارەکەی دارای ئەکەن زۆر ئەبێ. خەریک ئەبێ مان بگرن لە دانی. پرس بە مام مزرتک ئەکەن کە چی بکەن. مام مزرتک ئەڵێ: «ئەگەر مان بگرن نێردراوەکانی میر بە شکاتەوە ئەڕۆنەوە، میر هێزێکی گەورە ئەنێرێتە سەرتان باجەکەتان لە سەر زیاد ئەکا و بە زۆریش لێتان ئەسێنێ و ئازاریشتان ئەدا. چاک وایە باجەکە کۆ بکەنەوە و بیاندەنێ و میوانداریەکی شاهانەشیان بۆ بکەن، بەڵام لە ڕێشتن دا چەند کەسی بنێرنە سەر ڕێگایان، ڕووتیان بکەنەوە و باجەکەیان لێ بسێننەوە و هەموویان بکوژن یەکێکیان نەبێ، ئەویش بە سەر و دەستی شکاوەوە ئیزن بدەن بڕوات هەواڵەکە بباتەوە بۆ میر». بەڵێ: وەرتییەکان زۆریان ڕێز لێ گرتین، میوانداریی چاکیان کردین، باجەکەیشیان کۆ کردەوە و دایانێنێ. بەڵام لە ڕێگای گەڕانەوەدا جەردە هاتە سەریان ڕووتیان کردنەوە و ئەوانیان کوشت و منیشیان ئاوا لێ کردا»

*

لەم شەڕانەدا (هاوین و پاییزی ٨١) وەرتی و، دانیشتوانی ئازاری زۆریان دی بوو. چەند کەسی لە گەلیە ئازاکانیان کوژرا بوو. چەند کەسێکیان لێ گیرا بوو. ئەرکێکی زۆریشمان بە سەریانەوە بوو. ویستم دڵیان بدەمەوە. بەر لە گەڕانەوەم ئێوارەیەک هەموو پیاو ماقووڵەکانیانم بانگهێشت بۆ نانخواردن، بۆ ئەوەی هەندێ قسەیان بۆ بکەم، ئینجا خوا حافیزییان لێ بکەم.

لە هۆڵی مزگەوت کۆ بووینەوە. هەندێ قسەی گشتیم بۆ کردن. لە ناو بانگکراوەکان دا تییان دا بوو سەر بە لایەنەکانی تر بوون. ئەمویست هەستی کەسیان بریندار بکەم. بە داخەوە باسی شەڕی ناوخۆم کرد و سپاسی هەموویانم کرد کە پیمانەوە ماندوو بوون. ئینجا کەوتینە قسە و باسی ئاسایی. گفتوگۆ لە گەڵ خەڵکی وەرتی زۆر خۆش بوو. یەکێکیان لێ ی پرسیم: «چەند منداڵت هەیە؟»

زۆر جار ئەم پرسیارەیان لێ کردبووم. لە ناو ئەو کۆمەڵانەدا بە گەنجی ژنیان ئەهێنا و، ئەگەر یەکێ لە تەمەنی من دا بوایە و هێشتا سەڵت بوایە پێیان سەیر بوو. ئەبوو ناتەواوییەکی هەبوایە، ئەگینا چۆن ئەبێ ژن و منداڵی نەبێ؟

وتم: «هیچ!»

بە سەر سوڕمانێکەوە وتی: «بۆچی هیچ منالت نیە»

وتم: «چونکە ژنم نەهێناوە»

وتی: «بۆچی ژنت نەهێناوە!»

وتم: «کەسم پێ رازی نەبوو»

وتی: «چۆن کەست پێ رازی نەبوو!»

وتم: «ئەوەی من پێ ی رازی ئەبم ئەو بە من رازی نابێ و، ئەوەیش کە بە من رازی ئەبێ، من پێ ی رازی نابم.»

کابرا هەر لە سەری ڕۆیشت. نەیویست موجامەلەی من بکا و منیش نەمویستم ئەم باسە کوتایی پێ بهێنم وتم: «مام کوێخا کچت هەیە!»

وتی: «بەڵێ»

وتم: «باشە، کچەکەی خۆتم بدەرێ!»

وتی: «ئەو سەگە بە کەڵکی تۆ نایەت، بۆت ئەدەم بە خوێن»

وتم: «بۆچی بۆم ئەدەی بە خوێن، من بە خۆی رازیم»

وتی: «کچەکەی من مانگادۆشێن ئەزانێ. تۆ پیاوێکی خوێندەواری ئەبێ ژنێکی خوێندەوار بهێنی!»

وتم: «ئەوەتا تۆیش پێم رازی نابی!»

زۆر جار ئەم پرسیارەیان لێ ئەکردم، نەمئەزانی چۆنیان وەڵام بدەمەوە. بۆ ئەوەی لەم «محاکمە»یە ئەجاتم بێ، لە بەهاری داهاتوودا ژنم هێنا.

*

لە گەڵ مولازم عومەر و عەبدولڕەحیم و ساسان .. بەرێ کەوتین بەرەو قەرناغی داهاتوومان لە قەڵاتوکان. شەومان بە قسە و باس لە گەڵ کوێخاکانی مەنگوڕ بە سەر برد. بەیانی بەرێ کەوتین، ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینەوە ناو زەنگ. برادەران بە بۆنەی سەری ساڵەوە لە «هۆڵی شەهید شەهاب» ئاهەنگێکیان رێک خستبوو.

*

# سالی ١٩٨٢

### شێرکۆ و چلورەفرۆشەکان

بنکەکەمان تاقمێکی تێکەڵی سەیری شاری و لادێیی، گەنج و کامڵی خوێندەوار و نەخوێندەوار بوو. جگە لەوانەی کە بە دایمی لەوێ بوون، زۆرجار پێشمەرگەی خەڵکی سلێمانی ئەهاتن، چەند مانگ یان چەند حەفتە ئەمانەوە، تا چاریان ئەکرایەوە، ئینجا ئەچوون بۆ یەکێ لە تیپەکان.

دوو لە پێشمەرگەکان: مامە قالە و مام شێرکۆ. هەردووکیان لە ئەرکی رۆژانەی بارەگاکە، وەکو چێشت لێنان، قاپ شتن، نان هێنان، بازار کردن، ئێشکگرتنی شەوانە.. بەخشرا بوون. مامە قالە و مام شێرکۆ نموونەی دوو کەسایەتی جیاواز و خۆش بوون.

شێرکۆ، ناوی مام قادر و خەڵکی گوندی بێمووش و ماڵی لە ژاراوە بوو. ژن و منالی نەبوو. لە شۆڕشی ئەیلوول دا لە لقی مامەرزاییەکان پێشمەرگە بوو. دوای ١١ ی ئازار ببوو بە «حەرەس حدود». لە ئاشبەتاڵ دا گەڕابوەوە کوردستان و، لە گەڵ عەلی عەسکەری هات بوە دەرەوە و، هەر لە گەڵ ئەو بوو. کاک عەلی کە بە ڕێ کەوت بەرەو برادۆست ٤ کەسی لە پێشمەرگەکانی: مام قادری بێمووشی، مام سالحی مالومەیی، مام ئەحمەدی سیکانیانی، خالە حەمە.. لە بەر پیری لای ئێمە بە جێ هێشت. هەر چواریان «حەمقە» و «مامە رەزایی» بوون، زۆر بە دڵسۆزی دوای کاک عەلی کەوت بوون. بە درێژایی ماوەی قەندیل لە گەڵ ئێمە مابوونەوە و، هەر چواریان پێکەوە بوون. پێشمەرگەکانی تر بۆ خۆشی ناویان لێ نابوون: «العصابە الاربعە». دوای ئەوتانی کاک عەلی ئیتر شتێک نەما بوو پێکەوەیان کۆ بکاتەوە. خالە حەمە و مام ئەحمەد تەسلیم بوونەوە. مام سالح چوە لای مامجەلال و مام قادر هاتە لای من. پێشمەرگەکانی لای من هەمو شاری و گەنج بوون، ئەمیش بە هاندانی پێشمەرگەکان ناوی خۆی گۆڕی بە شێرکۆ و، بۆ نازداریش جاروبار پێیان ئەوت: «شێرۆ».

شێرکۆ هەتا بڵێی ی پاک و خاوێن و، ڕیشی تاشراو و سمێلێکی قنجی هەبوو. سەر و سمێلی بۆیە ئەکردەوە بەڵام نەیئەهێشت کەس پێ ی بزانێ، دەمیشی تاقمی تێ دا بوو، بەڵام کەس نەی دی بوو. کە خورما و رۆنیان دروست ئەکرد، شێرکۆ نەیئەخوارد ئەیوت: «دانم دێشێنێ» هەمیشە خۆی بەست بوو و تفەنگەکەی بە شانەوە بوو. حەزی لە میوانداری و هاتوچۆی ماڵەکانی شێنی ئەکرد. لە گەڵ مامە قالە ناکۆک و، زۆر جار شارییەکان تورەیان ئەکرد. کە سێخورمەی تێوە بنرایە یا کتوپڕ تەقەیان لە شتێ هەڵسانایە، راتچڵەکی و یەکسەر جنێوێکی ئەدا. زۆری حەلەکان وا بوون.

کە تورەیان ئەکرد، زۆر جار قسەیەکی بە من ئەوت و، ئەیوت: «بە ئەمایە بە چلورەفرۆشەکانی سلێمانی کوردستانم بۆ رزگار بکا!» لای وابوو گەنجەکانی سلێمانی هەمو چلورە فرۆش بوون و، چلورە فرۆشتنیش کارێکی ناشیرینە.

مامە قالەیش، خەڵکی سەنگەسەر بوو. لە دارپڕین و دار شکاندن دا زۆر شارەزا و بەکار بوو، داری هەمو زستانەکەی بارەگاکەی ئێمە ئەم ئەیبڕی و ئەیشکاند. هەرچی ئاژەڵ و

ولاخەکیشمان هەموایە ئەم خەسی جێگا و لەوەڕی ئەخواردن. هاوینانیش بیستانی تەماتە و سەوزەی بۆ ئەکردین. بەشێکی گرنگی پێویستیەکانی بنکەکەمان ئەم دابین ئەکرد. شێرکۆ خۆی لەم کارانە ئەئەگەیاند، لە بەر ئەوە مامە قالە زۆر جار تانەی لێ ئەدا و ئەچوو بە گژی دا.

## مەسئولی تەور

بەیانییەکیان شازاد لە بەزمێکی سەیر خەبەری بووبوەوە. ئەژدەر، لە سلێمانی زەڕەنگەر بووبوو، ماوەیەک بوو لە بارەگەکەی ئێمە میوان بوو. ئەژدەر، بێ پرسی مامە قالە، ناشیانە دەسکاری تەورێکی کرد بوو، دەمەکەی کوڵ کرد بوو، ئەویش بە توندی پیا هەڵشاخا بوو. ئەژدەریش پێ ی وت بوو: «بۆ توورە ئەبی خۆ تۆ مەسئول نیت؟» مامە قالە زیاتر هەڵچوو بوو، تیرو پڕ جنێوی بە ئەژدەر دابوو وت بووی: «چۆن مەسئول نیم من مەسئولی تەورم!»

شازاد ئەیوت دیارە وشەی مەسئول ئەوەندە خۆشە تەنانەت ئەگەر هی تەوریش بێ هەر خۆشە و گرنگە.

*

## دەوەن بە ئاش

هەندێ لەو پێشمەرگانەی بۆ ئیشوکار ئەهاتن بۆ سەرکردایەتی زۆر جار میوانی من ئەبوون. جارێکیان غەفوور دەرویشی و ئەبی چالاک میوانم بوون. هەردووکیان ئەندامی کۆمەڵە و، فەرماندەی کەرت بوون. ئەویان خەڵکی هەورامان و ئەمیان خەڵکی باڵەکایەتی بوو. هەر لەو کۆڕەدا: خەجێ، ڕیبەری «تالای ڕزگاری» و، یا حەلیم، ژنێکی باڵەکایەتی، میوانم بوون.

غەفوور شارەزای بنێشت کردن بوو، هەموو ساڵی خۆی و پێشمەرگەکانی کەرتەکەی لە لیرەوارەکانی هەورامان بنێشتیان ئەکرد. زۆرجار خەرجی چەند مانگێکی خۆیان و خێزانەکانیان دەرئەهێنا. هەندێ پرسیارم لێ کرد لە سەر جۆری بنێشت کردن و، کەرەستەکانی و، بەرهەمی ئەوساڵەیان.

ئینجا لە ئەبی م پرسی: «ئەمساڵ لە هیچ لایەک چوون بۆ کەوشان؟» غەفوور پیاوێکی قسەخۆش و زیرەک، بەڵام لە ڕەوشت و خوی کۆمەڵایەتی دا «محافظ» بوو. پرسی: «کەوشان چیە؟» ئەبی وتی: «لە بەهاران دا کە گوڵ ئەگەشێتەوە و، کوارگ و ڕیواس و کنگر و... پەیدا ئەبێ، گەنجەکان: کوڕ و کچی گوند یا چەند گوندێ، بەیانییان کۆ ئەبنەوە، ئەیکەن بە شایی و ڕەشبەڵەک. دوای ئەوە، بە کۆمەڵ و بە جووت، بۆ کۆ کردنەوەی گژ و گیا، بە دەشت و چیادا بڵاو ئەبنەوە. عەسر بە چارۆکەی پڕ لە گیا و کوارگ و گوڵی بۆنخۆش و جوانەوە لە چیا دائەبەزن. دیسان کۆ ئەبنەوە شاییەکی ڕەشبەڵەک ئەکەن و، بڵاوەی لێ ئەکەن هەر کەس بۆماڵی خۆی.»

ئەم سەیرانە بەهارییە نەریتێکی باو و دێرینەی ناوچەی باڵەکایەتیە. گۆرانیەکی بە ناوبانگی حەسەن زیرەک لە سەر «کەوشان» ، کە ئەڵێ:

کیژان دەچنە میرگوڵان،
بە عام دەچێن هەڵاڵان
عارەق لە هەنیەی دەتکێ، تەڕ دەکا وردە خاڵان

کیژان دەچنە میرگولان،
بە عام دەچن بەنەوشان
عارەقی سنگ و مەمکی، تەر دەکا پاژنەی کەوشان

ئەمی زۆر بە گەرمی و خۆشیەوە باسی ئەکرد. غەفور تورە بو، وتی: «چۆن ریگە ئەدەن خوشک و دایکتان شتی وەها بکەن..؟» ئەمی چوەوە بە گژی دا، وتی: «خوشک و دایکی تۆیش لەوی بونایە ئەچونا» خەریک بو دەمیان لە یەک بگیری. مشتومرەکەیان چیرۆکی «دەچوین بە ئاش» ی بیر هێنامەوە.

ئەگیرنەوە: دو ریبوار لە ریگا بە یەک ئەگەن. یەکێکیان لە ئاش ئەهاتەوە و دوەمیان ئەچو بۆ ئاش. هەردوکیان باراشیان پی بو. دوەم لە یەکەم ئەپرسی: « ئاشەکە چۆل بو یا قەلەبالغ بو؟»

یەکەم ئەلی: «زۆر قەرەبالغە، ئەبی سەرە بگری، رەنگە بە ۳ رۆژی تر سەرەت نەگاتێ»

دوەم ئەلی: «دەمسا من لەوی بومایە سەرەم ئەئەگرت و، لە پیش هەموتانەوە باراشەکەم ئەهاری»

یەکەم ئەلی: «نەتئەتوانی!»

دوەم ئەلی: «ئەمتوانی!»

را ریک ناکەون، دەوەنیک کە لە سەر ریگاکەیان دا ئەبی بکەن بە ئاش و، بزانن کامیان ئەتوانێ تۆزەیێ بکا و باراشەکەی لە پیش ئەوی کەدا لی بکا. لە ئەنجامی ئەم مشتومرەدا باراشەکانیان ئەرێژن بە سەر دەوەنەکەدا و یەکتریش ئەدەنە بەر خەنجەر.

هەمو ناوچەی پالەکایەتی راگوێزرا بو، جەمش لوتکەی شاخەکانی بە «ڕەبیە» ئەنی بو، کێ ئەیەتوانی بچی بۆ «کەوشان»؟ کەچی ئەمان خەریک بون لەم ژورەدا هەمان بەزمی «دەچوین بە ئاش» دوبارە بکەنەوە. بە ناچاری هەردوکیانم بیدەنگ کرد و، باسیکی ترم لە گەڵ دامەزراندن.

غەفور لە سەر «وردی مرۆڤ» قسەیەکی ئەستەقی هەبو: «ئەبوت ئەگەر کیوی شنرۆی بروخی بە زەلام ئەگیریتەوە، بەلام ئەگەر زەلام بروخی بە هیچ شتی ناگیریتەوە!»

*

میتەرولوجی

شەنی پیەکان لایان وابو: هەر هاوینی زەردەزیرە زۆر بی، ئەوساڵە زستانەکەی سەخت ئەبی. ساڵی ۱۹۸۱ هاوینەکەی زەردەزیرە زۆر و، زستانەکەی سەخت بو. بەفریکی زۆر باری. سەیر ئەوەبو لە گەڵ کریوەی بەفردا هەورە تریشقە و هەورە گرمەی زۆری لە گەڵ بو. ئەم دیاردە سروشتیەم هەر لەوی دی بو. ئەو زستانە کەوتمە کۆکردنەوەی هەندێ لەو وشانەی پەیوەندییان بە دۆخی ئاسمان و گۆرانی کەش و هەواوە هەبو. وشەکان هەموییان ئاشنا و ناسراون، بەلام کۆکردنەوە و لە یەک دانیان وەکو ریزە زاراوەیکی میتەرولوجی رەنگە بی کەلک نەبی، بە تایبەتی کورد هیشتا هیچ دەزگایەکی تایبەتی بۆ لیکۆلینەوەی لەم بابەتەی نیە.

*

هەوا کە سارد ئەکا، تا ئەندازەی ژیر سفر، ئەرز و ئاو ئەیبەستی(: رجیان،

جەمەدین). تریژی سەرووی ئاوی گزم و زەلکاو ئەبی بە سەھۆڵ (:بەستەڵەک، شەختە، جەمەد، یوزا) و، ئاوی سەر ئەرز ئەبی بە زوقم(: خوسار، سیخوار) و، چۆڕاوگە ئەبی بە چلوورە.

هەوا کە گەرم ئەبی، هەڵم لە ئاو، هاڵاو (:بۆق) لە ناو کشتوکاڵ و، گڕە و سەموون لە دەشت هەڵئەکا.

ئەگەر هەور ئاسمانی گرت، هەورەکە گەواڵ گەواڵ (:پەڵە پەڵە) ئەوەستی. یا هەمووی داتەگری. هەور تیرە و تاریک، چڵکن، سپی ئەبی.

ئەگەر هەور لە ئاسمان رەوییەوە (:هەڵی بڕەنگاند)، بە رۆژ شینایی ئاسمان و، بە شەو ئەستێرەکانی دەرکەوتن، بە رۆژ ساماڵ یا هەساو و، بە شەو سایەقە ئەبی. شەوی سایەقە لە زستان دا سارد ئەبی ئەرز و ئاو ئەبەستی.

ئەگەر هەور لە ئاسمان دا بەستی لە شێوەی باران، بەفر، تەرزەدا ئەباری.

باران نم نم، یا بە تاو، یا بە خوڕ، یا بە خوڕم ئەباری. بارانی بە خوڕ، رەهێڵە، لێزمە، لەنگێژە ئەکا. زۆرجار برووسکە (:هەورە تریشقە، چەخماخە) و، هەورە گرمەی لە گەڵ ئەبی.

کە باران بباری و، لە هەمان کات دا هەتاو بی، کوڕگەزێ بە و، یە ساوەیەک بە خوڕ بباری و خۆش بکاتەوە تاوە، کە سەرانسەری ولات بگرێتەوە ئیقلیمگیرە، کە لە گەڵ بەفر بباری شلێوەیە.

لە سەرەتای پایزدا پەڵە ئەدا. پەڵە بارانێکی نەرمە چەند شەو و رۆژ لە سەر یەک خۆش ناکاتەوە تا ئەرز تێرئاو ئەبی، ئاوی لە سەر رائەوەستی.

دوای بارانی پەڵە چەن رۆژی هاوینە پچکۆلەیە، هەوا خۆش و دنیا گەرم ئەبی.

بەفر (:بەرف، بەور) ئەگەر زۆر بباری کرێوە و، ئەگەر کەم بباری پرۆشە ئەکا. بستێک، قولاچێک، ئەژنۆیەک یا گەزێک و زیاتری تی ئەکا. لە شوێنێکی بەرزەوە کە با بەفر ئەبا بۆ شوێنێکی قولتر و پڕی ئەکاتەوە باپێزوە. لە لێژایی چیا بەرزەکانەوە هەرەس (:رنو) دی. لە کوتایی بەهار دا بەفر ئەچێتەوە، کوێستان خاڵ خاڵ ئەبی.

بەفرەلوکە، بەفرێکی خاوە کلوەکانی بە تەواوی نەبەستوە زو ئەتوێتەوە.

بەفرخوزرکە، بەفرێکی نەرم و وردە لە کۆتایی بەهاردا بە سەر بەفری زستان دا ئەباری و، ئەیتوێنێتەوە.

تەرزە (: تەزرە، کلێرە، تەگەرەگ، تەورگ) بە دەنکی رەقی گەورە یا پچووک ئەباری. گەلا و گوڵ ئەکوتی.

تەرزەلوکە، نەوەکو تەرزە رەقە و نەوەکو بەفر نەرمە زو ئەتوێتەوە.

بارانی زۆر ئەتوانی لافاو (:سێلاو، لێشت، لێشاو، لەهی)ی لی هەڵبستی.

لە کۆتایی زستان دا ئەرز تێر ئەبێتەوە، کە باران ئەباری نایێ بە لوڕ و لێتە.

لە کۆتایی بەهار و لە هاوین دا شەو دلۆپی ئاو لە سەر گژوگیا و گەلا شەونم (:ئاونگ، خوناو) دروست ئەکا.

لە ناوەراستی تەموزدا تاوێک باران ئەباری بۆنێکی خۆش لە ئەرز هەڵئەستێ.

بە درێژایی ساڵ و، لە هەموو وەرز و لە هەموو رۆژێک دا با ئەتوانی بوەزێ (:هەڵ بکا)، بای وەشت بارانی بە دوادا ئەباری، بای دارناوس لە کۆتایی زستان دا هەڵئەکا و دار

و درەخت گـژیکە و چرۆ ئەکـا. بای خـەزان کـۆتایی پایز هەڵئـەکـا گـەڵای زەردی درەخت هەڵئەوەرێنی.

بای شـەمـاڵ لە لای سـەرووەوە ئەوزێ و، فـێنک و نەرمـە، بارەش یا رەشـەبا لە لای خوارووەوە هەڵئەکات توندە، لە هاوین دا گـەرمە دوای نیـوەڕۆیان ئەبێ بە گڕە و شـەرا و، لە زستان دا سـاردە ئەبێ بە گزە، کە لە گەڵ بەفر و باران بێ، یا لە گەڵ یەکیکیان بە پێ ی توندی و نەرمی ئەبێ بە زریان، زەلان، وەیشومە، قەرتەنە، باسـریشـک، تۆفان.

هەندێ رۆژی زستان هەور دائەبەزێ، سەر ئەرز ئەبێ بە تەم (:تەموومژ، تەمتومان).

هەندێ رۆژی هاوین هەور تەپوتۆزی بیابان ئەهێنێ، ئەیهێتە خۆڵ بارین.

تێکچوونی دۆخی هەوا، ناوچەی گوشـاری بەرز و نزم دروسـت ئەکـا، گـێـژەڵوکـە لە ئاسـمـانەوە بەرەو زەمـیـن و گـەردەلول لە زەمـیـنەوە بەرەو ئاسـمـان (:گـەرەپیچ، باهۆز، بابەلیـسـک) ی لێ پەیدا ئەبێ.

*

کورد ناوی مانگەکانی ساڵی بە گوێرەی کەشی ئەو مانگە ناو ناوە: خاکە لێوە. بانە مەر. جۆزەردان. پوشپەر. گەلاوێژ. خەرمانان. رەزبەر. خەزەڵوەر. سەرماوەز. بەفرانبار. رێبەندان. رەشەمە.

لە هەندێ شـوێنی کـە بە مـانگی مـارت ئەڵێن: هەرمێ پشکوان و، بە نیـسـان: شەستە و، بە مایس: بەختەباران و، بە حوزەیران: بارانبڕان و، بە تشرینی یەکەم: گەلاریزان و، بە تشرینی دوەم: سەرپەڵە.

*

هەمـو ناوچەیەک کـۆمـەڵێ لەم زاراوانەیان هەیە، هەندێکیـان لە گـەڵ ئەمـانەدا هـەرادیفن، بەلام هەندێکیان ناوی دیاردەیەکی سـروشـتە لەوانەیە لە ناوچەکانی ترا نەبێ. نوسینەوە و بەکارهێنانی ئەم وشانە زمان دەوڵەمەن ئەکەن.

*

پێشینان وتویانە: «ئەگەر با بێ و ئەگەر باران، لە عومری زسـتان کـەم ئەبێتـەوە»، هەروەها: «لە زسـتان شـەوێ، لە پەیران تەوێ»، هەروەها: «لە هەمـو هەوری باران نابارێ». هەروەها: «باران بەهاری ناشێ ئەگـەرێ، باران ئەهاری جـوتی ئەگـەرێ»، هەروەها: «بەفـری بەهارێ، تا پنچەی دارێ، ناگـاتە ئێـوارێ»، بۆ یەکێ کـە تەمێ خـواردو نەیبێ لە تەجرووبەکانی رابوردو ئەڵێن: «نە بای دیوە و، نە باران»، بۆ مشـور خواردنی بێ سـودی دوای لێقەومان، ئەڵێن: «لە پاش باران کەپەنک».

*

## هەوڵی ئاشتبونەوە

دوای ئەو شـەڕانە هەمـومـان هەسـتـمـان پێوە ئەکـرد، کـە لەم شـەڕانەدا هێـزو توانای گەلەکەمان دائەچۆرێ. لە زۆر لاوە بە هەمان مەعنا نامەمان بۆ ئەهات بە تایبەتی لە ئەدیب و نوسـەر و پیـاوە ناسـراوەکـانی شارەوە. لە ناو خۆمـان دا بە دوقـولی و سـێ قـۆڵی و، لە چەندین کۆبونەوەی مـەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی سـەرکردایەتی دا باسی چارەسەری ئەم بەلا کوشندەیەمان ئەکرد و، ئەگەراین چارەیەکی بۆ بدۆزینەوە. بریارمان دا هەوڵێکی زۆر بدەین

بۆ ئەوەی کوتایی پێ بهێنین. یەکەمینیان لە ڕێگای دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە: وتارەکانی ڕادیۆ و بڵاو کراوەکان، زەمینەی بۆ خۆش بکەین. دوەمینیان بکەوینە پەیوەندی ڕاستەوخۆ لە گەڵ هەمو لایەنەکانی پەیوەندیدار.

*

**من و شعری ناوخۆ!**

ئەوسایش و، هەتا ئێستایش هەندێ لە سەرانی پارتی و حشع و لایەنەکانی تر لە ناو هاوڕێکانم دا من بە یەکێ لە توندڕەوەکان دائەنێن. بەشێکی شعری پڕوپاگاندەیان لە دژی من بوە. ڕاستیەکەیشی چەند جارێ من سەرکردایەتی لەشکرکێشییەکانی یەکێتیم کردوە. لێرەدا چەند وتاری دەقاودەق دوبارە ئەنوسمەوە کە لە کاتی خۆی دا دەربارەی شعری ناوخۆ، دوای گەڕانەوەم لە شەرەکان، وەکو سەروتاری کۆمەڵە لە ژمارەکانی کانونی دوەم و شوباتی ١٩٨٢ دا بە ناوی ناوەندەوە نوسیومە. ڕەنگە خوێنەوار تا ئەندازەیەک لە بیروبۆچونەکانم بگا.

*

**وتاری یەکەم:**

**گەلەکۆمەکێ ی چەکدار - سیاسی لە خزمەتی کێ دایە؟**

هاوین و پاییزی ساڵی پار، هەندێ شوێنی پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی بون بە مەیدانی زۆرانبازییەکی چەکدار - سیاسی توندوتیژی خوێناوی لە بەینی پێشمەرگەکانی ی ن ک و چەکدارەکانی هەندێ حزبی تردا.

زۆرانبازی چەند مانگی ڕابوردو، درێژە کێشانی ڕوداوە پچڕپچڕەکانی چەند مانگ و بگرە ساڵی پێشوتر بو، بەڵام ئەمجارەیان چەشنێکی بەرینتر، فراوانتر، توندوتیژتر و نەخشە کێشراوی بە خۆیەوە گرت بو، کە خۆی نواند لە گەلەکۆمەکێ ی چەکدار - سیاسی ٤ قۆڵی چەند حیزب و ڕێکخراوی جۆراوجۆری جیاواز لە ڕوی ڕیبازی ئایدیۆلوجی و سیاسیەوە. وە پێشتریش بە ژاوەژاوێکی پڕوپاگاندەیی خەست و فراوانی ئاراست، لە بارەی «ڕێککەوتنی نهێنی» ی ن ک لە گەڵ ڕژێمی صەددام بو لێدانی «هێزە نیشتمانییەکان» و ڕێگرتن لە «چالاکی شۆڕشگێڕانەیان دژی ڕژێم» زەمینەی بۆ خۆش کرا بو.

ڕوداوەکانی ئەم دواییەیش، وەکو هی جارەکانی تر، مایەی پەژارە و جێگەی پرسیاری کۆمەلانی خەلک بون، چونکە ڕەوتی بەرەو پێشەوە چونی شۆڕشی کوردستان و ئاقاری خەباتی سیاسی و پێشمەرگەیی لە شا ڕێ ی ئاسایی خۆی لا ئەدا و، لە شعری کوردەوە دژی هێزی حکومەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، ئەیگۆڕی بە شعری هێزەکانی کورد لە گەڵ یەکتری ڕو بە «کوردواندنی شەڕەکە»، بە تایبەتی لە کاتێک دا کە لە ئەنجامی گەرمبونی ئەمبەرەکانی جەنگی عیراق - ئێران دا لە بارترین هەلی میژویی، لە دو دیوی نیشتمانەکەی دا، بۆ بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی گەلی کوردستان - لە سەر ئاستی ستراتیجی بۆ جولانی سیاسی، وە بۆ دەسوەشاندنی کاریگەر و کوشندەی هێزە شۆڕشگێڕەکان لە دوژمنانی داگیرکەر - لە سەر ئاستی تاکتیکی، هەلکەوت بو.

*

لە گەڵ کۆمەلانی خەلکی کوردستان دا، ئێمەش لە پەژارەدا بوین، چونکە هەفتە نەبو بە ناڕەوا چەن هاوولاتییەکی کوردستان لە شعری ناوخۆدا، لەوانە چەندین هاوڕێ ی

هەلکەوتو و هەڵاڵی دڵری نیمە، نەکوژرین..

لە گەڵ کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان دا، ئیمەش ئەمانپرسی: بۆ؟ ئەم شەڕە لە پای چی؟ بۆ سوودی کێ؟ قوربانیەکانی ئەم شەڕە کێن؟ بۆچی و لە بەر چی.. هەرچەنده هەلومەرجی دەستپێکردنی کارێکی جیددی یا کاتی وەشاندنی گورزێکی کوشندە لە دوژمن ئەگات؟ تەقاندنەوەی ئاگرێکی لاوەکی و هەلگیرساندنی شەڕی ناوخۆ و کوژاندنی شەڕ و خەریک کردنی هێزی پێشمەرگەی ی ن ک کە بە درێژایی شەش ساڵی ڕابوردو هەر ئەو هێزی سەرەکی و کاریگەری بە گژا چوونەوەی ڕژێمی عێراق و دەزگا دامرکێنەرەوە چەقچەقەکانی بوە لە کوردستان دا، لە دوا شیکردنەوەدا بە قازانجی کێ یە؟

گوایە دنیای کورد ئەوەندە بە خێرایی لە گۆڕان دایە، کە تەرازوی هێزەکانی ناوی و سروشتی سیاسی و چینایەتییان و، بیروباوەڕ و بۆچون و ڕێباز و، ئوسلوبی کار.. یان وەها زو بگۆڕی؟

- ئەوانەی کە ناشیتاڵیان ڕەفز کرد و بە چەکی شۆڕ و توانایەکی کەمەوە ڕێگەی چیاکانی کوردستانیان گرت و لە ناخۆشترین هەلومەرجی نابەرامبەری تەرازوی هێزەکانی ڕژێم و هێزەکانی سەرجەم ئۆپۆزیسیونی عیراق دا، بە توانایەکی کەمەوە، دژی دوژمنێکی بەهێز و دڕ، خەباتی چەکدارانەیان دەس پێ کردەوە..

- ئەوانەی ئاڵای چەسپاندنی گیانی پێکەوەژیانی دیموکراتی بیروباوەڕ و حیزب و ڕێکخراوی جیاجیایان هەلکرد، بە جۆرێک کە بۆ گاڵتە پێ کردن، بە یارەگاکانی سەرکردایەتییان ئەگوتن: دۆڵی ئەحزاب!

- ئەوانەی کە ئاڵای ڕوخاندنی ڕژێمی صەددام و دامەزراندنی ڕژێمێکی دیموکراتییان لە عیراق دا هەلکرد و، نەک جارێ بەڵکو سەدان جار، بانگی هەمو هێز و حیزبەکانی عیراقیان ئەکرد، کە هێز و توانای خۆیان لە بەرەیەکی یەکگرتودا دژی ڕژێمی صەددام یەک بخەن و خەباتی چەکدار لە ڕوی سەرکردایەتی کردنی و پێکهاتنی هێزەکانی و مەیدانی چالاکیەوە بکەنە شۆڕشی هەمو عیراق..

بەڵێ ئەوانەی کە بە ڕەنج و ماندوبونی چەند ساڵ و بە خوێنی سەدان شەهید ڕاستیی ئەم دروشمانەیان سەلماند و بناغەکەیان دارشت، لە کاتێک دا کە زۆر کەس و زۆ لای تر ئەسەیان بە خەیاڵ و سەرەرۆیی و پیلانگێڕان و نۆکەرایەتی ئەم و ئەو لە قەڵەم ئەدا..

ئۆ بڵی ی دنیای کورد ئەوەندە زو بگۆڕی؟. ئەمانە هەمو بونە نۆکەری هەمان ڕژێم کە لە ماوەی شەش ساڵی خەباتی پڕ کوێرەوەری و مەینەت و تاڵی دا، زیاتر لە هەزار هەڵاڵ و هاوڕێ ی بە ناڕەوا لە شەڕی نابەرامبەر و، لە ژێر ئازار و ئەشکەنجە و، لە پای قەنارە کوشتون و، دەیان هەزار کەس لە خوشک و برا و دایک و باوک و خزم و خێزانی ئێمەیان کردون و ئازار داون و لە زیندان و گرتوخانە و سەربازگەکان دا توند کردون و، زیاتر لە هەزار گوند و دێیان کاوڵ و لە گەڵ خاک دا یەکسان کردون؟

کورد گوتەنی، سەیرە لە کوێدا

ئۆ بڵی ی ئەوانەی لە سەردەمی ئەو تراجیدیە سامناکە ناخۆشەدا خۆیان لە جەنگەی تراجیدیاکەدا ژیاون و بەرگەیان گرت و هیچ ئەبی ئەوساکە لە کوردستان دا هەر ئەوان بون کە هێزی سەرەکی سیاسی و چەکداری بە گژا چونی ڕژێم بون، ئێستا بونە نۆکەری ڕژێم

پارێزەری صەددام و هێزە داگیرکەرەکانی، وە ئەوانەش کە ئەوسا تەماشاچی و رەخنەگر و سەیرکەر و تۆمەت بە پاڵدەر و گەرمشیرین و ریز لێکدەر.. بون، بونە پارێزەری شۆرش و ئازادیخوازەکانی جەماوەری کوردستان و رێبازی شۆرشگێڕانە!

لە گەڵ کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان دا، ئێمەش ئەپرسین بۆ؟

ئاخۆ ئەو گەلە کۆمەکی بەی لێبان کردین و ئەو شەرەی پەیمان فرۆشتین لە سەر ئەوە بو کەوا ئێمە لە بیروباوەری خۆمان هەڵگەڕاوینەتەوە و لە دروشمەکانی خۆمان پەشیمان بوینەتەوە و دنەدانەوەی چارەنوسی خۆمان بەستینەوە بە چارەنوسی رەشی رژێمە خوێنڕێژە رزیوەکەی صەددام!؛ و، ئەمانەش گەرەکیان بو بە رێگەی گەلەکۆمەکی ی چەکدار - سیاسی، لە مەیدان دەرمان بکەن و بانگمانەوە بە ناو رژێم دا، یان بە زۆر بانهێننەوە سەر رێگای راستی شۆرش و ئازادیی جەماوەرا

*

هەمو زۆرانبازیەکی سیاسی بێگومان زەمینەیەکی مادی هەیە و لە راستی دا تواندنەوەی ملمڵانی ی چینایەتی بەینی چین و توێژە کۆمەڵایەتیە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵە، کە هەر یەکەیان بە پێی ی دەسکەوت و ئازادیی چینایەتی خۆی، لە روانگەی تایبەتی خۆیەوە سەیری روداوەکان ئەکا، هۆکانی دەس نیشان ئەکا، رێگەی چارەسەر کردن و ئوسلوبی کار بۆ کردنی دیاری ئەکات.

لە دۆخێکی وەکو ئێستای رۆژهەڵاتی ناوەراست دا، کە یەکێکە لە ناوچە هەرە گرنگەکانی دنیا، وە یەکێکە لە ناوچە هەرە ئالۆزەکانی دنیا و، شوێنی پەنگ خواردنەوەی چەندین کێشە و گیروگرفت و ناکۆکی قوڵ و گرنگ و کاریگەرە - لە ناو هەر دەوڵەتێکیان دا، لە بەینی دەوڵەتانی ناوچەکەدا، لە بەینی گەلانی ناوچەکە و هێز و دەوڵەتە گەورەکانی دنیادا.. بەمجۆرە روداوەکانی هیچ لەرزینێکی ئەم ناوچە ئالۆزاوە گرنگە، چەن بچیوک و چەپەک و پشت گوێ خراویش بێ، ناتوانێ رەوتی ئاسایی خۆی بگرێ بە دابڕاوی و دور لە دەستێوەردان و گوشاری ئەم و ئەو، ناکۆکیەکانی ناوی لە ئەنجامی کامڵ بونی هەلومەرجی مێژوویی خۆی دا، لە لایەن خودی خاوەن مەسەلەکەوە، لایەلا بکرێ.

جا مەسەلەی نەتەوەی کوردیش، وەکو یەکێک لە گیروگرفتە هەرە ئالۆز و گرنگ و بڕیاردەرەکانی ناوچەکە، دەمێکە سەرنجی بایەخی هێزە کۆنەپەرست و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان و دەوڵەت و هێزە زلەکانی دنیای راکیشاوە و هەر یەکەیان لە لای خۆیەوە، بە جۆرێک، چاوی تێ بڕیوە و هەوڵی داوە جی پێ ی خۆی بکاتەوە و پایەی کۆمەڵایەتی لە ناو چین و توێژەکانی کۆمەڵی کورد و نوێنەرە سیاسیەکانی دا بدۆزێتەوە و قورسایی خۆی بخاتە سەری. لە ناو بزوتنەوەی کوردیش دا لە مێژە دو جۆرە بۆچون هەیە بۆ لێکدانەوەی رەگی گیروگرفتەکانی گەلی کورد و دۆزینەوەی چارەسەر کردنی، کە لە دو سەرچاوەی ئایدیۆلۆجی جیاواز، بەڵکو لە دو جیهانبینی جیاوازەوە دەردێن:

یەکێکیان - لای وایە کە بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانی گەلی کوردستان ئەبێ پشت بە هێزی لە بن نەهاتوی کۆمەڵانی خەڵک ببەستێ و، کۆمەڵانی خەڵک خۆیان خاوەنی مەسەلەکەی خۆیان بن و چارەنوسی خۆیان بڕیار بدەن بە بێ دەستێوەردانی بێگانە. بناغەی ستراتیجی گشتی جوڵانەوەکەی لە سەر بنچینەی دابین کردنی پێویستیەکانی گۆران و گەشە کردنی کۆمەڵایەتی، ئابوری، سیاسی و فەرهەنگی.. کۆمەڵی کوردستان

دابڕێژێ، نەک بە پێی ی قازانجەکانی هێزەکانی دەرەوە و ململانێ و زۆرانبازییەکانی بەینی ئەوان.

ئەوی تریان - هەوڵ ئەدا جێگە بۆ جوڵانەوەی کورد بدۆزێتەوە لە ناو چوارچێوەی ستراتیجی زلهێزەکان و لە ناو کون و کەلەبەری ناکۆکییەکانی بەینی دەوڵەتەکانی ناوچەکەدا. هەر لە بەر ئەوە پشت بە دەرەوە ئەبەستێ و هەوڵ ئەدا بە هێزی دەرەکی و ناکۆکییەکانی ئەوانەوە بپەستێتەوە، وە بە گوێرەی هەڵکەوتنی هەلومەرجی چاک و خراپی «دەوڵی» مەسەلەی کورد بەرز بێتەوە و بڕەنێ، وە بیخاتەوە مەیدانی وازیی ناو دەوڵەتانەوە.

هەوڵدان بۆ بەستنەوەی مەسەلەی کورد بە ناکۆکییەکانی هێزەکانی دەرەوە جارێک لە گۆشەی راست و جارێکی کە لە گۆشەی چەپەوە، وە خەبات کردن بۆ ری برین لەم پیلانە، خۆی لە خۆی دا زۆرانبازییەکی سیاسییە، ناودانەوەی ململانێ ی چینایەتی چین و توێژە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵە، هەریەکەیان لە روانگەی قازانجی چینایەتی خۆیەوە، بەڵام بە گوێرەی گۆڕانی هەلومەرجی خاوبوونەوە و توندوتیژبوونی ناکۆکییەکان، ئەمیش ئەگۆڕێ: چەک دائەنێ یا چەک هەڵئەگرێ.

سر بوونی هەندێ هێز لە وەرزی سارد بوونی مەناخی ناکۆکییەکانی بەینی عیراق و ئێران دا، پاشان زیندوو بوونەوە و سەردەرهێنانەوەیان سەرلەنوێ لە وەرزی گەرمبوونەوەی مەناخی ناکۆکییەکان دا وێنەیەکی دزێوی بۆچوونی دووەمە. لە کاتێک دا کە مەسەلەی کورد لە حاڵەتی رێکی و ناڕێکی، ئاشتی و شەر، کۆکی و ناکۆکی دەوڵەتانی ئێران و عیراق دا، وەکو مەسەلەیەکی بابەتیی مێژووکرد هەر هەبوو.

هەڵگیرسانی جەنگی عیراق - ئێران هەلومەرجێکی نوێ ی لە سەرانسەری ناوچەکەدا خوڵقاند، لە لایەکەوە - هەلی بۆ هێزە شۆڕشگێڕەکان هەڵخست کە سود لە شەڕی ئەم دوو دەوڵەتە داگیرکەرە وەربگرن، بۆ زیادکردنی رادەی چالاکی و جەنگاوەری پێشمەرگەیی و بە دەستهێنانی سەرکەوتنی گەورە و کاریگەر لە چوارچێوەی ستراتیجییەکانی خۆیان دا. بەڵام لە لایەکی تریشەوە، هەلی بۆ هێزەکانی تریش رەخساند کە سەرلەنوێ بێنەوە مەیدان بۆ بەستنەوەی مەسەلەی کورد بە ناکۆکییەکانی ئەو دوو دەوڵەتەوە.

بەو پێ یە، لە سەر ئەرزی کوردستان ڕێبازێکی نوێ ی حیزب و هێزە سیاسییەکان هاتەوە گۆڕێ. لایەکیان ئەیویست و هەوڵی ئەدا سەربەخۆیی ڕیبازی شۆڕشگێڕانەی بزووتنەوەی رزگاری نیشتمانیی گەلی کوردستان، لە گەمە و پیلانی دەوڵەتەکانی عیراق و ئێران بپارێزێ و لە هەمان کات دا کەلک لە هەڵگیرسانی جەنگ وەربگرێ، بۆ زیادکردنی هەرچی زۆرتری چالاکی شۆڕشگێڕانەی سیاسی و چەکدار و ڕاپەراندنی کۆمەڵانی خەڵک. لایەکەی تریش ئەیویست و هەوڵی ئەدا کە خەباتی رەوای گەلی کورد لە عیراق دا بکات بە بەشێک لە ئەمەردەکانی جەنگی دەوڵەتی ئێران دژی دەوڵەتی عیراق و، لە چوارچێوەی ئەو نەخشەیەدا ئەیەوێ، کە بەشێکی لەو گەلە کۆمەڵەکی چەکدارە سیاسییە ـ قزڵبەدا خۆی ئەنواند، کە لە چەند مانگی ڕابوردودا دژی پێشمەرگەکانی ی ن ک کرا.

*

گەلەکۆمەکی کەی ئەمجارە، ئەگەرچی لەو دیو سنوورەوە، بە توانایەکی زۆرەوە نەخشەی بۆ کێشرا بوو، وەکو هەموو جارەکانی تر ئەمیش لە بەرامبەر باوەڕی پتەو و خۆراگریی دلێرانەی پێشمەرگەکانی ی ن ک دا شکا و سەری نەگرت. بەڵام هەر وەکو

هێرشەکەی ئەمجارە، لە هەمو ئەوانی پێشو، بەربلاوتر و توندتر و ڕێکخراوتر بو، هەروەها شکاندنەکەشی بە هەمان ئەندازە گەورە بو، بگرە لە لەوارەی هێرشەکەش زلتر بو، چونکە سەرلەنوێ چەند ڕاستیەکی بە زەقی ساخ کردەوە، لەوانە:

- دەرکەوت کە پێشمەرگەکانی ی ن ک لە ماوەی چەن سالی ڕابوردودا، لە سەختترین هەلومەرجی خەبات دا، چۆن بەرگەی هێرش و پەلاماری درندانەی هێزی داگیرکەری ڕژێمی فاشیستی عێراقیان گرتوە و، چونکە لە ناو باوەشی کۆمەلانی خەلک و لە گەڵ ئیش و ئازارەکانی ئەوان دا ژیاون، لە گشە کردنێکی چونایەتی و چەندایەتی شێنەیی و بەردەوام دا بون، لە بۆتەی خەباتی شۆرشگێرانەی خویناوی و سەخت و دژواردا قاڵ و پەروەردە بون، بۆیە بە هیچ هێزێکی خۆماڵی و خۆولاتیش لە شکاندن و بەزاندن نایەن و بە ئاسانی لە مەیدان دەرناکرێن، بگرە هەروەکو چۆن بە درێژایی سالانی پێشو، هێزی سەرەکی و کاریگەری بەربەرەکانی ی ڕژێم بون لە کوردستان دا، هەر بەو جۆرە پارێزگاری هەمان ئاستی بلند و شوێنی بەرز و سەربەرزانەی خۆیان کرد چ لە بەرامبەر هێرشەکانی ڕژێم دا و، چ لە بەرامبەر پەلاماری نارەوای هێزی چەکداری حیزبەکانی تردا.

- دەرکەوت هەر ئەو سیاسەتە سەرنەکەوت و لە ڕۆژەانی خەلک دا جێگیر نەبێت و سەرنج و بڕوای خەلک بە دەس نەهێنێ، کە لە سەر بناغەی ڕاستی و ڕوداو بنیات نراوە، نەک ئەوەی لە سەر بناغەی پیلانگێران و پروپاگاندەی ناراست و ژاوەژاوی دروستکراو و هاشە و هوشەی درۆ و هەلگێرانەوەی ڕوداوەکان و چەواشە کردنی گەڵ و تەفرەدانی خەلک و فیل و تەلەکەبازی.

ئەوانەی پەنایان بردە بەر شەری پروپاگاندەی درۆ، زۆری نەخایاند، درۆکانیان ئاشکرا بو، بوختانەکانیان دەرکەوت، دەستەکەیان کەوتە ڕو.. خۆیانی پی سوک و ڕیسواتر بون.

- دەرکەوت کی لە خزمەتی پلانەکانی داگیرکەرانی کوردستان دایە و بە کردەوە، بە نهێنی و بە ئاشکرا، نەخشەکانی ئەوان جیبەجی ئەکات، لە پەنای ئەودا و بە بەرماوەی ئەوان ئەژی و بە پی ی قازانج و دەسکەوتەکانی ئەوان ئەجولێتەوە و، بە فەرمانی ئەوان پێشرەوی و پاشەکشە ئەکا، سەر دەرئەهێنی و سەر ئەباتەوە کون. ئەگینا ئەوی بەهوی شەری ڕژێمی عێراق بکات، ئەگەر لە بیاتر نەبی، مەیدانێکی بەرین و فراوانی ئەبەرەوی چەکدار و چالاکیی سیاسی لە بەردەم دایە، سەدان سەربازگەی گەورە و بچوک و ڕەبیەی هێزی داگیرکەری دوژمنی لە بەر چاو و لولەی تفەنگ دایە و ڕێگەی لیدانی هێزەکانی ڕژێمیش هەر بە سەر سنگی پێشمەرگەکانی ی ن ک دا تی ناپەری.

- دەرکەوت کی لە هەمو لایەک زیاتر بە تەنگ بەجێهێنانی فرمانی نیشتمانی و لیپرسینەوەی مێژویی و جیبەجی کردنی خواست و داواکانی جەماوەرەوەیە و سورە لە سەر شکاندنی پیلانی «کورداندنی شەر» و تەخشتنی شەری ناوخۆ و، تەرخان کردنی هەمو وزە و تواناکان بۆ شەری ڕژێمی عێراق. ڕوداوەکان ئەیسپاتیان کرد، کە لەم ڕوانگەیەوە ی ن ک هەر وەکو سەر بۆ «زۆری چەک» و گورشار و گەلەکۆمەکی دانانەوێنی، بەلام ئەگەر ئازادی هەلبژاردنی شێوەی لایەلا کردنی گیروگرفتەکان بە ڕیگای سیاسی یا چەکدار، بەند بی بە دەسەلات و ئارەزوی یەکیتیی نیشتمانیەوە، ئەوا ی ن ک مەگەر هیچ ڕیگایەکی تری خۆپاراستنی لە بەردەم دا نەمێنی، جگە لە بە کار هێنانی چەک، ئەگینا هەمیشە ڕیگەی گفتوگۆی هێمن و دیموکراتی ئەگری و، ڕیگەی سیاسی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان

هەڵنەبژێری.

*

ڕووداوەکان کۆن دەبن و لە بیر دەچوونەتەوە، هۆکانی تەقینەوەی دەزعەکە هەر ماون، گیروگرفتەکان بە چارە نەکراوی هەڵپەسێردراون. کەواتە مەترسی هەڵگیرسانەوەی شەڕی ناوخۆ هێشتا لە گۆڕێ یە، بەڵام هێشتا هەلی بە لادا خستنی هێمنانە و سیاسی گیروگرفتەکان، لە هەلی لایەلا کردنی چەکدارانەیان، زۆرترە.

هێشتا لە قۆناغی ی ن ک وە دەرگای چارەسەرکردنی سیاسی مەسەلەکان بە کراوەیی، لە سەر گازی پشتە. (کۆمەڵە، کانوونی دووەمی ١٩٨٢)

*

وتاری دووەم:

شەڕی ناوخۆ یا شەڕی ڕزگاری نیشتمان؟

گەشەکردنی بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی گەلی کورد لە کوردستانی عێراق دا دوابەدوای شۆڕشی ١٤ ی تەمووزی ١٩٥٨، پاشان دەستپێکردنی خەباتی چەکدار و هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول و درێژەکێشانی چەن ساڵەی، کارێکی وەهای کرد کە کوردستانی عێراق ببێتە مەڵبەندێکی گرنگی بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی گەلی کورد لە سەرانسەری کوردستان دا. بگرە ببێتە ناوەندێکی ئەوتۆ کە تێکڕای تێکۆشەرانی کورد لە پارچە جیا جیاکانی کوردستان دا چاوی هیوای تێ ببڕن و پشتی پێ ببەستن و پشتیوانی لێ بکەن، خەباتی خۆیان و تێکۆشانی حیزب و ڕێکخراوەکانی خۆیانی پێوە گرێ بدەن، بەڵکو بیخەنە ژێر چەتری ڕابەریی سیاسی و ئایدیۆلۆجی و ڕێکخراوەیی.. سەرکردایەتیەکەیەوە.

بارزانی کە سەرکردایەتی شۆڕش و پارتی لە ژێر دەس دا بوو، هەروەها جوڵانەوەی کوردیش لە سەرانسەری کوردستان دا کەوتبوە ژێر نفوز و دەسەڵاتی ئەوەوە ئەیتوانی دەوری سەلبی یا ئیجابی وازی بکا هەم لە جوڵانەوەی کورد لەو پارچانەدا و هەم لە ناو حیزب و ڕێکخراوەکانیان دا، بە تایبەتی لەو قۆناغانەدا، کە سەربرای پەرەسەندن و بەهێز بونی شۆڕشەکە خۆی، لە ناو ڕۆشنبیران و تێکۆشەرانی کوردیش دا ئەو باوەڕە زاڵ بوو: ئەگەر لە پارچەیەکی کوردستان دا شۆڕش هەڵگیرسا تا بە ئەنجام ئەگات، ئەبێ هەمو پارچەکانی تر لە خزمەتی ئەو شۆڕشەدا بن و لە سنوری دەسکەوت و قازانجەکانی ئەودا بجولێنەوە.

ئەم باوەڕە ئەگەر لە چوارچێوەی ستراتیجێکی گشتی دا دابڕێژرایە و بەپێوی بکرایە و کاری پێ بکرایە، لەوانە بو ئەنجامی کاریگەر و گەورەی هەبوایە. بەڵام بە شێوەیەکی خراپ لە لایەن سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلولەوە، بە تایبەتی لە لایەن بارزانیەوە، بە کار هێنرا، هەم بۆ کۆیخایەتیەکی ناڕاستی پارچەکانی تری کوردستان لە ڕوی سست کردنی جوڵانەوەکانیان و خۆ هەڵقورتاندن لە کاروباری ناوەکی حیزب و سەرکردایەتیەکانیان و تەرخان کردنیان بۆ خزمەتی جوڵانەوەی کوردستانی عێراق.. وە هەم بۆ پاساودانی دەستێکەڵاوکردن لە گەڵ دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان. ئەوەش لە ڕەفتاری هەردو باڵەکەی پ د ک دا دەرکەوت و بە کردەوە سەلما.

هەرەس هێنانی کتوپڕ و خێرای شۆڕشی ئەیلول لە کوردستانی عێراق دا لە ئەنجامی ڕێککەوتنی شا - سەددام ساڵی ١٩٧٥ لە جەزائیر دۆخێکی نوێ ی لە ناوچەکەدا

خولقاند. ئەو ناوەندەی لە کوردستانی عێراق دا بۆ جوڵانەوەی کورد لە سەرانسەری کوردستان دا دروست بوبو هەرەسی هێنا. هەروەکو گەلی کوردی عێراق کەوتە گێژاوی مەینەتیەکی نەتەوایەتی دژوارەوە، هەروەها هەمو نەتەوەی کوردیش. لە ئەنجامی ئەوەدا، رەنجەڕۆ و دەردەزنگ و بەدبین بو لە هەر ناوەندێکی تر لە بزوتنەوەی کوردا.

هەرچەندە خامۆشیەیەکی ترسناک، لە دوای ئاشبەتاڵ، باڵی بە سەر کوردستان دا کێشا بو بەڵام زۆری نەخایاند، جوڵە و بزوتن کەوتەوە سەرانسەری نیشتمانەکەمان.

- لە کوردستانی عێراق، واتە لە کەلاوەی ئاشبەتاڵ دا، خەباتی ژێرزەمینی دەستی پێ کردەوە و هەر زۆر زو چوەوە قۆناغی خەباتی سیاسی - چەکدار.

- لە کوردستانی تورکیا بزوتنەوەیەکی سیاسی - جەماوەریی پەرەی سەند.

- لە کوردستانی ئێرانیش جمەجۆڵی ڕێکخراو سەری هەڵدایەوە و لە گەڵ ڕوخانی شا بوە بزوتنەوەیەکی سیاسی - جەماوەریی فراوان و قوڵ و، زۆریشی پێ نەچو بوە جوڵانەوەیەکی سیاسی - چەکدار.

ئەگەر پێشتر کوردستانی عێراق ببوە ناوەندی بزوتنەوەی کورد و بەشی زۆری حیزب و ڕێکخراوەکانی سەرانسەری کوردستان خۆیان پێوە ئەبەست یا لێ ی نزیک ئەکەوتنەوە و پەیڕەوی ئامۆژگاری و ڕێنوێنیەکانیان ئەکرد، لە گەڵ تێکچونی شۆڕشی کوردستانی عێراق دا ئیتر نەک هەر ئەو ناوەندە تێکچو بو، بەڵکو ئەو تەجروبەیەش لە بەر چاوی زۆربەی حیزب و ڕێکخراوەکانی کوردستان دا شکا بو، ئیتر لە بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کوردا ناوەندێک نەما بو لە ڕوی توانای سیاسی - تیوری یان لە ڕوی توانای چەکدار - مادیەوە ئەو هێز و نفوز و دەسەڵاتەی هەبێ، حیزب و ڕێکخراو و تێکۆشەرانی کوردستان پەرەی لێ بدەن و لێ ی کۆ ببنەوە. ئەگەر پێشتر کوردستانی عێراق ببوە نمونەیەکی دیاری کۆکردنەوەی جەماوەری خەڵک لە تاقە حیزبێک دا و سیستەمی تاقە پارتی بە سەر خەڵکی دا سەپا بو، ئەم تەجروبەیەش لە گەڵ ئاشبەتاڵی سەرکردایەتی و داودەزگاکانی پ د ک و تێکچونی شۆڕشە چەکدارەکەی کوردستانی عێراق، شکا و باوی نەما.

بەمجۆرە لە هەر پارچەیەکی کوردستان دا چەن حیزب و ڕێکخراو دەستیان کرد بە کارکردن و لە سەرانسەری کوردستان دا چەندین حیزب پەیدا بون. هی نوێ هاتنە مەیدانەوە و کۆنەکانیش بە خۆ کەوتنەوە.

دەرکەوتنی چەندین حیزب و ڕێکخراوی جۆراوجۆر، لە لایەکەوە ئەنجامی ئاسایی گۆڕان و گەشە کردنی کۆمەڵایەتی، ئابوری، سیاسی.. کۆمەڵی فرە چینی کوردستان و نیشانەی دەرکەوتنی سنوری چینایەتی بو لە بەینی چین و توێژە کۆمەڵایەتیەکان و ڕەنگدانەوەیان لە ڕێکخراوی سیاسی جۆراوجۆردا. لە لایەکی ترەوە دەرکەوتنی ئەم هەمو حیزب و ڕێکخراو و دەستە و تاقمانە.. کە هەندێکی شوێنی چینایەتی خۆی پێ نەدۆزرا بوەوە، یا لەم لا و لەو لاوە فڕیان پێ دا ئەکرا، نیشانەی ئاڵۆزیی و پەراگەندەیی سیاسی و پەرت بون و بە فەیرۆ چونی وزە و هێزی کۆمەڵاتی خەڵک بو، بگرە سەرەتای سەرهەڵدانی تەنگرەچەڵەمەیەکی قوڵ و ئاڵۆز بو لە بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کوردا، بە تایبەتی چونکە هەندێکیان بەرەو خۆ چەکدارکردنێکی لاسایی کەرانەوەی بێ بەرنامە ئەچون.

*

لەبەرئەوەی لە هیچ کام لەو دەولەت و ولاتانەی کورد و کوردستانیان بە سەردا بەش کراوە ماوەی ژیانی دیموکراتی و خەباتی سیاسی هێمنانە نەبوە، لەوەتەی بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانیی گەلی کورد، بە پێ ی تێگەیشتنی نوێ، پەیدا بوە، هەمیشە شێوەیەکی سەرەکی خەباتی چ بۆ مان و خۆپاراستنی وە چ بۆ دەربڕینی بیروڕا و داواکردن و سەندنی مافەکانی، بە ناچاری ڕێگەی خەباتی چەکدار و، هەڵبەی خۆ چەکدار کردن و بە کار هێنانی چەک بوە. هەر بۆیە زۆربەی حیزب و ڕێکخراوەکانی کوردستان هەوڵی پێکهێنانی هێزی چەکداریان داوە. جیا لە بەر ئەوەی ئەمانیش لە پەیڕەوی کردنی ڕەوشتی پێکەوەژیانی دیموکراتیانە و لە نەریتی پێکەوە هەڵکردنی سیاسی دا کەم تەجروبە بون و، هەمیشە داگیرکەران و ئیمپریالیزمیش لوتیان ژەندوتە مەسەلەی کوردەوە، بۆیە زۆرجار ناتەبایی و ناڕێکییەکانی بەینی ئەو هێز و تاقمانە، لە کاتێک دا کە ئەبێ بە ڕێگەی سیاسی لایەلا بکرێن، ئەتەقێتەوە و ئەگاتە پلەی پێکادانی چەکدار و شەڕی خوێناوی، بە جۆرێکی ئەوتۆ کە لە هەندێ قۆناغ و لە هەندێ کات و شوێن دا بزوتنەوەی کوردی توشی مەترسییەکی زل ئەکا، چونکە خەباتی هێزە کوردیەکانی لە شاری ی ئاسایی خۆی، واتە لە خەبات دژی داگیرکەران و ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانیان، لا ئەدا و ناکۆکی نێوان.هێزە کوردیەکان ئەتەقێتەوە و ئەوەندە توند ئەبێ بە جۆرێک لە باتی ئەوەی شەڕی قورس و خوێناوی بکەوێتە مەیدانی هێزەکانی کورد و داگیرکەرانەوە، ئەکەوێتە ناو ڕیزەکانی کورد خۆیەوە.

لە بە سەر کردنەوەی شریتی ڕوداوەکانی ماوەی چوار - پێنج سالی ڕابوردوی نیشتمانەکەمان دا ئەبینین:

- لە کوردستانی تورکیا ئەگەرچی شۆڕشی چەکدار و لەشکری چەکداری تیا نەبوە و حیزب و ڕێکخراوەکانی ئەوێ لە خەباتی ژێرزەمینیی دا بون، کەچی لە گەڵ ئەوەش دا ناکۆکی ئایدیولوجی و سیاسی لە بەینی هەندێ حیزب و ڕێکخراوی ئەوێ دا تەقیبێوە و کەوتنە کوشتن و تۆقاندنی کادر و ئەندام و دۆستی یەکتری، تا کودەتای سپایی و سەپاندنی حوکمی عورفی جێگەی بە هەمویان لێژ کرد و جموجوڵ و چالاکیی کەم کردنەوە و سەرکردە و کادر و ئەندام و لایەنگرەکانی گرتن و ڕاونان و دەربەدەر کردن.

- لە کوردستانی ئێران دا ئەگەرچی لە پاش ڕوخانی شا جەوێکی ئازاد و دیموکراتی کەم وێنەی خەباتی سیاسی و ململانێ ی ئایدیولوجی خولقا بو، بەلام لە گەڵ ئەستور بونی باسکی چەکداری ڕێکخراوی ئەوێ و لە گەڵ قوڵ بونەوەی ناکۆکییەکانی بەینیان، لەوێش هەندێ لە گیروگرفتەکانیان، کە ئەکرا بە ڕێگەی سیاسی چارەسەر بکرێن، جارویار ئەتەقیبەوە و ئەگەیشتە پلەی پێکا هەڵپژانی چەکدار و خوێناوی.

هێشتا ئەم گیروگرفتانەی ناو خۆیان بە لایەک دا نەکەوت بو، هەمو هێزەکانی شۆڕشی کوردستانی ئێران کەوتنە بەر پەلاماری چەکداری هێزێکی تر کە گوایە یەکێکە لە هێزەکانی کوردستانی عیراق.

- لە کوردستانی سوریاش ململانێ ی ڕێکخراوەیی و سیاسی لە بەینی حیزبەکان دا، هەندێ جار ئەوەندە توندوتیژ و قوڵ ئەبێ تا ڕادەی لە یەک دابڕان و بە گژ یەکا چونێکی وەها کە ئەگەر لەوێش خەباتی چەکدار لە گوڕێ بوایە لەوانە بو ئەویش بگاتە ڕادەی شەڕی خوێناوی و چەکدار لە بەینیان دا.

- لە کوردستانی عێراقیش ئەوە چەند ساڵە شەڕی ناوخۆ بۆتە یەکێک لە گەورەترین کۆسپەکانی ڕێگەی بۆ پێشەوە چوونی جوولانەوەکە. لێکدانەوەیەکی بابەتیی ڕەوتی ڕووداوەکان و نزیکبوونەوەیەکی گشت لایەنی دەری ئەخەن شەڕی ناوخۆیی بەینی هێزە کوردییەکان و خەریک بوونیان بە یەکترییەوە لە سەرانسەری کوردستان دا دیاردەیەکی گشتییە، ئەگەرچی لە کوردستانی عێراق و لە کوردستانی ئێران دا لە چاو پارچەکانی تردا گەرمتر و خوێناویترە. لە ڕاستی دا تێڕوانینەوەی هۆ ڕاستەقینەکانی شەڕی ناوخۆ دەری ئەخا کە جگە لە کەم ئەزموونیی ئەم حیزب و ڕێکخراوانە لە مەیدانی پێکەوە ژیانی دیموکراتییانە و، جگە لە ئاوەدانەوەی ململانێ ی بیروڕای جیاواز و قازانج و دەسکەوتی چینایەتی جۆراوجۆر، قووڵکردنەوەی ئەم دیاردەیە و ناوەوەی شەڕی ناوخۆ بە هیچ جۆر دوور نیە لە فێتی داگیرکەرانی نیشتمانەکەمان و ئیمپریالیزمی جیهانیی و نۆکەرەکانیان، وە لە نەخشە و پیلانەکانی ئەوان بۆ لادانی بزوتنەوەی ڕزگاریی نیشتمانیی گەلی کوردستان لە شا ڕێ ی مێژوویی خۆی واتە: شەڕی داگیرکەران و ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانیان، بەرەو شەڕی ناوخۆیی هێزە کوردییەکان لە گەڵ یەکتری واتە «کوورداندنی شەڕەکە» لە کاتێک دا کە هێشتا گەلی کورد لە قۆناغی شەڕی ڕزگاریی نیشتمان دایە نەک لە قۆناغی شەڕی ناوخۆیی چینە جیاوازەکانی.

لە قۆناغی ئێستای خەباتی ڕزگاریخوازانەی گەلەکەمان دا، شەڕی ناوخۆ، لە دوو دیوی کوردستان دا، لە دیوی عێراق و لە دیوی ئێران، خەتەرێکی گەورەی دروست کردووە بۆ سەر بزوتنەوەی ڕزگاریی نیشتمانیی گەلی کورد، بەشێکی گەورەی ڕەنج و فیداکاریی هێزە کوردییەکان لە شەڕی یەکتری دا بە فیڕۆ ئەچێ، هێزە کوردییەکان بە شەڕی سیاسی و چەکدار و ئیعلامی یەکترییەوە خەریک ئەکا و ناتوانن بە چاکی خەریکی دوژمنەکانی گەلەکەمان بن و گورزی کوشندەی تێ بسرەوێنن، کۆسپ و ئەگەرەی زل لە بەردەمی ڕەوتی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازانەی کوردا دروست ئەبێ و ناتوانێ ئەکانی بە تین و بە گوڕ بەرەو بەدیهێنانی ئامانجەکانی بەدا، دڵی کۆمەڵانی خەڵک لە تێکۆشان سارد ئەبێتەوە..

بۆیە ئەبێ لە ڕوانگەیەکی زانستییەوە، سەیری هەلومەرجی نوێ ی کوردستان بکەین، ناکۆکییەکانی ئەم قۆناغە هەڵسەنگێنین، سروشتەکانیان، ڕێگەی چارەسەر کردن و شێوەی لایەلا کردنیان دیاری بکەین، فەرمانەکانی خۆمان، لەم قۆناغە گرنگەی خەباتی گەلەکەمان دا دیاری بکەین.

ئەبێ زۆر بە وریایی و ژیری، زۆر بە هۆشیاری و بەرپرسیاری، بە دڵسۆزی و تین و تاوی شۆڕشگێڕانەوە، بە لە خۆبردوانێکی تەواو و هەست کردنێکی قووڵەوە بە لێپرسینەوەی مێژوویی، لە پلەی ئێستادا هەوڵ بدەین:

لە لایەکەوە - لە ڕووی سیاسی، ئایدیۆلۆجی، پێشمەرگەیی.. وە خۆمان تەیار و ئامادە بکەین بۆ پەکخستنی هەر پیلانێکی دوژمنانە و بۆ بەرەنگاریی هەر ڕووداوێکی ناڵەبار و نەویستراو و بۆ بەربەرچدانەوەی هەر پەلامار و هێرشێکی ئەکرێتە سەرمان.

وە لە لایەکی تریشەوە - بەپێی توانا وە هەوڵ بدەین کە چارەیەکی سیاسی بۆ شەڕی ناوخۆ لە کوردستان دا بدۆزینەوە کە بزوتنەوەی ڕزگاریی نیشتمانی گەلی کورد لە بەلای شەڕی لاوەکی لا بدا و نەهێڵێ لە شا ڕێ ی مێژوویی خۆی، شا ڕێ ی خەبات و شەڕ کردن دژی داگیرکەران و ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانیان لا بدا و بخرێتە سەر لاڕێ ی شەڕی

*

## وتاری سێیەم:

(مساوەمە) لە گەڵ داگیرکەران یا لە گەڵ هێزە ناکۆک و جیاوازەکانی کوردستان؟

عێراق و ئێران وەکو دو دەوڵەت کە هەر یەکێکیان پارچەیەکی کوردستانی داگیر کردوە و بەشێکی نەتەوەی کورد ئەچەوسێنێتەوە، لەوەتی دامەزراون، سەرەڕای ئەو ناتەبایی و ناڕێکییەی بە درێژایی مێژو لە سەر سنور و مەزهەب و ڕەگەز و، لە سەر کاروباری سیاسی و ئابوری.. هەیان بوە، هەمیشە لە کاتی مەترسی دا دژی بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی گەلی کوردستان ڕێک کەوتون، پیکەوە نەخشە و پیلانی کوژاندنەوەیان داناوە و تەڵەلایان پەک خستوە. ئەگەر هەندێک جاریش، یەکێک لەم دو دەوڵەتە یارمەتی جولانەوەیەکی کوردییان لە شوێنێک دا دابێت، لە چوارچێوەی وازیی تاکتیکی دەرنەچوە، بۆ بەکار هێنانی مەسەلەی ڕەوای کورد و خەبات و خوێن پێشکەشکردنی، وەکو هێزی زۆر بۆ بردن و گوشار و ئاژاوە نانەوە، بۆ بە دەستهێنانی مەبەستێکی سیاسی، یا سوپایی، ئابوری.. دژی دەوڵەتەکەی تر.

پەنجا ساڵی ڕابوردو چەندین نمونەی هاوکاری ئەم دو دەوڵەتەی تیا ئەبینری دژی گەلی کورد، کە دوایییەکەیان ڕێککەوتنەکەی شا - سەددام بو لە جەزائیر.

*

ڕوخانی ڕژێمی شا لە تیهران، زۆر مەسەلەی لە ناوچەکەدا گۆڕی، یەکێک لەوانە تێکچونەوەی پەیوەندیی هاوکاری و تەبایی عێراق - ئێران بو، کە بە شەڕی پروپاگاندە و دەستوەردانە کاروباری ناوخۆی یەکتری دەستی پێ کرد، تا گەیشتە وردەشەڕی سەر سنور و لە دوایی دا هەڵگیرسانی جەنگ لە بەینیان دا.

هەڵگیرسانی جەنگ لە بەینی ئەم دو دەوڵەتەدا، کە بە هۆی زیاد بونی داهاتی نەوتەوە لە حەفتاکان دا، ماکینەیەکی سوپایی و پۆلیسی گەورە و خوێنیان دروست کرد بو بۆ دامرکاندنەوە و داپلۆسینی گەلەکانی خۆیان و بزوتنەوە شۆڕشگێڕییەکانیان، هەلێکی لەباری ڕەخساند بۆ گەلانی ئەو دو دەوڵەتە بە گشتی، بۆ ئەوەی لە باتی ئەوەی لە شەڕی دو دەوڵەتی چەوسێنەردا، یەکتری شەق و پەق بکەن، هەوڵ بدەن بۆ ڕوخاندنی دەسەڵاتی زۆردارانەی چینە حوکمڕانەکان و ڕوخاندنی بنچینەکانی «ئیستیبدادی شەرقی»، کە بە ناشیرینترین شێوەی لەم ساڵانەی دوایی دا هەم لە حوکمی سەددام و حیزبە فاشیستیەکەی دا و هەم لە حوکمی خومەینی و دەسەڵاتی ئاخوندەکانی ئێران دا، بە دی ئەکری.

هەڵگیرسانی جەنگ ئەگەر بۆ گەلانی هەردو دەوڵەت هەلێکی لە بار بوبێ بەقۆزنەوە، بۆ چاکتر کامڵ کردنی هەلومەرجی دۆخی شۆڕشگێڕانە و گۆڕینی بنەڕەتیی خەسڵەتی دەسەڵاتی سیاسی چینەکانی هەردو کۆمەڵ، ئەوا بۆ گەلی کورد هەلێکی مێژویی ئەوتۆ بو کە لە مێژوی نوێ ی دا بۆ یەکەمین جار بو شتی وای لێ هەڵبکەوێ، کە لە ناو هەردو دەوڵەت دا دو بزوتنەوەی ئۆپۆزیسیونی خۆرت و دیموکرات و پێشکەوتنخواز، وە لە ناو هەردو بەشەکەی کوردستان دا دو جولانەوەی سیاسی - چەکداریی فراوانی خاوەن بنکەی جەماوەریی تیدا بێ، کە هەر یەکەیان خاوەنی بەرنامە و سەرکردایەتی و ڕێکخراوی سیاسی

و چەکدار بێ، لە سەر خاکی خۆی.

هەرچەندە هاوکاری هێز و حیزبەکانی هەردوو دیو لە ئاستی پێویستیەکانی قۆناغەکەدا نەبوو، بۆ قۆستنەوەی ئەو هەلە مێژووییەی، کە دوو دوژمنی دێرینە و بە هێزی گەلی کورد، سەدان هەزار سەربازیان دژی یەکتری لە مەیدانی جەنگێکی قورس و درێژی مایەپووچ دا بەر دابوە گیانی یەکتری، بۆ ئەوەی بە پێ ی گۆڕانەکانی هەلومەرجی نوێ ی نەتەوەیی و ناوچەیی و جیهانی.. چاو بگێڕنەوە بە بەرنامەکانیان دا، بگرە بە ستراتیجی گشتی جوڵانەوەی کوردا لە هەردوو دیو، بۆ دانانی ڕێوشوێنی ناوکۆیی کارکردن و، تەکاندانێکی نوێ بە خەباتی کورد، لە ڕووی دروشم و ڕێباز و شێوەی کارکردنی و هاوپەیمانێتییەوە.

لە کاتێک دا توانای ئەمە لە گۆڕێ بوو، بەڵام بۆچوونی زاڵ و ڕەوتی ڕووداوەکان وەها ڕۆیشت کە هێزە سیاسی - چەکدارەکانی کوردستان هەر لایەنە لە دیوی خۆی دا و لە سنووری بەرنامە و ستراتیجی خۆی دا کەڵک وەربگری لە هەلی خەریک بوونی دەوڵەت و سوپای داگیرکەری وڵاتەکەی خۆی بە جەنگێکی دەرەکی قورسەوە، بۆ گەشە پێدانی جوڵانەوەکەی و بەدەسهێنانی سەرکەوتنی سیاسی و سپایی.

هەڵگیرسانی جەنگی عێراق - ئێران هەلێکی لەبار بو لۆ تێکرای ئۆپۆزیسیۆنی عێراق و دوژمنەکانی ڕژێمی سەددام، وە بە تایبەتی بۆ گەلی کورد و هێزە سیاسی - چەکدارەکانی کوردستان چونکە ئەیانتوانی کەڵکێکی گەورەی لێ وەربگرن بۆ هەڵگێڕانەوەی تای لاسەنگی تەرازووی هێزەکانی ڕژێم و گەلی کورد، بە تایبەتی کە سەددام و حیزبە فاشیستەکەی لە ئەنجامی جێگیربوونی دۆخی ناوەوەی دا و لە ئەنجامی زیادبوونی دەرامەتی نەوت و زیادبوونی ژمارەی هێزە چەکدارەکانی و تفاقی جەنگی و دەسگرتنی تەواوی بە سەر هەمو شوێنە گرنگەکانی کوردستانی عێراق دا، لە دوای ئاشبەتاڵی ١٩٧٥، ناهاوتاییەکی سپایی گەورە و ناهەرامبەرییەکی بێ وێنەی ئەوتۆ لە بەینی هێزی پێشمەرگە و هێزە چەکدارەکانی ڕژێم دا دروست بوبو، کە لە دابەشکردن و بەراوردکردنی ژمارەی هەردولادا، یەک پێشمەرگە زیاتر لە دوسەد چەکداری ڕژێمی عێراقی بەرئەکەوت. تەنانەت هەندێ جار جگە لە هێزی پیادە و جاش کە هێرشیان سەر مەقەڕەو یا کەرتێکی پێشمەرگە، ژمارەی ئەو هالیکۆپتەرانەی بەشداری هێرشەکە ئەبوون، لە ژمارەی پێشمەرگە پەلاماردراوەکان زۆرتر بوون.

لە باری ناهەرامبەری ماددی و بەشەری دا، لە بەینی پێشمەرگە و ڕژێم دا، هەر هێزی مەعنەوی و باوەڕ بو بە ڕەوایی و ڕاستی مەسەلەکە، کەمکورییەکانی پێشمەرگەی پڕ ئەکردەوە و لاسەنگییەکەی هەردوتای تەرازووی هێزەکانی ڕاست ئەکردەوە. لە گەڵ ئەوەش دا بە درێژایی ساڵانی ٧٦ - ٨٠. ڕۆڵە دلێرەکانی کوردستان نەک هەر بەرپەرچی قارەمانەتیەوە بەرگەی دژوارییەکانی هەلومەرجی خەبات و هێرش و پەلامارەکانی دوژمنیان گرت و بەس، بەڵکو لە زۆر مەیدان و شوێن دا جڵەوی دەسپێشکەرییان لە دەس دوژمن دەرهێنا و دەیان داستانی قارەمانێتییان نوسیەوە و سەدان سەرکەوتنی دیاریان لە شەڕگەکان دا بە دەس هێنا.

هەڵبەتە هەڵگیرسانی جەنگی عێراق - ئێران بۆ پێشمەرگە شاییەکی خۆش بو، چونکە سپا و هێزە چەکدارەکانی عێراق، ئیتر نەیانئەتوانی بەر خەستیبە هێرش بهێنن و

بەو چەشنە لە کوردستان دا هێزەکانیان دابەش و جێگیر بکەن و بە گوێرەی توندبوونی شەر و پێکدادان ئەتوانن زیاتر هەندێ لە هێزە داگیرکەرەکانی کوردستان بکێشنەوە و بیبەن بۆ مەیدانی جەنگ لە گەڵ ئێران و لە هەندێ شوێنی تریش دا هێزەکانیان تەنگ بکەن.
خەریک بوونی هێزەکانی دوژمن بە شەڕی سپایەکی نیزامی هاوتای خۆیەوە لە جەبهەیەکی ترەوە، دەسەڵاتی لە کوردستان دا لاواز ئەکرد و توانای شەڕکردنی کەم ئەکردەوە و ئۆرگانەی زەعیفی لە ناوچەکان و باژێر و ئۆردوگاکان دا ئەدا بە دەستەوە.. ئەمانەش هەمووی زەمینەی لەباری بەرزکردنەوەی رادەی چالاکی و وەشاندنی دەستی کاریگەریان لە دوژمن خۆش ئەکرد. بەلام لە هەمان کات دا خەریک بوونی هێزی پێشمەرگەش بە شەڕی ناوخۆ و ناکۆکی دروستکراوی لاوەکییەوە، یەکێ هێزەکانی پێشمەرگەی ئەخست بۆ قۆستنەوەی ئەم هەلە و بە گەڕ خستنی هەموو وزە و توانای دژی ڕژێم و هێزە داگیرکەرەکانی لە کوردستان دا.
تەرخانکردنی هەموو تەقەلا و توانای هێزی پێشمەرگە و ڕێکخراوەکانی یەکێتیی نیشتمانی لە مەیدانی چەکدار، سیاسی، ئیعلامی.. دا بۆ ئەنجامدانی فرمانی سەرەکی لە بەگژاچوونی ڕژێم دا، لە هەلومەرجی ئەوسای کوردستان دا کە هۆکانی شەڕی لاپەلا و تەڵبەندەوەی ناکۆکی لاوەکی لە کایەدا بۆ، پێویستی بە چوارچێوەیەکی گشتی جوڵان و بزوتن بو لە سەر ئاستی کوردستان، عێراق و، ناوچەکە، بۆ کۆکردنەوەی هەموو هێز و تواناکان دژی ڕژێم، یا هیچ نەبێ خاوکردنەوەی گرژی نێوانیان، بۆ ئەوەی لە باتی ئەوەی بە یەکترییەوە خەریک بن هەر یەکەیان لە قوڵی خۆیەوە بە دوژمنەوە خەریک بێ.

•

هەڵگیرسانی جەنگی عێراق - ئێران دۆخێکی وەهای دروست کرد کە دەوڵەتەکانی عێراق و ئێران، وە هێزەکانی دژی عێراق و هێزەکانی دژی ئێران، هێز و دەوڵەتانی ناوچەکە تێکرا کەوتنە جوڵان و وەرگرتنی هەڵوێست و، ناچاری کردن ڕێزبەندیەکی نوێ هەڵبژێرن لە دۆستایەتی، دوژمایەتی، هاوکاری، نۆکەرایەتی، بێلایەنی..
لە لایەکەوە - دەوڵەتی عێراق و دەوڵەتی ئێران هەریەکەیان هەوڵی ئەدا بۆ ئەوەی سود لە خەباتی کورد وەربگری لە ململانێ سپاییەکەی دا وەکو بەشێک لەو جەنگەی دژی ئەوی تر ئەیکرد، وە هەر یەکەیان بە پێ ی تێگەیشتن و بۆچوونی خۆی، هەوڵی ئەدا دەس بخاتە ناو هێزە سیاسی و تەنانەت هێزە عەشایەری و دینیەکانی کوردیشەوە، وە لە ڕوی سپایی و سیاسییەوە کەڵک لە جوڵانەوەی کورد وەربگری بۆ قورسکردنی تای تەرازوی هێزەکانی خۆی لە شەڕدا.
لە لایەکی تریشەوە - حیزب و هێزەکانی کوردستان، ئەوانیش هەر یەکەیان بە پێ ی بۆچون و تێگەیشتنی خۆی، هەر یەکە لە لای خۆیەوە کەوتە وەرگرتنی هەڵوێست و هەوڵدان بۆ وەرگرتنی کەڵک لە تەڵبەندەوەی ناکۆکییەکانی بەینی عێراق و ئێران و گەیشتنی بەرەبەری توندوتیژی واتە پلەی جەنگ، چ بە دروستکردن یا بەهێزکردنی پەیوەندی لە گەڵ ئێران و چ بە دروستکردنی (محور) لە گەڵ هێزەکانی تردا دژی ڕژێمی عێراق.
بێگومان جەمجوڵ و هەوڵدانی هیچ کام لەو لایەنانەش، بە کارێکی سەیر و نائاسایی دانانرێ، بەڵکو لە هەلومەرجێکی وەهادا شتێکی ئاساییە و چاوەڕوانکراوە.
حشع و حسک و لم کە لە هێزەکانی کوردستانی عێراقن و ڕێگەی ململانێ ی

چەکداریان گرتوە دژی ڕژێمی عێراق.. هەر یەکەیان بە جۆرێک و بە شێوەیەک هەڵوێستی خۆی دیاری کرد لە جەنگی عێراق - ئێران، وە هەر یەکەیان بە جۆرێک هەڵوێستەکەی خۆی هەم بە دڵووەزگا ڕەسمیەکانی ئێران ڕاگەیاند و دایە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ئێرانی (ڕادیۆ، تەلەفزیۆن، ڕۆژنامە)، وە هەم لە بەیان و بڵاوکراوەکانی خۆیان دا چەند جارەیان کردەوە. ئەگەرچی ئەمانە بە جیا هەڵوێستی خۆیان دەربڕی بوو، بەڵام ناوەڕۆکی هەڵوێستی هەر ٣ لاکەیان چەن حەرکەیکی لە یەکچوی تیا ئەخوێنرایەوە کە بریتی بوون لە:

أ. دەربڕینی ناڕەزایی توندوتیژ لە هەڵگیرساندنی شەڕ.
ب. توندکردنی مەسئولیەتی هەڵگیرساندنی شەڕەکە لە ملی عێراق.
ج. پشتیوانیکردنی تەواو لە حکومەتی ئێران دژی حکومەتی عێراق.

هێزەکانی ئێمە یەکێک بو لەو هێزانەی ئەیوایە لە هەمو لایەک زیاتر سود لە ئاکۆکی ئێران - عێراق و جەنگەکەی بەینیان وەربگری، بە تایبەتی چونکە لە چاو هێزەکانی تردا، ئەم گەورەترین هێزی شەڕکەر بو دژی عێراق لە سەر ئەرزی کوردستان. جگە لەمەش هێز و ڕێکخراوەکانی ئێمە و جەماوەری خەڵک.. لە ماوەی چەن ساڵ شەڕی نابەرامبەر و خەباتی سەخت و دژواردا ئازارێکی زۆریان لە دەس حکومەتی عێراق و دەزگا دامرکێنەرەوەکانی و هێزە داگیرکەرەکانی چێشت بو، کە لە هی ئەوانیتر زۆرتر بو، ئەمەش هەمو جۆرە هەوڵدان و هارکاریەکی حەلاڵ ئەکرد دژی ڕژێمی عێراق بۆ «هەق» لێ کردنەوە و «هەق» لێ سەندنی. لە لایەکی تریش هەموی گرنگتر: ئەو کاتە چەندین بەرژەوەندی و قازانجی گرنگ و کاریگەری لە ناو ئێران و لە بەر دەسەڵاتی ئێرانیەکان دا بو، بە تایبەتی وەجیبەیەکی گەورەی چەک، کە لە وڵاتێکی دۆستەوە، بێنک لە سەر پەیمان و بەڵێنی ئێرانیەکان، گواستبویەوە ناو ئێران بۆ ئەوەی لەوێوە بیگەیێنێتە کوردستانی عێراق.. لە گەڵ ئەمانەش دا هەمو، ئێمە ئامادە نەبوین لەو هەلومەرجەدا بە پێچەوانەی هەڵسەنگاندن و بۆچونەکانی خۆمانەوە هەڵپەرستانە بجوڵێینەوە، یان هیچ مەرجێکی ئێرانیەکان قبوڵ بکەین کە لە گەڵ سەرەتاکانی خۆمان یا قازانج و دەسکەوتە بنچینەییەکانی نەتەوەی کوردا نەگونجێ.

هەر لەم ڕوانگەیەوە هەم (عرض) ی ئێرانی و مەرجەکانی ئەوانمان دایەوە دواوە و پشتیوانیمان لە حکومەتی ئێران نەکرد، بەو جۆرەی ئەوان ئەیانویست، لەو شەڕەدا دژی عێراق. هەم (عرض) عێراقی و مەرجەکانی ئەوانیشمان ڕەت کردەوە و پشتیوانیمان لە حکومەتی عێراق نەکرد، بەو جۆرەی ئەوان ئەیانویست لەو شەڕەدا دژی ئێران. بەڵکو لامان وابو کە ئەبێ ئەو هەلە مێژوییە بقۆزرێتەوە و شەڕ توند بکرێ، مەک لە گێژاوی (مساومە) ی سوک و پروپوچ و کاتی دا لە گەڵ دەوڵەتی ئێران یان لە گەڵ دەوڵەتی عێراق دا بزر بکرێ و لە دەس بدرێ و، گەلی کورد بهاوێژرێتە داوی فروفێڵی تاکتیکیی یەکێکیانەوە و لە ئەنجام دا ببێتە قوربانیەکی سەرپەراوی ڕێککەوتنەوەی ئەوان. وە ئەگەر (مساومە)ش هەر پێویست بێ، ئەوا ئەبێ لە گەڵ هێزە ئاکۆک و جیاوازەکانی کوردا بکرێ نەک لە گەڵ داگیرکەرانی کوردستان. (کۆمەڵە، شوباتی ١٩٨٢)

*

### ئەنوەر حەسەن و قازان

ئەنوەر حەسەن گەنجێکی هەڵکەوتوی کەرکوک بو. کە دوای تاشبەتاڵ گەڕا خوێندکاری کلیەی هندسە بو لە بەغداد. ئەویش وەکو هاوڕێکانی حوکم درا و لە زیندانی ئەبو غرێب دا مابوەوە تا لە عەفوی ٧٨ دا بەر بو. هەر ئەو کاتە هاتە ریزی پێشمەرگەوە. لە گەڵ ٩ کادری تر نێردران بۆ لوبنان بۆ مەشقی جەنگی دوای گەڕانەوەی کرا بە فەرماندەی هەرێمی ٢ ی کەرکوک.

لە رۆژی ٥ ی مارتی ٨٢ دا هێزێکی تێکەڵاوی جەیش و جاش بە پشتیوانی هەلیکۆپتەر لە گوندی قازان هەڵی کوتایە سەر ئەنوەر و هاوڕێکانی کە بە هەمویان ٢٢ کەس بون. لەم شەڕە نابەرامبەرەدا ١١ کەس کوژرا: ئەنوەر حەسەن. رزگار جەلال (هیمن) ماموستا عەبدولخالق صالح (تاسۆ). ماموستا عەبدوللا صالح (چیا). سوارە شێخ صدیق. کامەران مام عومەر. کەریم چەمچەماڵی (گۆران). نوعمان عەبدی. حەمە شوکر بلەکێنی. نەجمەدین فاتیح (شیروان). موطلق تەقی.

زۆری ئەم پێشمەرگانە کەرکوکی بون. راستیەکەی ئەمە زەرەرێکی گەورە بو. چونکە پاشەرۆژێکی باش لە ئەنوەر و هەندێ-لە کادرەکانی تر ئەکرا.

*

### یەکێتیی نوسەرانی کوردستان

حەمەی حەمە باقی لە زیندان بەربوبو، بەلام نەیئەویست خۆی پیشانی کەس بدات. حەمە پێش گرتنی لە چەند کۆڕێکی ئەدەبی دا شیعری خوێند بوەوە یەکێکیان بە ناونیشانی «بروخێ بێدەنگی» شیعرەکانی رەمزی بون، بەلام دژی زوڵمرەوی بەعس. یەکێ لەو برادەرانەی، لە راگەیاندنی یەکێتی کاری ئەکرد، لە گەڵ هەندێ لە ئەدیبەکانی سلێمانی نێوانی خۆش بو. هات بۆ لام باسی حەمە و هەڵوێستی ئازایانەی سیاسی بۆ کردم، داوای لێ کردم نامەیەکی بۆ بنوسم. ئیمە پێشتر ناسیاویمان نەبو. نامەیەکم بۆ نوسی. برادەرەکە بۆی نارد و دوایی خۆی بە نهێنی چوەوە بۆ سلێمانی. چەند نامەیەکم پێ دا نارد بۆ چەند کەسێکی تریش. حەمە بڕیاری دابو بێتە شاخ و بێ بە پێشمەرگە. لە شۆڕشی ئەیلول دا ماوەیەک لێپرسراوی ناوچە بو لە هێزی رزگاری.

حەمە هاتە دەرەوە قسە و باسی سیاسی و ئەدەبی زورمان کرد. بە لایەوە چاک بو لە گەڵ ئەدیبەکانی کورد لە ناو شارەکان دا پەیوەندی دۆستانە دابمەزرێنین. لە سەر داوای ئەو، مامجەلال و من، چەندین نامەمان نوسی بۆ زوری ئەدیبە کوردەکان لە سلێمانی، هەولێر، بەغداد.. خۆی نامەکانی بۆ بردن. ئەمە کارێکی باشی تێ کردن. کە هاتەوە بیری دامەزراندنی یەکێتی نوسەرانی لە لا گەڵاڵە ببو بە تایبەتی بەعس بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی نوسەرانی کوردی دابو.

تاقمی ئەدیب و نوسەر رویان کرد بوە شاخ، بەلام بە سەر حیزبەکان دا دابەش ببون، لە مانەش هەندێکیان خۆیان خۆیانیان بە ئەدیب و نوسەر ئەزانی. ئەگینا بە پێوانەی ئەدەبی بە «کۆڵکە ئەدیب» یا بە «کۆڵکە نوسەر» یش دائەنران.

هەڵوێستی یەکێتی لە یەکێتیی نوسەران بەم جۆرە بو: یەکێتیەکەیان دور بێ لە دەستێوەردانی حیزبەکان و، «نان و ئازادی» و پێویستیەکانی چاپ و بلاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان بۆ دابین بکرێ.

هەندێ لە نووسەرەکان چەند کۆبوونەوەیەکیان کرد و، بە هاوده‌نگی لە گەڵ ژمارەیەکی زۆر لە نووسەرانی شار، «یەکیەتی نووسەرانی کوردستان»یان پێک هێنا و، گۆڤاری «نووسەری کوردستان»یان بڵاو کردەوە.

لەم گۆڤارەدا بەرهەمی ئەدەبیی نووسەرانی شاخ و چەندین کەس لە نووسەرانی ناسراوی شار، وەکو: شێرکۆ بێکەس، حسێن عارف، مستەفا ساڵح کەریم، رەئوف بێگەرد، دلشاد مەریوانی، تاهیر ساڵح سەعید.. لە ژێر ناوی نهێنی دا، بڵاو کرایەوە.

هەروەها چەندین کۆمەڵەی شیعر، لەوانە: کۆمەڵە شیعری حەمەی حەمە باقی، شێرکۆ بێکەس، حسێن مەولود، جەمیل رەنجبەر و، کۆمەڵە چیرۆک و بابەتی تر لە کتێبی سەربەخۆدا بڵاو کرایەوە.

*

## هەوڵێکی سەرنەکەوتو لە گەڵ حسک

حەمەی حەمە باقی کە هات بۆ شاخ، هەوڵی ئەدا بە هاوکاری لە گەڵ نووسەرانی کە دابەش بوبون بە سەر لایەنەکانی جودا، یەکیەتیی نووسەرانی کوردستان گەشە پێ بدا. لە هەمان کات دا لەو ڕێگایەوە زەمینەی جۆرێ لە ئاشتبوونەوە خۆش بکا. حەمە و زۆر کەسی تریش زۆر جار باسی هەوڵی ئاشتبوونەوەیان لە گەڵ ئەکردین و، ئامادەیی خۆیان دەرئەبڕی بۆ نارۆی و هێنان و بردنی نامە و پەیام.

حەمە لە گەڵ حاجی حاجی برایم دۆستایەتی کۆنیان هەبو. بە هەوڵی ئەو دانیشتنێکی لە شەنێ ڕێک خست لە یەکێتی عومەری حاجی عەبدوڵڵا و من و، لە حسک تاهیری عەلی والی و حاجی بەشدار بون.

پاش هەندێ قسە و باس هاتینە سەر باسەکان. حاجی لە میانەی قسەدا وتی: «مامجەلال برا گەورەی ئێمەشە..» من زۆر قسەکەم پێ بڕی، وتم: «کاک حاجی با واز لەم جۆرە موجامەلاتە بهێنین. لە ئێوە مامجەلال بە براگەورەی خۆتان ئەزانن و، نە ئەویش خۆی بە براگەورەی ئێوە ئەزانێ. ئەوە چەند ساڵە ئێوە لەسەی پێ ئەڵێن. چاکتر وایە بە ڕاشکاوی باسی هۆی ناکۆکییەکان بکەین.»

هەردو لامان ئارەزوویەکی قوڵمان بۆ ئاشتبوونەوە و ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکانمان دەبڕی. لە بەر ئەوەی لە دەس پێ کردنەوەی شۆڕشەکەدا لە گەڵ ئەمان پێکەوە بوبین و، ساڵانێکمان لە ناو یەکێتی دا پێکەوە بە سەر برد بو، لە ناو ڕێکخراوەکانی تردا ئەمانمان لە هەمویان بە نزیکتر دائەنا لە خۆمان. ئێمە باری سەرلێجی خۆمان بۆ ڕوون کردنەوە. زۆر لە مێژ بو ئێمە لامان وابو هۆکانی هەڵگیرسانی شەڕی نێوان ڕێکخراوە کوردییەکان: فرە - لەشکری و، حوکمڕانی و، پارەیە.. پێشنیارمان بۆ کردن: هەر ڕێکخراوە لە کاروباری ئایدیولوجی، سیاسی، ڕێکخراوەیی دا سەربەخۆ بێ، بەڵام دامودەزگاکانی جوڵانەوەکە، بە تایبەتی پێشمەرگە و ڕاگەیاندن و دەسکەوتی دارایی، وەکو نمونەیەک بۆ دەسەڵاتی پاشەڕۆژی کورد، یەک بخەین.

لەو کاتەدا توانای یەکیەتی زۆر زیاتر بو لە هی ئەوان. ژمارەی پێشمەرگەی زۆرتر و، سەرچاوەی دەسکەوتی دارایی فراوانتر و، دەزگای ڕاگەیاندنی: ڕادیۆ و چاپخانە، گەورەتر بو. لە هەمو ئەو شتانەدا ئەبوین بە هاوبەش. ئەوان وەکو حیزب قازانجێکی زۆرتریان ئەکرد. بۆ ئەوەی دڵنیایان بکەین کە ئەوە بۆ هەڵلوشینی ئەوان نیە، پێشنیارمان

کرد فەرماندەی گشتی پێشمەرگە و زۆری فەرماندەی هەرێمەکان لەوان بێ. کەسێکی وەکو کاک تاهیر دابنێن، چ ڕووشوێنێکی تریش بە (ضمان) ئەزانن بۆ دڵنیایی ئەوان ئێمە ئامادەین بیکەین.

نوێنەرەکانی حسک پەرەکەیان لا پەسند بو، داوایان لێ کردین پەڕووراکانی خۆمانیان بۆ بکەین بە پرۆژەیەکی نوسراو بۆ لێکۆڵینەوەی لە مەکتەبی سیاسی حیزب دا بۆیان بنێرین.

*

ئێمەش لە ڕۆژی ۹ ی مارتی ۱۹۸۲ دا پێشنیارەکانی خۆمان لەم پرۆژەیەدا بۆ ناردن:

*

یەکیەتی نیشتمانیی کوردستان دوای هەڵسەنگاندنی باری سیاسی و هەلومەرجی کوردستان و عیراق و بە ڕەچاو کردنی دەسکەوتەکانی بزووتنەوەی خەڵکی کوردستان و عیراق و دۆخی شۆڕشە عیراقیە دیموکراتیەکەمان بە چاکی زانی بەم یادداشتە هەوڵ و تەقەلای یاشکردنەوەی پەیوەندیەکانی هەردولامان و پێکهێنانی هاوخەباتیەکی چەسپاو لە نێوانمان دا بهێنێتە ئەنجام. ئەزانین پێویست، لەزانین دارشتنی پەیوەندی و هاوخەباتیمان لە سەر چەند سەرەتایەکی چەسپاو کە نەتوانی تا سەر بێت و بە ڕاستی و بە جیددی برایەتی و هاوخەباتی نێوانمان پێک بێت و بچەسپێت.

بۆیە بە پێویستمان زانی پێشنیارەکانمان بۆ دو لۆزانج کە پێکەوە بەستراوە بخەینە بەرچاوتان، بە هیوای ئەوەی ئێوەش بە چاوی پەروش و گیانی هەست کردن بە بەرپرسیاریەتی نیشتمانیەوە هەڵیان بسەنگێنن و لە ڕەش و پێشنیارەکانی خۆتان بە نوسین ئاگادارمان بکەنەوە تا لە کۆبونەوەی داهاتوی نوێنەرانی دەسەڵاتداری هەردولا گفتوگۆیان لە سەر بکرێت.

لۆزانجی یەکەم:

یەک و حەکمی بەڵێن ئەدەین بە یەکتری کە:

۱. هیچ کامیان لە گەڵ حیزب و لایەنێکی دیکەدا هاوکاری سیاسی و ئیعلامی و سەربازی نەکات دژی ئەوی دیکەیان بێت.

۲. هیچ کامیان لە سەر حسابی ئەوی دیکەیان، یان بۆ دژایەتی سیاسی و سەربازی و ئیعلامی ئەوی دیکەیان داخلی هیچ جبهەیە یان لیژنەی تنسیق یا ڕێککەوتنێکی دوقۆلی نەبن لە گەڵ هیچ حیزب و لایەنێکی دیکە.

۳. هەردولا ئازادی کاری سیاسی و ئیعلامی و سەربازی دژی ڕژێم و داوودەزگاکانی و، ئازادی گەشەکردنی تەنزیمی و پێشمەرگەیی، بەو مەرجەی بۆ زەرەردان نەبی لەوی دیکە، لە هەمو شوێنەکانی کوردستان بۆ یەکتری بسەلمێنن.

٤. هەردولا نابی پەنا بەرنە بەر ڕێگەی هێرشی چەکدار یا هێرشی ئیعلامی دژی ئەوی دیکەیان بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکی و گیروگرفتەکانی بەینی هەردولا.

٥. هەردولا پەیڕەوی ڕێگەی سیاسی و گفتوگۆی دیموکراتی دەکەن بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفت و ناکۆکیەکانی بەینی هەردولایان.

٦. هەردولا حورمەتی بیروباوەر و ڕێکخستنی ڕێبازی یەکتری بگرن و، ئەندام و

پێشمەرگە و دەستەکانی خۆیان بە گیانی دۆستایەتی و هاوکاری و پەیوەستی بە دەنگوباسی یەکتری ئامۆژگاری بکەن.

٧. هەروەها هێزەکانی پێشمەرگە و ڕێکخراوەکانی خۆیان هان ئەدەن بۆ تەرکیز کردنە سەر ڕژێم و دامودەزگاکانی و بۆ کاری هاوبەش و بۆ دانانی نەخشە و پلانی هاوبەش.

٨. هەروەها هەوڵ ئەدەن هەڵوێستە گشتییەکانیان لە ڕووداوە گرنگەکانی دێنە پێشەوە بە ڕێگەی گفتوگۆ یەک بخەن. لە کاتی پەلاماردانی لایەکیان دا لە لایەن لایەکی دیکەوە بە نارەوا، لایەکەی دیکە داکۆکی لێ ئەکات.

٩. هەمو ئەو بڕیار و ئامۆژگارییانەی پەیمانەی ئەم ڕێککەوتنە و پێشتر لە سەرکردایەتی و دەزگاکانی هەر کام لەم دولایەنەوە بە نهێنی یا بە ئاشکرا دەرچوە، هەڵئەوەشێتەوە ئیتر کاریان پێ ناکرێت.

لقڕگەی دوەم:

١. یەک و حسکم پەیمان ئەدەن کە ئازادی ژیانی سیاسی بۆ خۆیان و هەمو حیزب و ڕێکخراوە سیاسی و دیموکراتیەکانی کوردستان ئەسەلمێنن و، لە سنوری دەسەڵاتی خۆیان دا ئەیپارێزن.

٢. یەک و حسکم پەیمان ئەدەن کە هەوڵی خۆیان یەک بخەن بۆ ئامادەکردنی هەلومەرجی یەکخستنی هەمو دامودەزگا گرنگەکانی شۆڕش لە ڕووی سەرکردایەتی و بەرنامەی گشتی و هێزە چەکدارەکانی و شێوەی کارکردنی و بەڕێوەبردنی ناوچەکانەوە بە:

یەکەم: یەکخستنی هێزی پێشمەرگە لە ڕووی سەرکردایەتی و شێوەی ڕێکخستن و شێوەی شەڕکردنیەوە، بە جۆرێک ببێتە سوپای یەکگرتوی هەمو گەلی کورد لە کوردستانی عێراق دا کە هەمو حیزب و ڕێکخراوەکان بە جیاوازی بیروباوەڕیان بەشداری تێ دا بکەن.

دوەم: پێکهێنانی بەڕێوەبەرایەتی یەکگرتو لە ناوچەکان دا کە نوێنەری دەسەڵاتی کۆمەڵانی خەڵک و شۆڕش بێ لە ناوچەکان دا بۆ ڕێکخستنی پەیوەندیەکانی نێوان دانیشتوان.

سێیەم: یەکخستنی داراییەتی ماڵی، چ ئەوەی لە ناوەوە دەس ئەکەوێ و چ ئەوەی بە یارمەتی لە دەستەکانی دەرەوە وەرئەگیرێ، بۆ سەرف کردنەوەی بە سەر دامودەزگاکانی شۆڕش دا.

چوارەم: یەکخستنی سیاسەتی ئیعلامی شۆڕش و توانای لایەنە بەشدارەکانی لە دامودەزگای ئیعلامیی یەکگرتودا لە ناوەوە و دەرەوە.

*

## مەیدانی ئازاد

لە کاتێک دا حشع لە ژێر سایەی بەعس دا سەرکردایەتیی حیزبی بەعسی لە ژیانی سیاسی عێراق دا لە حوکمڕانی و لە جەبهەدا سەلماند بو، ڕێکخراوە دیموکراتیەکانی خۆی هەڵوەشاند بوەوە، هیچ جۆرە چالاکیەکی لە ناو هێزە چەکدارەکانی عێراق دا نەئەنواند، لە کوردستان بە پێچەوانەوە ئەجوڵایەوە. ئامادە نەبو دەس لە بچوکترین دەسکەوتی حیزبیی خۆی هەڵبگرێ. نەیویست ئەوەی لە لای بەعس دۆڕاند بوی لێرە مایەکەی دەر بهێنێتەوە. لە بەرامبەر ئەم بیرەی ئەمەدا: بیری یەکخستنی دامودەزگاکانی شۆڕش، یەکخستنی پێشمەرگە

و دارایی و راگەیاندن، حەشع لەوەتی گەڕابووەوە بۆ شاخ بیریکی پێچەوانەی هێنا بوو کایە: کوردستان مەیدانێکی ئازاد بێ بۆ چالاکی سیاسی و پێشمەرگەیی هەموو حیزبەکان بە بێ جیاوازی بیروباوەڕیان. حیزبەکانی تریش ئەم بالنۆرەیەیان دووبارە ئەکردەوە.

مەبەستیان لە مەیدانە ئازادەکە، ناوچەکانی چالاکی یەکێتی بوو، ئەگینا هیچ لایەکیان باسی یادەبنانیان نەئەکرد کە پارتی پارانی کرد بوو بە تەنیا بۆ خۆی.

مەبەستیشیان لە چالاکی سیاسی و پێشمەرگەیی، حوکمڕانی ناوچەکان و، کۆکردنەوەی گومرگ و باج و سەرانە و، گرتن و بەردانی خەڵک بوو، نەک شەڕ کردن لە گەڵ هێزە چەکدارەکانی بەعس. لە ناو ئەو هێزانەدا زۆر کەس هەبوون، دەیان ساڵ چەکیان بە شانەوە بوو، بەڵام تەنیا یەک جار تووشی شەڕ نەبووبوون لە گەڵ هێزەکانی حکومەت.

خۆپەرستی لە ناو سەرانی ڕێکخراوە کوردییەکان دا زۆر قووڵ بوو، زۆربەیان ئەوەیان پێ گەورەتر و خۆشتر بوو، کە سەرکردەی حیزبێکی ۱۰ کەسی بێ، نەک ئەندامی سەرکردایەتی یەکگرتووی جوڵانەوەیەکی ۱۰ هەزار کەسی. بۆ پاساودانی ئەمەش زۆرجار «تەنگوچەڵەمەی باوەڕ» یان ئەکرد بە بیانووی یەک نەگرتن و، یەک نەخستنی داووەدەزگاکانی جوڵانەوەکە. تەنگوچەڵەمەی بێ باوەڕییان ئەوەندە قووڵ کردبوو، هەر لایەک هەموو قسە و پرۆژە و کرداری لاکەی تری، ئەگەر بە نیازی باشیش بوایە، بە جۆرێکی تر لێک ئەدایەوە. لای وایە ئەو ماستە بێ موو نییە و، لە بن ئەو شتە باشەدا پیلانێک یا نیازێکی خراپ و دوژمنانە حەشار دراوە.

هەر بۆ ئەو بێ باوەڕییە دروستکراوە، لێرەدا دوو نموونە ئەهێنمەوە:

- ملازم محەممەد شەوقی، یەکێ لە سەرانی پاسۆک، لە هاوڕێکانی نزیک بوو. سەرانی پاسۆک گومانیان لە یەکێتی بوو لە پەناوە لە ناویان برد بێ. چەندی پاکانەمان بۆ ئەکردن نەیانئەویست باوەڕ بکەن. تا خۆیان ڕووداوەکەیان بۆ ڕوون بووەوە. لە کاتی گەڕانەوەی دا لە ناوچەی سلێمانی، بە ناو ئێراق دا تێ پەڕی بوو. لەو کاتەدا شەڕ لە کوردستانی ئێران گەرم بوو. ئەو ناوچەیەی ئەوی لێ تێ پەڕی بوو، کەوتبووە بەر هێرشی هالیکۆپتەری ئێرانی و، لەوێ کوژرا بوو.

- عەلی هەژار و کوردۆ گەلالی، دوو کادری سەرکردایەتی حسک، لە ناو شار بێ سەر و شوێن بزر بوون. لێپرسراوەکانی حسک ماوەی چەند ساڵ یەکێتییان تاوانبار ئەکرد بە فڕاندنیان. چەندی پاکانەمان بۆ ئەکردن نەیانئەویست باوەڕ بکەن تا خۆیان دوای ڕاپەڕین لە ناو فایلەکانی «ئەمن» ی هەولێردا، چارەنووسی هاوڕێکانیان بۆ ڕوون بووەوە.

سەرانی حسک ئەم پرۆژەیەیان وەکو پێشبینیمان کرد بوو وا لێک دابوەوە کە ئەوە بۆ هەڵلووشینی ئەوان و، تێکدانی ڕیزەکانی جووە. لە چەند دانیشتنێک دا لە گەڵ سەرانی پاسۆک، پێشنیارێکی لەو بابەتەمان بۆ ئەوانیش کرد، ئەوانیش قبووڵیان نەبوو. بە دوای ئەوانیش دا شێخ قادری سۆتکە «لەشکری ئیسلامی کورد» و سامی سنجاری «پارتی دیموکراتی گەلی کوردستان» و شێخ محەممەد خالیدی بارزانی «حیزبوڵڵا» یان دامەزراند.

کوردەکانی موکریان قسەیەکیان هەیە ئەڵێ: «شەندە لە مەندە کەمتر نییە» ئەم حیزب و ڕێکخراوانە هیچیان خۆی لەوی تر بە بچووکتر نەئەزانی. هەموو ئەمانە سوور بوون لە سەر ئەوەی: هێزی چەکداری تایبەتی خۆیان، دەزگای ڕاگەیاندنی خۆیان، پەیوەندی تایبەتی خۆیان لە گەڵ دەوڵەتان، دەزگای تایبەتی پارە کۆکردنەوە و پارەسەندنی خۆیان، دادگا و

زیندانی تایبەتی خۆیان هەیە.. ئەوانەیان بە نیشانەی سەربەخۆیی حیزب و، گەورەیی سەرکردە و سەرکردەکانیان ئەزانی.

ساڵی ١٩٨٢ سەرەڕای هێزەکانی یەکێتی، ئەو هەموو لەشکرە بێ دیسیپلینەی: پەدەک، حشع، حسک، لاک، گەل، حیزبوڵڵا.. لە کوردستان دا تەراتێنیان ئەکرد. بە ئارەزووی خۆیان پارەیان لە خەڵک ئەسەندو ڕاووڕووتیان ئەکرد، بێگاریان بە لادێیی ئەکرد، خەڵکیان ئەفڕاند و ئەکوشت، لەیان ئەبوو بە جاشی حکومەت و ئەچوونەوە ئەبوونەوە بە پێشمەرگە، دالدەی گومانلێکراو و تۆکەرانی بەعسیان ئەدا. حشع چونکە خۆی حیزبێکی بچووک بوو، بە خۆشییەوە سەیری پارچە پارچە بوونی جوڵانەوەی کوردی ئەکرد و، حەزی ئەکرد سەدان وردە حیزب و ڕێکخراو لە سەر ئەرزی کوردستان دا دروست بێ، بەڵکو ئەو خۆی بێ بە گەورەترینیان.

*

## خۆپیشاندانی شارەکان

ساڵی ٧٤ ژمارەیەکی زۆری مامۆستا و خوێندکارەکانی زانکۆی سلێمانی چوونە ڕیزی شۆڕشەوە. سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاری دا زانکۆی سلێمانی لە قەڵادزێ دابمەزرێنێتەوە. مامۆستا و خوێندکارەکانی لەوێ کۆ کردەوە. هێزی ئاسمانیی عێراق لە ڕۆژی ٢٤ ی نیسانی ٧٤ دا شاری قەڵادزەی بۆردومان کرد. نزیکەی ٢٠٠ کەس کوژران. هەندێکیان خوێندکار بوون. لە ناو خوێندکارەکان دا ٣ ئەندامی کۆمەڵە کوژران.

لە بەر ئەوەی تا ئەو کاتە بە کۆمەڵ لە یەک ڕۆژدا ئەوەندە نەکوژرا بوو. سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاری دا ئەم ڕۆژە بکا بە «ڕۆژی شەهید».

بۆ زیندووکردنەوەی ئەم یادە دانیشتوانی قەڵادزە بە هاندانی ڕێکخراوەکانی یەکێتی لە بەهاری ٨٢ دا کەوتنە خۆسازدان. ڕۆژی ٢٤ ی نیسان ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی قەڵادزە لە سەرقەبران کۆبوونەوە و، چەند لافیتەیەکیان بەرز کردەوە و کەوتنە ڕێپێوان بەرەو ناوشار. خۆپیشاندانەکە گەورە بوو. هێزەکانی بەعس تەقەیان لێ کردن دوو ئافرەت کوژرا: سنەوبەر محەمەد، مامۆستای سەرەتایی. ئامینە سوور، کەیبانوو. ٧٤ کوڕ و ١١ کچ گیران. دانیشتوانی شار دوکان و بازاڕیان داخست و دائیرەکان مانیان گرت. پشێوی و نائارامی تا ٣٠ ی نیسانی خایاند.

ڕادیۆکەی یەکێتی ڕیپۆرتاجێکی دەنگیاری لە سەر ئەم ڕووداوە بڵاو کردەوە. هاوڕێیانی ڕێکخستن ڕووداوەکەیان بە ڕێکوپێکی تۆمار کرد بوو، وێنەی زۆریشیان لێ گرت بوو. ڕادیۆکەمان کەوتە هاندانی خەڵک بۆ خۆپیشاندان دژی بەعس. داوا لە هەموو ڕێکخراوە نهێنییەکانی یەکێتی کرا خۆیان ساز بدەن بۆ خەبات و کاری جەماوەری.

کوژرانی ئەو دوو ئافرەتە ئاوی بە ئاگردا نەکرد، بەڵکو زیاتر خەڵکی وروژاند. هەڵومەرجی ناو شاری قەڵادزە ئاڵۆزا بوو. لە چلەی ئەو دوو شەهیدەدا خۆپیشاندانێکی گەورەتر ساز کرا. ئەم جارەش هێزەکانی بەعس لێیان دا بەڵام پێیان سەرکەوت نەکرا و، نائارامی درێژەی کێشا و تەنییەوە.

بۆ هاودەنگی لە گەڵ خۆپیشاندەرانی قەڵادزێ ئۆردوگاکان ڕاپەڕین. جادەکانیان بە تایەی سووتاو دائەخست و، کۆبوونەوەی فراوان ئەکرا. هوتافیان بە ژیانی پێشمەرگە و ڕووخانی بەعس ئەکێشا. ڕۆژانە ڕیپۆرتاجی دەنگدار و تۆمارکراوی ئەم ڕووداوانە ئەگەیشتە

دەزگای ڕاگەیاندن و، ڕادیۆکەیش بۆ هاندانی زیاتری خەڵک بە لێدوانەوە بڵاوی ئەکردەوە. لە زۆر جێگا ڕادیۆکەی یەکێتییان ئەخستە سەر مێکرۆفۆنی مزگەوتەکان. ڕێکخراوەکانی سلێمانی کەسوکاری شەهیدانیان لە گۆڕستانی شەهیدان سازدا و، بە ڕێپێوان لە گردەکەوە بەرەو ناوشار بە ڕێ کەوتن. خۆپیشاندانەکە گەورە بو. هێزەکانی بەعس تەقەیان لێ کردن و چەند کەسێکیان کوشت. ئەو کۆڵانەکانی سلێمانی بوو بە جێگەی کۆبونەوەو خۆپیشاندانی بەردەوام. بە دەس پێشکەری ڕێکخراوەکانی هەولێر، خوێندکارانی زانکۆی سەلاحەددین خۆپیشاندانێکی گەورەیان ڕێکخست. لەویش چەند کەسێ گیران و چەند کەسێ کوژران. بۆ پشتیوانی لە خۆپیشاندانی شار و ئوردوگاکان، جگە لەوەی بە ڕادیۆ ئەکرا، پێشمەرگەش ڕادەی چالاکییەکانی لە دژی هێزەکانی بەعس زۆر زیاد کرد و، چەندین جار چونە ناو سلێمانی و هەولێرەوە.

نائارامی سەرانسەری ناوچەکانی سنوری گرت بووەوە. بەردەوام لە شار و ئوردوگاکان دا خۆپیشاندان و کۆبونەوە بۆ دەربڕینی نارەزایی لە ڕژێم هەبو. بەڵام ئەمە لە ناوچەیەکی دیاریکراودا قەتیس ما بو؛

- ئیمە نەمانتوانی بادینان بجوڵێنین. پارتی و حشع بەش کارێکیان نەکرد بۆ جوڵاندنی. لەو کاتەدا سەرکردایەتی پارتی لە ڕاژان بون لە نزیک ورمی ئاگایان لەم ڕوداوانە نەبو، مەگەر لە ڕێگای ڕادیۆی لایەنەکانی ترەوە.
- لە بەغداد خوێندکارانی کورد لە چەند زانستگایەک کەوتنە مانگرتن و خۆپیشاندان، بەڵام خوێندکارانی عەرەب بە دەنگیانەوە نەهاتن.

کاربەدەستانی بەعس لە زۆر جێگا لە دۆستەکانی خۆیان و لە پیاوماقوڵانی ناوچەکەیان ئەپرسی ئەمانە چییان ئەوێ؟

هەر لە سەرەتاوە بۆ ئەوەی باری ئەم کارە شۆڕشگێڕانەیە لە توانای خۆی زیاتر قورس نەکەین و، بە تەدریج لە گەڵ گەورەبون و تەنینەوەی ڕاپەڕین دا دروشمەکانی بگۆڕێ، ئەمان هێشت داواکاری زل و قەبە بکەن بە دروشمی خۆپیشاندانەکان. داواکارییەکان بریتی بون لە:

- بەردانی گیراوە سیاسییەکان.
- گێڕانەوەی جوتیارەکان بۆ دێهاتەکانی خۆیان.
- نەمانی تیرۆر تۆقاندن لە شارەکان دا.

لایەنەکانی جود، بە تایبەتی حشع، لە ڕادیۆکەیان دا داوایان لە خەڵک ئەکرد، تا ڕوخاندنی ڕژێم بەردەوام بن. بەڵام خەڵک بایەخیکیان بە قسەکانی ئەوان نەئەدا.

لەو کاتەدا باروودۆخی عێراق لە مەیدانی جەنگ دا باش نەبو. تەرازوی شەڕ بە قازانجی ئێران داشکا بو. عێراق بۆ دامرکاندنەوەی ئەم نارەزاییە هەندێ لەو داوایانەی جێبەجێ کرد؛

- زۆربەی گیراوەکانی بەردا.
- چاوپۆشی لە دانیشتوانی هەندێ ناوچە کرد بگەڕێنەوە سەر گوندەکانی خۆیان.
- زەبروزەنگ لە ناو شارەکان دا لە جاران کەمتر بووەوە و، هەندێ لە جەللادەکانی لە پایەتی موڵازم موحسینەکەی سلێمانییان گوێزایەوە.

ئێستر ئیمەش هەم ئامۆژگاری ڕێکخراوە نهێنییەکانمان کرد بە شێنەیی کۆتایی پێ

بهیتن و، له رادیۆکەیشمان دا زمانی هاندانمان گۆری.

کاکەسین قادر، که یەکێ بو له هاندەرە چالاکەکانی خۆپیشاندانەکانی قەلادزە، هەر ئەو کاتە وتاریکی دریژی له سەر خۆپیشاندانی قەلادزە به ناوی «زەریا» وە بۆ گۆڤاری گزمطه نوسی.

*

یەکەمین جار بو کوردستان بەو جۆرە پشلەقێ. دەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێم زۆر به توندی کەوتنه دامرکاندنەوەی. د. فاضیل بەرواک ئەوسا بەرپۆوەبەری «ئەمن» بو راپۆرتیکی دریژی له سەر رووداوەکان بۆ صەددام نوسیوە. صەددامیش بە خەتی خۆی هەندی پەراوێزی لی نوسیبوه. به پی ی ئەو راپۆرته ژمارەی کوژراو و گیراوەکانی خۆپیشاندانەکان بەمجۆرە بوە:

سلێمانی ١١ کوژراو ٢٣ بریندار ١٣١ گیراو

کەرکوک ٦ کوژراو ٩٥ بریندار ٢١٠ گیراو

هەولیر ٧ کوژراو ٢٠ بریندار ٤١٠ گیراو

دهۆک خۆپیشاندانی تی دا نەبوبو، له بەر ئەوە قوربانیشیان نەبوە.

*

## قاسملو و ناویژی

له بەهاری ٨٢ دا لەو کوبونەوانەدا که د. قاسملو له گەڵ سەرکردایەتی یەکیتی ئەکرد، چەند جاری باسی گفتوگۆی لە گەڵ بەعس ئەهێنایە پیشەوە. هەمان باسی له گەڵ سەرانی حشع کرد بو.

ئیمە لە ناوخۆمان دا لەم باسەمان کۆلیەوە. مامجەلال هیچ باوەریکی بە بەعس و بە گفتوگۆ نەبو له گەڵی. بەلام ئیمە هەموومان لامان وابو: ئەگەر بەعس لایەنی کەمی مافەکانی کورد بسەلمێنی، بۆچی لە گەڵی ریک نەکەوین، بە تایبەتی لەو هەلومەرجە ئالۆزەدا کە ئەوسا جولانەوەی کوردی تی کەوت بو؟

ئەو کاتە هەلومەرجی سیاسی رۆژهەلاتی ناوەراست گۆرانیکی قولی بە سەردا هات بو:

یەکیتی و، ریکخراوە کوردییەکانی تر له عیراق له شورش دا بون.

حدکا و، ریکخراوە کوردییەکانی تر له ئیران له شورش دا بون.

هەمو حیزب و ریکخراوە کوردییەکان لە تورکیا دژی خونتا و کودەتاکەی راوەستا بون و، پی کا کا خەریکی خۆ ئامادە کردن بو بۆ کاری چەکدار.

عیراق لە جەنگ دا بو دژی ئیران، نیشانەی بە لاداکەوتنی بە شەر یا بە ریگای سیاسی لە ئاسۆدا دیار نەبو. بەلکو ئیران هیزەکانی خۆی ریک خست بوەوە، لە چەند شوین جەبهەی عیراقی شکاند بو.

سوریا لولەی نەوتی عیراقی راگرت بو، لە هەولیکی جیددی دا بو بۆ روخاندنی عیراق و، عیراق سوریای بە هاوکاری ئیران و بە خائینی نەتەوەی عەرەب دائەنا.

حوکمی عەسکەری خونتا له تورکیا، ئیران و سوریای بە دەستیوەردان له کاروباری ناوخۆی تاوانبار ئەکرد.

هەلومەرجیکی کوردی و ناوچەیی ئالۆز و تیکەڵ و پیکەڵ خولقا بو. رووداوەکانی

ئێران و جەنگی عێراق - ئێران هۆی سەرەکی ئەم ئاڵوزانە بو. حکومەتی عێراق، ئەگەر پێویستایە ئەیتوانی ڕۆڵێکی گەورە لە ناو جوڵانەوەی نەتەوەیی کوردا بە ئازادی خۆی بگێری و، هەموجوڵانەوەی نەتەوەیی کورد، لە سەرانسەری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا، بکاتە پشتیوانی خۆی. عێراق ئەیتوانی یارمەتی شۆڕشی کوردەکانی ئێران بدا و، یارمەتی ڕێکخراوە کوردییەکانی سوریا و، یارمەتی کوردەکانی تورکیایش بدا. جوڵانەوەی کورد لەم پارچانەدا جوڵانەوەی ڕەسەن بون، حیزبی سیاسی و دامودەزگای تا ئەندازەیەک پێشکەوتویان هەبو. ئەم هێزە کوردییانە ئەیانتوانی لە ناکۆکی عەرەبی - ئێرانی و، لە ناکۆکی عەرەبی - تورکی دا، لولاپێکی ستراتیجی بۆ عێراق و عەرەب دروست بکەن. ئەویش تەنیا بەوە ئەکرا کە مافی نەتەوەیی کورد لە عێراق دا بسەلمێنی و، کورد لە دەزگای بڕیاردانی سیاسی عێراق دا بکا بە هاوبەش. لەمە ئەگەر هیچی دەس نەکەوتایە کوردی عێراقی ئەکرد بە پشتیوان و یارمەتیدەرێکی بەهێز لە ملمڵانێ ی خۆی و ئێران دا.

*

گفتوگۆ، بەڵکو پەیوەندی ڕوت، لە نێوان یەکێتی و بەعس دا، لە سەر یەکێتی زۆر ئەکەوت:

- هەمو هێزە کوردییەکانی نەیار و ناحەزی یەکێتی، ئەیانکرد بە کەرەستەیەکی بە پێزی شەڕی پڕوپاگاندە بۆ شکاندنی یەکێتی.

- هەمو هێزە عێراقییەکانی موعارەزەی عێراقی، ئەیانکرد بە بەهانەی پەلاماردانی یەکێتی.

- ئێران ئەیکرد بە بیانو بۆ زیاتر دوژمنایەتی کردنی یەکێتی و، سوریا و لیبیا ئەیانکرد بە بیانو بۆ تەنگ هەڵچنینی زورتر بە یەکێتی و، بڕینی ئەو یارمەتیە کەمەی ئەیان دایە.

لە بەرامبەر ئەم هەمو زیانە سیاسی و مەعنەوییەی یەکێتی دا بەعس چی بۆ ئەکرد و، چۆن زەرەرەکانی بۆ ئەبژارد؟

ڕەنگە یەکی لەو لایەنانەی بەعس، وەکو بیروباوەڕ و حیزب و وەکو سەرکردە و زەلام، لە هەمو لایەن و کەسێکی تر باشتر بناسی یەکێتی و سەرکردەکانی بی. ئاشنایی لە گەڵ بیروباوەڕی بەعس و، ناسیاوی لە گەڵ هەندی لە سەرکردەکانی ئەگەڕایەوە بۆ ماوەیەکی درێژ پێش ئەوەی حوکمی عێراق بگرنە دەس.

*

خواستەکانی یەکێتی

هەر لە سەرەتای دەسپێکردنەوەی شۆڕشەوە حکومەت هەرچەن یەکێکی ئەنارد بۆ گفتوگۆ، ئەیپرسی: چیتان ئەوێ؟

هەڵبەتە کاربەدەستانی حکومەتی عێراق و حیزبی بەعس ئەیانزانی کە سەرکردایەتی یەکێتی هیچ داواکارییەکی عەشیرەتی، یا شەخسی، یا تەنانەت حیزبایەتیشی نیە و، ئەیزانی کە داواکانی، بریتیە لە داواکانی گەلەکەمان و مافە نەتەوایەتی و دیموکراتییەکانی. ئەم جارەیان کە حکومەت لە ڕێگەی د. قاسملوەوە لە ئێمەی پرسی: چیتان ئەوێ؟ داواکانی خۆمان بۆ چارەسەرکردنی(هەمیشەیی، لەزناغی، جەرزنی) کێشەی نەتەوایەتی گەلی کورد لە عێراق دا لە ۳ چوارچێوەدا دارشت:

یەکەمیان - ڕێککەوتنێکی گشتی و ڕیشەیی بۆ ئێستا و پاشەڕۆژ لە چوارچێوەی هاوپەیمانێتییەکی ستراتیجی دا کە خۆی ئەنوێنی لە پێکهاتن و ڕێککەوتنی نەتەوەی کورد و نەتەوەی عەرەب لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا لە سەر بنچینەی دانانی بە مافی یەکتری دا لە ئازادی بڕیاردانی چارەنوسی خۆی دا، کورد وەکو نەتەوەیەکی دابەشکراو و چەوساوە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا و، عەرەبیش وەکو نەتەوەیەکی دابەشکراو و چەوساوە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا، هەر یەکەیان ئامانجی خۆی هەیە لە یەکگرتنەوە و ڕزگاری دا وە لە پێشکەوتنی کۆمەلایەتی دا، کە ئەتوانن پێکەوە پەیمانی هاوکاری ستراتیجی ببەستن بۆ داناني ڕیوشوێنی ناوچەکە و جۆری پێکەوە ژیانیان.

بەم پێ یە بەعس ئەبێ لە مەیدانی سەلماندنی مافی نەتەوەیی گەلی کوردا، نەک هەر مافی ئۆتۆنۆمی بسەلمێنێ، بەلکو ئەبێ دان بە مافی ئازادی بڕیاردانی چارەنوسی دا بنێ.

دووەمیان - ڕێککەوتنێکی قۆناغیی سنووردار، لە چوارچێوەی دەولەتی عێراق دا لە سەر بنچینەی سەلماندنی ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینە، بە چەشنێک کە تەنها کاروباری: «دیفاع و مالیە و خارجیە» لە دەسەلاتی حکومەتی مەرکەزی بێ و کاروبارەکانی تر لە دەسەلاتی حوکمی ئۆتۆنۆمی بێ.

لە گەل ئەوەش دا:

- ناوچە ڕاگوێزراوەکانی سنور بە گوێرەی پلانێکی گشت لایەنە (شامل) بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان.

- ئەو شار و ناوچانەی کوردستان کە لە سنوری حوکمە زاتیەکەی ئێستا دەرهێنراون، بخرێنەوە سەر کوردستان.

- تۆقاندن و دەسەلاتی دەزگا داسەپێنەرەوەکانی لە کوردستان دا نەمێنێ و ئازادی دیموکراتی بدرێ بە هەمو لایەنە جیاوازەکان.

سێیەمیان - ڕێککەوتنێکی جوزئی و وەقتی بۆ ڕاوەستاندنی تەقە لە بەینی هێزە چەکدارەکانی یەکێتی و هێزە چەکدارەکانی حکومەت دا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، تا مەترسی جمهوریەتی ئیسلامی تهران هەم لە سەر عێراق و هەم لە سەر هەردو دیوی کوردستان دور ئەخرێتەوە و لەو ماوەیەش دا هەلی گفتوگۆ لە سەر چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد ئەڕەخسێ.

*

## شۆڕشی بێ موسیقا

ڕۆژێکیان خەریکی شتنی قەسەلەکەم بوم. تەشتێکی گەورەم دانا بو قەسەلەکەم تێ خست بو، خەریک شۆردنی بوم. حەمەی حەمە باقی بە هەلە داوان هات کردی بە هەرا، وتی: «ئێوە ڕیزی هونەرمەند ناگرن! ئێوە ڕیزی نوسەر ناگرن! ئێوە هەر چەک و چەکدارتان بە لاوە گرنگە!..»

وتم: «کاکە حەمە هێواش! چیە؟»

وتی: «دلێریان نارد حەمەی بکەن!»

وتم: «دلێر کێ یە؟»

وتی: «دلێر موسیقارێکی گەورەی کوردە!»

وتم: «کێ ناردویەتی حەپسی بکا؟»
وتی: «ئەرسەلان»
وتم: «دانیشە ئێستا ئەنێرم بە دوریا بیهێنن بۆ ئێرە، ولێ ئەدەینەوە و لە گەڵ ئەرسەلان ئاشتیان ئەکەینەوە!»

ئەرسەلان کاروباری راگەیاندنی یەکێتی ئەکرد. ناردم بە دوای دلێر دا هات. چیرۆکەکەم لێ پرسی وتی: «من تازە هاتومەتە دەرەوە. لە شار لە ڕێکخستن دا بووم. ئەرسەلان ناردی بۆ فلان بەش لە راگەیاندن لە بەر ئەوەی لە گەڵ زۆولێ من نەئەگونجا وتم ناچم. وتی ئەبێ هەربچی. وتم ناچم. وتی ئەگەر نەچی ئەتنێرم بۆ زیندان. وتم هەر ناچم. لە سەر ئەوە ناردی حەپسم بکەن»

دیار بو دلێر چاوەڕوانی پێشوازی گەرم و نازکێشانی زۆری کرد بو، ئەم ڕەفتارەی ئەرسەلان پێچەوانەی چاوەڕوانییەکانی ئەو بو، زۆر دلگیر ببو. من دلم دایەوە و، ویستم تووڕەیینەکەی خاو بکەمەوە و تێی بگەیێنم کە یەکێ دێتە دەرەوە ئەبێ بە گوێرەی پێویستییەکانی جولانەوەکە لێرە یا لەوێ دابنرێ، نەک بە ئارەزووی خۆی، ئەگینا کارەکان ناڕۆن و، تۆ پیاوێکی تێکۆشەر و هونەرمەندی، ئەو شتانە لە خەلکی تر باشتر ئەزانی، ئەرسەلانیش پیاوێکی تێکۆشەرە و، تازە لە زیندان هاتۆتە دەری و، شارەزای کاروباری راگەیاندنە و، بۆ قازانجی راگەیاندن ئەو داوایەی لێ کردوی، ئەبوایە قبولت بکردایە یان بە خۆشی و بێ تووڕە بون رەتت بکردایەتەوە. هەرچی لە گەلم وت دلی نەهێنەمەوە جێگای خۆی کەلکی نەبو. ویستم لە گەڵ ئەرسەلان دایان بنێم و لە یەک نەگەیشتنەکەیان چارە بکەم دیسان کەلکی نەبو، بێئەندازە لاسار بو، سوور بو لە سەر ئەوەی ئیتر بە لای موسیقا دا ناچێ و، پێشمەرگایەتی ئاکا، منیش گەیشتە ئێنم، وتم: «کاک دلێر عاجز مەبە، شۆڕش بە بێ موسیقایش ئەکرێ!»

دلێر ئەم قسەیەی منی لە دل گرت بو، هەرگیز لە بیری نەئەچووەوە، لای چەندین ڕۆشنبیر و موسیقار بە گلەییەوە باسی کرد بو.

دلێر لە گەڵ ئەرسەلان ئاشت بووەوە. تیپێکی موسیقای دامەزراند. تیپەکەی ناو نا بو: «تیپی موسیقای شەهید کاوزان». لام وایە وشەی شەهید: کە نیشانەی مردنێکی پیرۆزە و لە کوردەواری دا شیوەن بە دوای خۆی دا ئەهێنێ، لە گەڵ تیپی موسیقا: کە خۆشی تێدا بە زیان و لە کوردەواری دا شایی بە دوای خۆی دا ئەهێنێ، دو شتی نەگونجاو بن. هەر لە بەر ئەوەی لە سەرەتاوە بەم جۆرە تێگەیشتنە تیپەکەیان دامەزراند و بەرێوە برد، ئەگەرچی هەمو پێویستییەکانی کاری داهێنەرانەیان بۆ دابین کرا بو، لە ماوەی ٨ سال دا نەیانتوانی تەنیا یەک سرود یان یەک گۆرانی داهێنن بکەوێتە سەر زمانی خەلک و، لە موسیقای کوردی دا، لە پال سرودەکانی: ئەی ڕەقیب، گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و، دەمی ڕاپەڕینە و، نەورۆز.. دا بهێنێتەوە.

*

## ڕێککەوتنی یەنک - پدک

هەر لە مانگەکانی مارت و نیسان دا حەمەی حەمە باقی بە هۆی حشعەوە دو جار چو بۆ سەردانی پارتی لە تەهران بۆ ئەوەی پەیام و نامەی یەکێتییان پێ بگەیێنێ سەبارەت بە ئارەزووی ئاشتبونەوە.

مەسعەودی نەدی بو، لە رازان قەلەکەدیزەی دی بو، راسپارەکانی پێ گەیاند بو. وەڵامێکی دیاریکراویان نەدابوەوە، پێیان وت بو وەڵامی نامەکە بە هێزی حشعەوە ئەنێرنەوە. لە مانگی تەمووزدا لە بارەگای حشع لە پشتاشان نوێنەرانی یەکێتی و پارتی کۆبونەوە.

نوێنەرانی یەکێتی: فەرەیدون عەبدولقادر و د. خدر مەعصوم و، نوێنەرانی پارتی: محەمەدی مەلا قادر، مەشەید ئەحمەد، رۆژی ۲۸ ی تەمووزی ۱۹۸۲ لە بارەگای حشع لە پشت ئاشان دانیشتن. لەم دانیشتنەدا ڕێککەوتنێکیان ئیمزا کرد، نوقتە گرنگەکانی ئەوەبو:

- گیروگرفت و ئاکۆکی نێوان هێزە سیاسیەکان بە گفتوگۆی سیاسی، بێ ئەوەی پەنا بەرنە بەر چەک، چارەسەر بکرێ.

- کوردستان لە خانەقینەوە تا زاخۆ مەیدانێکی ئازاد بێ بۆ چالاکی سیاسی و پێشمەرگەیی هەمو لایەنەکان.

- هێزەکانی پارتی و یەکێتی بە ئاگاداری و هاوئاهەنگی یەکتری ئەچنە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکتری و، تا شێوەیەکی تر ئەدۆزرێتەوە جاری حوکمڕانی ناوچەکان وەکو خۆی ئەمێنێتەوە.

توخنی هیچ مەسەلەیەکی سیاسی نەکەوت بون. لەمەیش پارتی نیازی گێڕانەوەی هەندی لە هێزەکانی هەبو بۆ کوردستان. گوشاری ئێرانییان لە سەر بو کاری چەکدار بکەن لە ناو کوردستانی عێراق دا، بە بێ ڕەزامەندی یەکێتی پێش نەیانئەتوانی هێزەکانیان بنێرنەوە بۆ کوردستان.

پارتی هێزەکانی ناردەوە بۆ هەمو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی. مەلا محەمەد بارەگای لە وەرتێ دانا و، نادر هەورامی، قادر هێزەکانیان هێنایەوە ناوچەکانی سلێمانی.

رۆژی ۲۱ ی تشرینی دووەمی ۸۲ دەستەیەکی نوێنەرایەتی یەکێتی کە پێک هات بو لە: د. کەمال خۆشناو، د. خدر مەعصوم، ئازاد هەورامی لە بارەگای حشع لە پشتاشان لە گەڵ نوێنەرانی حشع: عومەری عەلی شێخ، مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی، فاتیح رەسوڵ بۆ باسی کێشەکانی هەردولا دانیشتن لەو کۆبونەوەیەدا، حشع ئاگاداری یەکێتیان کرد کە پارتی لەوەوڵ ناکا یەکێتی هێز بنێری بۆ بادینان چونکە (اتفاق) ەکەی پشتاشان (اتفاقیکی محلیە) بادینان ناگرێتەوە و، لە بادینان لە نێوان یەکێتی و پارتی دا (اتفاق) نیە.

پێشینان وتویانە: «بەشی خۆم بۆ خۆم، ئەوەی تۆش ئەخۆم!» پارتی وەهای ئەکرد، ئەمەیشیان بۆ ئەچوە سەر، چونکە کەس بە دەنگ نەئەهات. لەو ڕێککەوتنەدا حشع ناوبژیکەر و شایەت بون، لە بارەگاکەی ئەوانیش دا ئیمزا کرا بو. لە سەر ئەم پەیمانشکێنیەی پارتی هیچ نارەزاییەکیان دەرنەبڕی. بەڵکو بە «روحی ریاضی» وەری گرت و داوای لە یەکێتی ئەکرد لە سەر ئەم وردە، شتانە گیروگرفت دروست نەکا.

*

لاک هیچ کام لەو بەڵێنانەی بە یەکێتی دابو بە جێ نەهێنا. سەرەتا کە هێشتا لاواز و جێگەی خۆی نەگرت بو، بە نەرمی ئەجوڵایەوە، کە بە هێز بون و، زیادیان کرد ئیتر گوێیان نەئەدایە یەکێتی و، بەرەو ئەوە ئەچون خۆیان حوکمڕانی ناوچەکان بکەن. چەند جاری لەسەیان لە گەڵ کرا کەڵکی نەبو. پشت ئەستور بون بە ئێران و، ئێران هانی

ئەوان لاملی بکەن. ئەگەر لەوە زیاتر چارەنووسیان لی بکرایە ئەبوون بە هێزێکی ئەوتۆ چارەکردنیان دژوار ئەبو. بریارمان دا تا مەترسییەکەیان زلتر نەبوە چارەیان بکەین. پلانی چەککردنیان دانرا. بۆ جێبەجێ کردنی ملازم عومەر چو بۆ بەری مەرگە و، هێزەکانی کۆیە، کۆسرەت، گەرمیان، قەرەداغ و ناوچەکەیان لە سەر کۆ کرایەوە.

لە ۳ جێگا بارەگایان دانا بو. هێزیان لی کۆ کرد بوەوە: بەری مەرگە، سەرگەلوی دولی جافەتی، حاجی مامەندی شارباژێر.

لە تەموزی ۸۲ دا لە ماوەیەکی کورت دا هەمو چەک کران. بەرگرییەکی کەمیان کرد. لە بەرگەلو کور و برازاکانی حاجی شێخ قادر هەندی بەرگرییان کرد. چەند کەسی لەوان کوژرا و، لە یەکێتی پێش سەلاحی حاجی رەشیق، فەرماندەی تیپی ٤٧ ی پیرەمەگرون کوژرا. سەلاح موحەندیس و هاوری ی کۆمەلە و، لە بنەمالەیەکی دەولەمەن بو. پیاوێکی تازا و چاونەترس و، سەرکردایەتی دەیان شەر و بۆسەی کرد بو. یەکی بو لە باشترین فەرماندەکانی پێشمەرگە.

لاک هەلوەشا و ئیتر خۆی بۆ ریک نەخرایەوە.

*

## دوەمین کۆنفرەنسی کۆمەلە

لە مانگی ئابی ۸۲ دا دوەمین کۆنفرەنسی کۆمەلە بە ئامادەبونی ۲۲۲ نوینەر لە هۆلی شەهید شەهاب لە ناوزەنگ بەسترا. بەشداری نوێنەرانی ریکخراوە نهێنییەکانی شارەکان لەم کۆنفرەنسەدا زۆرتر بو لە چاو کۆنفرەنسی یەکەم دا.

بەشێکی کاتی کۆنفرەنس تەرخان کرا بۆ باسی ریکخستنەوەی کاروباری ریکخراوەیی و پێشمەرگەیی یەکێتی و، بەشێکی تریشی تەرخان کرا بۆ دانانی بەرنامەی کۆمەلە؛ بۆ پێشکەوتنی کۆمەلایەتی و، چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی کورد.

کۆنفرەنس بە هەلبژاردنەوەی سەرکردایەتی نوی ی کۆمەلە کۆتایی هات. مامۆستا جەمال تاهیر ئەگەرچی لە ناو شار بو ئەویش هەلبژێردرا بە ئەندامی سەرکردایەتی.

*

## پێکهێنانی یەکێتیی شۆرشگێران

لە ۱۵ ی ئابی ۱۹۸۳ کادرە پێشکەوتوەکانی ریکخستنەکانی خەتی گشتی و بزوتنەوە لە ترۆژلە کۆبونەوە و بریاریان دا: هەردولا لە ریکخراوێکی تازەدا یەک بگرن و، هەمو ریکخستنەکانیان تیکەلاوی یەکتری بکەن. پرۆگرامەکەی یەکێتیی نیشتمانی بکەن بە پرۆگرامی خۆیان. سەرکردایەتییەکی تیکەلاویان هەلبژارد و، مامجەلالیان کرد بە سکرتیری ریکخراوەکەیان.

ئیمە لە کۆمەلەدا ئەم یەکگرتنەمان پی هەنگاوێکی باش و بە کەلک بو. بەلام بونی مامجەلال بە سکرتێری ئەم ریکخراوە، کە ئەبو هاوتای کۆمەلە بی لە ناو یەکێتی دا و، لە هەمان کاتا مونافیسی بی، لە گەل ئەوەدا نەئەگونجا کە مامجەلال سکرتێری گشتی یەکێتی پش بی. مامجەلال بۆ راگرتنی هاوسەنگی نێوان کۆمەلە و شۆرشگێران، وازی لە سکرتارییەتی شۆرشگێران هێنا.

*

**هێزی پشتیوان**

د. قاسملو داوای کۆبوونەوەیەکی بە پەلەی کرد بۆ لە گەڵ مامجەلال و عەزیز محەمەد. ڕۆژی ١٥ ی تەمموزی ١٩٨٢ لە بارەگای هاوینەی مامجەلال لە سەرچاوەی تۆژەڵە کۆبوونەوەکە کرا. منیش بەشداری کۆبوونەوەکە بووم. لە کۆبوونەوەکەدا د. قاسملو دەستی کرد بە قسە کردن، وتی: «ئێوە هەردولاتان دۆستی حیزبی دیموکراتن، ئەمرۆ من هاتووم دۆستەکانی دیموکرات تاقی ئەکەمەوە، پێویستیمان بە یارمەتی هەیە هاتووم داوای یارمەتیمان لێ بکەم!»

لێمان پرسی: «پێویستیتان بە چ جۆرە یارمەتییەک هەیە؟»

وتی: «سپای پاسداران هێرشێکی زۆر گەورەیان دەس پێ کردوە بۆ سەر بارەگاکانمان. هێزەکانی دیموکرات بە تەنها ناتوانن بەری ئەم هێرشە بگرن. هێزەکانمان زۆر ماندوون و زەبری زۆریان لێ کەوتوە. ئەگەر فریامان نەکەون دەلێمەری سیاسی و بنکەکانی ترمان لە مەترسی گرتن دایە و، ئەبێ ڕوبکەینە عێراق. پێویستیمان بە پێشمەرگەکانی کوردستانی عێراق هەیە»

ڕاستیەکەشی هێرشێکی گەورەیان لە سەر بوو، هێزەکانی تاران لە هەمو لایەکەوە لە پێشڕەوی دا بوون و، هێزەکانی دیموکراتیان ئەشکاند و، شوێنەکانیان لێ ئەگرتن. پەشێوکان بە د. قاسملوەوە دیار بوو.

عەزیز محەمەد وتی: «ئێمە ئەبێ ئەم داوایە دراسە بکەین، ئینجا ئەتوانم جوابت بدەمەوە!»

د. قاسملو وتی: «کاک عەزیز من خۆم لە ولاتانی سۆسیالیستی ژیاوم، شارەزای شێوەی کارکردنیان بووم، کە وتیان (دراسەی ئەکەین) یەعنی ئەو داوایە جێبەجێ ناکەن. من ئێستا پێویستیم بە پێشمەرگەی حیزبەکەی ئێوە هەیە، تا کۆمیتەی ناوەندی حشع کۆ ئەبێتەوە و بڕیارێک ئەدا، شوێنەکانی ئێمە ئەگیرێن!»

کاک عەزیز ئەچوە ژێر باری هیچ جۆرە بەڵێنێکی یارمەتیدانەوە. د. قاسملو لە حشع ناتومێد بوو ڕوی کردە مامجەلال وتی: «ئێوە ئەڵێن چی؟»

مامجەلال وتی: «ئێمە لە سەر بڕیاری پێشوی خۆمان ماوین. ئەوەی لە توانای ئێمەدا بێ بۆ یارمەتیتان ئامادەین. تەنانەت ئەگەر لەو پێناوەدا شۆڕشی کوردستانی عێراق شەهیدیش بێ»

*

لە ماوەی ٣ سالی ڕابوردودا چەند جاری هەولمان دا بۆ دەمان بگا بە ئیمام خومەینی و سکالای خۆماتی لە لا بکەین. کاربەدەستانی ئێرانی ڕێگەیان لێ ئەگرتین. لەو کاتەدا ئێمە هیچ پەیوەندییەکمان لە گەڵ ئێران نەمابو. هیچ هیوایەکیشمان بە یارمەتی و پشتیوانی ئێران بۆ یەکێتی یان بۆ موعارەزەی عێراقی نەبو. بەڵکو گەیشت بوینە ئەو باوەڕەی ئێران لە یارمەتیدانی موعارەزەدا بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی بەعس نەک هەر جیددی نیە و بەس، بەڵکو ئەیەوێ عێراق بە دار و بەرد و، شیعە و سونە و، کورد و عەرەب و، موعارەزە و ڕژێمەوە.. ورد و خاش، یا هیچ نەبێ لاواز و زەلیل بکا.

١. هیچ جیددیەتێک لە کاربەدەستانی ئێران دا نەئەبینرا بۆ یارمەتی موعارەزەی عێراقی، تەنانەت بۆ ئە ڕێکخراوانەش کە دینی بون و سەر بە ئێران بون. بۆ ئەوەی

ناکۆکییەکانیان لە ناودا قوڵتر بکا، بە جیا رەفتاری لە گەڵ نەکردن و، لە چوارچێوەی ستراتیجی خۆی دا هەڵی نەسووڕاندن.

٢. هەمو ئەو حیزب و لەشکرانەی لە کوردستانی عیراق دا ئەتراتێنیان ئەکرد لە ژێر سایەی تیهران دا دامەزرا بون، یا بە یارمەتی ئەو بوژابونەوە. بە چەک و پارەی ئەوان ئەژیان. بە کردەوە جولانەوەی کوردی لەت و پەت کرد بو.

٣. وەجبەیەکی گەورە چەک و تفاقی جەنگ بۆ یەکێتی هات بو، کە زیاتر لە ٥ هەزار کلاشینکوف و ١ هەزار ئاربیجی و سەدان هاوەن و ساروخی تی دا بو. کاربەدەستانی تیهران بەڵێنیان دابو ڕێگە بدەن بە یەکێتی ئەم چەکانە بە ناو تیهران دا بگوێزێتەوە بەڵام کە گەیشتە ناو ئێران دەستیان بە سەرا گرت و، بردیان بۆ خۆیان.

لەو کاتەدا هەلومەرجی جەنگی عێراق باش نەبو، جولانەوەی کورد ئەیتوانی بەم چەکانە تا رادەیەکی باش تەرازوی جەنگی لە کوردستان دا بە قازانجی خۆی بگۆڕێ. بەڵام ئەم ڕێ لێ گرتنە زەرەرێکی گەورەی لە یەکێتی دا.

*

د. قاسملو داوای هێزێکی بچوکی کرد مامجەلال بەڵێنی دابە هەر ئەو ڕۆژە مشوری ناردنیان بخوات. هێزێکی پێشمەرگە لە ڕێ بون، ئەوانەی لە گەڵ هەڵی بچکۆل نارد.

د. قاسملو پێشنیاری کرد کە مولازم عومەر، بۆ ئیحتیمارەی عەسکەریە، سەردانێکی مەیدانەکانی شەر بکا و فەرماندەکانیان بیبینی بۆ ئەوەی بزانی کەموکورییەکانیان چییە. ڕۆژی دوایی عومەریش چو بۆ سەیری مەیدانەکانی شەر و هێزەکانیان. زۆری هێزەکانی دیموکرات هەڵوەشا بون و، وورەی شەریان نەمابو، تەنانەت لە هەندێ شوێن بەشی شارەزایی و چاوساغی هێزەکانی یەکێتی پشتیان نەما بو. ناچار دارای هێزی مەڵبەندەکانیان کرد. مامجەلال بۆ ئەوەی گورج و تین بخاتە بەر هێزەکانی یەکێتی خۆی چوە ساوین بارەگای دانا و، ڕاستەخۆ سەرکردایەتی هێزەکانی یەکێتی ئەکرد، کە ژمارەیان لە ٢ هەزار تێ پەری بو.

حدکا ناویان لە هێزەکانی یەکێتی نابو؛ «هێزی پشتیوان». هێزی پشتیوان لە چەند جێگا تووشی شەر بو و، هێرشەکانیان دوا خست. چەکدارەکانی پارتی شان بە شانی هێزەکانی تیهران بەشداری شەر بون و، چەند کەسێکیان لێ بە دیل گیرا. ڕادیۆی حدکا بە ستایش و شانازییەوە هەواڵی شەرەکانیانی بڵاو ئەکردەوە.

د. قاسملو ئومێدی بەوە نەمابو کە ناوچەی ئازادکراو بپارێزن، هەوڵەکەی بۆ ئەوە بو بە شێنەیی کەلوپەلی دەفتەری سیاسی و، بارەگاکانی ترپان و، دەزگای ڕادیو و، دیلەکان، بە سەلامەتی بگوێزنەوە بو ناوچەی بیتوش لە سەر سنور. لە ماوەی چەند حەفتەیەک دا ئەم کارەیان ئەنجام دا.

*

پارتی بە ئاشکرا شەری دژی حدکا ڕاگەیاند بو، لە لەشکرکێشییەکانی تیهران دا بەشدار ئەبون. لایەنەکانی تر جود، ئەوانەی کە خۆیان بە دۆست و هاوپەیمانی حدکا ئەزانی وەکو: حشع، حسک، پاسوک، بۆ ئەوەی دڵی تیهرانیان لێ نەڕەنجێ، ئامادە نەبون هیچ یارمەتییەکی بدەن. بەڵکو هێرشێکی گەورەی پروپاگاندەیان لە دژی هاوپەیمانی یەکێتی دەس

پێ کرد، بە بیانووی ئەوەی یەکێتی مەیدانی ڕاستەقینەی خەباتی چۆڵ و، بۆ ڕازی کردنی دڵی کاربەدەستانی بەعس ئەم کارەی کردوە. دەزگای پروپاگاندەی حشع، لەم مەیدانەدا، لە هەمووان چالاکتر و دەم هەراشتر بوو. لە ناو یەکێتی یش دا ناڕازییەکان، بە تایبەتی ئەوانەی دوایی تر «ئاڵا»یان پێک هێنا، بۆ دروستکردنی گومان لە سەرکردایەتی یەکێتی و، ساردکردنەوەی پێشمەرگە بە توندی کەوتنە پروپاگاندە.

کاربەدەستانی تەهران، ئەم هاوکارییەی یەکێتییان لە گەڵ حدکا، بە «کارێکی لە بەخشین نەهاتوو» دانەنا. چونکە لایان وابوو ئەگەر ئەم پشتیوانییە نەبوایە ئەوان تەواویان ئەکردن و، نەیانکردن بە دیوی عێراق دا.

ڕێبەستنێکی تازە دروست بوبوو لە لایەک تەهران و پارتی و لایەنەکانی جود، لە لاکەی تر حدکا و یەکێتی. پارتی، لە ژێر گوشاری تەهران دا، شەڕی ڕاگەیاندنیان دەس پێ کردەوە، لە ڕادیۆکەیانەوە بە ئاشکرا کەوتنەوە هێرش بۆ سەر یەکێتی. بۆ وەڵامدانەوەی ئەم هێرشانە زنجیرەیەک وتارمان بۆ ڕادیۆی یەکێتی ئامادە کرد لە ژێر ناوی: «مەسەلەی کورد یەک مەسەلەیە، یا چەند مەسەلەیەکە؟»

سەرباسەکانی ئەمانە بوون: ئەرک و فرمانی نیشتمانیی و سیاسەت و هەڵوێستی شۆڕشگێڕانە. چەند تێبینییەکی مێژوویی دەربارەی مەسەلەی کورد. کێن دۆستەکانی کورد و کامانەن دوژمنەکانی؟ ئاڵۆزاندنی پەیوەندی بەینی لایەنە چەکدارەکانی کوردستانی عێراق بە قازانجی کێ یە؟ پەیوەندی ناوخۆیی جوڵانەوەی ڕزگاری نیشتمانیی و پەیوەندی لە گەڵ خەباتی شۆڕشگێڕانەی گەلانی ناوچەکە. پروپاگاندەی درۆ دژی یەک خزمەتی داگیرکەرانی کوردستان ئەکا. دیسانەوە مەسەلەی دۆست و دوژمن و سۆشیال دیموکراتەکان. تاکڕەوی نەتەوایەتی و سەربەخۆیی یا ڕەدووکەوتن. لە ناو بردنی جوڵانەوەی کورد لە بەشێکی تری کوردستان دا لە قازانجی کێ و لە زەرەری کێ یە؟

لە گەڵ تەواوبوون پێکەوە بیرەکانی وتارەکانمان گەڵاڵە کرد و، هەندێکی ئەو و هەندێکی من نووسیم. سەرەڕای ئەوەی بە ڕادیۆ بڵاو کرایەوە، کرایە نامیلکەیەکی تایبەتی و چاپ کرا.

تا ئەو کاتە هەندێ لە لق و ناوچەکانی پارتی لە کوردستانی عێراق لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی دا مابوون، ئەوانیش کەوتنە گێچەڵ بە هێزەکانی یەکێتی. ڕووداوەکان وایان ئەگەیاند کە دیسان شەڕی پارتی - یەکێتی هەڵئەگیرسێتەوە، پارتی بۆ بیانوویەک ئەگەڕا.

*

## هەڵوێست وەرنەگرن، بەڵام هەڵوێست دەرنابڕن!

لە هەموو ئەو کۆبوونەوانەدا کە لە نێوان حشع و یەکێتی دا بە دوو قۆڵی یان بە بەشداری لایەنەکانی تریش ئەکرا، یەکێ لە باسە سەرەکییەکانی، باسی دەسوەردانی پارتی بوو لە کاروباری کوردستانی تەهران دا، یان وردتر باسی هاوکاری چەکدارەکانی پارتی بوو لە گەڵ هێزە چەکدارەکانی تەهران دژی کوردەکانی تەهران، بە تایبەتی حدکا. لە هەموو کۆبوونەوەیەک دا حشع ناڕەزایی خۆی دەرئەبڕی دژی ئەم هەڵوێستەی پدک. لە یەکێ لە کۆبوونەوەکان دا بەڵێنیان دابوو کە ئەگەر پدک جارێکی تر ئەو ڕەفتارەیان دووبارە کردەوە، هاوکاری تەهرانیان کرد دژی حدکا ئەوان بە ئاشکرا هەڵوێست وەرئەگرن لە دژی پدک.

یەک چەند جارێکی تریش، بەڵکو بە فرەوانییەکی زۆرتر، لە شەڕەکان دا بەشدار بوو. مامجەلال لە کۆبوونەوەیەکدا بە گیری هێنا بوون، کە بۆچی هەڵوێستی خۆیان بە ئاشکرا لەو ڕووداوانە لە ناو دەزگاکانی ڕاگەیاندنی خۆیان دا باس ناکەن. مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی وت بووی: «ئێمە وتومانە هەڵوێست وەرنەگرین، ئەمانوتوە هەڵوێست دەرنەبڕین»

یەک لە دەوری تیران پەلاماری حدکای ئەدا هەرگیز ڕەخنەیەکی بە ئاشکرای لێ نەگرت، کەچی کە یەکێتی چو بۆ یارمەتیدانی حدکا هەمو توانای پروپاگاندەیی خۆی لە دژی یەکێتی خستە کار.

*

ئەم بڕیارەی یەکێتی، کە منیش تیا بەشدار بووم، زۆرتر شتێکی «عاطفی» بوو تا لێکدانەوەی سیاسی و هەڵسەنگاندنی ڕووداوەکان. هێزەکانی حدکا تێک شکا بوون، هەر ناوچەیەکیان لێ نەگیرا بە یەکجاری چۆڵیان نەکرد. پێشمەرگەیان تێ دا ئەنجەشتەوە بۆ درێژەدان بە شەڕی پارتیزانی. یەکێتی بەم کارە نەیتوانی حدکا هەڵسێنێتەوە، بەڵام تیرانی لە خۆی وروژاند و، ئەو «ئاشتییە لەرزۆک»ەی لە نێوان پارتی و یەکێتی دا بوو سەر لە نوێ تێک چوەوە. یەکێتی کەوتە ناو مەترسییەکی گەورەترەوە لەو مەترسییەی هەرەشەی لە حدکا ئەکرد. مەترسی شەڕ لە ٣ مەیدانی جیاوازدا: عیراق کە شەڕی لە گەڵ ڕائەگیرا بوو، تیران کە لە بەر خاتری حدکا شەڕی لە گەڵ دەس پێ کرا بوو. جودە بە سەرکردایەتی پارتی کە لە ژێر گوشاری ئیران دا خەریکی خۆ سازدان بوو بۆ پەلاماردانی یەکێتی.

## پێکهێنانی مەڵبەندەکان

دەیان هەزار لاو لە سەربازی هەڵات بوون و، لە گوندەکان دا دانیشت بوون، هەندێکیان ئەبوون بە پێشمەرگە. هەرێمەکان زۆر لەبە بوبوون، هەندێکیان بوبوون بە ٤٥٠ تا ٥٠٠ پێشمەرگە. سەرکردایەتی هێزێکی وا گەورە لە توانای زۆر لە فەرماندەی هەرێمەکان دا نەبو. فەرماندەی هەرێم و فەرماندە و کادرەکانی تر دەستیان ئەخستە ناو کاروباری خەڵکەوە. گلەیی زۆرمان پێ ئەگەیشتەوە لە سەر ڕەفتاری هەندێ لە کاربەدەستەکانی پێشمەرگە. ئەندامەکانی سەرکردایەتی لە ناوزەنگ کۆببونەوە، هەندێکیان کارێکی دیاریکراویان نەبو.

ڕێکخستنی هەرێم ئیتر لە چار پێشکەوتن و پەرەسەندنی جوڵانەوەکەدا نەئەگونجا. ئەبو شێوەیەکی تر بۆ ڕێکخستنی پێشمەرگە و کاروباری خەڵک بدۆزینەوە. ماوەیەک بو لە ناو خۆمان دا ئەم باسەمان ئەکرد. هەندێکیان دژی هەمو جۆرە ئاڵوگۆڕێ بوون لە ڕێکخستنەوەی هەرێمەکان دا، هەندێکیان وا تێ گەیاند بو کە ئەمە بۆ لێدانی ئەوان و، کەمکردنەوەی دەسەڵاتی ئەوانە. ڕاستییەکەی بۆ چاکتر ڕێکخستنەوەی کاروباری ناوچەکان و پێشمەرگە بو، نەک بۆ لێدانی کەس.

کاروباری جوڵانەوەکە هەر شەڕ نەبو لە گەڵ هێزەکانی بەعس، بەڵکو بوبو بە جۆرێک لە حوکمڕانی، دەسەڵاتی حکومەت لە زۆر ناوچەدا نەما بو، یا کز بوبو، خەڵک بۆ یەلاداخستنی کێشەکانیان ڕویان لە داودەزگاکانی شۆڕش ئەکرد. بڕیارمان دا کە هەرێمەکان هەڵوەشێنینەوە و، تیپیان لێ دروست بکەین و، هەر چەند تیپێک بەرەو ڕوی دەزگایەکی بالاتر بکرێنەوە، کە تێکەڵاو بێ لە چەند لێپرسراوێک و، هەریەکەیان کاری دیاریکراو و دەسەڵاتی دیاریکراوی هەبێ بە ناوی مەڵبەندەوە.

مەلبەند پێک ئەهات لە:

١. لێپرسراوی یەکەم، کە سەرپەرشتی هەمو کاروبارەکانی مەلبەندەکەی ئەکرد.

٢. لێپرسراوی کاروباری پێشمەرگە، سەرکردایەتی تیپەکانی ئەکرد.

٣. لێپرسراوی کاروباری کۆمەلایەتی، سەرپەرشتی ئەنجومەنی ناوایەکان، قوتابخانە، نەخۆشخانە، دادگا و زیندان.. ی ئەکرد و، کێشەکانی ناو خەلکی چارەسەر ئەکرد.

٤. لێپرسراوی کاروباری سیاسی، سەرپەرشتی رابەرە سیاسیەکانی ئەکرد.

٥. لێپرسراوی کاروباری دارایی، سەرپەرشتی دەرامەت و خەرجی مەلبەندەکەی ئەکرد و، موچەی پێشمەرگە و، مەسرەفی بارەگا و شەرەکانی رێک ئەخست.

٦. لێپرسراوی راگەیاندن، هەوالی پێشمەرگە و چالاکییەکانی و، دەنگوباسی ناوچەکەی ئەنارد بۆ دەزگای راگەیاندن، بە تایبەتی بۆ رادیۆ.

ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکێتی، پاش لێکۆلینەوەی لایەنی جوگرافی، ئیداری، کۆمەلایەتی.. دابەش کرا بە سەر ٤ ناوچەدا و، ٤ مەلبەند بۆ سەرپەرشتی کردن و بەڕێوەبردنیان پێک هێنرا.

## مەلبەندی یەک

بارەگای مەلبەند لە حاجی مامەند دانرا دوایێتر بە هۆی شەری ئێران - عێراقەوە برایە بەلەکجار لە ناوچەی قەرەداغ.

تیپەکانی: ١٥ ی هەورامان، ١١ ی شارەزوور، ٣١ ی بەرزنجە، ٣٣ ی سلێمانی، ٣٧ ی شاباژێر، بەستران بە مەلبەندی یەکەوە.

## مەلبەندی دو

بارەگای مەلبەند لە سەرگەلو دانرا.

تیپەکانی: ٢١ ی کەرکوک، ٢٣ ی سورداش، ٤٧ ی پیرەمەگرون، ٥٧ ی سەگرمە، ٥١ ی گەرمیان، ٤٣ ی ئاسۆس، ٦٨ ی مامەندە، ٤٤ ی چەکرەج، ٦١ ی جوتیاران، بەستران بە مەلبەندی دوەوە.

## مەلبەندی سێ

بارەگای مەلبەند لە وەرتێ دانرا.

تیپەکانی: ١٢ ی سۆران، ١٤ ی ئاکۆ، ٧٤ ی بالەک، ٧٧ ی کۆزەلە، ٧٨ ی کاروخ، تیپی کۆرەش، بەستران بە مەلبەندی سێ وە.

## مەلبەندی چوار

بارەگای مەلبەند لە بالیسان دانرا.

تیپەکانی: ٨٦ ی دەشتی هەولێر، ٨٣ ی هەوری، ٩١ ی سەفین، ٩٣ ی کۆسرەت، ٩٩ ی بێتوێن، بەستران بە مەلبەندی چوارەوە

*

لە پێکهاتنی مەڵبەندەکان دا هاوسەنگی کۆمەڵە و باڵەکانی تری یەکێتی لێک درابۆوە.

هەر مەڵبەند نەخۆشخانەیەکی هەبو پزیشک سەرپەرشتی ئەکرد و، دادگایەکی هەبو چەند کەسێکی قانونی کاریان تێ دا ئەکرد، دەزگای بێتەلی هەبو بۆ پەیوەندی لە گەڵ م س.

مەڵبەند لە راستی دا حکومەتێکی بچکۆلانە بو، لە ماوەیەکی کورت دا جێگیر بون و، بون بە جێگای باوەر و رێزی دانیشتوانی ناوچەکان.

رێکخراوەکانی کۆمەڵەیش سەربەخۆ کاریان ئەکرد. راستەوخۆ بەسترا بون بە دەزگای ناوەندی رێکخستنی کۆمەڵەوە.

بە گوێرەی پێویستی ئالوگۆر لە ئەندامانی مەڵبەند و، سەرتیپەکان دا ئەکرا.

*

## یەکێتی و حکومەت

د. قاسملو پێشنیارەکانی ئێمەی گەیاند بە کاربەدەستانی عێراق. تا چەند مانگی هیچ هەواڵێکی نەبو. شەرەکانی کوردستانی ئێرانی بە سەردا هات. د. قاسملو لەو ماوەیەدا بەرزان تکریتی و صەددام حسێنی بینی بو. وەڵامی پێشنیارەکانی ئێمەیان دابۆوە:

پێشنیاری یەکەم - خوا بوە لاوە بە بیانوی ئەوەی هێشتا هەلومەرجی رێککەوتنێکی ستراتیجی لەو بابەتە، لە نێوان عەرەب و کوردا، نەگەیشتوە.

پێشنیاری دوەم - کە بریتی بو لە ئۆتۆنۆمی، موافق بون بۆ ئەوەی بکرێ بە بنچینەی دەستپێکردنی گفتوگۆ.

پێشنیاری سێیەم - کە بریتی بو لە راگرتنی شەر، ئامادە بون بۆ جێبەجێ کردنی دەستبەجێ.

کاربەدەستانی عێراق رێزێکی زۆریان لە د. قاسملو و بیروراکانی ئەگرت. لەو کاتەوا لە نێوان یەکێتی و حکومەت دا ئەو دەوری «وسیط» ی ئەبینی. کاربەدەستانی عێراق داوایان لێ کرد بو کە کۆبونەوەیەک رێک بخا بۆ ئەوەی نوێنەرانی یەکێتی روبەرو ببن و، وەڵامەکانی بەعس بۆ پێشنیارەکانی یەکێتی بە دەمی خۆیان تەئکید بکەنەوە.

*

رۆژی ١٣ ی تشرینی یەکەمی ٨٢ د. قاسملو لە گوزرە شەر کۆبونەوەیەکی رێکخست بۆ یەکتر بینین. لە لای یەکێتی: مامجەلال و من و، لە لای حکومەتی عێراق: ئەبو ئەحمەد، ئەبو عودەی، ئەبو محەممەد، ئامادە بون. د. قاسملویش وەکو «وسیط» و میواندار بەشدار بو.

*

ئەبو ئەحمەد (عەقید روکن خەلیل محەممەد شاکیر)، ئەفسەرێکی موسڵاوی بو، بارێدەدەری سەرۆکی «جیهازی موخابەرات» و، ئەبو عودەی (عەقید ئیحسان) لێپرسراوی ناوچەی سەروی موخابەرات لە کەرکوک و، ئەبو محەممەد لێپرسراوی موخابەراتی هەولێر بو.

«جیهازی موخابەرات» یەکێ لەو دەزگایانە بو، بەعس دوای ئەوەی هاتە سەر کار دای مەزراند. حیزبی بەعس بەر لەوەی بێتە سەر کار رێکخراوێکی بچوکی بۆ کۆکردنەوەی

دەنگوباس و کوشتنی ناحەزەکانی، بە ناوی زیکخراوی «حنین» دروست کرد بو، صەددام خۆی سەرپەرشتی ئەکرد. کە هاتە سەر کار گەورەتری کرد و، بودجەیەکی زلی بۆ تەرخان کرد، ماوەیەک سەعدون شاکیر و، دوای ئەو تا ١٩٨٤ بەرزان تکریتی سەرۆکی بو. ئەم دەزگایە بە ناو بۆ کاروباری دەرەوە دامەزرێنرا بو، بەلام دەستی وەر ئەدایە ناو هەمو کاروبارێکی ناوخۆی عیراقەوە و، لە گەڵ دەزگاکانی: ئەمن و ئیستیخبارات، لەم بارەیەوە بەربەرەکانێی ئەکرد. ئەمیش، وەکو دەزگاکانی کە، راستەوخۆ بە دیوانی سەرۆکایەتی واتە بە صەددامەوە بەسترا بون. لە ناو هەر ٣ دەزگا ئەمنیەکان دا: ئەمن، ئیستیخبارات، موخابەرات دا، بەشێکیان بۆ مەسەلەی کورد تەرخان کرد بو. لە هەر سێکیان دا ناوی: «شوعبەی ٣» بو.

*

ئەبو ئەحمەد لە قسەکانی دا وتی: «ئێمە لە لایەن سەرۆکەوە نێردراوین. سەرۆک سڵاوتان لێ ئەکا. ئێمە دەسەڵاتی گفتوگۆمان نیە، ئەرکی ئێمە ئەوەیە بیروراکانی سەرکردایەتی بۆ ئێوە بهێنین و، بیروراکانی ئێوەیان بۆ ببەینەوە. سەرکردایەتی ئامادەیە: بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە سەر بنچینەی بەیانی ١١ ی ئازار بە رێگەی گفتوگۆی هێمنانە و رێککەوتن لە گەڵ یەکێتی. هەروەها بۆ دانانی رێوشوێنی وەستاندنی شەر لە بەینی یەکێتی و حکومەت دا. ئێوە عیراقین، چاکتر وایە مامجەلال و نوێنەرانی یەکێتی بێن بۆ بەغداد بۆ ئەوەی سەرۆک ببینن و گفتوگۆی راستەوخۆ دەس پێ بکا.»

مامجەلال بە گەرمی بە خێرهاتنی کردن. سوپاسی د. فاضلی کرد بۆ هەوڵ و تەقەلاکانی. ئامادەیی یەکێتی دەبڕی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان بە رێگای سیاسی. بە درێژی باسی سیاسەتی چەوتی بەعسی کرد بەرامبەر گەلی عیراق بە گشتی و، گەلی کورد بە تایبەتی. ئیبالی هەمو رووداوەکانی عێراقی خستە ئەستۆی بەعس. خواستەکانی بزوتنەوەی کوردی بۆ روون کردنەوە و، داوای لێ کردن کە ئەگەر بە تەمای گفتوگۆیەکی راستەقینە و سەرکەوتو بن پێویستە هەمو لایەنەکان بەشدار بن. مامجەلال لە قسەکانی دا توندوتیژ بو.

ئەبو ئەحمەدیش ئیبالی هەمو رووداوەکانی خستە سەر کورد. وتی ئەگەر ئەتانەوێ گفتوگۆ سەرکەوتو بێ سەرۆک ئەڵێ: «ئەبێ چارەی بنەرەتی هەمو گیروگرفتەکان بکرێ و، رێککەوتنێکی ستراتیجی بێ نەک تاکتیکی، با مامجەلال زیاد تەکتەکە نەکا!»

«تەکتەکە»: وشەی بە عەرەبی کراوی «تاکتیک»ە. مەبەستی لە تەکتەکە لەرو قیل بو. لای صەددام و سەرانی بەعس وا باو بو: مامجەلال، ستراتیج ئەکا بە قوربانی تاکتیک و، زورتر تاکتیکزانە وەک لەوەی شارەزای کاری ستراتیجی بێ. مامجەلال لەم قسەیە توندتر بو، وتی: «ئێمەی فەقیر لەم شاخ و داخە چوزانین تەکتەکە چیە؟ صەددام حسین خۆی خوای تەکتەکەیە!»

*

لە وەڵامی حکومەت پرسرا: کە ئاخۆ حکومەت ئەیەوێ چارەسەری گیروگرفتی کورد بکا، یاخود ئەیەوێ یەکێتی بکا بە گژ لایەنەکانی ترا؟ هەلبەتە وەڵامەکە وتیان کە حکومەت ئەیەوێ گیروگرفتی کورد بە جۆرێکی بنەرەتی چارەسەر بکا و، ئەیەوێ شەر لە کوردستان دا نەمێنێ. لە بەر ئەوە ئێمەیش داوامان لێ کردن کە هەوڵ بدەن پەیوەندی لە

گەڵ حشع و پارتی بش بکەن بۆ هەمان مەبەست و هەوڵ بدەن کورانی بەرزانی رازی بکەن.
لە وەڵام دا وتیان: «لە گەڵ پارتی گفتوگۆمان هەیە» بەڵام بۆ حشع وتیان: «ئێمە حشع لە چوارچێوەی «وڵاتەوەی کوردا نابینین. هەوڵ ئەدەین لە شوێنی تروە قسەیان لە گەڵ بکری».
لە ناو قسەکان دا منیش هەندێ «مداخلە» م کرد. بەڵام گفتوگۆی سەرەکی لە نێوان ئەبو ئەحمەد و مامجەلال دا بو.

*

مامجەلال گفتوگۆکانی ناو کۆبونەوەکەی بە نامە بۆ عەزیز محەمەد نوسی. داوای لی کرد سەرانی پارتی بش ئاگادار بکا. بۆ ئەوەی هیچ لایەک توشی کاری یەکلانە نەبی و. هەڵوێستێکی یەکگرتویان هەبی. یا هیچ نەبی خواستەکانیان لە یەک بچی.
عەزیز محەمەد لەو کاتەدا بە ناو تیهران دا بە ڕێگاوە بو بۆ سوریا. بەن بۆنەیەوە سەردانی پارتی کرد بو لە رازان. لە پاش ماوەیەک وەڵامی مامجەلالی دابوەوە. لە نامەکەی دا سوپاسی کرد بو کە ئاگاداری کردوە و. ئەویش ئاگاداری پارتی کرد بو. پێشنیاری بۆ کرد بو لە سەری بڕوا و. ئەگەر شتێکی تازە هاتە پێشەوە ئاگاداری بکا.

*

وەفدی عیراقی لە دانیشتنەکە ئاسودە و خۆشحاڵ نەبون. چاوەڕوانی شوکرانە بژاردنێکی زۆرتر بۆ صەددام و خواستی کەمتر و قسەی نەرمتر. بون. وایان ئەزانی ئەم «عەرض» ، منەتێکی گەورەی صەددامە بە سەر یەکێتیەوە! ئەڵێن کابرایەکی لە خۆیایی و لوتبەرز هەبوە. هەرکەسی. لە کاتی چاکوچۆنی دا بۆ پیشاندانی تەواضوع. پێ ی وت بێ: «تاهنا موخلیصم!» لەوەڵام دا وتویەتی: «واجیبی خۆتە!» صەددام. لە بابەتی ئەم کابرایە بو. لای وابو هەر کەسی دڵسۆزی بی. یا خزمەتی بکا. واجیبی خۆی بە جێ ئەهێنی. نابی چاوەڕوانی سوپاس و پاداش و دانەوەی چاکە بی. چونکە «رسالە خالدە» ی «امە عربیە واحدە» بە مرۆڤایەتی ڕائەگەیەنی. دوای ئەم دانیشتنە هیچ جۆرە پەیوەندیەک لە نێوان یەکێتی و بەعس دا نەما.

*

## سوشیال دیموکرات

یەکی لە هەوڵەکانی هەمو لایەنەکانی جود بۆ زڕاندنی ناوبانگی یەکێتی. بەشداری نوێنەرانی یەکێتی بو لە کۆنگرەی حزبی سۆسیالیستی فەرەنسی و. دەرچونی بڕیارێک بو بە قازانجی کورد. لایەنەکانی جود. بە تایبەتی حشع. ئەمەیان بە پیلانی ئیمپریالیزم دائەنا دژی جولانەوەی کورد. یەکێتی سۆڤیەت هێشتا هەرەسی نەهێنا بو. شەڕی سارد هێشتا کۆتایی نەهات بو. زۆر لە لایەنەکانی جولانەوەی کورد نەیانئەزانی سوشیال دیموکرات چیە و. هەندێکیان هەر ئەیان بیست بو.
جود ئەم مەسەلەیەی لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی خۆی دا. لە وتارەکانی رادیو و. لە بلاوکراوەکانیان دا. ئەوەندە گەورە کرد بو لە ناو خۆیشمان دا خەریک بو بە خراپ دەنگی ئەدایەوە. هەندێ لە ئەندامەکانی ناو کۆمەڵە بیست بویان لێنین. لە سەردەمی خۆی دا. دژی سوشیال دیموکرات راوەستاوە. لە بەر ئەوە ئەوانیش ئەمەیان بە کارێکی خراپ ئەزانی.

لەرەبەدوون کە وتارەکانی بۆ ڕادیۆ ئامادە ئەکرد زاتی نەئەکرد لەم مەسەلەیە بدوێ، ئەوەکو لە ناو توندڕەوەکانی کۆمەڵدا بە سۆشیاڵ دیموکرات تاوانبار بکرێ. ناچار بووم خۆم ئەم ئەرکەم گرتە ئەستۆ. لە ڕیزی ئەو زنجیرە وتارەدا کە لە ژێر ناوی: «ئایا مەسەلەی کورد یەک مەسەلەیە یا چەند مەسەلەیەکە؟» وتارێکم بۆ ئەم باسە تەرخان کرد کە لێرەدا دووبارە کتومت ئەینووسمەوە:

## دیسانەوە مەسەلەی دۆست و دوژمن و سۆشیاڵ دیموکراتەکان

چەند جارێکە لێرە و لەوێ، بە دزی و بە ئاشکرا، بە نووسین و ئیستگە هەندێ لایەن بۆ مەبەستێکی دیاریکراو باسی ئیشتیراکییەتی دەولی یاخود سۆسیاڵ دیموکراتەکان و مەسەلەی کورد دێننە ناوانەوە کە گوایە پیلانێکی ئیمپریالیستی لە کایەدایە بۆ تێکەڵاوکردنی مەسەلەی کورد بە نەخشەکانی ئیمپریالیزم بە هۆی سۆسیاڵ دیموکراتەکانەوە، وە هەمو جارەکانیش بە چەشنێکی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ پەلەی تاوانبار کردن بۆ ئێمە درێژ ئەکرێ کە گوایە ئێمە ئەوە جێبەجێ ئەکەین..

جا با بزانین سۆسیاڵ - دیموکراتەکان کێن و ڕاستە پیلانێ وا لە کایەدایە و ئێمەیش بووین بە جێبەجێکەری؟ یاخود ئەم بوختانە لە کوێوە هاتوە؟

سۆسیاڵ - دیموکراتەکان چەند حیزبێکی سیاسی گەورەی ئەورووپای غەربیین کە لە چوارچێوەی ئیشتیراکییەتی دەولی دا پەیوەندییان لە گەڵ یەک هەیە. ئەمانە لە دەوروبەری جەنگی جیهانیی یەکەم دا لە گەڵ لینین و کۆمۆنیستەکانی ئەو سەردەمە تێکچوون لە سەر مەسەلەی شۆڕشی چەکدار و دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا و چەند مەسەلەیەکی بنچینەیی و گرنگی مارکسیزم - لینینیزم.

بێگومان لە ماوەی ٦٠ - ٧٠ ساڵی ڕابوردوودا دنیا تووشی گۆڕانی زۆر گەورە و قووڵ بوە، نە حیزبەکەی لینین وەکو ساڵی ١٩١٨ ماوە و، نە سۆسیاڵ - دیموکراتەکانیش حیزبەکانی ساڵی ١٩١٨ ن، ئێمە ئێستا لە کۆتایی ١٩٨٢ داین، کە نەخشەی دنیا و زۆر لە بۆچوون و تێگەیشتنەکانی ئەو زەمانە گۆڕینیان بە سەردا هاتوە.

ئێستا لە ئەورووپای غەربی دا چینێکی کرێکاری بەهێز و پێشکەوتو، گەشەکردو لە ڕووی چۆنایەتی و چەندایەتییەوە هەیە کە قورسایەکی گەورەی هەیە لە ژیانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەوێ دا. چینی کرێکاری ئەورووپای غەربی هەم لە ڕووی گەڵاڵە بوونی هەستی چینایەتی و هەم لە ڕووی مەیینی لە قالبی ڕێکخراوەیی دا چەندین هەنگاوی ناوە بۆ پێشەوە.. زۆر لەو گیروگرفتانەی کە بەر لە سەد ساڵ یا لە پەنجا ساڵا هەی بوە، ئێستا نەی ماوە و هەندێک لەو مافانەی بەدی هێناوە کە ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی تا ئەندازەیەکی زۆر تەئمین کردوە.

لە کوردستان دا گەشەکردنی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، فەرهەنگی لە چاو ئەورووپادا زۆر بە هێواشی بۆ پێشەوە چوە، لە کاتێکا لەوێ زۆر بە خێرایی ڕۆیشتوە، لە گەڵ ئەوەش دا هەر کەسێ وا بزانێ وەزعی ئێستای کوردستان و چینە کۆمەڵایەتییەکانی و حیزبە سیاسییەکانی وەکو پەنجا ساڵ لەمەوبەر وایە، بێگومان بە هەڵەدا ئەچێ و بە کابرایەکی بێ خەبەر لە دنیا لە قەڵەم ئەدرێ، هەڵبەتە ئەوێ لای وابێ وەزعی ئەورووپای ئێستاش و چینە کۆمەڵایەتییەکانی و حیزبە سیاسییەکانی وەکو پەنجا ساڵ لەمەوبەرە، بێگومان کابرایەکی لە دنیا بێ خەبەرە.

سوسیال - دیموکراتەکانی ئەورووپا ئێستا بەشێکی گەورەی چینی کرێکار و نەقابەکانیان لە ژێر دەس دایە. لە سەرانسەری ئەورووپای غەربی دا: لە فەرەنسا، ئیسپانیا، ئەڵمانیا، نەمسە، سوید، نەرویج، هولاند، بریتانیا، ئیتالیا.. تەنانەت لەم وڵاتانەدا حوکمیان گرتۆتە دەست هەڵبەتە نەک بە ڕێگەی ئینقیلابی عەسکەری یا بە زەبری لولەی تفەنگ، بەڵکو بە ڕێگەی هەڵبژاردنی ئازاد و ئەو ریفۆرمانەی لە بەرنامەکانیان دا هەیە.

سوسیال - دیموکراتەکان ئێستا لە فەرەنسا و سوید و نەمسا حوکمیان بە دەستەوەیە و تا چەند حەفتە لەمەوبەر حوکمی ئەڵمانیای فیدراڵیشیان بە دەستەوە بو.

سوسیال - دیموکراتەکان ئێستا لە پەیوەندییەکانی ناو دەوڵەتان دا قورساییەکی ئەوتۆیان هەیە نە یەکیەتی سۆڤیەت و نە چین و نە دەوڵەتانی سوسیالیستی تر، وە نە ئەمریکا و نە وڵاتانی دنیای سێیەم ناتوانن پشت گوێیان بخەن. بۆیە هەر حیزبێکی کوردستانی بیەوێ مەسەلەی کورد، یا هەر مەسەلەیەکی تر بە بیروڕای گشتی ئەورووپا بناسێنێ و هەوڵ بدا پشتیوانی گەلانی ئەورووپی بە دەس بێنێ، ناتوانێ سوسیال - دیموکراتەکان پشت گوێ بخا کە جگە لەوەی چەندین حیزبی گەورە و فراوانن، ملیونەها کرێکار و سەدان نەقابەی کرێکارییان لە گەڵە، سەدەها ڕۆژنامە و گۆڤار و ئێستگەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و سینەما و نوسەر و فەیلەسوف و هونەرمەندیان هەیە.

حیزبی سوسیالیستی فەرەنسە کە ئێستا حوکمڕانە چەند ئەندامێکی حیزبی شیوعی وەزیرن لە وەزارەتەکەیان دا و نوێنەری چەن حیزبی شیوعی لە کۆنگرەکانیان دا بەشدار بون.

یەکێک لە دائیرەکانی چالاکیی ڕێکخراوی ڕزگاری فەلەستین ناو حیزبە سوسیال - دیموکراتەکانە و هەر کات بە میوانی بانگ کرا بێ بۆ کۆنگرە یا کۆبونەوەیەکیان بە خۆشییەوە چون و لە کاتی ئابڵوقەدانی فەلەستینییەکان دا لە بیروتی غەربی، هەڵویستی حیزبی سوسیالیستی فەرەنسی و حیزبە سوسیال - دیموکراتەکانی تری ئەورووپا مەعلوم بو کە چیە و لە چاو هەڵویستی هەندێ دەوڵەتی عەرەبی دا چۆنە بەرامبەر بە مەسەلەی فەلەستین.

جا با لێرەدا بپرسین: ئەگەر بەشدار بونی نوێنەرانی حیزبی شیوعی لە کۆنگرەی سوسیال - دیموکراتەکان دا بۆ حیزبی شیوعی حەلال بێ و، بەشدار بونی وەزیری شیوعی لە وەزارەتی سوسیال - دیموکراتەکان دا بۆ حیزبی شیوعی حەلال بێ و، پەیوەندی و دۆستایەتی لە بەینی ڕێکخراوی ڕزگاری فەلەستین و سوسیال - دیموکراتەکان دا بۆ فەلەستینییەکان حەلال بێ، ئەی بۆچی بۆ ئێمەی کوردی دابەشکراو و زەلیلکراو، کە دوژمنەکانی دەستیان ناوەتە بینی بیخنکێنن، پەیوەندی کردن لە گەڵ سوسیال - دیموکراتەکان و پشتیوانی کردنی ئەوان لە مەسەلەی ڕەوای گەلەکەمان ئەبێ بۆچی تاوان و پیلانگێڕان بێ؟

یاخود پێشینان گوتەنی: یانێکە و دو هەوا؟

سوسیال - دیموکراتەکان، کە هەندێ لایەن بۆ مەبەستێکی تایبەتی خۆیان و بە درۆ کردویانە بە خوێنی سیاوەش و، بە درۆ وای دەرئەخەن کە ئەوە پیلانێکی زلە لە مەسەلەی کورد، لە ڕاستی یەکێکن لەو لایەنانەی کە جوڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی کورد ئەبێ هەوڵ بدا کە پشتیوانی و لایەنگرییان بە دەس بێنێ و هەوڵی ئەوە بدا لە مەسەلەی ڕەوای

کورد بگەن و دۆستایەتی بکەن. بێ ئەوەی جوڵانەوەی کورد و هێزە شۆڕشگێڕەکانی سەربەخۆیی سیاسی و ئایدیۆلۆجی خۆیان لە دەس بدەن.

ئەوی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە: هەر ئەو لایەنەی - مەبەست پارتی بوو - کە ئێستا ئاواتی دۆستایەتی سۆسیال - دیموکرات ئەدەنە پاڵ ئێمە. خۆیان لە ساڵانی ٧٤ و ٧٥ و ٧٦ ەوە تا ساڵی ٧٩ بە ئیمزای سەرۆکەکەیان چەندین عەرزوحاڵی پێشکەش بە ئینتەرناسیۆنالی سۆسیالیست کردووە بۆ قبوڵکردنیان بە ئەندام لە ئینتەرناسیۆنالی سۆسیالیست دا. [word 'ئینتەرناسیۆنالی سۆسیالیست' rendered as printed: ئیشتیراکیەتی دەولی]

ئێمە هەرگیز عەرزوحاڵمان نەداوە بە ئیشتیراکیەتی دەولی کە بەکیتی بە ئەندام وەربگری.

ئەوەی ساڵی ٧٤ وەفدێکی رەسمیی ناردە فینلەندا و داوایەکی رەسمیی پێشکەشی پێشەرمانی سەرۆکی ئیشتیراکیەتی دەولی کرد، ئەوە ئێمە نەبووین و حزبێکی تر بوو.

ئەوەی کە چەندین وتاری بە کوردی و بە عەرەبی بۆ ماستاوکردن لە گۆڤاری نەظەری حزبەکەیان دا لە سەر ئیشتیراکیەتی دەولی نووسی ئێمە نەبووین، بەڵکو حزبێکی تر بوو.

ئەوەی داوای ئەندامەتی کرد و قبوڵ نەکرا و رەت کرایەوە، ئێمە نەبووین و حزبێکی تر بوو. هەر کەسێکیش ئەیەوێ بە چاوی خۆی ئەو بەڵگانە ببینێ، ئەتوانی لە ئارشیڤی مەرکەزیی ئیشتیراکیەتی دەولی تەماشایان بکا.

ئەوانەی دیواری ماڵەکەیان شووشەبەندە با بەرد لە خەڵکی تر نەگرن چونکە خۆیان زەرەر ئەکەن.

حیکایەتی ئەو درۆ زلەی هەندێ لەو تاقمانە بۆ سەر لێ شێواندن و ساختەچێتی ئەیکەن بە بەڵگە لە سەر پیلانگێڕانی سۆسیال - دیموکراتەکان دژی جوڵانەوەی کورد و بەشدار بوونی ئێمەش لەو پیلانەدا بەمجۆرەیە:

ئەمساڵ حزبی سۆسیالیستی فەرەنسی کۆنگرەی ئاسایی خۆی بەست. بە میوانیی کۆنگرە، دەیان حزبی شیوعی و سۆسیالیستی و دیموکراتی بانگ کرد بوو، یەکێک لەو رێکخراوانە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو، کە هەڤاڵان عومەر شێخمووس و ئەحمەد باموەرنی لە ناو وەفدێکی کوردیی نوێنەری پارچەکانی ئێران و تورکیا و سووریادا بەشداری کۆنگرەکە بوون. جگە لە نوێنەرانی یەکێتیمان، نوێنەری چەند حزبێکی کوردستانی و نوێنەری رێکخراوی رزگاریی فەلەستین و دەیان حیزب و رێکخراو و جوڵانەوەی رزگاریخواز، بەشدار بوون.

لە ئەنجامی هەوڵدانی وەفدەکەی کوردستان لە کۆنگرەکەدا، کۆنگرە بڕیارێکی دەربارەی پشتیوانی کردن لە خەباتی میللەتانی فەلەستین و ئەریتریا و پۆلیساریۆ و کوردستان لە پێناوی بەدیهێنانی مافی چارەنووس دا لە وڵاتەکانی خۆیان دا. مەسەلەی ئەم چوار میللەتە پێکەوە لە پڕۆژەی یەک بڕیاردا باس کراوە.

بێگومان میللەتی فەلەستین ئەمەی بە سەرکەوتن دانا بۆ خۆی کە گەورەترین حزبی فەرەنسە ئەم مافەی پێ رەوا دیوە.

هەروەها میللەتی ئەریتریا و پۆلیساریۆش ئەمەیان بە سەرکەوتن دانا بۆ خۆیان کە گەورەترین حزبی فەرەنسە مافی چارەنووسی پێ رەوا دیون.

کەچی هەندێ کوردی داخ لە دڵ بۆ مەبەستێکی دیاریکراو کەوتنە هات و هاوار و هێرش کردنە سەر ئەو بڕیارە و سەر ئەو وەفدەی بەشداری کۆنگرەکە بوە و، سەر یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کە ئەو وەفدەی ناردوە و، هەندێ کوردی نەزان پیاوەتی ئەو بڕیارەیان بە گرتنی هەندێ عالی لەوەنسی دابەوە و دڵیەرویان پێ ئەئلێشاندن.

ئێمە لە مەسەلەی ناسینی دۆست و دوژمن دا بەرچاومان روونە، نە لێڵایی دەسکەوتی حیزبایەتی و عەشیرەتی و، نە تاریکایی تەعصبی کوێرانە و، نە بە هۆی خۆ هەڵواسینەوە بەم لا یا ئەولا دا بەری چاوی لێکدانەوەمان ناگیرێ. بەڵکو وەکو ڕێکخراوێکی سەربەخۆ، چەکدار بە تیۆری زانستی کە ڕێباز و سیاسەتی گشتی و هەڵوێستەکانی لە دۆست و دوژمن لە ئەنجامی شیکردنەوەی واقیعی بابەتی دا بە سەنگ و تەرازوی زانستی دیاری ئەکات.

ئێمە ناساندنی مەسەلەی کورد و بڵاوکردنەوەی هەواڵ و دەنگوباسەکانی و سەلماندنی عەدالەت و رەوایی ئامانجەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کورد لە سەر ئاستی جیهان، بە گەلانی دنیا و حیزب و ڕێکخراوە سیاسی و نەقابی و ئینسانییەکانی و، بە دەزگاکانی ئیعلام و بیروڕای گشتی، لە ناو ئەواندا بە سۆسیال - دیموکراتەکان بە یەکێک لە ئەرکەکانی هەڵاڵەتی دەرەوەی وڵاتمان ئەزانین، کە خۆشبەختانە تا ئێستا ئەنجامی باش و سەرکەوتنی باشمان تێ دا بە دەس هێناوە. ۱۹۸۲/۱۱/۲

*

## تۆڕی پەیوەندی بێتەل

یەکێتی لە ڕووی پەیوەندییەوە زۆر دواکەوتو بو. پەیوەندی نێوان دەزگا سەرکردەییەکانی و هێز و ڕێکخراوەکانی بە نامە و تەتەر بو. لە هەندێ شوێن هۆکی تۆکی بە کار ئەهێنرا، بەڵام بەمە نەئەتوانرا هەمو ناوچەکان بە یەکەوە ببەستێ. هەندێ جار کەلک لە رادیۆ وەرئەگیرا.

بەختیاری برام چەند جاری پێشنیاری بۆ کردم. هەوڵی دامەزراندنی تۆڕی پەیوەندی بدەین و، ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ ئەنجامدانی. من ئەمەم زۆر پێ باش و پێویست بو، بەڵام پێم رانەبو ئەکرێ.

هاوینی ۸۱ هەوڵی دامەزراندنی تۆڕێکی ۳ لایی دا. بە دەزگای بێتەلی «بی تار سی» ئاوزەنگ و مەرگە و وەرتێ پێکەوە بەستران. بەڵام ئەمە لە زستان دا درێژەی پێ نەئەدرا چونکە ئێوە بێتەلەکە لە بەرزایی شاخەکان دانرێ. لە کۆتایی ۸۱ دا داوا لە هەمو هێزەکان کرا هەرچی بێتەل و شتێک پەیوەندی بە بێتەلەوە هەبێ بینێرن بۆ سەرکردایەتی. لە هەندێ شەڕدا بێتەل گیرا بون. بەختیار کەوتە پەیجوری. هەرچی هەبو ناردیان. هەندێکیان گوللەیان بەر کەوت بو. بە هەموی دوانی لێ چاک کرایەوە. یەکێکیان لە سەرکردایەتی دانرا و یەکێکیان نێردرایە وەرتێ. دوای ئەوە ئیتر تیپەکان هەندێ شەڕیان ئەکرد بە تایبەتی بۆ گرتنی دەزگای بێتەل. چەند دانەیەک گیرا و، خۆیشمان بە هۆی ڕێکخراوێکی تیرانیەوە ٤ دانە بێتەلی «کنورد» مان لە ئەوروپا کڕی. لە پاییزی ۸۲ دا تۆڕێکی پەیوەندی باشمان دامەزراند. هەر چوار مەڵبەندەکە و زۆربەی تیپەکانی بە یەکەوە بەست بو. بەڵام بێتەلەکان هەریەکەیان مارکەیەکی جیاواز بو: بیل، راکاڵ، ترمسن، کنورد. ئەم تۆڕە کەلکی زۆری هەبو. هەواڵ و دەنگوباسەکان بە تازەیی ئەگەیشتن. ئاگامان لە هەمو

هیزەکان ئەبو. زۆرجار کە نەمانئەتوانی کۆببینەوە بە بیتەل قسەمان لە گەل یەکتری ئەکرد
و، بیروڕامان ئەگۆڕیەوە
لە سەر هەمان مەسەلە کەریم ئەحمەد وتارێکی درێژی بە عەرەبی لە گۆڤاری
«الثقافە الجدیدە» دا نوسی.
دانانی سۆسیال دیموکرات بە دوژمنی کورد و، پشتیوانیەیان لە کێشەی کورد بە
پیلانی ئیمپریالیزم و، هاوکاری لە گەلیان بە تاوان و خیانەت، بیگومان نیشانەی
بەرچاوتەنگی حشع و، نزمی ئاستی تێگەیشتنی سەرکردایەتی حزبە کوردییەکان بو.

•

## تەفسیری قورئان

من کە منداڵ بوم، بۆ ئەوەی بەرمەللا ئەبم، باوکم لە پشتی هاوینەدا ئەیبەردم بۆ
حوجرە، بە زۆر قورئانی پێ ئەخوێندم، بێ ئەوەی تێ ی بگەم. دوایی خۆم لە بەغدا کە بوم
بە قوتابی زانستی سیاسی و، هەندێ لە بابەتەکانی خوێندنەکەمان پەیوەندی بە ئیسلامەوە
هەبو وەکو: بیرکردنەوەی سیاسی عەرەبی - ئیسلامی، مێژوی سیاسی ئیسلام و، قانونە
گشتیەکانی ناودەوڵەتان، ناچار بوم بە دوای هەندێ کتیبی تەفسیر و فیقهی ئیسلام دا
بگەڕیم. بە کوردی هیچ سەرچاوەیەکم بەر دەس نەکەوت، بەلام بە عەرەبی ئەوەندە زۆر بو
لە ژماردن نەئەهات. لە ناو تەفسیرەکان دا دوانم هەلبژارد بۆ خوێندنەوە و پێداچونەوە،
یەکێکی کۆن: «تەفسیری جەلالەین» و، یەکێکی نوێ: «فی ظلال القران» لە نوسینی
سەید قوطب.
کورد یەکێکە لەو میللەتانەی زۆر لە زومرە موسوڵمان بوە و، لە پێناوی ئیسلام دا
شەڕی زۆری کردوە و، زانای گەورەی لە بواری نوسینی: فیقه، تەفسیر، کەلام، زمان..
تێ دا هەلکەوتوە و، کەم دێ هەیە مزگەوتی تێ دا نەبی. کەچی مەلاکانی کورد بە زمانی
کوردی، جگە لە چەند «عەقیدەنامە» یەکی کورت و چەند «مەولودنامە» یەکی،
شوێنەوارێکی ئەوتۆیان بە جی نەهێشتوە. تەفسیری قورئان و لێکدانەوەی حەدیسەکانی
پێغەمبەر و، دانانی کتیب لە سەر فیقهی ئیسلام، بە کوردی نەنوسراوە. تەنانەت
دوعایەکیان بە کوردی نەخوێنیوەتەوە. لە کاتیک دا لە ئیسلام دا شتیک نیە ریگەی لەمە
گرتبی.
قورئان، بە فارسی زۆر زو و، بە تورکی لە سەردەمی دەسەلاتی عوسمانی دا
تەفسیر و تەرجومە کراوە. بە کوردی ئەوەی من بیستومە و، دیومە تەنیا ۳ تەفسیرە:
تەفسیری مەلا محەممەدی جەلی زادە کە لە چلەکان دا نوسیویەتی، تەفسیری نامی و،
تەفسیری خاڵ، کە هەردوکیان لە حەفتاکان دا نوسیویانە.
هاوڕێکانی شارم، هەمو ئەو کتیبانەیان بۆ ئەناردم کە لە بەغدا بە کوردی و عەرەبی
دەرئەچون، هەروەها حەفتەنامەی «هاوکاری» و مانگنامەی «بەیان» و رۆژنامەی «روشنبیری
نوێ». هەندێ لە نوسەرەکان خۆیان کتیبەکانیان بە دیاری بۆ ئەناردم. رۆژیک لە گەل
بەریدی شاردا، جزمی دوەمی «تەفسیری خاڵ» و «چاپی دوەمی «پەندی پیشینان» م
پیگەیشت. مامۆستا شیخ محەممەدی خاڵ بە خەتی خۆی هەردوکیانی پیشکەش کرد بوم.
شیخی خاڵ و من، لە دو تەمەنی جیاواز و، لە دو شوێنی سیاسی جیاواز و، لە
سەر دو بیروباوەڕی جیاواز بوین.. لە ژیانم دا زۆر جار دیاری جۆراوجۆرم لە بزنەی جیا

جیا دا بۆ هات بوو، بەڵام هیچیان ئەوەندەی ئەم دیارییە خۆشحاڵی نەکردم.

لە گەڵ شێخی خاڵ هەرگیز ڕووبەڕوو دانەنیشتبووم، بەڵام دوو ناسیاریی قووڵم لە گەڵی هەبوو: یەکەمیان، وتارەکانی لە گۆڤارەکانی: گەلاوێژ و ڕۆژی نوێ و، کتێبەکانی: فەرهەنگی خاڵ و، ژیننامەکانی: مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی، مەولەوی زەهاوی، شێخ مارفی نۆدێ، مەولوودنامەی ئەوزەنەر، تەفسیری جزمی عەمما.. دووەمیان، ئەختەری کچی و خەسرەوی برازای.. کە لە گەڵ هەر یەکەیان لە قۆناغێکی خوێندن دا و، لە کۆڕێکی خەباتی سیاسی دا ئاشنا و ئاسیاو بووین. هەر بە هۆی د. خەسرەوی شێخ مستەفای برازای و زاوایەوە، لەو هەلومەرجە سەخت و ناڵەبارەدا منی خوێندبووەوە و کتێبەکانی بۆ نارد بووم.

ئەم پیاوە گەورەیە چەندین بەرهەمی بە نرخ و گرنگی پێشکەشی گەلەکەی کردبوو، لە ناو بەرهەمەکانی دا دوانیان جێگای تایبەتییان هەیە: فەرهەنگی زمانی کوردی و، تەفسیری قورئان.

نامەیەکی کورتی پێزانینم بۆ نووسی، سپاسم کرد بۆ دیارییە بە نرخەکانی، لە خوای گەورە لەشساغی و تەمەنی درێژم بۆ بە ئاوات خواست... من زۆر جار لە ناو جاف دا «دەس مزیچنم» کرد بوو و، دەستی زۆر ژنی لە خۆم گەورەتر و پچووکترم ماچ کرد بوو، بەڵام لە هەموو ژیانم دا ئەوە یەکەمین جار بوو بۆ کەسی بنووسم: «دەستە پیرۆزەکانت ماچ ئەکەم».

لە ناو ئێمەدا حەسەن کوێستانی لە هەموومان زیاتر سۆراخی کتێبی کوردی ئەکرد، هەموو ئەو کتێبانەی بۆم ئەهات، بە وانەیشەوە کە نووسەرەکانی بۆیان ئەناردم، ئەم دا بەو لە کتێبخانەکەی دا هەڵیان بگرێ، یەکێ لەو کتێبانە ئەم تەفسیرە بوو.

ماوەیەک ئەمویست شارەزایی پەیدا بکەم لە سەر جۆری بیرکردنەوەی دینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی.. هەندێ لە نووسەرە گەورەکانی کورد لەوانە: مەلا ئەبووبەکری موصەنیف. زۆری کتێبەکانی ئەم بیرکەرەوە گەورەیە لە کتێبخانەکەی خاڵ دا هەبوو. جارێک بە هۆی د. خەسرەوەوە هەواڵی هەندێکیانم پرسی و، داوام لێ کرد بو ئەگەر ڕێگە بدا فۆتۆکۆپیی هەندێکیانم بۆ بنێری. مامۆستا خاڵ ئەم هەواڵەی ئەوەندە پێ خۆش بوو، دەستخەتی کتێبەکەی بۆ ناردم. کتێبەکە بە فارسی و بە خەتێکی ڕەوانی جوان نووسرا بووەوە. ویستم سەر لەنوێ بینووسمەوە. ماوەیەک خەریکی بووم، بەڵام کە لە شێعرەکانی چوومەوە گلام ماوەی ئەو جۆرە کارانەم نەما و، ترسام خۆم شتێکم لێ بێ و کتێبەکە بفەوتێ، لە بەر ئەوە وازم لە پرۆژەکەم هێنا و، بە سپاسەوە بۆم ناردەوە.

*

جیا دا بۆ هات بوو، بەڵام هیچیان ئەوەندەی ئەم دیارییە خۆشحاڵی نەکردم.

لە گەڵ شێخی ـاڵ هەرگیز ڕووبەڕوو دانەنیشتبووم، بەڵام دوو ناسیاویی قووڵم لە گەڵی هەبوو؛ یەکەمیان، وتارەکانی لە گۆڤارەکانی: گەلاوێژ و ڕۆژی نوێ و، کتێبەکانی: فەرهەنگی خاڵ و، ژیننامەکانی؛ مەلا عەبدوللای بێتووشی، مەولەوی زەهاوی، شێخ مارفی نۆدێ، مەولودنامەی ئەوتەنەر، تەفسیری جزمی عەمما.. دووەمیان، ئەختەری کچی و خەسرەوی برازای.. کە لە گەڵ هەر یەکەیان لە قۆناغێکی خوێندن دا و، لە کۆڕێکی خەباتی سیاسی دا ئاشناو ناسیاو بووین. هەر بە هۆی د. خەسرەوی شێخ مستەفای برازای و زڵوایەوە، لەو هەلومەرجە سەخت و نالەبارەدا منی خوێند بووەوە و کتێبەکانی بۆ نارد بووم.

ئەم پیاوە گەورەیە چەندین بەرهەمی بە نرخ و گرنگی پێشکەشی گەلەکەی کردبوو، لە ناو بەرهەمەکانی دا دوانیان جێگای تایبەتییان هەیە: فەرهەنگی زمانی کوردی و، تەفسیری قورئان.

نامەیەکی کورتی پێزانینم بۆ نووسی، سپاسم کرد بۆ دیارییە بە نرخەکانی، لە خوای گەورە لەشساغی و تەمەنی درێژم بۆ بە ئاوات خواست... من زۆر جار لە ناو جاف دا «دەس مزیچێنم» کرد بوو و، دەستی زۆر ژنی لە خۆم گەورەتر و بچووکترم ماچ کرد بوو، بەڵام لە هەموو ژیانم دا ئەوە یەکەمین جار بوو بۆ کەسی بنووسم: «دەستە پیرۆزەکانت ماچ ئەکەم».

لە ناو ئێمەدا حەسەن کوێستانی لە هەموومان زیاتر سۆراخی کتێبی کوردی ئەکرد، هەموو ئەو کتێبانەی بۆم ئەهات، بە وانەیشەوە کە نووسەرەکانی بۆیان نەناردم، ئەم دا بەو لە کتێبخانەکەی دا هەڵیان بگرێ، یەکێ لەو کتێبانە ئەم تەفسیرە بوو.

ماوەیەک ئەمویست شارەزایی پەیدا بکەم لە سەر جۆری بیرکردنەوەی دینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی.. هەندێ لە نووسەرە گەورەکانی کورد لەوانە: مەلا ئەبوبەکری موسەنیف. زۆری کتێبەکانی ئەم بیرکەرەوە گەورەیە لە کتێبخانەکەی خاڵ دا هەبوو. جارێک بە هۆی د. خەسرەوەوە هەواڵی هەندێکیانم پرسی و، داوام لێ کرد بوو ئەگەر ڕێگە بدا فۆتۆکۆپیی هەندێکیانم بۆ بنێری. مامۆستا خاڵ ئەم هەواڵەی ئەوەندە پێ خۆش بوو، دەستخەتی کتێبەکەی بۆ ناردم. کتێبەکە بە فارسی و بە خەتێکی ڕەوانی جوان نووسرا بووەوە. ویستم سەر لەنوێ بینووسمەوە. ماوەیەک خەریکی بووم، بەڵام کە لە شەڕەکانی جوددەوە گلام ماوەی ئەو جۆرە کارانەم نەما و، ترسام خۆم شتێکم لێ بێ و کتێبەکە بفەوتێ، لە بەر ئەوە وازم لە پڕۆژەکەم هێنا و، بە سپاسەوە بۆم ناردەوە.

*

# سالی ١٩٨٣

## ریککەوتنی ١٩ قۆلی

سوریا و لیبیا هەولیکی زۆریان دا بۆ کۆکردنەوەی موعارەضەی عیراقی. جەنگی عیراق - تیهران هەوای لای هەموان دروست کرد بو کە ئەم شەرە سەری صەددام بخوات. زۆر کۆسپ لە ریگای پیکهینانی بەرەیەکی فراوان دا بو. یەکیکیان ناکۆکی نیوان پارتی و یەکیتی بو. چەند مانگی بو ئیمە بریارمان دابو ئەوپەری نەرمی بنوینین و، هەولمان دابو لە گەل پارتی کۆتایی بە ناکۆکییەکانمان بهینین. د. فوئاد مەعصوم بە نوینەرایەتی یەکیتی و، ئیدریس بارزانی بە نوینەرایەتی پارتی لە پەیوەندی و کۆبونەوەکان دا، لە شام و طەرابلوس بەشدار ئەبون.

روژی ٦ ی شوباتی ٨٣ لە طەرابلوسی لیبیا ١٩ ریکخراوی عیراقی لەوانە یەکیتی، پارتی، حسک، حشع، ریککەوتنیکی کورت و پوختیان ئیمزا کرد. بەندە سەرەکییەکانی بریتی بو لە:

١. پیکهینانی بەرەیەکی فراوانی کراوە بۆ هەمو لایەنەکان.

٢. بەرنامەی سیاسی بەرە:

أ. روخاندنی رژیمی عیراق.

ب. دامەزراندنی رژیمیکی دیموکراتی.

ج. جۆری هەلبژاردنی رژیم ئەدریتە دەس گەلی عیراق.

د. سەلماندنی ئۆتۆنۆمی کوردستانی عیراق و دابینکردنی مافی تورکومان.

هـ. ریکخستنی کۆبونەوەیەک لە ٢٥ ی شوبات دا بۆ دانانی بەرنامە و پەیرەوی ناوخۆی بەرە.

٣. لە ماوەی مانگیک دا بەرە پیک بهینری.

٤. لەمروەوە ئەبی:

ا. دەسبەجی شەری راگەیاندن راپگیری.

ب. ناکۆکی چەکداری ناوخۆ راپگیری.

بریار درا بو کۆبونەوەی داهاتو لە شام بکری و، لەو کۆبونەوەیەدا چوارقۆلی و جود یەک بخرین. بەلام پیش کۆبونەوەکە حشع لە ریکەوتنەکەی تەرابلوس پەشیمان بوەوە و، کۆبونەوەکەی شامی تیک دا.

*

هاوزەمان لە گەل ئەم کۆبونەوانە کۆبونەوەی دوقولی یەکیتی و حشع لە روژانی ٥ - ٦ ی شوباتی ٨٣ لە ناوزەنگ کرا. ئەگەرچی لەم کۆبونەوانەدا ریککەوتنیکی سیاسی بۆ کۆتایی هینان بە ناکۆکییەکانی ناوخۆ و پیکهینانی بەرەی فراوان و، هاوکاری دوقولی ئیمزا کرا، بەلام چونکە هەلومەرجی کوردستان ئالوزاو و، لە چەند جیگایەک ورده شەر لە نیوان پیشمەرگەکانی یەکیتی و، لایەنەکانی جودا لەوما بو، زۆر بە راشکاوی بە دەستەی

نوینەرایەتی حشع: کەریم ئەحمەد، عەبدولرەزاق صافی، ئەحمەد بانیخێلانی، وترا: کە ئەگەر جود لە ناوچەکانی خوارەوە شەر بە هێزەکانی یەکێتی بفرۆشن، ناهێڵین ئەوان لە سەرکردایەتی بە ئاسودەیی دابنیشن فەرمانی شەر دەربکەن.

*

لەو رۆژانەدا کە ئەم هەولانە لە شام، طەرابلوس، ناوزەنگ.. بۆ یەکخستنی تەقەلای سیاسی ئەیارەکانی بەعس و، کاری هاوبەش، ئەدرا، چەند روداوی نالەبار کە لەگەڵ ئەم هەولانە ئەشسازان رویان ئەدا:

١. هێزەکانی پارتی لە شوباتی ٨٣ دا بە سەرکردایەتی حەسەن میرخان ژاژۆکی و، بە یارمەتی ئێران هاتنە نزیک بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی لە ناوزەنگ و، بەرزاییەکانی بەرامبەریان گرت و، هەرەشەی داگیرکردنی ناوچەکەیان ئەکرد. محەممەدی وطان، فەرماندەی تیپی ٦١ ی کۆزەش، نامەی دۆستانەی بۆ حەسەن نوسی و، بە نوێنەرایەتی یەکێتی محەممەدی وەطان و عەلی وەیس، لە گەڵ دو کەسی حشع رۆژی ١٣ ی شوبات چون بۆ بینینی، بۆ خاوکردنەوەی گرژی لە ناوچەکەدا. هەولەکە سەری نەگرت، وەکو دوایی لە نامە گیراوەکانی ناو هەگبەکەی حەسەن دا دەرکەوت مەسعود نارازی بوبو لە بینینی نوێنەری یەکێتی و، فەرمانی پی کرد بو جاسوسان و ناوچەکە بەر ئەدا.

مەسعود بەمجۆرە وەلامی حەسەنی داوەتەوە:

برای عەزیز حەسەن میرخان ژاژۆکی

پاشی سەلامان

کاغەزەکەت گەیشت و هەرچیەکی نوسی بوت زانیم. بە هیچ شێوەیەک هەق نەبو ئێوە لە گەڵ ئەوان دانیشن. قسەی ئەبو بۆ ئەبو شوان و مەحمود، بەلام ئەوی تر - مەبەستی نوێنەرەکەی یەکێتی: محەممەدی وطانە - ئێمە رازی نەبوین و بروسکەیشمان بۆ کردی کە نابی لە گەڵ ئەوان دابنیشن. ئایا ئەم دانیشتنە چۆن کراوە؟

من چاوەڕوانی کاک ئیدریس ئەکەم، ئەگینا من خۆم ئەهاتم بۆ ئەو ناوچەیە و، ئەو هێزەی لە گەڵ خۆم هێناوە هەمویم ئەهێنا، ئەمساڵ هەمو هێزەکانی خۆمان ئەخەینە ناوچەی قەلادزێ و رانیە. ئێستا گرنگ ئەوەیە حەراسەتێکی باشتان هەبی لە شوێنە حەساسەکان و، بۆ عەمەلیات و پێشڕەوی من خۆم دێم ئینشائەللا.

گرتنی ئوتلەکەی سەری جاسوسان پشتی دوژمنی شکاند - مەبەستی یەکێتیە - و من سوپاسی هەمو ئەوانە ئەکەم زەحمەتیان کێشاوە، ئینشائەللا مەشایەخ مەرتەبەیان بەرز ئەکا.

هەروەکو وتم باشترین هێزی خۆمان ئەخەینە ئەو ناوچەیەوە لە بەر ئەوە پێویست ناکات زیاتر بچمە ناو تەفصیلاتەوە.

دوعای خۆشیتان لە خوا ئەخوازم براتان مەسعود بارزانی ٨٣/٢/٢٨

٢. حشع هەندی بیانوی داتاشی و، پاش چەند رۆژی لە ریککەوتنە ١٩ لقیەکەی طەرابلوس پەشیمان بوەوە. لە ناو سەرکردایەتی ئەو بەرەیەدا هەمو لایەنەکان وەکو یەک یەک دەنگیان هەبو. حشع لە پیش دا ئەمەی قبوڵ کرد بو، بەلام لی ی پەشیمان بوەوە بە

بیاننوی ئەوەی هەندێ لەو لایەنانەی ڕێککەوتنەکەیان ئیمزا کردوە هێزی بچوکن و، نابێ هێزە گەورەکان و هێزە بچوکەکان وەکو یەک بن.

٣. لە ڕۆژانی ١١ - ١٢ ی شوباتی ٨٣ دا لە دەشتی هەولێر و دەشتی کۆیە هێزەکانی جود بە کۆمەڵ لە گەڵ هێزەکانی یەکیتی دا بە گژ یەکا چون و، جود ئەمەی کرد بە بیانو، لە ١٦ ی شوبات دا بە ناوی لیژنەی هەولێریانەوە بەیانێکی توندوتیژی پڕ لە هێرشی دژی یەکیتی دەرکرد و، رادیوی پارتی چەند ڕۆژێ لە سەر یەک خوێندیەوە. لەشکری یەکیتی یش ڕۆژی ٢٠ ی شوبات وەڵامی دایەوە.
ڕۆژی ٢٤ ی شوبات سکرتاریەتی جود بەیانێکی توندوتیژی دژی یەکیتی دەرکرد و، حشع یش یادداشتێکی توندی دا بە یەکیتی.

*

بە کردەوە ناوەڕۆکی ڕێککەوتنەکەی طەرابلوس پوکایەوە. هەلومەرجی کوردستان گەیشت بوە ئەوپەری ئاڵوزی. پێشمەرگەکانی یەکیتی و لایەنەکانی جوَد لە یەکتری ئەبەن ئەبون. وەکو ئەمان بیستەوە سەرانی جود، باسی «تأدیب» و «لوت شکاندن» ی یەکیتیان ئەکرد.
بەڵگە گیراوەکان دەریان خست: سەرکردایەتی جود، لە ناو خۆیان دا پێک هات بون گەڵەکۆمەکێیەکی چوار قۆڵی سیاسی - چەکدار بکەن بۆ گرتنی بارەگای مەلبەندی ١ لە حاجی مامەند و گرتنی بارەگای مەلبەندی ٤ لە بالیسان، ئینجا گرتنی جادەی کۆمەتان - خانەقا و، لە دوا قۆناغی لەشکرکێشیەکەدا بارەگاکانی سەرکردایەتی لە ناوزەنگ. دیارە لە هەڵسەنگاندنی هێزەکانی خۆیان دا توشی زۆر - هەڵسەنگاندن و لە هی هێزەکانی یەکیتی دا توشی ژێر - هەڵسەنگاندن ببون.

*

## ئەندامەکانی لەش و شکان

مەسعود لە نامەکەی دا باسی «پشت شکاندن» و سەرانی تری جودیش لە هەمو جێگایەک باسی «لوت شکاندن» یان ئەکردین. من خۆم دو جار لوتم شکا بو جارێکیان بە منالی و جارێکیشیان بە گەورەیی. جارێکیش قاچم شکا بو. ئەو ماوەیەش بڕبڕەی پشتم توشی دیسک ببو، ئەویش جۆرێکە لە پشت شکان. ئەمزانی ئازاری پشت و لوت و قاچ شکان چیە!
شکان و شکاندن، بە ڕونی چەند مەعنایان هەیە وەکو: ورد کردن شتی ڕەق. دابەزینی نرخی پارە و کەلوپەل. ڕیسوا بون. بەلام لە گەڵ ئەندامەکانی لەش دا ڕیزی وشەگەلی تری ی لی ئەکەویتەوە هەم «مەعنای حقیقی» ان هەیە و هەم «مەعنای مجازی» وەکو:
سەر شکان: تێشکان، وەکو ئەلێن: «پەلاماری دا بەلام بە سەری شکاو و جلی دڕاوەوە گەڕایەوە»
زمان شکان: لە قسە کەوتنی کاتی سەرەمەرگ. یان وەکو دوعای شەڕ: «زمانت بشکێ!»
دەس شکان: دەستەخەرۆ کردن. یان وەکو ئەلێن: «دەستی شکاوم..» بۆ مردنی

کەسێکی خۆشەویست یا لە دەس دەرچونی هەلێکی بە نرخ.
ئەژنۆ شکان: ئەو بڕی ورە بەردان و داڕوخانی دەرونیی.
ڕو شکاندن: تەریق کردنەوە.
لوت شکاندن: تەمێ کردن، شکاندنی غرور و بایی بون.
چاو شکاندن: تۆقاندن و ترساندن.
دەم شکاندن: وەلامدانەوەی قسەیەک بە قسەیەکی ڕەقتر. یان وەکو دوعای شەر: «دەست بشکێ!»
مل شکاندن: هەلنان بە قیل بۆ گلاندنی. یان وەکو دەرکردن بە سوکایەتییەوە: «مل بشکێنە!»
پشت شکاندن: لێ سەرواندنی جەزرەبەیەکی کوشندە.
دڵ شکاندن: ڕەنجاندن.
قاچ شکاندن: هەڕەشەیە، وەکو ئەلێن: «بێیت بەم ناوەدا قاچت ئەشکێنم!»
ئێوە بە خۆمان بکەوین بۆ ئەوەی توشی ئەم هەمو شکانە نەبین!

*

## سەید صادق و بالاتەران

مانگی شوباتی ٨٣ جارێکی کە بەعس بە هۆی حدکاوە جوابیان بۆ ناردین کە هەمان وەفدی حکومەت ئەیانەوێ لەگەڵ مامجەلال و نوێنەرانی یەکێتی دابنیشن. داوای لێ کردن کە ئەگەر ئەیانەوێ بێیان با خۆیان بێن بۆ ناوزەنگ. حەزیان ئەکرد لە جێگایەکی نزیک قەلادزە بێ، بەلام ئێمە پێمان داگرت کە بێنە ناوزەنگ. وەفدی عێراقی بە ئوتومبێل هەتا نزیک سونێ هاتن. ئێمەش دەستەیەک پێشمەرگەمان نارد پێشوازییان بکا و بیانهێنێ بۆ ناوزەنگ. لە نزیک بارەگاکەی من لە زێنوی سور جێگا و ڕێگامان بۆ ئامادە کردن.

ڕۆژی ١٣ ی شوباتی ٨٣ نوێنەرەکانی حکومەت جارێکی تر هاتنەوە. وەفدی حکومەت، هەمان وەفدی پێشو: ئەبو ئەحمەد، ئەبو عودەی، ئەبو محەمەد بو. ڕێگای سونێ - ناوزەنگ بەفر گرت بوی، بەفرەکەیش بەست بوی، ولاخ نەیئەتوانی هاتوچۆی بە سەردا بکا. بۆ یەکێ نەشارەزای ڕۆیشتنی سەر بەفر بوایە زۆر ناخۆش بو. بە پێ هات بون تا گەیشتن زۆر ماندو بون. بەرەوپیریان چوین و زۆر بە گەرمی پێشوازیمان کردن و، بردمانن بۆ ئەو شوێنەی بۆیان تەرخان کرا بو تا بحەسێنەوە. ئەبو ئەحمەد، دیار بو شەکەت بوبو، بە گلەییەوە بە منی وت: «کاکە ئەتانەوێ ئەشکەنجەمان بدەن وا ئێمەتان هێنا بۆ ئێرە؟» وتم: «ئەبو ئەحمەد ئێمە لێرە ئەژین و هیچ بە ئەشکەنجەیشی نازانین، تۆ عەسکەرییت هێشتا ئەمە باسی ماندوبون بکەی. حەزمان کرد جێگاوڕێگاکەمان ببینن و ئێمە بناسن!»

ڕاستییەکەی ئەمانویست ئەو قسانەی صەددام لە سەر دواکەوتویی و بێ ئاگایی ئێمە کرد بوی بە درۆ بخەینەوە. جگە لەوەی میوانداری باش و، چەندین جۆر خواردن و خواردنەوەمان بۆ دانان، چەندین گۆڤار و ڕۆژنامەی نوێ و کتێبی تازە چاپکراومان بە زمانی جیاجیای عەرەبی، فارسی، ئینگلیزی، ئەڵمانی.. پیشان دان.

ئیوارەکەی مەشروباتیان پێشکەش کردن ئەمان خواردەوە. لە بەر ماندوو بوون زۆر کەم نانیان بۆ خورا. داوایان کرد شەو دابنیشن بۆ ئەوەی ڕۆژی داهاتوو بگەڕێنەوە بۆ قەلادزە. قسەکەی جاری پێشوویان وتەوە، کە ئەوان تەنیا قسە ئەکەن و قسە ئەبەن. دەسەلاتی گفتوگۆ و بڕیاردانیان نییە. باسەکانی جاری پێشو دووبارە بوونەوە. نوێنەرەکانی حکومەت پێیان لە سەر ئەوە دائەگرت کە مامجەلال سەردانی بەغداد بکات و، ئەیانوت: یەک دانیشتنی مامجەلال لە گەڵ سەرۆک هەمو کێشەکان چارەسەر ئەکا. باسی ئەوەیشیان کرد کە پەیوەندییان لە گەڵ پارتی پێش کردوە و، لە گەڵیان دانیشتون و لە گفتوگۆکەدا چوونەتە پێشەوە. بەڵام نەیانوت باسی چییان لە گەڵ کردوون و بە چی گەیشتون.

مامجەلال هەواڵی ئەم کۆبونەوەیەشی بە نامەیەکی تایبەتی بۆ کەریم ئەحمەد نوسی.

*

شارەزوور لە زۆر کۆنەوە مەڵبەندی مەلاریا بوە. هەمو ساڵ زۆر کەس بە لەرز و تا مردون. جارێک کابرایەکی شارەزووری کوڕەکەی لەرز و تا ئەگری. زۆر نەخۆش ئەبێ. باوکی کوڕەکەی زۆر خۆش ئەوێ ئەترسێ بمرێ. بڕیار ئەدا خێر بۆ کوڕەکەی بکا بەڵکو لەو نەخۆشییە هەڵسێتەوە. سەید صادق و باڵاتەمران دو شاخن بەرامبەر بە یەک، بە سەر لوتکەی هەر یەکێکیانەوە مەزاری پیاوچاکێکی لێ یە. کابرا گیسکێک ئەکا بە خێری سەید صادق و ئەیچێتە بەرامبەری، ئەڵێ: «بە گیسکی چاکی ئەکێشمەوە باشە، نایکەی باڵاتەمران بە کەڵەشێری کرە ئەکا!»

ئێمە ئەمانتوانی لەم دانیشتنە بە ئەێنی بگرین، ئەمانەیلین کەس پێی بزانێ، بەڵام خۆمان بە تەنقەست بە ئاشکرا بە جۆرێک ڕێکمان خست، کە هەمو لایەک: لایەنەکانی جود، حکومەتەکانی ئێران، سوریا و لیبیا پێی بزانن. لەوەیش مەبەستمان ئەوەبو، وەکو چیرۆکی گیسک و کەڵەشێرەکەی کابرای شارەزووری تێ یان بگەیەنین، کە ئەگەر ئێران و جود ئامادە نین شەرمان لە گەڵ ڕابگرن، ئەوا بەعس ممنونە شەرمان لە گەڵ ڕابگرێ. ئەوسا هێزی سەرەکی لە سەر ئەرزی کوردستان کە تەنگی بە عێراق هەڵچنی بو، هێزەکانی یەکێتی بو، نەک هێزەکانی جود. بە ڕاگرتنی شەڕی یەکێتی - بەعس یەکەردەوە شەر ئەئما، ئەوسا دەستی یەکێتی بەتاڵ ئەبو بۆ ئێران.

*

کەمینێکی کوێر

چونی هێزەکانی یەکێتی بۆ یارمەتی دانی حدکا و، هاوبەشی هێزەکانی پارتی لە هێرشەکانی ئێران دا بۆ سەر بنکەکانی حدکا و هێزی پێشمەرگەوان، گرژی خستبوەوە پەیوەندییەکانی یەکێتی - پارتی و، چاوەڕوانی ئەوە ئەکرا ئەو ئاگربڕەی بێ ڕێککەوتنی سیاسی لە نێوان هەردو حیزب دا ئیمزا کرا بو، ئیتر بڕ ئەکات. لە پڕ لە شارباژێر ڕوداوی لەوما، بە یەکجاری ئاگری شەڕی سەرانسەری هەڵگیرساندەوە.

جەنزای عەلی کاتب ماوەیەک بو هات بوە شاخ. بوبو بە لێپرسراوی ناوچەی سلێمانی پارتی. جەنزا هەواڵی بۆ من و عومەری حاجی عەبدوللا نارد کە: «باوەڕی بە حیزبایەتی نەماوە، بۆیە هاتۆتە دەرەوە لە سلێمانی ترساوە یەکێتی لە پەناوە بیگرێ، کاتی خۆی بە هۆی سیاسەتەوە دوژمنایەتی لە نێوان ئەو و کۆکزییەکان دا دروست بوە، ئەگەر ئێمە لە گەڵ مەحموودی حاجی ئەمرج کە ئەوکاتە سەرلیپی هەورامان بو، ڕێکی بخەینەوە، باری

دارایی باشە، واز لە ناوچە و پارتی نەهێنێ، بە یەکجاری سەفەری ئەورووپا ئەکا.»

جەزا لە کاتی شەڕی ناوخۆیی جەلالی - مەلایی دا، لە کۆتایی شەستەکان دا لە سەر دڵوای عەبدولوەهاب ئەتروشی گەورە فەرماندەی پارتی لە ناوچەی هەڵەبجە، خالیدی حاجی فەرەجی کۆکۆیی کوشت. خالید گەنجێکی ڕووناکبیر و بە نرخ و، لێپرسراوی ناوچەی هەڵەبجەی باڵی جەلالی بو. لە تۆڵەی ئەمەدا کۆکۆییەکان لە سلێمانی برایەکی جەزایان کوشتەوە. کوشتنی خالید، لە سەر شتی تایبەتی و ناکۆکی شەخسی نەبو، بەڵکو هۆی سیاسی بو. خالید هاوڕێیەکی نزیکی من بو. ناردم بە دوای مەحموودی حاجی فەرەج دا. قسەم لە گەڵ کرد و ڕاسپاردەکەی جەزام بۆ باس کرد. مەحموود جوامێرانە هاتە پێشەوە یەکسەر وتی: «ئێمە لە گەڵ ئەوانە ناکۆکی خێڵەکی و تایبەتی مان نەبوە، ناکۆکی سیاسی مان لە سەر حیزبایەتی هەبوە، ئێوە چی بە چاک ئەزانن من پێ ی ڕازیم». داوامان لێ کرد لە گەڵی دابنیشێ و ئاشت ببنەوە. ڕازی بو. مەحموودمان ڕێگە دا بگەڕێتەوە هەورامان تا لە گەڵ جەزایش قسە ئەکەین و، کات و شوێنی بە یەک گەیاندنی مەحموود و جەزا دابنێین.

ئێمە لەم کەین و بەینەدا بووین بە بیستنی هەواڵمان بۆ هات ڕۆژی ۱ ی نیسان پێشمەرگەی یەکێتی جەزایان کوشتوە. بە ڕاستی هەموومان زۆرمان پێ ناخۆش بو. لامان وابو ئەمە تاوانێکە تایی بێ سزادان تێ بپەڕێ. بە ڕادیۆ ڕوونکردنەوەیەکمان بڵاو کردەوە، بە داخەوە ڕووداوەکەمان باس کرد و، سەرەخۆشیمان لە کەسوکار و هاوڕێکانی کرد، بەڵێنمان دا کە لێکۆڵینە لە گەڵ بکوژەکان بکەین و، سزای تاوانبارەکان بدەین. پارتی چونکە لە بەیانو بوون وا بە خێرایی دەستیان کردەوە و کەوتنە کوشتن، هەقەکەی خۆیان لە ئەنجامی زنجیرەیەک تاوان دا فەوتان.

*

دارەکەی حسک

حسک لە شارباژێڕ و شارەزوور ناوبانگیان باش نەبو. بە ناڕەوا ئازاری خەڵکیان ئەدا و پارەیان ئەسەند و خەڵکیان ئەگرت. لە سەر ڕێگای سلێمانی - چوارتا لە نێوان ڕێڵەدەر و دوکانیان دا دارێکی لێ بو، پێشمەرگەکانی حسک زۆر ڕۆژ لە بن ئەو دارەدا ڕائەوەستان و، هەر ئۆتۆمۆبیلێک ئەهات و ئەڕۆیشت ڕایان ئەگرت پارەیان لە ڕێبوارەکان و بەنزینیان لە شوفێرەکە وەرئەگرت. بەو هۆیەوە ئەم دارە ناو نرا بو دارەکەی حسک و، لە سەرانسەری ناوچەکەدا ناوی دەرکرد بو. لێپرسراوەکانی حسک هانی پێشمەرگەکانی یەکێتیان ئەدا چەک بفرۆشن و بچنە ناو ئەوانەوە. هەندێ جار پارەیان لە کەسوکاری پێشمەرگەکانی یەکێتی ئەسەند و، هەندێ جار کادر و پێشمەرگەی یەکێتیشیان ئەگرت ئەگەر سەری خۆیان نەئەهێلاندایە بەریان نەئەدان.

نێوانی مەڵبەندی ۱ و هەرێمەکانی حسک ناخۆش بو. حسک لە شارەزوور چەند کادر و پێشمەرگەی یەکێتیان گرت بو. چەندی بە خۆشی هەوڵی بەردانیان درا کەڵکی نەبو، ئەیانویست بە پارە و چەک بیانفرۆشنەوە. هاوزەمان لە گەڵ ئەمەدا چەند پێشمەرگەیەکی هەرێمی ۳۷ ی شارباژێڕیش چەند پارچەیەک چەکیان فڕاند بو، چووبونە لای عوسمانی قالەی مەنوەر. عوسمان فەرماندەی هەرێمی شارباژێڕی حسک بو.

کەرتەکانی تیپی ۳۷ کەوت بونە تەعقیبی عوسمان بۆ ئەوەی بیگرن. عوسمان

کابرایەکی وریا بو زلار زو بۆنی مەترسی ئەکرد. ئیتر لە هاتوچۆ کەوت بو. ئەو رۆژە چەند پێشمەرگەیەکی یەکێتی لەو ناوەدا ئەبن. یەکێکیان تفەنگێکی لە دەس دەرئەچێ چەند کەسی لە خزیان بریندار ئەکا. جەزا ویست بوی پیاوەتییان لە گەڵ بکا بیانگەیەنێتە نەخۆشخانە لە چنگیان. عوسمان ئوتومبیلەکەی خزی ئەدا بە جەزا. جەزا بریندارەکان و یەکێ لو پێشمەرگەی خزی سوار ئەکا و، ئەکەوێتە ڕێگا. کەمینەکەی تیپی ۳۷ کە لە دوورەوە ئوتومبیلەکەی عوسمان ئەبیان و، ئەبیان چەند چەکدارێکی تی دایە، بی چاوەری کردن دایان گرت بوونەوە. هەر لەوی دا جەزا و دو کەس لە پێشمەرگە بریندارەکان و ساخەکان کوژران. کە ئەچنە سەریان ئینجا ئەزانن چ کەتنێکیان کردوە.

*

ئاوات ئەیوت: وەمن مەلا بەختیار داوای لی کردوم عوسمان بگرم بۆ ئەوەی لە گەڵ گیراوەکانی هەورامان بیانگۆڕیتەوە. پێشمەرگەکان لە باتی ئەوەی بیگرن بە نیازی کوشتنی تەقەیان لە ئوتومبیلەکەی کردوە وایان زانیوە عوسمانی تی دایە. بە هەڵە جەزا بەر کەوتوە، دو پێشمەرگەی خزیشمانی لە گەڵ کوژراوە.» پێشمەرگەکان هەمان قسەیان دوبارە ئەکردەوە.

مەلا بەختیار ئینکاری ئەکرد کە داوای گرتنی عوسمانی لە ئاوات کرد بی.

هەندی کەسی کە رووداوەکەیان بە جورێکی تر ئەگێرایەوە. چەند پێشمەرگەیەک چەند پارچە چەکێکی تیپی ۳۷ ئەفڕێنن و رائەکەن بۆ لای عوسمان. ئاوات نامەیەک بۆ عوسمان ئەنوسی داوای لی ئەکا دەسبەجی چەکەکانی بۆ بنێرێتەوە. عوسمان بە شێوەیەکی ناشیرین وەڵامی ئەداتەوە. لە سەر ئەوە ئاوات کەمینی بۆ عوسمان داناوە و، بۆ بەدبەختی جەزای تی کەوتوە.

رووداوەکە هەر چۆنێ بی، بیانوی دا بە جەود و، لە ناو جەودا بە پارتی، شەری سەرانسەری دەس پی بکاتەوە.

*

لە پەیوەندی دا بوین لە گەڵ مەڵبەند بۆ گرتن و لێکۆڵینەوەی بکوژەکان. پارتی چونکە لە بیانو ئەگەڕا، بی چاوەری کردنی ئیجرائاتی یەکێتی دو کاری تولەسەنانەیان کرد:

– رۆژێک دوای رووداوەکەی جەزا، ۲ ی نیسان، لە گوندی بوسەیەکیان نایەوە لە ناو ئوتومبیلێک دا ۸ کادر و پێشمەرگەی یەکێتیان کوشت. ئەم پێشمەرگانە لەو رووداوەدا بەشدار نەبون و، ئەیشیان بیست بو شتی وەها قەوماوە.

– لە کاتی شاردنەوەی تەرمی جەزا و هاوڕێکانی دا، هەڤاڵی ئەحمەد بەگ، کە خزمی جەزا بەلام پێشمەرگەی یەکێتی بو، بی چەک چو بو بەشداری مەراسیمی ناشتنی بکا، هەر لەوی دا گرت بویان کوشت بویان.

ئیتر هەلومەرجی مەڵبەندەکە وا تێکچو. هێزەکانی هەردولا کۆبونەوە و سەنگەریان لە یەک گرت. هەر لایەک هەوڵی ئەدا لایەکەی تر بە شکاوی لە ناوچەکە دەربکا. ژمارەیەکی زور لە پیاوماقوڵ و ریش سپی و مەلا کەوتنە خۆ بۆ ناوبژی مەڵبەندی ۱ و لقی سلیمانی پارتی و، خاوکردنەوەی گرژی و، گێڕانەوەی ئاشتی. لێپرسراوەکانی پارتی بە لاساری و کەللەڕەقییەوە ناوبژییەکەیان ڕەت کردەوە.

•

لەو کاتەدا ئێمە ئابلوقە درا بووین لە هیچ لایەکەوە ڕێگای هاتوچۆمان نەبوو بۆ دەرەوەی کوردستان. نەمانئەتوانی نامە و بڵاوکراوەکانی یەکێتی بە ڕێکوپێکی بگەیەنین بە هەڤاڵەکانی دەرەوەمان. چاروبار پەیامەکانمان بە کۆد و بە ڕادیۆ ئەخوێندەوە، لە شام وەریان ئەگرت. هەلومەرجی کوردستان بە تەواوی شێوا بوو. شەڕی ناوخۆ خەریک بوو هەمەو ناوچەکان و هەمو لایەنەکانی ئەگرتەوە.

من بە تەمای سەردانی ناوچەکانی سلێمانی و، کۆبونەوە لە گەڵ مەڵبەندەکان، سەرتیپەکان، ڕێکخراوەکان، کەرتەکانی ڕێکخستن.. بووم. لە گەڵ ئازاد هەورامی، قادری حاجی عەلی بەگ، ڕەحمان سەید، سلێمی حەمە ئاغا، مەحمود (کە بە مەلازم مەحمود ناسرا بوو)، بەختیاری برام... لە ناوزەنگەوە بە ڕێ کەوتین. بەفر ناوچەکانی سنور و شاخەکانی گرت بوو. لە شاخی سەخت و بەفراوی هومل مان دا و چوینە پێنجوێن. لەم ناوچەیەدا بە ماسی گەورە ئەڵێن: «هومل».

دەفتەری سیاسی هەڵکا بارەگاکەیان لە پێنجوێن بوو. ئەوان تەلەفۆنی سەتەلایتیان هەبوو. ڕێگەیان دام بە تەلەفۆنەکەیان قسە لە گەڵ هەڤاڵانی ئەوروپا بکەم. ئەمویست سەرلەنوێیان ڕابگەیەنم بۆ ئاڵۆزانی هەلومەرجی کوردستان و، هەندێ ڕاسپاردەی م س هەبوو پێیان بڵێم، بە تایبەتی داوایان لێ بکەم داوا لە سوریا و لیبیا و فەلەستینیەکان بکەن، کە تەئسیریان لە سەر جود هەبوو، هەوڵ بدەن ڕێگەی تێنەوەی ئاگری شەڕی ناوخۆ بگرن. عومەر شێخموس بەرپرسی کاروباری دەرەوە ئەو کاتە لە لەندەن ئەژیا. ژمارەکەی ئەومان لێ دا کەس هەڵی نەگرت. تەلەفۆنم بۆ ماڵی ئیبراهیم ئەحمەد کرد. هەلو هەڵیگرت. وتم: «من فلاتم قەلەم و کاغەزی بهێنە هەندێ شت پێ ئەڵێم بینوسە و بیدە کاک عومەر، چونکە کاک عومەرم دەس نەکەوتوە!» یەکسەر وتی: «مەسەلەیەک پێ تۆیش گەیشتیتە ئەوێ؟» جود، بە تایبەتی حشع، ئەوەندە بە درێژ باسی پەیوەندی نهێنی و ژێربەژێری یەکێتیان کرد بوو، ئەم جۆرە کەسانە باوەڕیان کرد بوو. وایئەزانی لە بەغدادەوە قسەی لە گەڵ ئەکەم. چی لە گەڵی خەریک بووم تێ ی بگەیەنم لە جێگایەکی ئەمێنەوە لە کوردستانەوە قسە ئەکەم و، کارەکەم زۆر پەلە و پێویستە، ئەو هەر لە سەر ئەو قسە هەڵەی مەڵەقانەی ڕۆیشت. ناتومێد بووم جنێوێکم پێ داو تەلەفۆنەکەم داخستەوە.

لەوێوە چوینەوە دەوری کوردستانی عیراق سەردانی کەلاوەکانی باوزی، ڕازان، ئەشکەنەمان کرد، کە تازە پێشمەرگە هەندێکیانی ئاوا کرد بووەوە و بارەگایان لێ دانا بوو. جەمال حەکیم، ناظم عومەر، ئەرسەلان بایز، یوسف زوزانی، ئەحمەدی دادی.. لەوێ بوون. دەزگای ڕاگەیاندن گواستبوویانەوە ئەوێ، ڕادیۆکەیشیان لەوێ خستبووە کار. بە تەما بوین زۆری بارەگاکانی سەرکردایەتی بهێنە ئەو ناوچەیە.

بە گوریس لە ئاوی زێ پەڕینەوە بەری ئاسۆس. لامان دایە کەلاوەکانی سەرتەنگ. ناوچەکە ئاتەمین بوو. مەفرەزەیەکی حسک لە مەرگە پێشمەرگەیەکی یەکێتیان کوشت بوو. هێزێکی یەکێتی هات بوو بۆ ڕاونانی مەفرەزەکەی حسک. ڕۆژی ١٠ ی نیسان شەڕێک لە بەینی مەفرەزەکەی حسک و هێزەکانی یەکێتی دا لە ئاسۆس لەوما بوو. مەفرەزەکەی حسک دەستیان وەشاند بوو پێشمەرگەیەکی یەکێتیان گرت بوو، ناوی سەید براییم و، فەرماندەی کەرت بوو لە تیپی ٢١ ی کەرکوک. ئەوان شارەزای ناوچەکە بوون خۆیان حەشار دابوو. ڕۆژی

دوایی چوینە ئاوەڕێ. عەبدولرەحیم عەبدوللا فەرماندەی تیپی ٤٣ ی ئاسۆس بو. مالەکەی لەوێ بو. ڕوستەم و هەندێ لە پێشمەرگەکانی تیپی ٢١ ی کەرکوکیش لەو ئاوە بون.

*

## شەماڵ و بادەاوان

شەو لە ئاوەڕێ مایتەوە. بەیانی ١٦ ی نیسان لە مالەکەی عەبدولرەحیم نوست بوم، شەیەکی هەلیان ساندم. عەبدولرەحیم نامەیەکی پیشان دام لە ڕێکخراوەکانی ئاوشارەوە بۆیان هات بو. لە نامەکەدا نوسرا بو کە ڕۆژی ١٥ ی نیسان هێزێکی تێکەلاوی حشک و حشع لە بادەلوان بۆسەیەکیان ناوەتەوە ٥ پێشمەرگەی یەکیتی تی دا کوژراوە، لەوانە: شەماڵ فەرماندەی تیپی کۆسرەت و، سەرباز ئەحمەد جیگری فەرماندەی تیپەکە. هەردوکیان پێشمەرگەی مەلەزە سەرەتاییەکان و دو پێشمەرگەی هەلکەوتو بون. تۆمەز مەلەزەکەی حسک کە لە ئاسۆس کشا بونەوە، چوبونە کۆسرەت، لە بادەلوان لە گەڵ مەلەزەیەکی حشع یەکیان گرت بوەوە. شەماڵ نازانی ئەوان لە بادەلوانن، لە گەڵ سەرباز و شۆرش حاجی و چەند کەسی لە پێشمەرگەکانی تیپەکەی بە سواری ئوتومبیل ئەچی بۆ بادەاوان. هەر کە دائەبەزن یەکسەر دایان ئەگرنەوە، هەر لەوێ دا پێنجیان لی کوشت بون و، کەوت بونە ڕاوانانی ئەوانی تر.

هەوالم بۆ تیپی کۆسرەت نارد بینە لای ئیمە لە مەرگە و هاتن.

*

## شەو لە شارباژێر

سەرکردایەتی جود فەرمانی دابو بە هێزەکانی هەمو لایەنەکانی جود پیکەوە پەلاماری بنکەکانی یەکیتی بدەن. بەهادین نوری، لیپرسراوی قاطیعی سلیمانی و کەرکوک، ئەم فەرمانەی جیبەجی ئەکرد. لەتاتەت مەکتەبی سیاسی حشع پش داوایان لی کرد هاوکاری هێزەکانی جود بکا دژی یەکیتی، بە قسەی ئەوانیشی ئەکرد.

بەهادین لە کۆنەوە لە گەڵ سەرانی حیزبەکەی لە سەر کۆمەلی مەسەلەی گرنگ ناکۆک بو. بەرامبەر ناکۆکی نیوان حیزبە کوردییەکان ڕەش وابو، ئەوە ناکۆکیە لە ناو باسکە جیاوازەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردا، ئیی حشع لەو ناکۆکیەدا بیلایەن بی و، خۆی لەو شەرەوە نەگلینی. جگە لەمەیش، بەهادین ئەیزانی ئەرازوی هێز بە قازانجی یەکیتیە، لەو ناوچەیەدا هەر شەرێ لە نیوان یەکیتی و لایەنەکانی جودا بی، بە قازانجی یەکیتی بەلادا ئەکەوی، لیتر بوچی خۆی تیکەلاوی شەرێکی دۆراو بکا: هەلویستەکەی بەهادین هێزەکەی حشعی لەو ناوچەیەدا لە زەرەر و زیان پاراست.

*

ڕۆژی ١٩ ی نیسان شەر لە شارباژێر هەلگیرسا. ڕۆژی ٢٠ ی نیسانی ٨٣ کۆتایی هات. هێزەکانی پارتی و حسک لە سورکیو ئاوا بون و بە شکاوی کشانەوە بۆ ئیران و، هێزەکەی حشع، بە سەلامەتی، کشایەوە بۆ بەری قەرەداغ. لەو کاتەدا من لە بەری مەرگە بوم.

*

هەوالەکانی لە مەلبەندی ٤ و تیپەکانی و ڕێکخراوەکانی ناوچەکەوە ئەهاتن و، نامەکانی لە دوستەکانمانەوە پیمان ئەگەیشتن، هەمویان وایان ئەگەیاند، هێزەکانی لایەنەکانی

جود؛ پارتی، حسک، حشع، پاسۆک، له دەوروبەری بالیسان، که بارەگای مەلبەندی ٤ ی لی بو، کۆ بونەتەوە و نیازی پەلاماردانیان هەیە.

به پەیوەندی لەسەر لە گەڵ مامجەلال و مەکتەبی سیاسی کرد، ئەوانیش هەمان ئاگاداریان هەبو. وا ریک کەوتین:

١. هەمو هێزەکانی یەکێتی ساز بدەین بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر دەستدرێژییەکی یەکریزە سەرمان.

٢. ئازاد هەورامی بچی بو سازدانی پاشماوەی هێزەکانی مەلبەندی ٣.

٣. منیش بەشی له هێزەکانی مەلبەندی ١ و ٢ له گەڵ خوم بهێنم بۆ ناوزەنگ.

٤. ئەگەر لایەنەکانی جود پەلاماری مەلبەندی ٤ یان دا ئیمەش پەلاماری سەرکردایەتییان بدەین له قەندیل - پشتاشان.

*

ئازاد هەورامی کەوتە ری بەرەو بیتوێن و لەوێوە بۆ وەرتێ. رەحمان سەیدەیش لە گەڵی گەرابەوە. رەحمان حەزی ئەکرد ناوچەکانی سلێمانی ببینی، هەر بەو نیازە لە گەڵ من هات بو، ئارەزووەکەی نەهاتە دی. منیش وێستم له دەشتی قەلادزەوە بە کورتترین ریگادا بگەرێمەوە ناوزەنگ. بەلام هەوالیان بۆ هێنایین جاش سەر ئاوی زێ یان لی گرت بوبن. جاشەکان هەندێکیان سەر بە لایەنەکانی جود بون. لەبەر ئەوە چومە شارستێن و لەوێوە بۆ سەرگەلو. هێزێکی چەند سەد کەسیم کۆ کردەوە و لە گەڵ خوم بردم بۆ چوڕخاخ و مالومە و بە دولی سەفرە و زەرون دا چوینە هەرزنە بەرەو ناوزەنگ.

*

بە ریگاوە بوین بەرەو ناوزەنگ بیستمان هێزەکانی جود پەلاماری بالیسانیان داوە دولی بالیسان، دولی مەلەکان و، دول ئاکۆیان گرتوە و خەریکی گرتنی دولی خانەقا و دولی شەهیدانن بۆ ئەوەی ناوزەنگ بە تەواوەتی لە ناوچەکانی هەولیر دابڕن و، هێزەکانی یەکێتی کە لە دەرە شیرە - سەرچاوەی مەلەکان گەمارو درا بون بگرن.

لەم شەرانەدا ٧ پێشمەرگەی مەلبەندی ٤ کوژران، لەوانە: ئاسیق محەمەد شوکر (پێشرەو)، ئەحمەد ئەسمەری و، چەند کەسی بریندار بون، لەوانە: عەلی نەبی، شاخەوان، دلزار حەویزی.

پێشرەو کادرێکی هەلکەوتو و رۆشنبیری کۆمەلە، خەلکی کەرکوک و دەرچوی (الاقتصاد) بو. ماوەیەک بەرپرسی دەورەی پێگەیاندنی کادر بو. خۆی دەرسی تیوری سیاسی ئەوتەوە. کتێبێکی گەورەیشی به کوردی لە سەر تیوری سیاسی نوسی بو. فریا نەکەوت چاپی بکا.

ئەحمەد ئەسمەری یەکی لە پێشمەرگەکانی مەترەزە سەرەتاییەکانی دەشتی هەولیر و، هاوری ی کۆمەلە بو. لە بەر ئازایەتی و زیرەکی بو بو بە فەرماندەی کەرت.

دلزار کوری یەکرتاهای حەویزی بو. یەکرتاها یەکی بو لەو ئەفسەرە شورشگێرانەی کورد کە لە جمهوریەتی مەهاباد و لە شورشی ئەیلول دا بەشدار بو. دلزار لاوێکی بەنرخ و تێگەیشتو، دەرچوی (کلیەی ادارە) بو. گوللەیەک لە مێژەلاکی سەری دابو، هەردو چاوی کوێر کرد و، چاوەکانی هەرگیز روناکییان تی نەهاتەوە.

کەلوپەلی مەلبەند و مالی ئەندامەکانی تالان کرا. شەرمەکی سەید کەریم گیرا بو

پاسەپۆرتەکەی کە سووری بوو، لە گەڵ نامەیەکی کە من بۆم نووسی بوو، لە ناو شتەکانی دا، گیرا بوون. دەزگاکانی ڕاگەیاندنی لایەنەکانی جود چەند جارێ ئەم نامەیەیان بڵاو کردۆتەوە.
لە بەشێکی نامەکەدا بۆ سەید کەریمم نووسی بوو:
«بە هۆی سووریا و لیبیاوە زەغتێکی زۆرمان بۆ ق م و تەهران بردوە بۆ ئەوەی شەڕمان پێ نەفرۆشن و پەلاماری مەقەڕەکانی ئێرە نەدەن، دواکەوتنی هێرشەکەیان بە ڕەئی من ئەگەڕێتەوە بە زۆری بۆ ئەو زەغتە، چونکە هەڕەشەی ئەوەیان لێ کردن کە ئەگەر وازمان لێ نەهێنن ئەوا مەجبوورین شەڕی ئەملا ڕابگرین و خۆمان بۆ ئەوان تەرخان بکەین و ئیهالی ئەو مەسئەلەیەش ئەکەوێتە ئەستۆی ئەوان. ئێستا برادەران لەوێ خەریکن کە زۆر لە تەهران بکەن هەڵوێستی خۆی بگۆڕێ، هەرچەندە بڕوا ناکەم بە قەد سەرەیەک هەڵوێست بگۆڕێ»
پێشتر چەند جارێ لە کۆبوونەوەی دوقۆڵی دا لە گەڵ حشع پەیمان وت بوون کە ئەگەر شەڕ لە خوارێ هەڵبگیرسێ، لێیان ناگەڕێین ئەوانیش بە ئاسوودەیی لە پشتاشان دابنیشن. شەڕ ئەخەینە ناو سەرکردایەتییانەوە.

*

بێگومان منیش وەکو هەموو کوردێکی تر لە ناخی دڵەوە ئەم شەڕەم پێ ناخۆش بوو. ڕەنگە بۆ من، کە لە پلەیەکی بەرزتری لێپرسراوێتی دا بووم و، هەموو ژیانی خۆمم بۆ مەسەلەی گەلەکەم تەرخان کرد بوو، ناخۆشتر بووبێ.
حشع و پارتی و، لایەنەکانی تری جود لە هێرشەکانیان دا بۆ سەر یەکێتی، پەنایان ئەبردە بەر موهاتەراتی زۆر نزم. بەو پێشمەرگە قارەمانانەی، کە ڕژێمی بەعسیان هێنا بووە لەرزە و، بەو پیاوە ئازایانەی جەللادەکانی موسڵ و ئەبو غرێبیان سەرسام کرد بوو، ئەوت: جاشەکانی شەستوشەش و جاشەکانی بەعس. ئەم جۆرە پڕوپاگاندە ناڕاستە لە باتی ئەوەی بە قازانج بگەڕێتەوە بۆ جود، لە ناو پێشمەرگە و جەماوەری یەکێتی دا، بوو بە هۆی خولقاندنی داخێکی قووڵ و ڕقێکی ئەستوور لە جود.
– سەرکردایەتی حشع و کادرەکانی، ژمارەیەکی کەمیان نەبێ کە لە کوردستان بوون، ئەوانی تریان لە سووریا و ئەورووپا نیشتەجێ بوون.
– سەرکردایەتی پارتی و کادر و پێشمەرگەکانی، ژمارەیەکی کەمیان نەبێ کە لە کوردستان بوون، ئەوانی کەیان هەموو لە تەهران دانیشت بوون.
– سەرکردایەتی و کادر و پێشمەرگەکانی یەکێتی، چەند کەسێکی کەمی سەرکردایەتی نەبێ کە لە سووریا و ئەورووپا بوون، ئەوانی کەیان هەموویان بە خاوخێزانەوە لە کوردستان بوون.
لەو کاتەوە کە یەکێتی چوو بوو بۆ بارمەتیدانی حدکا، تەهران قەزەبی لە یەکێتی گرت بوو، ئەیەنەویست جود لە گەڵ یەکێتی ئاشتی بکا. دەرگای هەڵبژاردنی سیاسی، بۆ ڕێککەوتن لە گەڵ یەکێتی، لە ژێر گوشاری ئێرانی دا، لە لایەن جودەوە داخرا بوو. ئێمە تەنیا دوو هەڵبژاردنی سەختمان لە بەردەم دا بوو. هەڵبژاردنی سێیەمان نەبوو:
هەڵبژاردنی یەکەم، مەیدان چۆڵ بکەین بۆ جود، یان وەکو هەندێ لە لایەنەکانی جود ئەیانوت: بپێچینەوە بۆ تەویلەکانی یەکرمێز.
هەڵبژاردنی دووەم، لە مەیدان دا بچەقێین و، ئێمە ئەوان دەربکەین.

جەوە ئێرانیان هەموو دالدەیان بدا، ئەو کاتە ئێمە نە لە ئەرز و نە لە ئاسمان جێگەیەکمان نەبوو ڕووی تێ بکەین. ئەو ناوچە بچووکە نەبێ کە پارەگاکانی خۆمان و مەلبەندەکان و ماڵ و خێزانەکانمانی لێ بوو. ئەویش کەوت بووە بەر مەترسی هێرشی جەوە.
هێزەکانی پارتی بە سەرکردایەتی حەسۆ میرخان ژاژۆکی و، بە یارمەتی ئێران چوبوونە سەر چیای چاسووسان، بەرامبەر بە ناوزەنگ، چاروپار هاوەنی بە پارەگا و ماڵەکانەوە ئەنا. ناوزەنگ کەوت بووە مەترسی گیرانەوە، ئێمە چۆڵی بکەین.
ناچار بووین شەڕ لە سەر مانی خۆمان بکەین.

•

هەموو گەلێی لە سەرەتای ژیانی دا کە بیر لە پاشەڕۆژی ئەکاتەوە هیوای زۆر و ئاواتی جۆراوجۆر و ئارەزووی سوور و مۆری لە لا دروست ئەبێ.
منیش وەها بووم. بەڵام هەموو جارێ ژیان بەو ئاقارەدا ناڕوا کە بە تەمای بوی. ئاوات و ئارەزوو و هیواکان لە گەڵ ڕووداوەکانی ڕۆژگاردا ئەبن بە داڵغەی ڕابوردوو و، خەیاڵی لە جێبەجێ کردن نەهاتوو و، خەونی بە دی نەهاتوو...
کە خوێندنی ساناویم تەواو کرد، زەمانی عەبدولکەریم قاسم بوو. لەو سەردەمەدا کورد بە ئاسانی ئەیتوانی بچێتە کلیەی عەسکەری. ئەگەر بمویستایە ئەمتوانی بۆ ئەو زەمانە منیش لە کلیەی عەسکەری وەربگیرامایە. بەڵام خۆم هیچ ئارەزوویەکم نەبوو ببم بە ئەفسەر و حەزم لە ژیانی عەسکەری نەئەکرد، ئەگەرچی ئەو زەمانە ئەفسەر پایەیەکی تایبەتیان هەبوو لە ناو کۆمەڵ دا، تەنانەت بە زەمانی کچانی خوازبێنی کراوی بەغداوە ئەیانوت: «لو ملازم لو ملازم». من حەزم لە ژیانێکی تر ئەکرد کە هێمن و ئاسوودە بێ.
کە بووم بە پێشمەرگە، لە هەموو ژیانم دا جگە لە چەند حەفتەیەک مەشقی «کتائب الشباب» هیچ دەورەیەکی تەدریبی عەسکەریم نەدی بوو، ئەویش لە بەرنامەی دوای جەنگی شەش ڕۆژەی عەرەب - ئیسرائیل، هەرکەسی لەوانەی خوێندنی جامیعەیان تەواو ئەکرد، ئەم مەشقەی نەکردایە شەهادەیان نەئەدایە. ئەگینا بۆ ئەمەش نەئەچووم.
لە ئەدەبی کۆنی عەرەبی و فارسی دا لە ستایشی هەندێ لە کاربەدەستەکان دا نووسیویانە: «صاحب السیف والقلم». من گاڵتەم بەم ستایشە ئەهات. لە ژیانی پێشمەرگایەتیم دا هەرگیز خۆمم بە «ئەهلی تفەنگ» دائەناوە و، حەزم ئەکرد لە ڕیزی «ئەهلی قەلەم» دا حسابم بکەن. کە ئەو شەڕانە بوو. چەند نامەیەکم لە لێپرسراوەکانی ڕێکخراوە نهێنییەکان و، هەندێ لە ڕووشنبیرەکانی شارەوە بۆ هات. ناڕازی بوون لەوەی من سەرکردایەتی هیچ شەڕێک بکەم. هەندێکیان ئەترسان من لە شەڕێک دا بکوژرێم و، کۆمەڵەیش تووشی سەرگەردانی بێ. لەو کاتەدا سەرم زۆر قاڵ بوو، تەنەبەرژا بە نامەی درێژ وەڵامیان بدەمەوە. لە وەڵامی یەکێکیان دا نووسیم:
«هاوڕێ! پەژارەکەت لە جێگای خۆیا بەتی. بەڵام پرسیارە بە ناوبانگەکەی شکسپیر: «هەبێ یا نەبێ! ئەوە مەسەلەکەیە!» چارەنووسی یەکێتی و کۆمەڵە وەکو ڕێکخراو و چارەنووسی خۆمان وەکو تێکۆشەر، لە مەترسی دایە»
کە پەلاماری پالەوانیان دا و گرتیان، ئێمەیش بڕیارمان دا پەلاماری سەرکردایەتییان بدەین لە لەندیل. ئیتر چووم بۆ سەرکردایەتی شەڕەکان.

•

شەڕی یەکەمی جەوڕ

ئازاد هەورامی کارەکەی خۆی بە باشی ئەنجام دا بوو. هێزەکانی وەرتێ، دۆڵە ڕەقە، دۆڵی خانەقای ساز دا بوو، ئامادەی کرد بوون بۆ خەریک کردنی لای چەپی مەیدانی شەڕەکە و، چاوەڕوانی ئەکرد بە ڕادیۆ ئاگادار بکرێ دەس پێ بکەن.

ئێمەیش هێزەکانمان لە زەلی کۆ کردەوە. مامجەلال هات بۆ خواحافیزی و، وتارێکی بە سۆزی بۆ دان و، داوای لێ کردن ئەرکەکەیان بە چاکی بە جێ بهێنن و، بە پەلە بە ڕێ بکەون بۆ ڕزگارکردنی هاوڕێکانیان لە مەڵبەندی ٤ لە گەمارۆی جەوڕ.

ڕەمــزی دەس پێ کــردنی پەلامــاردان پاتگوازێ بوو، کــە ئێمە لە ڕادیۆ وە بڵاو بکرێتەوە، پەندێکی کۆنی کوردی بوو: «تۆڵە بە سەبرە، ئەمما بە زەبرە» ڕادیۆ دەستی کرد بە خوێندنەوەی پاتگوازەکە.

ناوی خوراماڵ لێ هێنا کەوتینە ڕێ. بۆ ئێوەڕۆ گەیشتینە پەستێ. داوام لێ کردن بۆ حەســانەوە لە بن دارەکانی چەمــەکەدا لا بدەن و نانی ئێــوەڕۆ بخۆن. من مــەفرەزەیەکی تێکەڵاوم لە پێشمەرگەکانی بارەگاکەی خۆم و هەندێ پێشمەرگەی گەرمیان پێک هێنا بوو، شاهۆ فەرماندەیان بوو. شاهۆ بەتانییەکی لە بن دارێک دا بۆ من داخست لە سەری دانیشتم. خواردنەکەمــان سەفەری بوو: نان، هێلکەی کوڵاو، تەمــاتە، خەیار و تــەڕوزە بوو. لە ســەر دەسرێک دام نا بوو. لەو کاتەدا فەقێ حەســەن پەیدا بوو. فەقێ حەســەن بارەگاکەی لەو ناوە بوو، خۆیشی خەڵکی ناوچەکە بوو. من بە دوام دا نارد بوو بۆ ئەوەی دەنگوباسی ناوچەکــە و شوێنی ســەنگەر و قایمکارییــەکانی جەوڕی لێ بپرسم. چەند کــەسێ لە گەڵ من لە ســەر بەتانیــەکــە دانیشت بوون. من هەســتام بچم بۆ لای فــەقێ حــەســەن چوم و بانگم کــرد بۆ بن دارێکی تر بۆ ئەوەی گــوێیــان لە قــســەکانمان نەبێ. کــە من ڕۆیشــتم ئەوانی تریش چونکە خواردنەکــەیان بە دڵ نەبوو لە ســەر بەتانیــیــەکــە هەســتــا بوون و ڕۆیشت بوون. مــام ســاڵحی گوڕنەســپ گوێ ی لە دەنگی هەندێ هاوڕێی دوور بوبوو، هاواری لێ کرد بوون: «پێشــمــەرگــە بڵاوەی لێ بکەن ڕوحە هات!» کەس گوێ ی نەدا بوویە.

*

ڕوحە!

گوڕنەســپ گــوندێکە لە گــەرمــیــان. مــام ســاڵح فــەرمــاندەی کــەرت و، بە دەســتی خۆی پیــاوێکی ئازا و، هەتا بڵێی ی قــســە خۆش و جوامــێــر و دڵپــاک بوو. هەمــو جــار ئەیوت: «مامجەلالیش بە پێشمەرگە بڵێ: برا تێکەڵ مەبن، بڵاوەی لێ بکەن، پێشمەرگە دامەزرێن! بە قــســەی ناکەن. بەلام کە فڕۆکەی کۆپتەر و هاشــەی تۆپ هات، ئیتر هەمو بڵاوەی لێ ئەکەن و لە شوێنی قایم دا دائەمــەزرێن! مامجەلالیش ئەو مــەرکەزییــەتەی نیــە کە ڕوحە هەیەتی. مــەرکەزییــەت ها وەلای ڕوحەوە!» مــەبەســتی لە «ڕوحە» فــڕۆکەی هالیکۆپتەر و هاشــەی تۆپ بوو. لەبەر ئەوە مام ساڵحمان ناو نابوو: «ڕوحە».

*

لە پڕ گوللە توپێکی گەورە هاشەی کرد و لە ناوی داین بەر بەتانییەکەی من کەوت، هەر لەوێ دا ٤ لە پێشــمــەرگەکانی مەفرەزەکەی منی کوشت: کامیل وەستا ئەحــمــەد خەڵکی کرێچنە، یاسین عەبدولکەریم خەڵکی کفری، ئیبراهیم ئەحمەد خەڵکی عەزیز قادر، ئەمین فەتاح خەڵکی جامریز. هەروەها بیســتــون جێگری فەرماندەی تیپی ٢١ ی کــەرکوک و،

بەدرخان صابیر پێشمەرگەی هەمان تیپ و، لەشکری چوارقورنەیی پێشمەرگەی تیپی ٩٩ ی کۆسرەت، کوژران. دەزگای پەخشەکەمان پارچە پارچە بو. من بە ریکەوت بەر نەکەوتم. هەموومان هەستاین و بە راکردن روومان کردە بن شاخ و قولایی دولەکە تا گەیشتینە ئەوێ بە هیلاک چوین. تۆپباران بەردەوام بو. دیەدوانەکە لە بەرزاییەکی بەرامبەر بە ئیمە چاوی لیمان بو چاوەڕیی نەکردین. تا ئیوارەیەکی درەنگ نەمانتوانی سەر دەر بهێنین.

*

بیستون (حەمید محەمەد) پێشمەرگەی مەترەزە سەرەتاییەکان بو. هاورێیەکی کۆنی کۆمەڵە و، کادریکی کریکاریی رووشنبیر و پێشمەرگەیەکی تازا و دلسۆز بو. سەیر ئەوەبو رۆژی پێشوتر کۆبونەوەی بە پێشمەرگەکانی تیپەکەیان کرد بو. یەکی لە پێشمەرگە توندرەوەکانی محاسبەیە کرد بو، ئەویش بە ناڕەوا تانەی لی دابو، وت بوی: «ئەو هەمو ساڵە تۆ پێشمەرگەیت، ئەگەر پێشمەرگەیەکی باش بویتایە نەکوژرای یا بریندار نەبوی!»

*

٧ کوژراو و ٢٢ بریندارمان هەبو. لاشەی کوژراو و بریندارەکان کۆ کرانەوە. بەدرخان چەند پارچەیەکی کەمی لەشی مابو. هەموومان رەوانەی ناوزەنگ کرد نەوە و نامەیەکم بۆ نوسین رووداوەکەم بۆ باس کردن و، داوای دەزگایەکی بیەسلم لی کردن.

ئیوارەیەکی درەنگ بە تاریکی بە ری کەوتین بەرەو قەلاتوکان. پێشتر ئاگاداری هیزیکی تیکەلاوی تیپەکانی ئاسۆس و ماملندم کرد بو لە مەرگەوە بە دەشتی قەلادزەدا بچن بۆ قەلاتوکان و بچنە سەری مۆلی گەورە لە زنجیرەی چیای قەندیل. سەری مۆلی کەوت بوە نیوان قەلاتوکان و قرناقاو، بە سەر هەمو سەنگەرەکانی جوردا زاڵ بو. من بە تەما بوم خۆم سەر بکەوم بۆ سەری مۆل و شاخەو شاخ هیزیک بنیرم ریگاکانی قەندیل لە کشانەوەی هیزەکانی جود بەرەو ئیران بگرن و، لەوێوە کە هەمو ناوچەکە بە چاکی تەبینری شەرەکە بەرێوە بەم. بەلام تۆپباران دوای خستین و نەخشەکەی تیکداین.

بارەگایەکی حشع لە سەر ریگامان بو. پێشمەرگەکانم ئاگادار کرد بو خۆیان تی نەگەیەنن. ئەگەر ریگەیشیان پی گرتن خۆیان پیوە خەریک نەکەن. بایی تیپەرین تەقوتۆلیان لە گەل بکەن. زوری پێشمەرگەکان شەو لە سەر ریگاکە ئاگریان کردەوە و خۆیان دا بە ئەرزدا بۆ نوستن. هیزەکانی جود کە لە بەرزاییەکان بون مەشخەلاتی ئاگرەکانیان ئەدی. خۆم چومە قەلاتوکان و فەرماندەکانم بانگ کرد. سەر لە نوی هیزەکانمان ریک خستەوە و ئەرک و فرمانم بە سەردا دابەش کردن. هیزیکمان نارد بۆ بەهیزکردنی . بری مول، بۆ ئەوەی هەندیکیان لەوێوە شۆر ببنەوە بۆ سەر سەنگەرەکانی جود. ٤ هیزی تریشم ئامادە کرد بۆ سەر ٤ جیگا لە کانی گاتران، گەری گازی، سەری سارین.. هەمو قولەکان هۆکی تۆپ‌یان پی بو.

*

پیش ئەوەی لە ناوزەنگ بە ری بکەوین ناردم چەند تۆپیک خامی سپیان کری و، دام بە تالمەکەی مامە ریشە هەلی بگرن. شوانی رەوف نوری جیگری ریشە بو، کوریکی قسە خۆش بو، رووی تی کردم وتی: «دیارە ئیمەت داناوە بۆ مردن، وا کفن تەسلیمی ئیمە ئەکەی!» من لە سەری نە رویشتم. جلوبەرگی پێشمەرگەکانی جود و یەکیتی، زمان و سەروسیمایان و چەکەکانیان لە یەک ئەچو، بۆ ئەوەی لە کاتی تیکەلاو بون دا لە یەکتری

جیا بکرێنەوە، پێش دەس پێ کردنی هێرشەکە. خامەکەمان لە شێوەی شریت دا بڕی و، هەر پێشمەرگەیەکی یەکێتی پارچەیەکمان دایە بیبەستی بە بازووی چەپیەوە.

*

تا نیوەڕۆ لە خۆئامادەکردن بووینەوە. غەریب سەعید بە سواری گوێدرێژێک پەیدا بوو. سەروگوێلاکی خوێناوی بوو. هەندێ وردە پارچەی نارنجۆکێکی بەر کەوت بوو. گالۆکێکی بە دەستەوە بوو، لە بەردەمی دا درێژی کرد بوو. ئەو لە کاتی تێپەڕین دا ئەمان دواپێن تاقمی کاروانە درێژەکەمان بوون. کەوت بوونە بەر شالاوی لە ناکاوی بارەگەکەی حشع لە ڕەزگە. وریای مام قادر کوژرا بوو، ئەمیش برینداز ببوو. یەکێ لە پێشمەرگەکان کە سەیری دیمەنی غەریبی کرد بە سەر کەرێکەوە، وتی: «سەیرا لە مەلا نەسرەدین ناچێ!»

هەر تاقمە ئەرکەکانی خۆیمان بە وردی بۆ ڕوون کرد بووەوە. لە سەعات ١٣ دا هەر ٤ هێزەکە بە ناو لێرەوارەکەدا بەرەو شوێنی دیاریکراو جوولان. منیش، لە گەڵ کوێخا عەلی قەلاوی، بە شێنەیی دوایان کەوتم و، بەردەوام بە هۆکی تۆکی قسەم لە گەڵ فەرماندەی قۆڵەکان ئەکرد. دەوروبەری سەعات ١٦ هەمو ئەو شوێنانەی دیاریمان کرد بوو گیران. هێزەکانی جوند هەندێکیان کوژران و هەندێکیان هەڵاتن. هەمو شوێنە بەرزەکانیان لە دەس دا و خێوەت و کەلوپەل و خۆراکیان بە جێ هێشت. عەلی مام ڕەسوڵ، لێپرسراوی زیندانەکەی حسک بوو، ئاگاداری کردین کە ئامادەیە: هەمو گیراوەکان لە گەڵ خۆی بهێنێ و، بیانە ڕیزی یەکێتیەوە. هەواڵمان بۆ نارد بێت. یەکێ لە گیراوەکان سەعید براییم بوو، سەعید براییم فەرماندەی کەرت بوو لە لیوای ٢١ کەرکوک. لە تەقەوتۆڵەکەی ئاسۆس دا گیرا بوو، گەیاند بوویانە ئەوێ.

ئازاد هەورامی بێش هێزەکانی مەلبەندی سێ ی ساز دا بوو لە قۆڵی کۆمەتانەوە هێرشی بۆ کرد بوون، هەندێ پێشڕەوی کرد بوو.

قوناغی یەکەمی کارەکەمان ئێوارە تەواو بوو، شەوەکەیمان دانا بۆ حەسانەوە. هەوا سارد بوو، ئیمە بۆ حەسانەوە چووینە ناو خێوەتێکی ئەوانەوە. یەکێک ڕادیۆی حشعی کرد بووەوە، ژنێک بە دەنگێکی ناساز جنێوی پێ ئەداین و، هەڕەشەی لێ ئەکردین. پێشمەرگەیەکیش لە دابەزینی سەری مۆڵ دا بریندار بوو بوو، گوللەیەک لە سمتی دابوو، دیار بوو ئازاری زۆری هەبوو، زۆری هاوار ئەکرد، دو سێ کەسیش لەو لاوە گاڵتەیان لە گەڵ ئەکرد، ئەیانوت: «هاوار مەکە تۆ لە ڕاکردن دا گوللەت بەر کەوتوە، بۆیە لە دواوەی داوی!»

بەیانی ڕۆژی داهاتو، ڕێکەوتی ٢ ی مایسی ٨٣ هێزەکەمان دەستی کردەوە بە هێرش. هەندێ کۆنە ڕەبیەی جەیش بە بەرزاییەکەوە بوو بەرامبەر قرناقاو و پشتاشان. لە گەڵ هەندێ لە فەرماندەکان من چوومە ناو ڕەبیەکەوە. حشع بە هاوەنی ١٢٠ ملیم دایان گرتینەوە و، بە دۆشکا دوور بە دوور تەقەیان لێ ئەکردین. هێزەکانی ئێمە ڕژانە ناو قرناقاو و دەستیان بە سەر بارەگاکانی حسک و پاسۆک دا گرت. پێشمەرگەیەکی بالەک: عومەر عەلی دەربەندی کوژرا. لە گرتنی حانوتەکەی حسک دا چەند ساردیەیەکی ئاوقوتوی لە دوای یەک خوارد بووەوە. لە کاتی خواردنەوەی کوکایەکی قوتودا گوللەیەک لە سەری دابوو. لەو کاتەدا تاریک بارانی دەنگ گەورە بە خوڕەم دەستی کرد بە بارین. سەرانی حسک و پێشمەرگەکانیان بە قەندیل دا هەڵگەڕان. هێزەکانمان هەندێکیان کەوتنە ڕاونانی ئەوان و

هەندێکیان هەڵیانکوتایە سەر بارەگاکانی حشع لە پشتاشان. منیش ئیتر دابەزیم بۆ دۆڵەکە.

*

## پی کا کا لە قەندیل

لە بەردەمی پشتاشان دا راوەستا بوم تەلە گەرم بو چەند کەسێکیان هێنا بۆ لام. باتگم کردن قسەیان لە گەڵ بکەم، بە کرمانجی ئەدوان. لێم پرسین: «ئێوە چین؟»

وتیان: «ئێمە پی کا کا ین!»

وتم: «پی کا کا چی ئەکا لێرە؟»

وتی: «هات بوین بۆ ناوبڕی ئێوە و جودا»

وتم: «کاکی برا قسەیەکی پێشینان ئەڵی: ئەگەر کەچەڵ حەکیم بوایە تەداوی سەری خۆی ئەکرد! ئێوەیش لە گەڵ هەمو گروپ و حیزبەکانی کوردستانی تورکیا لە شەڕدان بۆچی ناچن لە گەڵ ئەوان ڕێک بکەون لە پاش خەریکی ناوبڕی ئێمە بن؟»

یەکێکیان زۆر بە داخ بو، بە چەپۆک لە سەری خۆی ئەدا، هاوڕێیەکی کۆمیتەی ناوەندییان کوژرا بو، لە لایان زۆر بەرێز و خۆشەویست بو، ئەیوت: «ئێوە هەڤاڵیکی ئێمەتان کوشتوە، تورکیا و ئەمەریکا و هەمو ئیمپریالیزمی جیهانی بە دوایەوە بون، نەیانتوانی هیچی لێ بکەن، کەچی ئێوە لێرە کوشتتان»

داخی خۆمم دەربڕی سەبارەت بە کوژرانی هاوڕێکەیان، وتم: «ئەوە لە ئەنجامی هەڵەی خۆتان دا بوە کە هاتونەتە ناو ئەم شەڕەوە. ئێستاش بچن چەکەکانتان وەربگرنەوە و، بۆ کوێتان ئەوێ بە ڕێتان بکەم!»

ئەمانە مەفرەزەیەک بون لە گەڵ حشع لە نزیک کومتان بون، کە شەڕ دامەزراوە بە شیوعییان زانی بون. داوایان لێ کرد بون تەسلیم بن. یەکێکیان جنێوی داو وت بوی: «ئێوە چین تەسلیمتان بین!» گوللەیەکیان لە سنگی هەڵبڕی داو داو خەریک بو بمری. ئیتر ئەوانیش پەلاماریان دابون، کوڕێکیان لێ کوژرا بو بە ناوی خالید و، ئەوانی تریان گیرا بون. کە زانی بویان پێشمەرگەی پی کا کان نارد بویانن بۆ لای من. منیش ناردمن بۆ لای ئازاد هەورامی چەکەکانیان بۆ وەربگێڕیتەوە و وەکو خۆیان ئەیانویست بە ڕێیان بکا بۆ ڕوستی.

*

عەسری هەمان ڕۆژ شەڕ بە قازانجی یەکێتی بە لادا کەوت. لە گەڵ ئازاد هەورامی و هێزەکانی مەڵبەندی سێ یەکمان گرتەوە. بنکە و بارەگاکانی حشع گیران. بۆ ئەوەی شتەکان بە ساغی نەکەوێتە دەس یەکێتی، خۆیان زۆر شتی نەخۆشخانە، چاپخانە، رادیۆکەیان، هاوەن و دۆشکاکانیان خراپ کرد بو. هەندێکیان بە قەندیل دا هەڵگەڕان بەرەو ئێران. بەفر قەندیلی بەر نەدا بو. لەم شەڕەدا دو پێشمەرگەی یەکێتی کوژران: عوسمان کازاوی و، غەفور پشتاشانی. ئاگاداری هێزەکانی خۆمانم کرد کە ئیتر دویان نەکەون و وازیان لێ بهێنن.

*

هێزەکانی یەکێتی لە جوو بە داخ بون، بەلام تیپی کۆسرەت لەوان زیاتر، چونکە هەمسوی چەند ڕۆژێ بو فەرماندەی تیپەکەیان و جێگرەکەی و ٣ پێشمەرگەیان کوژرا بو.

دوای بە لاداکەوتنی شەڕەکە لە کاتێک دا خەریکی کۆکردنەوەی بەڵگەکان بوین، شۆڕش حاجی کە ئەوسا رابەری سیاسی تیپی کوسرەت و، بە ڕێکەوت لە بۆسەکەی بادەاوان دا نەکوژرا بو، کەوت بوە تەماشا کردنی بەڵگەکان. بە تووڕەبونێکی زۆرەوە هەندێ لەو بەڵگانەی بۆ من هێنا سەیریان بکەم. من لەو کاتەدا نەمئەپەرژایە سەر ئەوەی سەیری شرە و پڕە بکەم، ئەمویست هەرچی زوە بگەینە لای هێزە گەمارۆدراوەکەی مەڵبەندی چوار. بەڵام شۆڕش پێی ی داگرت کە هەر ئەبێ سەیریان بکەم و سەرنجی بۆ دوانیان ڕاکێشام؛

یەکێکیان، ڕاپۆرتێک بو دەربارەی ڕوداوەکەی بادەاوان بۆ عەزیز محەممەد و مەکتەبی سیاسی حیزبەکەیان نوسی بو. لەم ڕاپۆرتەدا نوسی بویان تاقمی چەکداری جەلالی لە گوندی بادەاوان کەمینێکیان بۆ هاوڕێیانی ئەوان و هەڤالانی حیزبی هاوپەیمان؛ حسک دانا بو. بەڵام هاوڕێیانی ئەمان لێیان هاتنە دەست و کەمینەکەیان شکاند و، پێنجیان لە جەلالیەکان کوشت. ئەمەش بە تەواوی پێچەوانەی ڕاستیی ڕوداوەکەوە بو.

دوەمیان، دەفتەرێکی گەورە بو بە قەوارەی (تەی چوار) تەرخان کرا بو بۆ لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی سەرکردایەتی و فەرماندە و هێزەکانی یەکێتی لە سەر شێوەی ئەو ڕاپۆرتانەی دەزگاکانی ئەمن و ئیستیخبارات دەربارەی حیزبەکانی موعارەزە ئامادەیان ئەکرد. زۆر بە درێژی ژمارەی پێشمەرگە و ناوی فەرماندە و ئەندامانی سەرکردایەتی و کادرە پێشکەوتوەکانی و، ڕادەی دڵسۆزیی و ئازایەتییان. تەنانەت ئەوەندەی بۆیان کۆ کرابوەوە، زانیارییان لە سەر پلەی خوێندەواری و پیشە و، ناوی ژن و منداڵ و خوشک و برا و کەس و کاریشیان نوسی بو.

سەیر ئەوە بو، شتێکی لە بابەتی ئەمەیان دەربارەی حیزبی بەعس و جەیشی عێراق و دەزگا سەرکوتکەرەکانی و، هیچ حیزبێکی تر نەکرد بو.

*

هەمو خەڵکی کوردستان بە پەژارەوە گوێ قوڵاغی هەواڵی ئەم شەڕانە بون. بە هاودەردیەوە لە گەڵ یەکێتی، کە لە لایەکەوە عێراق و، لە لایەکەوە تاران و، لەم لایشەوە هێزەکانی جودی لێ وروکا بو. دوستانی یەکێتی، تەنانەت خەڵکی بێلایەن، خەمی چارەنوسی یەکێتییان بو. ئەترسان بشکێ. ئێوارەی هەمان ڕۆژ بە بێتەل قسەم لە گەڵ ڕادیو کرد و، هەواڵی سەرکەوتنی یەکێتی و شکانی هێزەکانی چوار براکەی جودم ڕاگەیاند.

مەبەستی سەرەکیم لەو قسانە ڕوخاندنی وردی هێزەکانی جود و بەرزکردنەوەی وردی هێزەکانی یەکێتی بو، کە لەو کاتەدا لە دەرەشێر و سەرچاوەی مەلەکان گەمارۆ درا بون.

*

لە بنکەکەی حسک دا چەکێکی دژی فڕۆکە گیرا بو، بەڵام هەندێ پارچەیان لێ دەرهێنا بو. بە پێشمەرگەکانم وت: «بەو شوێنەدا بڕۆن کە ئەوانی پێ دا ڕۆیشتون بەڵکو بیاندۆزنەوە!» پاش نەختێ هاتنەوە پاچ و خاکەناز بێنن وتیان چاڵێکمان دۆزیوەتەوە تازە هەڵکەنراوە ڕەنگە لە وێ دا شاردبێتیانەوە. چون چاڵەکە هەڵ بدەنەوە. براییم ڕەبەن، کاتی خۆی پێشمەرگەی یەکێتی بو، لە قەراغ دانیشت چاوی لێ بو، وتی: «بۆچی ئەو چاڵە هەڵئەدەنەوە!» وتیان: «بە دوای پارچەی دیپیترولەکەدا ئەگەڕێین» براییم وتی: «ئەوە پارچەی دیپیترولی تێ دا نییە، بەڵکو لاشەی خوالێخۆشبو حەمە تاڵەی تێ دایە!»

منیش هەلم دایە وتم: «خولە لە سوێدە»
وتی: «پیری گەیشتەوە و، دوێنێ کوژرا!»

*

ڕۆژی ڕابوردو هەندێ لە سەرکردە و کادرەکانی حشع ڕووشت بوون. هەندێکیان دەرباز نەبوون، لەوانە: کەریم ئەحمەد، مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی، قادر رشید ناسک.. من لە دۆلی خانقا بوم کە ئەمانەیان هێنا. هەندێ قسەم لە گەڵ کردن و سەفەرەبەکەم جیا کردەوە بەرێیم کردن بۆ ناوزەنگ. بە سەفەرەکەم وت بۆ کە بە ڕێزەوە ڕەفتاریان لە گەڵ بکەن و، بە سەلامەتی بیانگەیەننە لای مامجەلال. گیراوەکانی تر ئەبردران بۆ وەرتێ. حشع سەرەتا هەمو گیراوەکانیان بە کوژراو دانا. لە دنیادا وایان بڵاو کردەوە.

*

ئێستر ئەبو خومان ئامادە بکەین بۆ شکاندنی گەمارۆی مەلبەندی ٤. بڵاو بوەوەی هەواڵی گیرانی سەرکردایەتی حسک و حشع، ورەی هێزەکانی جودی لە دۆلی بالیسان و ناوچەکانی تردا دابەزاند. چوینە وەرتێ هێزەکانمان کردە دوبەش:
- بەشێکیان لە وەرتێوە بە سارسیرەک دا بۆ سەرچاوەی مەلەکان.
- بەشێکیان لە دەرگەلەوە بۆ سەران و گەرموان.

لیرە لە باتی خامی سپی، پەروەکی زەردمان کردە بازوی ڕاست.

هێزەکان بێ بەرگری گەیشتنە شوێنەکانی خۆیان. لە گەڵ کەمال خۆشناو و هێزەکەی مەلبەندی ٤ لە سەرچاوەی مەلەکان یەکمان گرتەوە. دۆلی مەلەکان و پشتی خەتی و پشتی شیخ وەسان کە ئەمیرواتی بە سەر مەلەکان دا، بە دەس هێزەکانی جودەوە بو، بە تەقەیە نەهاتنەهێشت بە ئاسودەیی ئاو لە کانیەکە بیهان بۆ خواردنەوە.

ئەو ڕۆژە لەوێ مابینەوە بۆ پشوودان. بە تەما بوین ڕۆژی دوایی لە بەرە بەیان دا پەلاماریان بدەین. ئەوان لە ئێوارەوە دەستیان کرد بە کشانەوە. ناوچەکەیان بە تەواوی چۆل کرد. ڕۆژی دوەم کە چوینە بالیسان بە هەزاران کەس و بە سەدان ئوتومبیل لە هەولێر و شوێنەکانی ترەوە هات بون بە پیرمانەوە. تا ئەو کاتە ئەستەزانی حشع وا چارەنووس و بەزاوین لە ناو خەلک دا، زورایەتی خەلک وایان لێمان بو بە «مایەی لێبەتنە» و «هۆی ئاژاوە» یان ئەزانین.

*

تەفسیری جود بۆ ڕوداوەکان

دوای ئەوەی سەرانی جود و هێزەکانیان کشانەوە بۆ تهران، سەرکردایەتی جود پیکەوە بەیانێکیان لە سەر ڕوداوەکان دەرکرد و، هەرلایەنەش بە جیا بەیانی خۆی دەرکرد. جود لە بەیانەکەی دا نوسی بوی:

«وكانت ذروة هذه الاعمال الاجرامية، الهجوم الغادر المفاجئ الذي شنته قيادة (اوك) على منطقة پشت آشان لتصفية عدد من مقرات الحزب الشيوعي العراقي والحزب الاشتراكي الكردستاني و الحزب الاشتراكي الكردي (پاسوك) . هذا الهجوم الذي يمر عبر مرحلة جديدة من الانحطاط والتدهور، وارتكاب ابشع المجازر الدموية بدعم مفضوح من النظام الدكتاتوري الدموي..»

حەشع لە بەیانەکەی دا نوسی بوی:

«.. وهل یمکن لای متتبع للاحداث ان لایربط بین سلوك قادة الاتحاد الوطنی الکردستانی هذا والمفاوضات التی تجری بینهم وبین السلطة الدکتاتوریة وصفقة المساومة والاتفاق مع صدام. ان کل دیماغوغیة قادة الاتحاد الوطنی وبراعتهم البهلوانیة فی الدعایة لایمکن ان تغطی تواطئهم المفضوح مع طغمة صدام حسین.. هذا التواطؤ الذی ظهر فی تحضیرهم لهذه الحرب بالتعاون مع اجهزة السلطة ومخابراتها و مرتزقتها..»

پدک لە بەیانەکەی دا نوسی بوی:

«ان الطبخة التی ینفذها (اوك) ساهمت فی الاعداد لها دوائر الامبریالیة العالمیة بزعامة الامبریالیة الامریکیة واقطاب الاشتراکیة الدولیة (سوسیال دیمکرات)، وکافة الانظمة والقوی الرجعیة السوداء من اعداء الشعب العراقی والشعب الکردی..»

حسک لە بەیانەکەی دا نوسی بوی:

«لە ڕۆژی ١ - ٣ ئایاری ١٩٨٣ دا تاقمی سەوداکاری بە ناو (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، بە گوێرەی نەخشەیەکی گڵاوی تاوانکارانە، کە ماوەیەکی زۆرە ئیشی بۆ دەکەن، بە هاوکاری ڕژێمی فاشی بەغداد و ئاغاکانیان لە ئیمپریالیزم و هەندێ سەرکردایەتی سۆشیال دیموکراتەکانی ڕۆژئاوا، وەک ئەڵقەیەک لە زنجیرەی نەخشە و پیلانەکانی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم و هێزی کۆنەپەرست بۆ ناو تێکردن و کەسارزدانی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی لە ناوچەکەدا، هێرشێکی کەتوپڕی نامەردانەیان کردە سەر بارەگاکانی سەرکردایەتی حیزبمان.. و لایەنەکانی تری جود بە کەڵک وەرگرتن لە کزکردنەوەی چەکدارەکانیان بە ئاگاداری و لە بەرچاوی ڕژێمی فاشی بەغدا و بە پشتیوانی هەندێ لایەنی هاوپەیمانیان و بە هاوکاری و هاوئاهەنگاوی ڕاستەوخۆی هێزە چەکدار و جاشە خۆفرۆشەکانی ڕژێم، بە نیازی لەناوچوو کردن و لە ناوبردنی تەواوی سەرکردایەتی حیزبمان و حیزبی شیوعی عیراقی و پاسۆک وە بە مەبەستی ئەنجامدانی ئەرکی پێ سپێراویان و جێ بە جێ کردنی مەرجێکی تر لە مەرجەکانی دەست تێکەڵاو کردنە پیلانگێری یەکەیان لە گەڵ ڕژێم دا..»

پاسۆک لە بەیانەکەی دا نوسی بوی:

«پەردەیەک لە دواپەردەکانی ئەم شانۆ گاڵتەجاڕیە جاش مردیرنەی جەلالی ئەو هەمو کارەسات و مەینەتی و خەیانەت و خۆفرۆشی و کوردکوژی و ڕیزتێکدەری و گەرەلاوژی و ئاڵۆزی و ناپاکیەی ئەم چەند ساڵەی دوایی جەلالیزمی پێ ئابروە، کە لە ژێر لافیتە و مانشێتی دەبوجامەسایی (یەکێتی نیشتمانفرۆشانی کوردستان)..»

پێش شەڕی یەکەمی قەندیلیش جود و لایەنەکانی لە شەڕی پروپاگاندەدا دژی یەکێتی زۆریان لەم قسانە کرد بو. ئەمە، یەکێ بو لەو هۆ بنەڕەتیانەی، زەمینەی پەلاماردانی سەرکردایەتی جودی ساز کرد.

•

## تضامنی امی، یان قیرەی قازا

حەشع لە سەرانسەری دنیادا هێرشێکی پروپاگاندەیان دەس پێ کرد. شتی وایان لە گەڵ حیزبی بەعسیش نەکرد بو. ئیمە بە هۆی دابڕاویمانەوە لە دنیا زۆر ئاگاداری ئەم بەزمە نەبوین و گوێمان نەئەدایە. بەڵام زۆری نامە و بروسکەکانیان ئەنارد بۆ بارەگاکەی شام و،

ڕادیۆی پارتی هەندێکیانی بڵاو ئەکردەوە. ئەوە یەکەم جار بو ناوی هەندێ لەو ڕێکخراوانە بیبیستین. قاز بە پۆڵ ئەگەڕێن. هەرچەن یەکێکیان بلەرزێنی، بێ ئەوەی ئەوانی تر بزانن چی قەوماوە، هەمویان بە یەک دەنگ ئەقیژێن. پۆلە قازەکانی ئەم لا و ئەو لاش کە گوێیان لێ ی بێ بۆیان ئەسیننەوە. ئەمجارەیان (تضامن) ە (امن) یەکەی حیزبە شیوعیەکان لە گەڵ حشع دژی یەکێتی دەریان بڕی. لە قیرەی قازەکان ئەچو. چونکە بێ ئەوەی ڕاستی ڕوداوەکان بزانن بۆ پشتیوانی لە حشع کەوتنە ناردنی بروسکەی نارەزایی بۆ یەکێتی و، پەلاماردانی. یەکێتی هێزێکی بێ پشتیوان و بێ کەس بو، نە پەیوەندی بازرگانی لە گەڵ ئەو وڵاتانە هەبو ڕایبگری، نە ئەوتێشی هەبو تا لێیان بپری. دوژمنایەتی یەکێتی، بۆ ئەوان، هیچی لێ نەئەچو.

مەکتەبی سیاسی یەکێتی یادداشتێکی دەربارەی ڕەوتی ڕوداوەکان ئامادە کرد و، ناردی بۆ حیزبە شیوعیەکان. ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ قبولکردنی لیژنەیەکی بێلایەن لەو حیزبانە کە لە ڕوداوەکان بکۆڵێتەوە بۆ ئەوەی لایەنی بەرپرسیار دیاری بکری.

*

## ئیتیهامەکانی حشع

حشع، شەری پشتئاشانی کرد بو بە کەرەستەی پروپاگاندە دژی یەکێتی. ڕاستیەکەی زوری ئەو قسانەی ئەیان کرد درۆی دروستکراو بون:

- ئەیانوت: «ئەم هێرشەی یەکێتی لە سەر داوای حکومەتی بەعس و، بە یارمەتی ئەوان و، بۆ ڕازی کردنی ئەوان بوە، وەکو بەشێ لە نرخی ڕێککەوتنی لە گەڵ یەکێتی»

لەو کاتەدا هێزی سەرەکی لە مەیدانی خەبات دا دژی ڕژێمی بەعس، هێزەکانی یەکێتی بو، هێزەکانی جود قورساییەکی سیاسی - چەکداری ئەوتۆیان نەبو. چالاکی گەورەیان خەریک کردنی هێزەکانی یەکێتی بو، بە ململانێ ی دەسەڵات و شەری لاپەلاوە. لە کاتی شەرەکانی قەندیل دا، هێزەکانی یەکێتی بەر هێرشی بەعس کەوت، نەک هێزەکانی ئەوان. گەورەترین چەکی دەستی پێشمەرگەکان: ئارپیجی و بیکەیسی بو.

- ئەیانوت: «هەمو دیلەکانیان کوشتوین»

لەو شەرەدا زوریان کشانەوە بۆ ئێران، زیاتر لە ٥٠ کەسیان گیرا. لە ناو گیراوەکان دا: کەریم ئەحمەد، ئەندامی م س. مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی، ئەندامی ک ن و مەکتەبی ئیقلیمی کوردستان. قادری ڕەشید ناسک، ئەندامی مەکتەبی ئیقلیم. ئەمانە ٣ کەس بون لە سەرانی حشع، دەستبەجێ بە ڕیزەوە بە ڕێ کران بۆ ناوزەنگ. گیراوەکانی تریش ئیدرانە وەرتی. ڕێگایان درا بو بە ئارەزوی خۆیان کەسێوەنەوەی سیاسی بکەن، تەنانەت کۆبونەوەیەکیان بۆ چلەی کوژراوەکانیان کرد. کەس ڕێگەی لێ نەگرتن. پاش ماوەیەک هەمویان بەر دران.

- ئەیانوت: «ژنەکانیان کوشتوە و، دەستدرێژیان کردوتە سەر خێزانەکان»

دوای کشانەوەی سەرانی حسک و حشع و چەکدارەکانیان، هەمو خێزانەکانیان لە ناوچەکەدا بە جێ مابون. لە ناو ئەوانەدا خێزانی فاتیح ڕەسوڵ و فریشتەی خوشکی دلزار.. بە ڕێزێکی زۆرەوە ڕەفتاریان لە گەڵ کرا. هەر کەس ویستی ناوچەکە بە جێ بهێڵێ وڵاخی بۆ دابین کرا و، ئەوەی پێویستی بە پارە بو یارمەتی درا و، ئەوەی مایەوە کەس زوری لێ نەکرد بڕوا. تەنیا ١ ئافرەتی شیوعی کوژرا بو، ئەویش وەکو دوایی خۆیان لە ژننامەکەی

دا نوسی بویان، تا دوا فیشەک ئازایانە شەڕی کرد بو.
– ئەیانوت: «بارەگا و ماڵەکانیان تاڵان کردوین»
جەنگی داخە، تاڵان و ڕوتوڕووت بەشێکە لە نەریتی کۆنی شەڕوشۆڕی کوردەواری. دوای کشانەوەیان هەمو کەلوپەلی بارەگاکانیان: بەڵگە و کتێب، چەکی قورس، بەتانی و خەوەت، ئازوقە، دەرمان.. کەوتە دەس هێزەکانی یەکێتی. حەشع زۆری بارەگاکانی خۆی تێک دابو. ڕادیو، کەلوپەلی نەخۆشخانەکانیان خراپ کرد بو، پارچەی گرنگی هاوەن و دۆشکاکانیان دەرهێنا بو بۆ ئەوەی یەکێتی کەڵکیان لێ وەرنەگرێ.

*

زۆری بەڵگەکانی حسک، پاسۆک، حشع کەوتە دەس و دەسبەجێ نێردران بۆ ناوزەنگ. لە سەر ئەم شەڕە نامیلکەیەکی تایبەتی پشت ئەستور بە بەڵگە گیراوەکان بڵاو کرایەوە. بەڵگەکان لە ئارشیفەکەی مامجەلال دا هەڵگیراون.

*

## خۆشناوەتی

خۆشناوەتی بەو ناوچەیە ئەڵێن کە شوێنی ژیانی عەشیرەتی خۆشناوە. خۆشناو پێک هاتوە لە تیرەکانی: میر مەحمەلی، میر وسوێی، پشت گەلی (پشت گەلی) و، ئەوانیش ئەبن بە چەند بەرەبابەوە. لە لای سەرویەوە لەگەڵ عەشیرەتەکانی هەرکی و سورچی و، لە لای خوارویەوە لە گەڵ پیران (بلباس)، لە لای ڕۆژهەڵاتیەوە لە گەڵ ئاکۆ و، لە لای ڕۆژئاوایەوە لە گەڵ گەردی و هەرکی هاوسنورە. لە ڕوی بەڕێوەبەرایەتیەوە دابەش بوە بە سەر ناحیەکانی مەرکەزی شەقڵاوە، کۆیە، هیران، لە پارێزگای هەولێر و، ناحیەی بیتواتە لە پارێزگای سلێمانی.

عەشیرەتی خۆشناو سەرۆکایەتیەکی یەکگرتویان نەبوە. ڕیچ، لە گەشتەکەی دا بۆ کوردستان ساڵی ۱۸۲۰، لە دانیشتنێک دا لە گەڵ پیاوماقوڵەکانی بابان لە سلێمانی، کە باسی یەکێتی فیدراڵی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکای بۆ کردون، یەکێکیان وتویەتی جۆری بەڕێوەبەریتیەکەیان لە هی خۆشناو ئەچێ. مەبەستی ئەوە بوە کە سەرۆکایەتیەکی یەکگرتویان نەبوە کێشەکان بە لادا بخا، بەڵکو چەند کەسێ لە سەرۆکەکانی تیرەکانیان ئەنجومەنیان گرتوە بۆ باس و بڕیاردانێ.

سەرۆکەکانی خۆشناو نازناوی بەگیان هەیە، بەڵام عەشیرەتەکەیان پێیان ئەڵێن: میر و میران. میرەکانی خۆشناو ڕەفتاریان لە گەڵ جوتیارەکان زۆر خراپ بوە و، سزای قورسیان داون، وەکو دەماودەم ئەگێڕنەوە بۆ چاوترساندن و بۆ سزادان، ئەمامی گوێیان لە سەر سەری زەلامی زیندو ئاشتەوە و، بە پێ ی پەتی بە سەر ستەیری (درکە زی) دا گێڕیان پێ کردون.

صدیق بەگ، یەکێ لە سەرۆکە دەسڕۆیشتوەکانی عەشیرەتی خۆشناو، یا وەکو خۆیان پێیان ئەوت صدیق میران. لە گەڵ مەلا مستەفا ناکۆک بو. ئاڵقی لە کاراتیەکانی، کە خۆشناو و ئەندامی پارتی بون، ڕاسپارد بۆسەیەکیان بۆ دانا کوشتیان. حکومەتی قاسم لە سەر ئەوە فەرمانی گرتنی ئیبراهیم ئەحمەد، کە ئەوسا سکرتێری پارتی بو، دەرکرد. دوای ئەم ڕوداوە ئەم بنەماڵەیە ئیتر بە لای حکومەت دا کەوت و، بو بە یەکێ لە چەکهەڵگرە دڵسۆزەکانی حکومەت و، بەشدار بو لە دروستکردنی فورسان صەلاحەدین، مەغاوێزە خاصە،

لەوجی خەلیف...
ئەنوەر بەگ، یەکێکی کە لە سەرۆکەکانی خۆشناو، لە سەرەتای دەس پێ کردنی شۆڕشی ئەیلول دا بەشداری کرد و، یەکێ لە بنکە سەرەکییەکانی لە بێتواتە دانرا. سەرەنجام لە گەڵ کاربەدەستەکانی بارزانی بە تایبەتی عەلی عەسکەری، کە بێتواتەی کرد بو بە بارەگای خۆی، تێکچو، ئەنوەر بەگ چوە پاڵ حکومەت و، بو بە یەکێ لە چەکهەڵگرە دڵسۆزەکانی حکومەت و، بەشدار بو لە دروستکردنی لەوەستان سەلاحەدین، سەفەرزە خاصە، لەوجی خەلیف...
جیا لەمان هەزاران کەس لە ڕوشنبیر و جوتیارانی خۆشناوەتی لە شۆڕشی ئەیلول و، لە شۆڕشی حوزەیران دا بەشدار بون.
خۆشناوەتی بە گشتی شاخاوییە. گوندەکانیان کەوتوتە بناری شاخەکانی ماکۆک، شەشار، هەوری، سەفین، پیرمام، بەنەهاوی. ئاووهەوای خۆش و کانی و ئاوی سازگار و دیمەنەکانی جوان و دلگیرن. ئاژەڵداری و، کشتوکاڵ: ڕەز و باخ، دانەوێڵە، توتن و سەوزە ئەکەن و، دۆشاوی ترێ ی خۆشناوەتی بە ناوبانگە. بزنی مەرەز ڕائەگرن و، بێتواتە جۆلای هونەرمەند و زانای لی بو، «کوڕ» ی تەنک و نایابیان دروست ئەکرد.

*

## پەندێک لە خۆشناوەتی

ئافرەتێکی بێوەژن دو هێزە دۆشار، هێزەیەک دۆشاوی ڕەش و هێزەیەک دۆشاوی سپی، ئەدا بە کولی دا بیبا بۆ فرۆشتن. لە ڕێگایەکی چۆڵ توشی کابرایەک ئەبی. کابرا لی ی ئەپرسی: «ژنەکە کوڵەکەت چیە؟»
ژنەکە ئەڵی: «دۆشاو».
کابرا ئەپرسی: «ئەیفرۆشی؟»
ژنەکە ئەڵی: «بەڵی». ژنەکە لە دڵی خۆی دا ئەڵی ئەگەر لەم ئەیوەی ڕێگایە کڕیارێکم لی پەیدا بی لەم بکڕی باشتر نیە لەوەی ئەو ڕێگا دورۆە بپێوم؟
کابرا ئەپرسی: «ئەتوانم تامی بکەم؟»
ژنەکە ئەڵی: «بەڵی». کوڵەکەی دائەگری. دەمی هێزەیەکیان ئەکاتەوە.
کابرا پەنجەیەکی لی ئەدا و تامی ئەکا. ئینجا ئەڵی: «حەز ئەکەم ئەوی تریش تام بکەم».
ژنەکە ملی هێزە کراوەکەی بە دەستەوە ئەبی، دەمی هێزەکەی تریش ئەکاتەوە بە دەستەکەی تری ئەیگری. کابراکە دەس ئەکا بە یاری کردن لە گەڵ ژنەکە و دەس ئەبا بۆ ڕان و ناوگەڵی. ژنەکە ئینجا تی ئەگا مەبەستی کابرا چی بوە، بەڵام کەوت بوە هەڵوێستێکی دژوارەوە: دەس لە هێزەکان بەر بدا، بۆ ئەوەی خۆی لە کابرا بپارێزی، دۆشاوەکەی ئەڕژێ، دەس لە هێزەکان بەر نەدا کابرا سواری ئەبێ. ژنە لە داماوی دا نازانێ کامیان هەڵبژێری، ئەڵی: «وای لە قونێ! وای لە دۆشاوێ!»
ئەمە لەونەی «ئیشتیزاز» و «حیز فرسەتی» ە لە زمانی کوردی دا.

*

چوینە بالیسان. دۆڵی بالیسان بە ناوی گوندی بالیسانەوە ناو ئەبرا. کەوت بوە نێوان زنجیرەیەک چیاوە: ماکۆک – دەرە شیر – باری خەتی. زنجیرەی هەوری – کلاوقاسم

- بنی هەریر. چیای شێشار. ڕۆژهەڵاتی سەر بە سلێمانی و، ڕۆژئاوای سەر بە هەولێر بو. دۆڵێکی ئاوەدان و پڕ لە ئاوایی بو. گوندەکانی: شێرە، دەراش، مێرگەسەر، خەتێ، تولێ، زینێ، چیوە، وەرێ، مەلۆزک، بێراوە، کانی بەرد، ئەندێک، ئەنگۆز، نراوە، دواوە، زێوە، هەرتەل، هەرمک، سویرە.. لە بناری ئەم شاخانەدا بون. بارەگای مەڵبەندی چواری یەکێتی لە بالیسان و، بارەگای لایەنەکانی جود: پارتی لە بالوکاوا و، حشع لە شێخ وەسان و، حسک لە . جادەیەکی قیری گرنگ بە ناوەراستی دوڵەکەدا کرابوەوە ڕانیەی ئەبەست بە خلیفان، واتە بە جادەی هەولێر - حاجی هۆمەرانەوە.

چەند ڕۆژێ لە بالیسان ماینەوە، خەڵکێکی زۆر لە هەولێر و سلێمانیەوە هاتن بۆ لامان. مەڵبەند چوەوە جێگای خۆی. سەرلەنوی تیپەکانی: سەفین، هەوری، کۆسرەت، دەشتی هەولێرمان ڕێکخستەوە و، هەندێ ئاڵوگۆڕمان لە سەرتیپەکان دا کرد. هەندێ لە هێزەکانی حسک کشا بونەوە ناوچەکانی ئازەنین، سماقولیەکان، دەشتی هەولێر..

*

بەرەو سەفین

دوای چەند ڕۆژێ لە گەڵ تیپەکانی سەفین، کۆسرەت، دەشتی هەولێر، کەرکوک، گەرمیان، سەگرمە.. بە شاخی هەوری دا چوین بۆ ئازەنین. ئازەنین لە بناری سەفین دایە. کەوتۆتە ئەنیشت هیران کە ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی خۆشناو بو. گوندێکی ئاوەدان و خۆش و کانی زۆری لی دا بوو ڕەز و باخی خۆشیان هەبو. باخەکانیان زۆری هەنار بو. هەناری ئازەنین بە ناوبانگە. ترش و شیرین و میخۆشیان هەبو. سرکەی ئاوایان لی دروست ئەکرد. یەکێتی لە ناو خەڵکی ئازەنین دا ئەندام و لایەنگری زۆری هەبو. کۆمەڵەش ڕێکخستنێکی باشی هەبو.

*

مەلای مەعاشخۆر

پێش چەند ڕۆژێ لە پێکدادانێک دا، لە نێوان مەفرەزەیەکی یەکێتی و مەفرەزەیەکی جودا، پێشمەرگەیەکی یەکێتی کوژرا بو. تەرمەکەیان برد بوە ئازەنین بینێژن. مەلای مزگەوتەکە سەر بە بەعس بو، ئەیهێشت بو تەرمی پێشمەرگەکە بێنە مزگەوتەکەی و، لە گۆرستانی ئاوایی دا وەکو موسوڵمان کفن و دفنی بکەن، وت بوی: «ئەمانە کافرن!» پێشمەرگەکە خەڵکی ئەو ناوچەیە نەبو، مەلاکەیش نەیناسی بو، تەنها ئەوەندەی زانی بو کە پێشمەرگەی یەکێتی بوە و، یەکێتی پێش لەو کاتەدا شکا بو.

مەلاکەم بانگ کرد، هەندێ سەرزەنشتم کرد، وتم: «تۆ نوێژ بە پارە ئەکەی. هەر نوێژێ بە دیناری ئەکەیت، ئەگەر مەعاشەکەت بڕن، ئیتر مەلایەتی ناکەیت و، ڕەنگە واز لە نوێژکردنیش بێنی، کەچی حەلت بە خۆت داوە بی ئەوەی ئیمە بناسی بە کافرمان ئەدایتی ی و، ئەهێڵی لە گۆرستانی ئیسلام دا بمانێژن. ئەبی لێرە بڕۆی!» کابرا لە گیانی خۆی ئەترسا و، پەشیمانی لە قسەکانی دەرئەبڕی، بەڵام بایەخم بە قسەکانی نەدا داوام لی کرد ناوچەکە بە جی بێڵێ.

*

دوای چەند ڕۆژێ بە سەفین دا چوینە دۆڵی سماقولی. خۆم لە سماقولی سەروچاوە و، هێزەکانی تریش لە قەڵاسنج، زیارەت، سوسێ، گرتک.. بڵاو بونەوە و، بارەگایان دانا.

مەفرەزەکانی حەسەنەک زیاتر لە ٢٠ ئۆتۆمۆبیلیان لە دوای خۆیان بە شاردراوەیی بە جێ هێشت بوو. ئۆتۆمۆبیلەکان ئەوەی هی خەڵک بوو دامانەوە بە خاوەنەکانی و، ئەوەی هی حکومەت بوو دابەش کران بە سەر تیپەکان دا. لەم میراتیە منیش پیکابێکی دەبل کابینەم پێ برا. تیپەکانی هەوری، سەفین، دەشتی هەولێر، کۆسرەت.. مان ناردەوە شوێنەکانی خۆیان.

*

## سماقولییەکان

سماقولی چوار گوندن لە ڕیزی یەک: سەرووچاوە، گرتک، سێنان، گەلی. هەرچواریان کەوتوونە بناری سەفین بەرامبەر شاخی بنەباوی.

«سماقولی» ڕەنگە کورتکراوەی ئیسماعیل قولی بێ. قولی بە تورکی ئازەری واتە: بەندە، کۆیلە. هەتا ئێستاش لە ئێران دا عەلی قولی، حسێن قولی، ڕەزا قولی زۆرە کە لە جێگای عەبدولعەلی، عبد الحسین، عەبدولرەزای عەرەبی بە کاری ئەهێنن و، لە کوردی دا ئەبێ بە بەندەی عەلی، بەندەی حسێن و بەندەی ڕەزا. سماقولی واتە بەندەی سمایل.

«گرتک» وەکو لێرە ناوی گوندە لە پشدەر و باڵەکایەتی یش هەمان ناو هەیە. گرتک: گردک، گردۆلکە. گردی پچووک.

سەرووچاوە، سەرچاوەیەکی گەورەی ئاو و چەند کانیەکی لێ بوو. ڕەز و باخی خۆش و سپیداری ڕاست و باڵا بەرزیان هەبوو. کوێخا عەزیز و کوێخا عەبدە هەردووکیان لە سەرووچاوە دانیشتن دوو پیاوی کوردپەروەر و بەڕێزی ناوچەکە بوون. هەرچەندە خزمی یەکتری بوون، بەڵام لە گەڵ یەک ناکۆک بوون. کوێخا عەبدە بە منداڵی لە کۆیە خوێند بووی. خوێندەوار و ڕێکەوتوو بوو.

دۆڵی سماقولی بەستراوە بە دۆڵێکی ترەوە پێ ی ئەڵێن دۆڵی ئەسحابان لە سەر ئاوی هیزۆپ تەواو ئەبێ. بە درێژایی دۆڵەکە هەزاران گۆڕی لێ یە. وەکو دانیشتوانی ناوچەکە ئەگێڕنەوە لەم دۆڵەدا شەڕێکی قورس لە نێوان ئەسحابە و کافرەکان دا بووە. ژمارەیەکی زۆر ئەسحابە کوژراون و، لەو شوێنانەدا نێژراون. بەڵام هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی پشتیوانی لەم قسانە ناکا. ڕەنگە ئەفسانە بێ.

لە ئاوی ڕووباری هیزۆپ دا لە ئاستی جەلی کانیەک هەڵئەقوڵێ گەرلوە. ئاوەکەی گەرمە زۆرجار پێشمەرگە بە زستان خۆیان لێ ئەشت.

شوێنەواری هەندێ قوللە و قەڵا لە ئاوەگرد مابوو. ئاوەگرد بەشێکە لە زنجیرەی سەفین خەڵک ئەیانوت هی سەردەمی میر محەممەدی میری سۆرانە. ئەبێ پێش ئەویش ئاوەگرد قەڵای لێ بووبێ، چونکە یەکێ لە لەشکرکێشییەکانی والی بەغداد بۆ سەر میرەکانی بابان لەم دۆڵەدا بە گرتنی ئاوەگرد تەواو بووە.

چەند وشەیەکم لەو ناوە بیست وابزانم وشەی تایبەتی خۆشناوەتی بن. چونکە لە شوێنی تر باو نەبوون، لەوانە:

ئەوک: نار قورگ، گەروو.

خوزی: تەرایی نار گەروو. وەکو: خوزی لە ئەوکمدا هیشک بوو.

کەپک: لەپلە سەری شاخ. وەکو کەپکی خانزاد و کەپکی شێلانە لە سەفین و کەپکی حەمەداغا لە بنی هەرور. ڕەنگە ئەمیش لە کەپو، وەکو لوتکە لە لووتەوە داتاشرا

س:

گەڵ: هەڕەشە.

شێلو: لێڵ بوونی ئاو.

زیندی: ئەسپێ.

*

## فشە

کە گەیشتینە خۆشناوەتی، بە گاڵتەوە بە هەندێ لە فەرماندەکانی هێزەکەم وت: «لەم ناوچەیەدا سەید کاکە فشەی کردووە بە باو. ئەوەی فشەی زل و درۆی گەورە بکا دەربارەی ئازایەتی خۆی بە پیاوێکی ڕەشید ناو دەر ئەکا. ئێوەش تا لەم ناوچەیەداین بە ئارەزووی خۆتان فشە بکەن!»

لە گوندێکی خۆشناوەتی دوو کوڕی خزمی نزیکی یەکتری، بەڵام لە گەڵ یەک ناکۆک بوون. هەردوولایان کوردپەروەر و دۆستی پێشمەرگە بوون. ئەمویست ئاشتیان بکەمەوە. گوندەکەیان دوژمنایەتی تێ دا نەئەما و، ئەمەش لە یەکگرتنەوەی ئەوان قازانجمان ئەکرد. سامان و ڕوستەمم ڕاسپارد بۆ بکەونە بەینیانەوە و، خەریکی ڕێکخستنەوەیان بن و منیش دوا قسەی تێ دا بکەم. هەردوولا ڕەغبەیان ئەنواند و ملیان نەئەدا و، مەرجەکانی یەکتریان قبوڵ نەئەکرد.

یەکێ لە ناوبژیکەرەکان سەیر ئەکا بە قسەی خۆش و ئامۆژگاری کەسیان نایەتە سەر ڕێگای ئاشتبوونەوە و ڕێککەوتن، لە مزگەوتەکەدا کە ئەوان و، زۆری پێشمەرگە و فەرماندەکانیانی لێ ئەبێ، ئەڵێ: «ئەزانن لە دێ یەکێ گەرمیان لە گەڵ دوو کەس زۆر خەریک بوین ڕێکیان بخەینەوە. کەڵکی نەگرت بۆ ئەوەی ئاژاوەکە بکوژێنمەوە هەردووکیانم گرت. نەوتم پێ دا کردن و، هەردووکیانم سووتان. ئیتر ئاواییەکە ڕزگاری بوو لە دەستیان..»

یەکێ لە برادەرەکانم هاتەوە بە پێکەنینەوە وتی: «تۆ بە ئێمەت وت فشە بکەن! مەبەستت ئەوە بوو: فشە بۆ خۆمان بکەین یا بۆ خەڵک؟» وتم: «بۆ خەڵک» وتی: «فڵان فشە بۆ خۆمان ئەکا!» چیرۆکەکەی بۆ گێڕامەوە کردمان بە پێکەنین.

*

## گردەسوور و حەمامۆک

لەم ماوەیەدا دوو چالاکی پێشمەرگەیی گەورە بوو. لە سەرانسەری کوردستان دا دەنگیان دایەوە. یەکێکیان بۆسەیەک بوو لیوای ٢١ ی کەرکوک لە حەمامۆکی نزیک کۆیەوە بۆ هێزێکی هاوبەشی دەزگا سەرکوتکەرەکانی نایەوە. ١٨ کەسی تێ دا کوژرا. زۆربەیان تکریتی بوون. ئەوی تریان، شەڕێک بوو لە گردەسوور لیوای ٨٦ ی دەشتی هەولێر کردیان. هێزێکی گەورەی جەیش بە پشتیوانی کۆپتەر چوو بوە سەریان. هێزەکەی حکومەتیان شکاند و کوشتارێکی زۆریان لێ کردن و لاشەی کوژراوەکان لە شەڕگەکەدا بە جێ مان.

*

## شەهابە چەپەڵ

لە سەرچاوە، لە ژوورەکەی بەرامبەرمان تاقمێ لە پێشمەرگەکان بۆ پارێزگاری ئێمە ئەنوستن. ڕۆژێکیان یەکێ لە پێشمەرگەکان هات وتی: «هەموومان تووشی گەڕی بووین»

ورگ و ملی پیشان دام کریشێکی زۆری کرد بۆ ئەمنەزانی لە چییەوە تووش بوون. زیاتر لە ۲۰ پێشمەرگە ئەخۆشییە پێستیان گرت بوو. لەوانە بوو بکاتە ئێمەش. پزیشک هات سەیری کردن. چارەی ئەخۆشییەکەی دۆزییەوە. ئەبوو هەموو ڕۆژێ بە ئاوی شلەتێن خۆیان بشۆن و، جۆری دەرمانی بۆ نووسین، خۆیانی پێ بسوون. فانیلە و کراسی تازە لە بەر بکەن. نوێنەکانیان بگۆڕن یا هەموو ڕۆژێ لە بەر خۆر هەڵی بخەن.. تا چاک ئەبنەوە. لەو هەلومەرجەدا کارێکی گران و، مەسرەفێکی زۆر بوو. هەواڵمان نارد بۆ ڕێکخراوی هەولێر دەرمان و جلوبەرگ بنێرن.

ویستم هۆی بڵاو بوونەوەی بدۆزمەوە. دوای تۆژینەوە دەرکەوت کوڕێکیان لە گەڵە لە میوە ئەم ئەخۆشییەی گرتوە و لی ی کۆن کردوە قسەی نەکردوە، بە ئەنقەست هەموو ڕۆژێ جلوبەرگی پێشمەرگەکانی تری لە بەر کردوە و، بە نوێنەکانی ئەوان نوستوە. بەم شێوەیە هەمویان گرتویانە. ئەمە جەنایە (موظف صحی) هێزەکەیانە و، ناوی شەهابە و، خەڵکی خانەقینە.

ڕەوشتی ئەم کابرایەم بە لاوە سەیر بوو، پێشمەرگە ئەبێ خۆی لە سەر هاوڕێکەی بە گوشت بدا، کەچی ئەم ئەخۆشی تی دا بڵاو کرد بوونەوە، لە کاتێک دا خۆی لە بواری تەندروستی دا کاری ئەکرد. بڕیارم دا لە پێشمەرگایەتی دەری بکەم، بەڵام پێش ئەوە ئەیوە گیانی بکەم بۆ ئەوەی جارێکی تر تاوانی وا دووبارە نەکاتەوە. بانگم کرد زۆرم لۆمە کرد و، وتم: «لە بەر ئەوەی تۆ ئەم تاوانەت کردوە، لەوانەیە خەڵکی تریش تووش بکەیت، بڕیارمان داوە بتسووتێنین!» بە تووڕەییەوە بە پێشمەرگەکانم وت: «بیبەن بیسووتێنن!»

کابرا تا ماوەیەک وایئەزانی بە ڕاستی ئەیسووتێنن. شەهاب لە پێشمەرگایەتی دەرکرا. بەڵام مانگی زیاتری پێ چوو تا پێشمەرگە ئەخۆشەکان چاک بوونەوە.

*

سەفەرمزەکانی جود، بە تایبەتی هی حەسەک، کەوتنە هەڵوەرین: هەندێکیان هاتنە ناو یەکێتییەوە، هەندێکیان چوونە پاڵ ڕژێم و بوون بە جاش و، هەندێکیشیان لە بەرانەتییەوە چوون بۆ برادۆست و بارزان. چەکداری جود لە ناوچەکەدا نەما. دوای چەند حەفتەیەک منیش ئیتر ئیشم لە سماقولیەکان تەواو بوو، گەڕامەوە دۆڵی بالیسان.

*

مەلای خەتی

ماوەیەک لە قوتابخانەکەی گوندی «خەتی» دابەزیم. خەڵکی خەتی و، دانیشتوانی ناوچەکە بە گشتی لە گەڵ ئێمە دۆست و هاوکار بوون. مەلای خەتی خەڵکی ئەم گوندە بوو. لە ناو مێژووی کوردا تاوانی خیانەتی گەورە لە ئەتەوە و نیشتمان ئەدرێتە پاڵ دوو مەلا: ئیدریسی بتلیسی و مەلای خەتی.

دوای شەڕی چالدێران، بەشی زۆری سەرزەمینی کوردستان و، میرایەتییەکانی کورد کەوتە ژێر دەستی عوسمانییەوە، هەندێ کەس تاوانی ئەمە ئەخەنە ملی مەلا ئیدریس. بە پێ ی لێکۆڵینەوەکانی من؛ مەلا ئیدریس مێژوونووسێکی گەورە و ئاگادار و، دیپلۆماتێکی زانا و زیرەک و، کوردێکی دڵسۆز بوو. ئەوانەی ئەم تاوانەی بە پاڵ ئەدەن هیچ بەڵگەیەکی مێژوویان بە دەستەوە نیە. ئەوەی تۆپالی داگیرکردنی کوردستانی لە مل دایە دەرەبەگی ناو میرەکانی کورد بوو، نەک ئیدریسی بتلیسی.

بە گوێرەی بەندەباوی ناو خەڵک و، گێڕانەوەی هەندێ لە مێژوونووسەکانی کورد، وەکو: حوزنی موکریانی لە «میرانی سۆران» و عەلادین سەججادی لە «شۆڕشەکانی کورد» دا، مەلا محەممەدی خەتی، یەکێ لە مەلا گەورەکانی سەردەمی خۆی و، موفتی میرایەتی سۆران بوە. کە لەشکری تورک هێرشی هێناوەتە سەر میر محەممەدی میری سۆران، مەلا محەممەد فەتوای داوە: «بەرەنگاربوونی لەشکری خەلیفەی ئیسلام جائیز نیە و، هەرکەسێ شەڕی لە گەڵ بکا تەڵاقی ئەکەوێ.» لە ئەنجامی ئەم فەتوایەدا لەشکرەکەی میری سۆران بڵاوەیان لێ کردوە، میری سۆران خۆی داوە بە دەست لەشکری تورکەوە. بە گیراوی ڕەوانەی ئەستەمبوڵیان کرد و، هەرگیز نەگەڕایەوە و، هەواڵی نەبوو. میرایەتی سۆران کۆتایی هات.

*

## مەلیحا

حوزنی لە کتێبەکەی دا: «میرانی سۆران» باسی کتێبێک ئەکا، وەکو سەرچاوەی سەرەکی بۆ گێڕانەوەی ڕووداوەکانی سەردەمی میر محەممەد بە ناوی «مەلیحا»، کە میرزا محەممەدی وەقائیع نیگار بە شیعر هەڵی بەستوە. جەلیلی جەلیلیش لە پێشەکی کتێبەکەی دا دەربارەی «میرایەتییە کوردییەکانی ناو ئیمپراتۆریی عوسمانی» باسی دەستنووسێکی ئەم کتێبە ئەکا، کە لەشکری ڕووسیای قەیسەری لە شەڕەکانی یەکەمین جەنگی جیهانی دا لە داگیرکردنی ڕەواندزدا دەستی کەوتوە و، لە یەکێ لە کتێبخانەکانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران دا بوە. لە زۆر مەلا و خوێندەواری ناوچەکەم پرسی و، چەندی سۆراخم کرد، نە لە لای کەس هەبوو و، نە هیچیان لێ ئەزانی.

حوزنی وا باس ئەکا میری سۆران کانی ئاسنی لە ڕوستی دۆزیوەتەوە، ئاسنی لەوێ دەرهێناوە بۆ دارشتنی چەکەکانی. ڕەنگە ئەمە وابێ، بەڵام دانیشتوانی ناوچەکە، وەکو لە زمانی باوباپیرانیانەوە ئەیانگێڕایەوە: هەرچی پارچە ئاسنی شکاو و ناڵ و، هەوجەزیش لە ناوچەکەدا هەبوە کۆیان کردۆتەوە، لولەی تۆپەکانیان لەوە دروست کردوە نەک لە کانە ئاسنی ڕوستێ.

*

## حەسەن مارگر

یەکێ لەو پێشمەرگانەی شاهۆ هەڵی بژارد بوون، لە دەستەکەی من بێ، کوڕێکی گەرمیانی ویا بوو، ناوی حەسەن بوو. پێشمەرگەکان ناویان نابوو: حەسەن مارگر، چونکە مار و دووپشکی ئەگرت و، ترسی پێشمەرگەکانیشی لە گرتنیان ئەشکاند. حەسەن شارەزاییەکی زۆری پەیدا کرد بوو لە مار و دووپشک و جۆرەکانیان دا.

ئەوەندەی من گەڕاوم لە سەرانسەری کوردستان دا مار و دووپشک هەیە. مارەکان، هەندێکیان ژەهراوین و هەندێکیان ژەهراوی نین، بە گشتی گەورە نین، بە دەگمەن هەیە لە مەترێک درێژتر بێ. هەژدیها، کە لە هەندێ شوێن پێی ئەڵێن حەزیا یا شامار، لە فۆلکلۆردا باسی ئەکرێ، دەعبایەکی ئەفسانەییە، بە ڕاستی نەبوە، یا نەماوە.

لەو هەموو ساڵانەدا، ئەوەندەی من بیستوومە، تەنیا دوو جار ڕێکەوتی کردوە مار بە پێشمەرگەیەوە داوە. ئەویش لە تاریکایی شەودا نەیان دی بوو پێیان پێ دا نابوو.

مار، چەند جۆری هەیە، وەکو: تیرە مار، ڕەشمار، زەردە مار، سێجە مار، سفرە

مار، سیسەمە مار، شلّە مار، کوێرە مار، کولە وەیاب، کولە کوێر.. هەندێ لە مانە لە هەندێ شوێن هەن و لە هەندێ شوێنی تر نین.

تولە مار، بەچکەی مارە.

مار لە زستان دا سر ئەبێ، لە بەهاردا کاژ فڕێ ئەدا، ئەگەزێ یا پێوە ئەدا، کە ماندو یا تینوی ئەبێ ئەلیشێکێنێ، بۆ ڕاوێشتن ئەکشێ و، بۆ پشودان پەیکە ئەخوا، ئەگەر ئازاری نەدری بە زۆری بێ وەزەن ئەبێ.

دوپشکیش چەند جۆری گەورە و ناوەنجی و پچوک و، زەرد و ڕەش و کالی هەیە. جۆرەکانی و ناوەکانی بە گوێرەی ناوچەکان ئەگۆڕێن: چزەپیالە، کلاشەدوم، سزلسزلە، جەرراحە، دەمارەکزڵ، دوپشکە ڕەشە.. هی هەندێ ناوچە کوشندەن، بە هەر کەسێکەوە بدەن بە دەگمەن لە مردن دەرباز ئەبێ.

حەسەن زۆر ڕۆژ ماوەیەکی باش خۆی وێن ئەکرد، بە دوای مار و دوپشک دا ناو کەلەکی بەرد و چەم و پەرژین و کون و کەلەبەر ئەگەڕا.

کە ماری ئەدۆزییەوە بزنمتەی ملی ئەگرت و، بەنێک یا گزرمێیەکی بەنی لە دانی گیر ئەکرد. دانی هەڵ ئەکێشا ئەوسا یاری پێ ئەکرد. زۆر جار بەری ئەدان.

کە دوپشکی ئەدۆزییەوە چیلکەیەکی ئەخستە سەر پشتی. دوپشکەکە کلکی کلاقە ئەکرد بە چیلکەکەوە بدا، گری ی پێش چزوەکەی ئەگرت و، بە شتێکی ڕەق نوکی چزوەکەی، کە زۆر کورت و لە مو باریکترە، ئەشکاند، ئەوسا ئەی خستە سەر دەستی یاری پێ ئەکرد.

تا چوینە بەری مەرگە حەسەن لە گەڵمان بو، ئیتر پەیوەستیمان پێ ی نەما، ڕیکەم دا بگەڕێتەوە ناوچەکەی خۆیان، لە چالاکییەکی پێشمەرگەدا کوژرا.

*

چەند کەسی لە کادرەکانی ناوچەی هەولێر لە ناو خۆیان دا کەوتبونە قسە و قسەلوک کە گوایا من سلێمانیچیەتی ئەکەم، هەرچی خەلکی سلێمانی نەبێ ڕێگای نادەم کاری بدرێتی و باوەری پێ ناکەم.

ڕۆژێک لە بالیسان کۆبونەوەیەکم پێ کردن بۆ ئەوەی ئەم قسەیەیان لە گەڵ باس بکەم، بە ژمارە ئەندامانی م س، ک س، مەسئولی مەلبەندەکان، ئەندامانی مەلبەندەکان، لیپرسراوی ڕێکخراوەکانی کومەلە، سەرتیپەکانی پێشمەرگەم.. بۆ باس کردن و یەک بە یەک شوێنی لە دایک بون و گەورەبونیانم بۆ ڕون کردنەوە. دەرکەوت ئەم قسەیە هیچ بناغەیەکی نەبو. ئینجا پێم وتن: وتم بیرکردنەوەی ئێوە سەیرە. ئێوە خۆتان بە ئینتەرناسیونالیست دائەنێن. هەندێکتان خۆی بە کزمزنیست ئەزانی. ئەبو بە لاتانەوە گرنگ نەبێ مەسئول خەلکی کوێ بێ؟ بەلکو چەندە خزمەتی شورش و کومەلە و یەکێتی ئەکا، زۆرجار مرۆڤ چەندە ئیدیعای گەورە بێ، بەلام دنیا هەر لە کونی قازانجەکانی خۆیەوە ئەبینێ.

*

پارەکاکەی من کە لە قوتابخانەکەی خەتی دا بو زۆر قەرەبالغ بو. جەنگی عیراق - ئێران لە ناوچەی حاجی ئومەران زۆر گەرم بو. هەمو ڕۆژێ چەند جاری پۆلە فڕۆکە و هالیکۆپتەری عیراق بە سەر خۆشناوەتی دا ئەچون بۆ مەیدانی شەر. ترسام ڕۆژێک ئێمەش

بووژوومان بکەن، گوێزامانەوە سەر «کانی بەرد». شوێنەکەی قایم و، بۆ خۆپاراستن پێچ و پەنا و، ئاشبەردی زۆری لێ بوو.

*

## رۆڵی ئافرەت

خولی یەکەمی شەڕی جوود تەواو بوو. ئەو کاتە من ناوم کەوتبووە ناوان. دوستەکانی جوود بە خراپ و، دوستەکانی یەکێتی بە چاک تێیان ئەڕوانیم.

رۆژێکیان پۆلە لورکەی عێراق وەکو شارە زەردەواڵەی وروژاو ئەگەڕێن بەرەو ئاوچەی حاجی ئومەران. ئێمە لە «کانی بەرد» دانیشتبووین، وەکو رۆژەکانی تر خەریکی کاری رۆژانەی پێشمەرگە بووم. عەلی بچکۆل لە خەتێ بوو، نامەیەکی بۆ ناردم نووسی بووی: دوو کچی ئاسیاوم لە سلێمانیەوە هاتوون ئەیانەوێ بێن بۆ سەردانت، ئەگەر ساوەت هەبێ بیانبینی. زۆرم پێ خۆش بوو. حەزم ئەکرد ئەختی کەشتی کۆڕی دانیشتنەکانم، کە بە زۆری لە گەڵ پێشمەرگە و لادێیی بوو، بگۆڕم. وەڵامم دایەوە بیان نێری.

کچەکان گەیشتن بە گەرمی پێشوازیم کردن و بە خێر هاتنم کردن. پێکەوە دانیشتین. پێشمەرگەکان ئاو و چایان بۆ هێنان. پرسیارم لێ کردن: ناویان چییە و، خەڵکی کوێن و، ئیشیان چییە؟ هەردووکیان فەرمانبەر بوون. یەکێکیان خەڵکی لای کەرکوک و، ئەوی تریان خەڵکی لای سلێمانی بوو. کەرکوکییەکەیان جلوبەرگی ئاسایی لە بەردا بوو، شوی کرد بوو بەڵام لە سەر جیاوازی بیروباوەڕی سیاسی لە گەڵ مێردەکەی ئاکۆک بوو، ئەم سەر بە جوڵانەوەی کورد و مێردەکەی سەر بە حکومەت بوو. سلێمانییەکەیان ئالرەتێکی بالابەرز و جلێکی کوردی رازاوەی تەنکی لە بەر کرد بوو، هێشتا شوی نەکرد بوو. بە دەم و دوانیان دا وریا و زیرەک و تێگەیشتو بوون..

وتم: «هیچ کارێکی تایبەتیتان هەیە بە من بکرێ بۆتان بکەم؟»

وتیان: «هیچ کارێکمان نییە. هاتووین لە نزیکەوە تەماشات بکەین و ئەگەر کاتت هەبێ هەندێ موناقەشەت لە گەڵ بکەین؟»

وتم: «فەرموو بە ئارەزووی خۆتان موناقەشە بکەن»

سلێمانییەکەیان پرسی: «باوەڕت بە خوا هەیە؟»

بە لامەوە سەیر بوو موناقەشەکانی بەم پرسیارە دەس پێ کرد، بەڵام تێگەیشتم خۆی بە چەپێکی ئازادیخواز و سەربەست و کراوە ئەزانێ. وتم: «ئەوە شتێکی تایبەتییە، پەیوەندی بە ویژدانی مرۆڤ خۆیەوە هەیە»

وتی: «ئەدی تۆ سکرتێری رێکخراوێکی مارکسیت ئەبێ رەئی ئاشکرات هەبێ!»

وتم: «ئەوە شتێکی تایبەتییە، کار لە باوەڕی سیاسی ناکا. لە ناو ئێمەدا زۆر کەس هەن باوەڕی قوڵیان بە خوا هەیە و، لە هەمان کات دا خۆیشیان بە مارکسی ئەزانن»

وتی: «ئەوە بە یەکەوە ناگونجێن، یەکێ کە مارکسی بێ ئەبێ مادی بێ..» لە سەر ئەمە رۆیشت و، بەڵگە و بیانوی مارکسیە کلاسیەکە توندڕەوەکانی دووبارە ئەکردەوە. زۆری لە گەڵ خەریک بووم تا باسەکەم پێ گۆڕی.

هاتە سەر کێشەی ژن، پرسی: «رەئیت بەرامبەر بە ژن چییە؟»

کردم بە گاڵتە لە گەڵی، وتم: «ژن نیوەی کۆمەڵە و دایکی نیوەکەی تریشە»

وتی: «مەبەستم ئەوەیە: رەئیت بەرامبەر یەکسانی ژن و پیاو چییە؟»

وتم: «له گۆڤاری کۆمەڵەدا وتارێکی درێژ له سەر کێشەی ئافرەت بڵاو کراوەتەوە من نوسیومە، لەوێ دا باسی یەکسانی ژن و پیاوم کردوە.»

وتی: «ئەی بۆ رێگەتان نەداوە بە ژن، وەکو پیاو، لە شۆڕشەکەدا بەشدار بن. ئەوانەیش کە هاتون لە بەر ئەوەی رێگای کارکردنیان نەدراوەتێ وازیان هێناوە؟»

وتم: «ئێمە بە هۆی جەنگی پارتیزانییەوە خزاوینەتە ناوچە شاخاوییە سەختەکانەوە. ئەو ناوچانەیش بە هۆی دابڕانیانەوە لە پێشکەوتنی شار و شارستانی لە ریزی ناوچە هەرە دواکەوتووەکانی دنیادان. ناتوانین بە پەلە و بە زۆر بیروبۆچون و ئارەزووەکانی خۆمان بخەینە جێگەی ئاتونەکانی ئەوان.. ناچارین ریزی ئەریتە باوەکانیان بگرین، ئەگینا داتەپڕین و دەرمان ئەکەن.»

زۆر بابەتی جۆراوجۆری فەلسەفی، کۆمەڵایەتی، سیاسی، فەرهەنگی.. باس کران، باسەکان سەرەتایان هەر گفتوگۆیان نەبو. لە زۆری دا بیروڕامان جیاواز بو.. بەڵام بۆ هەردوکمان خۆش بون: بۆ من چونکە ماوەیەک بو مانەوی شەڕوشۆڕێکی بێهودە بوم و، زۆر لە میژ بو گوێم لەو جۆرە باسانە نەبوبو. بۆ ئەو، چونکە نەیتوانی بە ئازادی بیروڕاکانی خۆی بۆ یەکێ دەربڕی کە بە جیددی گوێ ی لێ ئەگرێ و، موناقەشەی لە گەڵ ئەکا.

نزیک عەسر کەوتینەوە. گفتوگۆکانمان ئەوەندەیان لق و پۆپ لێ بوبوەوە، ناسیاوییەکەی ئەو تەنیا چەند سەعاتێمانی وەها قوڵ کرد بو، ئەتوت زۆر لە مێژە یەکتری ئەناسین، بۆیە وەها بە راشکاوی ئەدواین. ویستم بە ئوتومبیل رەوانەیان بکەم بۆ خەتی بۆ لای عەقلی یا بۆ ئەو شوێنەی خۆیان ئەیانەوێ. ناردم بە شوێن شوفێرەکەدا و، وتم: «ئەتانەوێ بۆ کوێ بڕۆن؟»

لە ناو چەند تاشە بەردێکی قوچ دا لە سەر لیادێک دانیشت بوین، پشتمان دا بو بە ریزە چیای دەرە شێر - باری خەتی و، دوڵی بالیسان و ریزە چیای هەورێ - کڵاو قاسم - زینەتیر بەرامبەرمان بو. شوێنێکی هەتا بڵێی خۆش بۆ سەیرانی خەڵکی شار و، رۆمانسی بۆ دڵدار و دڵخواز و، قایم بۆ پێشمەرگە..

کچی تابەن پڕ بە دڵ حەزی ئەکرد بمێنێتەوە درێژە بە باسەکانی بدا. منیش پڕ بە دڵ، حەزم ئەکرد دڵی رابگرم، بەڵام نەمئەتوانی چونکە لە قسەو باسی ناو پێشمەرگە ئەترسام، ئەو قسە و باسانەی ئەو نرخی فەلسەکی بۆ دانەنان و، لای وابو ئەبێ لێ ی باخی بین.

پێشمەرگەکە ئوتومبیلەکەی هێنا. داوام لێ کردن سوار بن لە گەڵی. کچە بە روگرژی و بە دڵشکاوی هەستا رۆیشت. ئومەز لە دڵی خۆی دا قینێکی قوڵی لێ هەڵگرت بوم، ئەوەندە دڵگران بو بو: لە بەڵێنەکەی پەشیمان بوبوەوە کە دابوی لە نەخۆشخانەی ناوەندی کار بکا. لە رێکخستن وازی هێنا و، لە هەر جێیەکی بۆی بکرایە منی تاوانبار ئەکرد بە دوژمنایەتی ژن و، ئەیوت: «باوەڕی بە یەکسانی ژن و پیاو نیە و، رقی لە ژنە!»

لە کاتی راگرتنی شەڕی بەعس - یەکێتی دا ساڵی ٨٤ هاوسەرەکەم لە نەخۆشخانە بۆ عەملیاتی لە دایکبونی منا کەوت بو. ئەم خاڵە لە نەخۆشخانە چو بو بۆ لای، لێ ی پرسی بو: «تۆ ژنی فلانی؟» وت بوی: «بەڵێ» لێ ی پرسی بو: «چون ئەتوانی لە گەڵی هەڵ بکەی؟» وت بوی: «بۆچی؟» وت بوی: «رقی لە ژنە» ئەم بەشەوباوە تا چەند ساڵ بە

دواسەوە بو، گەیشت بووە دەم چەند ئافرەتێکی ناسیاوم. جارێکیان لە میانەی قسەدا یەکێکیان لێ ی پرسیم: «بۆچی رقت لە ژنە؟»

وتم: «یەکێ لەو شتانەی لە ژیان دا حەزم لێ بێتی ژنە، کێ ئەمەی پێ وتوی؟»

وتی: «وام بیستوە»

سەرلەنوێ چیرۆکەکەم هاتەوە بیر. بێگومان من ئەم ئەزانی ئەلهسامەکەی وەها ئەشکێتەوە و ئەو جۆرە بە رێ کردنە بە «تێهانە» دائەنێ، ئەگینا بە جۆرێکی وەها رەفتارم لە گەڵ ئەکرد بە دڵی خۆش و خەیاڵی ئاسودەوە بگەڕێتەوە.

*

## ئاژاوەی ناو ئەدیبان

ساڵی ١٩٦٩ بە بڕیارێکی م ق ث ڕێگەی دامەزراندنی یەکێتیی نووسەرانی کورد درا. کاکە مەم بۆتانی و ئالمی لە نووسەرانی کورد داوای ئیجازەیان کرد و، ئیجازەیان پێ دان. زۆری نەخایاند بەیانی ئازار خوێندرایەوە، ئەویش خرایە ناو دەسکەوتەکانی ئازارەوە. ئەم یەکێتییە، ئەگەرچی لە چاو تەمەنی دا بەرهەمی ئەدەبیی زۆری لە دوای خۆی بە جێ نەهێشتوە، بەڵام لە رووی سیاسییەوە دوای ئاشبەتاڵیش خۆی نەدۆڕاند و، نەچوە ژێر باری زۆر و گوشاری بەعسەوە.

بەعس کۆڕی زانیاری کورد کە جاران دەزگایەکی سەربەخۆ بو، بەیانی ئازاریش سەڵماند بوی، کرد بو بە بەشی لە «المجمع العلمي العراقي» بە ناوی «الهيئة الكردية» وە، ئەیویست «یەکێتی نووسەرانی کورد» یش هەڵوەشێنێتەوە و بیکا بە بەشی لە «اتحاد الادباء والكتاب». نووسەرانی کورد لە ناو خۆیان دا ناکۆک بون لە سەر ئەوەی بچنە ناو یەکێتییە عێراقیەکەوە یا موقاطەعەی بکەن. (عبدالامیر معله) چەند کۆبونەوەیەکی لە گەڵ کرد بون. عەبدولئەمیر ئەوسا راوێژکاری رۆژنامەوانی صەددام و نووسەری چیرۆکی «الايام الطويلة» بو. هەندێ لە نووسەرانی پەیوەندیدار رەئی ئێمەیان پرسی. ئێمەش بۆمان نوسین چۆن نووسەرانی گەلەکەمان لە مەیدانی پێشمەرگەیی و سیاسی دا باوەڕیان بە ئێمە هەیە، ئاوەها ئێمەش لە مەیدانی نوسین و ئەدەبی دا باوەڕمان بە نووسەرانی گەلەکەمان هەیە، بڕیاردان لەو بارەیەوە بۆ خۆیان بە جێ ئەهێڵین و، هەر بڕیاری بدەن، ئێمە ڕێزی بڕیارەکەیان ئەگرین و، بە هی خۆمانی ئەزانین.

ئەمان موقاطەعەیان بکردایە، یا بەشدار بونایە، بەعس ڕێکخراوەکەی هەر هەڵئەوەشاندەوە. بۆ ئەوەی هەندێ دەسکەوتی قانونی بە دەس بهێنن کەوتنە گفتوگۆ لە گەڵ (عبدالامیر معله) و وەزیری ئیعلام (شفيق الكمالي). شەفیق کەمالی بەڵێنی هەندێ دەسکەوتی تایبەتی پێ دابون. لە سەر ئەوە زۆری نووسەران ڕەئیان وا بو بەشداری ڕێکخراوە عێراقیەکە بن.

ناکۆکی دەوروبەری ناو جوڵانەوەی کورد و، ناکۆکی شەخسی، لە ناو نووسەرانیش دا ڕەنگی دابوەوە، نووسەران لە ناو خۆیان دا ناکۆک بون، تەنانەت تاوانی ناڕەوایان ئەدایە پاڵ یەکتری. کابرایەکی گزنە شیوعی بە ناوی حەمە سەعید حەسەن، کە خۆی بە چەپێکی توندڕەو و، بە نووسەر و شاعیر و ڕەخنەگر دائەنا، نامیلکەیەکی نوسی بو دابوی بە دەزگای ڕاگەیاندنی یەکێتی بۆی چاپ بکەن. لە نامیلکەکەی دا بە زمانی سەرسەری سەرجادە دوا بو، جنێوی پیسی بە نووسەر و ئەدیبەکانی کورد دابو، ئیتیهامی کرد بون بە ترسنۆکی،

جاسوسی، جاشایەتی بەعس.. نامیلکەکە بڵاو بووە، بەڵام دەنگی ناڕەزایی لە هەمو ئەدیبەکانەوە بەرز بووەوە. چەندین توێنەر و نامەیان نارد و، ئەوەی ئەوانی زۆر نارەحەت کرد بوو، ئەوە بوو: نامیلکەکە، دەزگای ڕاگەیاندنی یەکێتی چاپ و بڵاوی کرد بووەوە.

لە سەدا هەڵەیەکی منی تێ دابوو. لە کاتی چاپ کردنی دا ئەرسەلان بە بیسەڵ لە منی پرسی حەمە سەعید نامیلکەیەکی هێناوە بۆی چاپ بکەین. بیکەین یا نە؟ منیش بێ ئەوەی بزانم یا بپرسم ناوەڕۆکەکەی چی تێ دایە، یا ئەرسەلان بۆم باس بکا، بە گوێرەی داهێنکردنی سەرەتای «نان و ئازادی» بۆ نووسەرانی کورد وتم بڵاوی بکەنەوە! ئووسەرسەلان خۆیشی ئەو جۆرە نووسینانەی پێ خۆش بو. لە سەرەتاوە ئەگەر ئەرسەلان ئەم هەڵەیەی بە من نەکردایە، ئەم بەزمەش دروست نەئەبو.

من کەوت بوومە هەڵوێستێکی دژوارەوە: لە لایەک هەمو نووسەرەکان لە من زیز بون و گلەییان لێ ئەکردم، چونکە بە ئاگاداری من بڵاو کرا بووەوە. لە لایەکی ترەوە جنێو و تۆمەتەکانی حەمەسەعید ڕاست نەبون و، ئەگەر لە دەزگای ڕاگەیاندنی یەکێتییەوە بڵاوی نەکردایەتەوە هیچ نرخێکی نەئەبو. لەم بابەتە نووسەرانە هەبون، کە بەعس یان حشع ڕایان ئەسپاردن بۆ پەلاماردانی نووسەرانی تر، بەڵام کەس بایەخی بە نووسینەکانی ئەوان نەئەدا، بێ ئەم چونکە لە دەزگایەکی شۆڕشەوە دەرچو بو، حسابێکی تری بۆ ئەکرا.

نووسەرەکان خۆیان نامیلکەیەکیان لە وەڵامی نامیلکەکەی حەمە سەعیدا نووسی و، داوایان لە من کرد: هەم پێشەکی بۆ بنووسم، هەم لە دەزگای ڕاگەیاندنی یەکێتی بۆیان چاپ بکەن. داواکەیانم جێبەجێ کرد. حەمە سەعید زیاتر خۆی قرشکی کرد و، ئەیویست خۆی بە «قوربانی ئازادی بیر» پیشان بدا. بە درۆ وە خۆی لە هەموان گورگە کرد و کەوتە جنێودانی «مەقلی و موزون». بەم کاسپیە نزمە لە ڕێگای حشعەوە خۆی گەیاندە سوید.

*

## شێرکۆ بێکەس

دوای ئاشبەتاڵ شێرکۆ بێکەس دور خرا بووە بۆ خوارووی عێراق، لە ئاوایییەکی دواکەوتوی گەرم لە سەر ڕوباری فورات دایان نابو. ئەم دورخستنەوەیە شێرکۆی لە شیعر نەخست بو. لەو ماوەیەدا چەند شیعرێکی سیاسی درێژی دانا بو. لەوانەی گەیشت بونە ئێمە: «کوچ» و «ئەرایەسوک». لە ئاوزەنگ بە ڕێکوپێکی گزلار و ڕۆژنامە کوردی عەرەبیەکان و، هەمو کتێبەکانی دەرئەچون پێمان ئەگەیشت.

«کوچ» شیعرێکی سیاسی بو. بە زمانێکی ئەدەبی چیرۆکی ئاشبەتاڵ و چونی بە کۆمەڵی بۆ تاران ئەگێڕایەوە. پاش ماوەیەک «مەسنەوی» «داستانی هەڵو سورەکانی قەندیل» مان پێ گەیشت. ئەمە شیعرێکی سیاسی بو چیرۆکی دەس پێ کردنەوەی شۆڕش ئەگێڕایەوە. شیعرەکانی بە لای منەوە زۆر بەرز و کاریگەر و، پڕ بون لە دیمەنی جوان و، ئاوازی خۆش. جا نازانم هۆی ئەمە ئەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە باسی قۆناغێکی خەباتی کوردی ئەکرد خۆمی تێ دا بەشداربوم، یان هەر بە ڕاستی شیعرەکان بە لای ڕەخنەوانێکی بێلایەنیشەوە وەها بو. لە سەر ئەم شیعرە پارتی بڕیاری کوشتنی شێرکۆیان دا.

لە مێژ بو لە گەڵ شێرکۆ دوریەدور ئاشناییمان هەبو، ئەگەرچی لە بیروباوەڕی سیاسی دا جیاواز بوین، بەڵام من هەمیشە بە ڕێزێکی زۆرەوە لە شیعرەکانی شێرکۆم

ئەروانی، ئەو کاتەی لە «ڕوانگە»دا بانگی نوێ کردنەوەی ئەدەبی کوردییمان دا، ڕۆژێ لە لای من زیاتر پەیدا کرد. ئەمجارە ئیتر لە هەڵوێستی سیاسی دا لە یەکتری نزیک کەوتینەوە. نامەیەکم بۆ نارد و، ئەویش وەڵامی دامەوە. ئیتر ئاڵوگۆڕی نامەمان بێ پسانەوە بەردەوام بوو. سەیرم کرد شێرکۆ بە تەنیا شاعیر نیە، بەڵکو ڕوشنبیرێکی گەورەی کوردە. خاوەنی بیروڕای سیاسی پێگەیشتوو و کاملە. ئەوەندەی تر لە لای من خۆشەویست بوو. زۆر زۆر شیعری ئەنارد لە ئیستگە بڵاو ئەکرایەوە. شیعرەکانی لە ناوەڕۆک و شێوەدا تازە بوون و، بابەتێکی نوێ و داهێنراو بوو لە شیعری سیاسی کوردی دا. بۆ پێشمەرگە و بزوانندنی گیانی شۆڕشگێڕانەیش لە هەناوی مرۆڤی کوردا کارێکی بێ وێنە بوو.

تا لە ناوزەنگ بووم ئەمتوانی ڕووبەڕوو ببینم. کە چوومە دۆڵی باڵیسان چەند جارێ لە گەڵ ڕەئوف بیگەرد، مستەفا ساڵح کەریم، تاهیر ساڵح سەعید بە نهێنی هاتن و، پێکەوە دائەنیشتین. قسە و باسی جۆراوجۆری سیاسی و ئەدەبیمان ئەکرد.

*

حەسەنزی لە چاسووسان

لە دریژەی شەڕەکانی حدکا - ئیران دا هێزێکی پارتی لە چلەی زستان دا بە سەرکردایەتی حەسەنزی میرخان ژاژۆکی و، بە یارمەتی ئێران لە ئاڵوەتانەوە هەڵکشا بوون بۆ چیاکانی پشتی دۆڵە تۆ نزیک لوتکەی چاسووسان، بەرامبەر ناوزەنگ. بەفرێکی ئەستوور سەرتاپای شاخەکەی لوس کرد بوو. ئەوان بۆ ئەوەی سەرمایان نەبێ چادرەکانیان لە بەفر گرت بوو. بۆ ئەوەی ون نەبن لە ڕێگاکەی بناری شاخەکەوە تا چادرەکانیان پەتیان ڕایەڵ کرد بوو. بە پەتەکەدا ڕێگاکەیان ئەدۆزییەوە و، بە کۆڵ خواردەمەنی، سووتەمەنی، تەقەمەنی و کەلوپەلی تریان سەرئەخست. چاروبار خانوەکانی ناوزەنگیان ئەدایە بەر هاوەن. ناوزەنگ ئیتر لە مەترسی کەوتن دا بوو. ئێمە مشووری جێگایەکی تر بخۆین بۆ بارەگای دەزگا سەرکردەییەکان، بیرمان لە ناوچەی بارزی کرد بووەوە.

پێش ڕاگوێزان ناوچەکە چەندین گوندی ڕەکوو: بارزی، سەرشیو، ڕازان، ئەشکەنە، قندۆل، چەکوران، دەوزان، بەرکێشان، باڵبلان، گەنارێ تێ دا بوو. شوێنێکی شاخاوی خۆش، پڕ دار و دەوەن و، کانی و ئاو. پشتی دابوو بە چیای چاوناسکەوە، کە بەشێ بوو لە زنجیرەی چیای هۆمل، زەردکە، بوڵفەت... تیپی جوتیاران سەر لەنوێ ناوچەکەیان ئاوەدان کردەوە. فەرماندەی تیپی جوتیاران: محەمەد ڕازانی و، فەرماندەی کەرتەکانی لە کوێستانەکانی بۆرێ، بیوەکە، قزڵغان، سپیرکان، ساتیە.. بارەگایان دانا بوو. خانوبەرەیان لێ دروست کرد بووەوە.

بڕیارمان دا هەندێ لە دەزگاکان بنێرینە ئەوێ. پێشەکی هێزێکمان نارد هەندێ جێگای ئەمین بۆ دەزگای ڕاگەیاندن دیاری بکەن. دەزگای ڕادیۆیان گواستەوە و، ئیستگاکەیان لە شوێنێک دامەزراند لە پشتی ئەشکەنە ناوی قزلەگی بوو.

لە دەورەبەری نەورۆزەوە دەستیان کرد بە گوێزانەوە. هەندێ لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و دەزگای ڕاگەیاندن.. چوونە ئەوێ و، چەند جێگایەکیان ئاوەدان کردەوە. بەشێ لە کەلوپەلی بارەگاکانی ناوزەنگ گوێزرایەوە بۆ ئەوێ.

*

## هاتنی مامجەلال بۆ خۆشناوەتی

دوای ئەوەی شەڕی قەندیل بە لادا کەوت. هێزەکانی جەود دەرکران بۆ تەهران. بارەگاکان لە ناو زەنگ کەم بوبونەوە و، زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی بە ناوچەکان دا بڵاو بوبونەوە ئیتر کاتی ئەوە هات بو، هێزەکانی ناوزەنگ تەنک بکرێن و ئینجا چۆڵ بکرێ. مولازم عومەر و هێزێکی کەم مانەوە. مامجەلال بەرەو خۆشناوەتی هات. لە نزیک گوندی بالیسان بارگەی خست و، کەپریان دروست کرد و خەوەتیان هەڵدا. ئەوە جاری یەکەم بو مامجەلال لە شارەکان نزیک ببێتەوە، بە هەزاران کەس لە توێژی جۆراوجۆری خەڵکی گوند و شارەکانی کوردستان ئەهاتن بۆ سەردانی.

*

## جەمال تاهیر: مردنێکی ناوەخت

جەمال تاهیر لە سلێمانی لە دایک بوە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە سلێمانی و، خانەی مامۆستایانی تەواو کرد. بو بە مامۆستا. هێشتا هەرزەکار بو تێکەڵاوی ژیانی سیاسی بو. ئەندامی یەکێتی قوتابیانی کوردستان و پارتی بو.

ئەندامی شانە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە بو.

دو جار گیرا و، هەردو جار دوای ئەشکەنجەدانی زۆر لە «ئەمن»ة ی سلێمانی بە ڕێکەوت پێش تەواو بونی لێکۆڵینەوە و درانی بە دادگا، بەر لێبوردنی گشتی کەوت و بەر بو. لە کاتی گرتنی دا ئازایەتییەکی بێ وێنەی نواند بو. ساڵانی ١٩٨٠ - ١٩٨٣ لێپرسراوی ڕێکخستنە نهێنیەکانی ناوشاری کۆمەڵە و، لێپرسراوی مەفرەزەکانی ناو شار بو. کە هاتیشە شاخ بۆ بە بەرپرسی دەزگای ناوەندی ڕێکخستن. یەکێ بو لە سەرکردە هەڵکەوتوەکانی کۆرە.

ڕۆژی ١٧ ی تەموزی ٨٣ ئەیەوێ بڕوا بۆ گەڕان. جەباری حاجی عوسمان بانگ ئەکا بە ئوتومبێلەکەی من بیبات بۆ گەڕان. جەبار لێخوڕینەکەی باش نەبو، چەند جاری پێم وت بو ئوتومبێل لێ نەخوڕی. مامۆستا جەمال زۆری لێ کرد بو لە گەڵی بڕوا. ئوتومبێلەکە پیکابێکی دەبل کابینە بو. خۆی لە پێشەوە سوار ئەبێ و، جەبار لێ ی ئەخوڕی و، خانەی ناوەڕاست و پشتی ژمارەیەکی زۆرتر لە یاری خۆی پێشمەرگە سواری ئەبێ. لە کاتی ڕۆیشتن دا پێشەکەی سوک و پشتەکەی زۆر قورس ئەبێ. لە سەر جادەی بالیسان، کە جادەیەکی تەخت و خۆش بو، لە تاسەیەک دا هەڵگەڕابوەوە و، دەستبەجێ مامۆستا جەمال مرد بو. چەند پێشمەرگەیەکیش بریندار بو بو.

کە هەواڵەکەیان دا بە من یەکسەر چوم بۆ بالیسان تەرمەکەیان برد بو بۆ مزگەوتەکەی ئەوێ. پاش شتن بە خاکمان سپارد و لە سەر گۆڕەکەی هەندێ قسەمان کرد. لە سەردەمی خوێندنی ناوەندیەوە، بە هۆی کاری سیاسیەوە، هاوڕێ ی یەکتری بوین. لە دامەزراندنی کۆمەڵەدا لە گروپەکەی ئێمە بو. مردنی مامۆستا جەمال زیانێکی گەورە بو لە کۆمەڵە و یەکێتی و بۆشاییەکی گەورەی دروست کرد. لە کاروباری ڕێکخراوەیی دا یەکجار شارەزا و، لە بیر و لێکدانەوەی سیاسی دا زیرەک و ورد و، لە ڕوبەڕوبونەوەی کێشە و گیروگرفت دا ئازا و چاونەترس بو. دژی دەستەگەری و چەپایەتی توندڕەو بو. ئەم مردنە ناوەختە بۆ من کۆستێکی ڕاستەقینە بو، هاوڕێیەکی دڵسۆز و پشتیوانێکی پتەوم لە دەس چو. جەبار هیچی لێ نەهات بو، بەڵام لە ترسی من خۆی شارد بوەوە و، تا ماوەیەکی درێژ

ئەویرا خۆی پیشانی من بدا، چونکە لە ریزی پێشمەرگایەتی دەرم کرد بو. چەهار لە ١٩٧٨ەوە لە گەڵ خۆم پێشمەرگە بو، کوڕێکی دڵێر و ئازا و مشوورخۆر بو، بە راستی دڵسۆزی من بو، منیش زۆرم خۆش ئەویست و ریزم ئەگرت. ماوەیەکی درێژ کاروباری ماڵ و پارەگاکەمی بە رێوە ئەبرد. دوای ئەوەی نائومێد بو سەری خۆی هەڵگرت بۆ ئەڵمانیا.

•

کۆبونەوەی سەرکردایەتی کرا. لەم کۆبونەوەیەدا چەند بڕیارێکی گرنگ درا. بۆ یەکەمین جار یەکێتی دروشمی؛ «دیموکراسی بۆ عێراق و، مافی چارەنوس بۆ گەلی کورد» ی بەرز کردەوە و، ناوی رادیۆکەی لە «دەنگی شۆرشی عێراق» ەوە کرد بە «دەنگی گەلی کوردستان».

•

## کۆنفرەنسی کۆمەڵە

سەرکردایەتی کۆمەڵە بڕیاری دا خۆی ئامادە بکا بۆ سێیەمین کونفرەنس. بۆ ئەو مەبەستە دەزگای رێکخستن کە پێکهات بو لە: ئازاد هەورامی، قادری حاجی عەلی، رێکەوتی عوسمان بەگ. راسپارد سەرپەرشتی کۆنفرانسەکانی کەرتەکانی رێکخستن بکەن بۆ هەڵبژاردنەوەی ئەندامانی کەرت و، نوێنەرانی کۆنفرەنسی سێیەم. هەرسێکیان بە رێ کەوتن بۆ بەجێهێنانی ئەرکەکەیان.

•

## شەڕی دوەمی جوەد

هەواڵ هات هێزەکانی جوەد سەر لە نوێ هاتونەتە ناوچە سنورییەکانی قەندیل. لە قەلاتوکانەوە تا دوڵی بالەکیان بڵاو بونەتەوە. هێزی تیپەکانی بالەک، کاروخ، هەریمی ١٤ لە دوڵی خانەقا پەرینەوە، چیاکانی مامە روت، کەلەکی بالەیی، گرت و لێیان دامەزران. جەیش هێرشێکی کرد و، هەندێ شوێنی ناوچەکەی گرت و هاڵیکۆپتەر کەوتە فڕین و سوڕانەوە. هێزەکانی یەکێتی لە چیاکانی سەرووی دوڵی خانەقا کشانەوە چیاکانی خوارووی دوڵەکە. جەیش کشایەوە. هێزەکانی جوەد شوێنەکانیان گرت و، هەمو چیاکانی سەرووی جادەی خانەقا کەوتە دەستیان و، رادیۆی پارتی گرتنی ناودەشت و دوڵی خانەقای وەکو سەرکەوتنێکی گەورەی جوەد باس کرد.

هەر ٤ لایەنەکەی جوەد؛ پارتی، حشع، حسک، پاسۆک، هەمو هێزەکانی خۆیان بۆ ئەم لەشکرکێشیە ئامادە کرد بو. ئێرانیش کارئاسانی بۆ کرد بون، یارمەتی دابون و، چەند پاسدارێکیشی وەکو ئەفسەری پەیوەندی لە گەڵ نارد بون.

ئەوسا زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتی بۆ کۆبونەوە هات بون بۆ دۆڵی بالیسان. بڕیارمان دا هێزێک بە سەرکردایەتی عەلی پچکۆل و سەید کەریم بنێرین نەهێڵن زیاتر پێشڕەوی بکەن و ئەگەر بۆیان بکری دەریان کەن. عەلی و سەید کەریم لە بەرەبەیانی ٨٣/٨/١٣ دا هێرشێکیان بۆ کرد بون بۆ چیاکانی ئەوبەر جادە، دەستیان لە چەند شوێنێکی گرنگ گیر بوبو، لەوانە کەلەکی بالەیان، بەلام نەیانتوانی بو درێژە بە هێرشەکەیان بدەن و، بە تەواوی دەریان بکەن.

زارگەلی

لە دوڵی بالیسانەوە بەری کەوتم. ناظمی حەمەی سلێمان و، عەلی نەبی پشم لە گەڵ

بوون. لە بناری کاروخەوە دابەزینی هالیکۆپتەر و شەوە تۆپی هێزەکانی ئێران و عێراق لە «گرد مەندیل» بە چاکی ئەبینران. عێراق گردمەندیلی ناو نابوو: «گردە مەند» و ئێرانیش ناوی نا بوو: «تەپەی شەهید سەدر». هێرشەکەی جوێ هاوزەمان بوو لە گەڵ هێرشی ئێران بۆ سەر ناوچەی حاجی هۆمەران و، بە ئاگاداری و بۆ هاوکاری ئەوان بوو. پێشمەرگەکانی پارتی لە گرتنی حاجی هۆمەران دا، شان بە شانی هێزەکانی ئێران، بەشدار بووبوون. سەددام تۆڵەی ئەم بەشدار بوونەی لە بارزانییەکانی ئۆردوگای قوشتەپە و بەحرکە کردەوە.

بنکەی فەرماندەییم لە زارگەلی دانا. زارگەلی گوندێکی راگوێزراو بوو ئاوەدانی تێ دا نەبوو. لە سەر جۆگاکە لە نزیک جادەکە و لە ناو گەڵەکەدا جێگەمان چاک کرد. ئەو زەمانە من لەشم ساغ و تەن دروست بووم. لە جۆگاکەی بەردەمان دا گۆمێکی بچوکم دروست کرد بوو هەموو شەوێ بەر لەوەی بۆ نوستن رابکشێم، خۆم لە ئاوە ساردەکەی هەڵئەکێشا. جگە لە بەختیاری برام کە کاروباری پەیوەندی بێتەل و بروسکەی رائەپەراند، عەبدولرەحیم عەبدوللا، شۆڕش حاجیم. لە گەڵ بوون. هاورێیەتی لە گەڵ عەبدولرەحیم دا زۆر خۆش بوو. پیاوێکی ئازا و بەزات و قسە خۆش و وریا بوو. لە شوێنی خۆی دا «تەعلیق» ی خۆشی ئەدا. لەم سەفەرەدا لە گەڵ حاجی خدر ئاغای ئەنی ئاشنایەتیم پەیدا کرد. هەموو رۆژێ لە بەیانییەوە تا ئێوارە لە لامان ئەبوو. حاجی ئاغا پیاوێکی بە ساڵاچووی بەرێز و قسە خۆش و بە زات بوو. کوڕەکانی پێشمەرگە بوون. کەمالیان لەم شەڕانەدا رانی شکا و، ماوەیەکی درێژ لە جێگادا کەوت.

فەرماندەی لولەکانم بینی و، هەلومەرجی ناوچەکە و هەردولام هەڵسەنگاند. کەوتینە خۆئامادە کردن بۆ دەرپەڕاندنی هێزەکانی جوێ.

*

## هەنگوانی

لە لای سەرومانەوە ئەشکەوتێکی گەورەی دەم کراوەی لێ بوو. هەنگێک هێلانەی لە قلیشی بنمیچەکەی دا کرد بوو. دیار بوو هەنگێکی فەرماڵغ و کۆن بوو. هەنگوینی زۆری تێ دابوو. هەرکەس ئەهات بۆ لامان و ئەیبینی تەماعی لێ ئەکرد. بەڵام شوێنەکەی را هەڵکەوت بوو هەرچی فێلێکیان لە گەڵ بەکار ئەهێنا ئەیانئەتوانی بیگەنێ و بیبەن.

هەنگ، بۆ جیاکردنەوەی لە مێشە رەش لە هەندێ شوێن پێ ی ئەڵێن: «مێش هەنگوین».

هەنگ «نێر» و «مێ» و «شا» ی هەیە.

نێرەی هەنگ لە مێ گەورەترە. رەنگی بۆزە، هەنگوین ناکا. «چزوو» ی نیە و ناتوانی پێوە بدا.

مێ لە نێر بچوکترە. پارێکەڵیە رەنگی تێکەڵاوە لە زەرد و رەش. هەنگوین ئەکا. چزوی هەیە. پێوە ئەدا لە گەڵ پێوەدان دا چزووەکەی دەردێ و ئەمرێ.

هەنگ لە بەهاران دا پوورە (شەماڵە) ئەدا. «پوورەدان» ئەوەیە شایەک لە پوورە ئەسڵییەکە جیا ئەبێتەوە، ئەفڕێ بۆ دەرەوە هەنگەکانیش شوێنی ئەکەون. شا لە سەر لقی درەخت، یا گوێسوانە یا هەر شوێنێکی تر ئەنیشێتەوە، هەنگەکانی تر هەموویان لێ ی ئەورووکێن و لە شێوەی هێشوودا لێ ی کۆ ئەبنەوە.

بۆ گرتنەوەی ئەبێ «خەڵێت» (پلوورە، شەماڵە، کەندو) یەکی تازە بەیان ناوەکەی

هەنگوین یا هەر شیرینییەکی تری تێ هەڵدەسوون و، لە ژێر پووشی هەنگەکەدا دائەنرێ. بە گوێرەی شیرینەکە یان بە کەوچک هەنگەکانی تێ ئەکەن، یا ئەیخەنە ناو پوورەکەوە، کە شاکەیانی تێ چو ئەوانیش دیسان لێ ی کۆئەبنەوە و تێ ی ئەورووکێن. پشتی خەڵێنەکە ئەگیرێ، تەنیا کونی بەردەمی ئەهێڵرێتەوە بۆ هاتوچۆ. تا ئێواری لە هەمان شوێن دا دائەنرێ، کە تاریکی کرد ئەگوێزرێتەوە بۆ «هەنگەڵان». هەنگەڵان شوێنێکی تایبەتیە ئەرخان کراوە بۆ دانانی خەڵێنی هەنگەکان لە هاوین دا لە هەتاو ئەیپارێزێ و لە زستان دا لە بەفر و باران.

هەنگەکان خۆیان ناو خەڵێنەکەیان بە «بەرمێو» کونیر ئەکەن. بەرمێو، مادەیەکی شینی رەقە. زستانیش دەمی دەرگاکەیان بە هەمان مادە دائەخەن.

هەنگ لە ناو خەڵێنەکەدا لە «مێو» «شان» هەڵئەبەستی. شانەکان ئەگەر لە باری درێژی هەڵبەسترا بن پێ ی ئەڵێن: «تیرە شان»، و ئەگەر لە باری پانی هەڵبەسترا بن «پەنکە شان». شانەکان پڕ ئەکەن لە هەنگوین. هەندێ جار لەرێ ناکەون هەموو شانەکان پڕ بکەن. ئەوی بە بۆشی مابێتەوە پێ ی ئەڵێن: «کەمە شان». ئەگەر پوورەیەک چالاک و ئەرەبالغ بێ، «دەرەبە» ی زیاد لە پشتی پوورەکەی ئەبەستێ. دەرەبە لە لوور وەکو کونج، یا لە تەختە وەکو کەللەی هێلەک دروست ئەکرێ و، دوای پڕکردنی لێ ی ئەکرێتەوە.

هەنگ بە درێژایی بەهار و هاوین خەریکی دروستکردنی هەنگوینە. لە پایزدا ئەیبڕن، واتە زۆری شانەکانی لێ دەرئەهێنن و کەمێکی بۆ خواردنی زستانی هەنگەکە بە جێ ئەهێڵن. لە کاتی بڕین دا بە دوکەڵی ئەپاڵە «قانگ» ی ئەدەن. دوکەڵەکە لە ناو پوورەکەی دا کۆ ئەبێتەوە زۆری هەنگەکان پوورەکە بە جێ ئەهێڵن ئەوسا بە چەقۆ شانەکان لە دیواری پوورەکە ئەکێشنەوە. بڕینی پەنکە شان ئاسانترە لە بڕینی تیرە شان، چونکە تیرە شان بە ئەلیشت پێکەوە هەڵبەستراون و وریاییەکی زۆری ئەوێ بۆ ئەوەی لە کاتی بڕینی یەکێکیان دا ئەوانی تر خراپ نەبن.

دانیشتوانی ناوچە شاخاوییەکان لە بەهاردا هەنگەکانیان ئەگوێزنەوە بۆ مێرگەکانی کوێستان تا پایز لەوێ دایان ئەنێن. لە پایزدا ئەیانهێننەوە بۆ هەنگەڵانی زستانە لە ناو ئاوایی دا. مێوی هەنگوینی ئەم شوێنانە سپی و هەنگوینەکەیان زەردی کاڵە. سەرچاوەی مێوەکە گوڵی گەنمە کێوی و سەرچاوەی هەنگوینەکەیش هەڵاڵەی گوڵە بۆنخۆشەکانی کوێستانەکەیە.

هەنگ چەند دوژمنێکی هەیە: زەردەواڵە، شەوگەرە و مارمێلکە، هەنگەخۆرە و کەلەسەمە. ئەیخۆن.

مرە، کە جۆرە پەپوولەیەکە، ئەچێتە ناو پوورەکەیەوە لە ناو شانەکانی دا گەرا دائەنێ. شانەکان ویران ئەبن و هەنگەکە ئەمرێ.

ورچ کە بە شیرینەکەیان قیر بو ئەویش پوورەکە ئەشکێنێ و هەنگوینەکەی ئەخوا و، هەنگەکان سەرگەردان ئەبن.

هەندێ جار زەردوویی ئەگرێ بۆ چاککردنەوەی بە دوکەڵی ئێسکە ماسی قانگی ئەدەن. هەروەها ترشی رەوانی ئەبێ. هەندێ جاریش لە برسان دا پەلاماری پوورەی یەکتری ئەدەن و، بە هەزاران دانە لە بەر دەرگای پوورەکانیان دا لە یەکتری ئەکوژن. بۆ ئەوەی ئەم شەڕە بکرێتەوە ئەبێ هەنگوین یا شیرینیان بۆ دابنرێ.

جۆرە هەنگێکی کێوی هەیە وردترە لە هەنگی ئاسایی لە ناو کونە بەردا هێلانە ئەکا، لە هەندێ شوێن پێ ی ئەڵێن: «شەمەتلێنکە» و لە هەندێ شوێنی تر: «شەپەتۆکە». ئەمیش شان هەڵئەبەستێ و هەنگوینی تێ ئەکا. تامی هەنگوینەکەی خۆشترە لە هەنگوینی ئاسایی، بەڵام کەمە، هەر بەشی پارووێکە. پێم وانیە لە سەر شەمەتلێنکەی کوردستان هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستی کرا بێ.

دوای ڕاگوێزانی دێهاتی سنور ژمارەیەکی زۆر هەنگ بەرەڵڵا بوبون، لە کلۆری دار و کونی بەرد و ئەشکەوت دا جێگیر بوبون. هەنگدزز ئەیان دۆزینەوە. لە سەر کانی چاودێری هەنگەکەیان ئەکرد کە ئەهات بۆ ئاوخواردنەوە و، دوای هەستانی بۆ فڕین چاودێری هەنگەکەیان ئەکرد چەند بەرز ئەبێتەوە و، بەرەو کوێ ئەڕوا، بەوەدا شوێنەکەیان دیاری ئەکرد و ئەچون بۆ دۆزینەوە و گرتنەوە و بڕینی.

پێشمەرگەکانی دۆڵی باڵیسیان و هەندێ لە خەڵکی ناوچەکە هەندێ هەنگیان گرت بوەوە و، کردبویانە شەلکەوە و، لە هەنگڵاتی پچوک و ئەبیتراودا دایان نابو. لەشکرەکەی پارتی کە هات بون، دوای ئەوەی زڵدیان بڕی بو شەلکەکانیشیان لە ناو هەڵکێشا بو، بۆ ئەوەی هەنگەکان بڕن.

*

## کاروباری لوجستیکی

لە تەقەمەنی و خواردەمەنی و پێخەف دا ناتەواو بوین. شۆڕش حاجیم کرد بە لێپرسراوی کاروباری لوجستیکی کڕینی ئازوقە، تەقەمەنی.. تەقەمەنی مان لە قاچاخچی بە نرخێکی گران ئەکڕی. چەردەیەکی باش فیشەکی کلاشینکۆف، بی کەی سی، گوللەی ئاڕبیجی، نارنجۆکمان.. کڕی. ئازوقەیش بە زۆری نان و هەندێ خواردنی قوتو بو. پێشمەرگەکان هەمو ڕۆژێ ڕادیۆی پارتیان ئەکردەوە. جنێوی زۆر ناشیرینیان بە یەکێتی ئەدا و، باسی لێشاوی خواردەمەنی، تەقەمەنی، کەلوپەلی ئەکرد کە عێراق بە لۆری لە دۆڵی خانەقاوە بۆ یەکێتی ئەنێری. ئەم پڕوپاگاندە درۆیەی کە هەمو ڕۆژێ ڕادیۆکەیان دوبارەی ئەکردەوە، لە دو لاوە بۆ ئەوان بە زەرەر بو:

- وورەی هێزەکانی خۆیانی ئەڕوخاند، کە ژیانیان لە بەرزاییەکانی قەندیل دا بە هۆی سەرما و برسێتی و دوریان لە کەسوکار و چۆڵیی ناوچەکەوە زۆر ناخۆش بو.
- قینی پێشمەرگەکانی یەکێتی هەڵئەساند و، ڕقیانی لە جوود ئەوەندە ئەستور ئەکرد کە بە هیچ جۆرێ دەستیان لێ نەپارێزن و، وەکو خائینی درۆزن و، بەکرێگیراوی بێگانە ڕەفتاریان لە گەڵ بکەن. پێشمەرگەکان دانە جیرەیان بو لیبان.

*

شوێنێک لە زلجیرەی بیبە بە ناوی بەرمیبدانەوە بە دەس چەکدارەکانی پارتیەوە بو، ئێوارانی بە سەر جادەکەدا و، بە سەر بەشێکی هێزەکانی ئێمەدا، زۆرجار لەوێوە تەقەیان ئەکرد و، خەڵکیان بێزار ئەکرد. حەسەن کوێستانی و عەلی نەبی بە تەما بون پەلاماری بدەن ئەو شوێنەیان لێ بسێنن. شەو بو بە تەقەیەکی گەرم و، گوللەی ئاڕبیجی لە تاریکی شەوەکەدا وەکو پشکۆی ئاگر ئەهات و ئەچو. من لە زارگەڵێوە چاودێری شەڕەکەم ئەکرد. وامزانی هێزەکەی ئێمە پەلامار ئەدەن، کەچی هێزەکانی پارتی هەمان شەو پەلاماریان دابو شوێنەکەی ئێمە بگرن. لەم شەڕەدا برایەکی تری حەسەن و پێشمەرگەیەکی تر کوژران، بەڵام

حەسەن شوێنەکەی بەرنەدا و دابەزی تا هێرشەکەی پارتی تێک شکێنرا.

*

کۆبوونەوەیەکم لە گەڵ فەرماندەکانی پێشمەرگە کرد کە چی بکەین؟ دوو ڕەئی جیاواز بوون: هەندێکیان ئەیانوت لەم شاخە ساردە بکشێینەوە چیاکانی خوارووی جادە؛ دوورە بی و تەورە و، لەوێ دابەزرێین. هەندێکی کە ئەیانوت ئێمە پەلاماریان بدەین و، بیانکەینەوە بە دیوی ئێران دا. ناظم، کە یەکێ لە فەرماندەی بەتالیونە ئازا و هەڵکەوتووەکانی شۆڕشی ئەیلول بوو، لەم ڕەئیەدا بوو، وتی: «ئەتوانین ئەڵێین لەم شاخانە بکشێینەوە بۆ شاخەکانی ئەوبەر، لەوبەریش کە هاتنە سەرمان ئەڵێین با بچینە کاروخ و بیرمکە دیفاع بکەین. لەویش کە هاتنە سەرمان ئەڵێین با بچینە هەورێ.. ئاخیرییەکەی وای لێ دێ ئێمە لە دەشتی کەرکوک شەڕیان لە گەڵ بکەین.. چاکتر وایە شەڕەکە لێرە بکەین و لێرە بیانشکێنین!»

*

خۆ ئامادە کردنمان تەواو کرد. لە گەڵ پێشمەرگەکانی گەرمیان دا بە کەلەکی باڵەیان دا سەرکەوتم بۆ نزیک سەنگەری پێشمەرگەکان. چەند کەسێکی شارەزام هەڵبژاردە بچن بۆ نوڕینی شوێنەکانی جود. هاتنەوە ئاگاداریی وردیان لە سەر شوێنەکانیان و لەوارەی هێزەکانیان کۆ کرد بووەوە.

هەندێ سەرچاوەمان پەیدا کرد بوو دەنگوباسەکانی ئەوانیان بۆ ئەناردین. ئەوانیش زانیاری باش و بە کەڵکیان دەس ئەکەوت. هەواڵەکانی بزمان ئەحات وایان ئەگەیاند ئیدریس لە دێیەکی نزیک ئەوان بوو لە دیوی ئێران ئاگاداری کرد بوون کە دێت بۆ سەردانیان. من بەم هەواڵە زۆر خۆشحاڵ بووم. چەند ساڵ بوو بنەماڵەی بارزانی لە واشنتۆن و کەرەج دانیشت بوون و، خەڵکیان بۆ شەڕی ئێمە ئەنارد، وا ئێستا خۆی دێت بۆ مەیدانی شەڕ. ماوەیەک هێرشەکەم ڕاگرت بە هیوای گەیشتنی ئیدریس. هەر دەر نەکەوت. ژیانیشمان بە شاخەکەوە زۆر ناخۆش بوو، ئاوی کانییەکانی ئەوەندە سارد بوو بە زەحمەت دەس و دەموچاوی پێ ئەشۆرا. هەموومان پشتی دەست و ڕوومەتمان قڵیشا بوو، ڕوخسارمان تاریک هەڵگەرا بوو. شەو زۆر سارد و خواردنمان زۆر خراپ بوو. هێڵەکانی ڕووبەڕوو بوونەوەمان لە یەکتری نزیک بوو، لە تەقەی بەرامبەردا ۲. کەس زیاتر بریندار بوو. بەڵام هیچ کەسێ لە پێشمەرگەکان خۆی نەئەدزییەوە.

*

شەڕە جنێو بە هۆکی تۆکی

ڕۆژێکیان هۆکی تۆکیەکەم کرد بووەوە لە گەڵ عەلی بچکۆل قسەم ئەکرد. کابرایەک هاتە سەر خەت. قسەکانی پێ بڕیم. پرسی: «تۆ فلانی؟»

وتم: «بەڵێ!»

جنێوێکی بە دایکم دا وتم: «دایکم نەماوە!»

جنێوێکی بە ژنەکەم دا وتم: «ژنم نیە!»

جنێوێکی بە خوشکم دا وتم: «هەموویان شوویان کردوە مێردیان هەیە!»

وتم: «بۆچی لە مەسئولەکانتان ناپرسن لە باتی ئەوەی هەموو ساڵێک جارێک بتانهێنن بۆ سەر یەکێتی و هەندێکتان بە کوشت بدەن و بە شکاوی بتانگێڕنەوە بۆ ئێران، بۆچی لە گەڵ یەکێتی ڕێک ناکەون بە خۆشی و بە بێ شەڕ بێنەوە بۆ کوردستان؟»

وتی: «ئێمە عەینەک لە چاوەکانی پشتناشان نین - مەبەستی شۆڕەبەکان بوو کە لە شەڕی ئایاردا تێشکا بوون - ئێمە شێر و پڵنگەکانی بادینانین.. ئێمە هاتووین دایکت....»

کوڕەکە بە گەرماڵەیی ئەدوا، لام سەیر بوو بادینانی کە بە ئەدەب و مەعریفەت ناسراون، جنێوفرۆشی وەهایان لێ دا بێ. سەیرم کرد قسەکانم کاری لێ ناکا، وتم: «شێر و پڵنگی بادینان گوێ بگرن! هەولێری قسەیەکیان هەیە ئەڵێن: مەیدان مشکان نەیانخواردووە! لە مەیدانەکەدا یەکتری ئەبینین»

بە هەموو هێزی تێزکییەکانم راگەیاند: ئیتر دابێنن و جارێکی تر قسەی پێ نەکەن تا خۆم بە نامە ئاگادارتان ئەکەمەوە.

*

مەیدانی شەڕەکەم کرد بوو بە ٣ شەرگە:

شەرگەی سەرەکی زنجیرە چیای بێبە بوو کە هێزەکانی پارتی و بارزانییەکانی لێ دامەزرا بوو.

شەرگەی خەریک کردن، ئەمیش دو قۆڵ بوو:

قۆڵی یەکەم، لە سەر چیای بێبە، تیپێک بنکەکەی من کە تیپ عەلی تەیی پەلاماریان بدا و، هەمیشەیان لای وابوو ئەمە هێرشی سەرەکی لێ ئەکری.

قۆڵی دووەم، زنجیرە گردێکی نێوان جادەی خانەقا و گوندەکانی ئێنزێ، لیوژێ، سلێ و بزلی.. کە هێزەکانی حەسەک و حشمی لێ دامەزرا بوون، تیپ هێزەکەی عەلی پیچکۆڵ پەلاماری بدا.

لە شەڕی مانگی مایس دا، حشم و حەسەک جەنزەمەیان پێ گەیشت بوو، ئەمانیست ئەمجارەیان جەنزەمە لە پارتی بسرەوینن و، غرورییان بشکێنن. لە بەر ئەوە تەرکیزمان کردە سەر ئەوان.

جارێکی تر تاقمێک پێشمەرگەی تێکەڵاو لە شارەزا و نەشارەزام نارد بچن بو سەیری شوێنەکانیان و، رێگاکانی پەلاماردانیان. خۆم ناوچەکە شارەزا بووم. جاری یەکەم ساڵی ١٩٧١ و جاری دووەم لە کاتی کارەساتی هەکاری ما ساڵی ١٩٧٨ دی بووم و، ئەو چەند رۆژەیش کە بە شاخەکەوە بووم، بەردەوام سەیرم ئەکرد و لە شارەزاکانم ئەپرسی و، بیرم لێ ئەکردەوە: رووبەروو پەلاماریان بدەین، یان لە لاوە؟

رووبەرو توشی زیانی گیانیی زۆر ئەبوین و، ئەوانیش وایان چاوەڕێ ئەکرد لەوێوە پەلامار بدەین. بەلام بە درێژایی دۆڵی خەلاپ بۆشایی بوو، ئەوان پەیان ئەکرد بووەوە و هێزیان لێ دانەنا بوو. ئەمانتوانی لەوێوە بە نهێنی لێیان بسوڕێین. دۆڵەکە درێژ بوو ئەوان بە درێژایی بەرمەیدان - کونەکۆتر - بێبە دامەزرا بون و، یەکێ لە بنکەکانی فەرماندەییان لە سەر کاتی کونەکۆتر دانا بوو. لە باتی ئەوەی بە ڕێچکە و لە یەک ڕیزدا پەلاماری یەک شوێن بدەن، من وەهام دانا کە بە پانایی شاخەکە لە شێوەی «گەڵە دڕەو» دا لە ٨ جێگاوە پەلاماریان بدەن.

هێزەکانم گورلەبۆر کرد، چالاک و تەندروست و بە زاتەکانم جیا کردەوە، شارەزا و نەشارەزا و، پێشمەرگەی ناوچەکە و پێشمەرگەی دەرەوەی ناوچەکەم تێکەڵاو کرد و، ٨ تاقمی ڕێکوپێکم لێ پێک هێنا.

هەر تاڵمی فەرمانەدەی یەکەم و دووەم و سێیەم و، شوێنی هێرشەکەیان و ئامانجەکەیانم بۆ دیاری کردن و، داوام لێ کردن سەعات ۹ ی شەو خۆیان و پێشمەرگەکان بین بۆ دوایین کۆبوونەوەی پێش هێرشەکە.

لە کاتی دیاریکراودا ئامادە بوون. هەموویان .۲۳ کەس بوون. بەڵام هەڵبژاردەی هێزەکەی یەکێتی و، لە پیاوە هەرە ئازا و دڵسۆزەکانی کورد بوون. لە قسەکانم دا گرنگیی سیاسی هێرشەکە و، شکاندنی جودەم بۆ روون کردنەوە و ئاگادارم کردن کە:

- نابێ لە کاتی رۆیشتن دا قسە و، دەنگە دەنگ بکەن و یەکتری بانگ بکەن.
- نابێ لایتی دەس بە کار بهێنن، پێڵەکانی هەڵبگێڕنەوە، نابێ جگەرە بکێشن.
- نابێ هۆکی تۆکی بەکار بهێنن تا تەقە دەس پێ ئەکا.
- هەمو کەسێ لەبێ پێشمەرگەکەی بەردەمی و، ئەوەی دوای خۆی بناسێ و، نابێ ئەو ریزە لە هیچ حاڵەتێک دا، جگە لە کوژران و بریندار بوون، تێک بدا.
- هەر کەس کوژرا لە شوێنەکەی خۆی بە جێ ی ئەهێڵن تا شەر بە لادا ئەکەوێ و، هەرکەس بریندار بو یەک کەس لە گەڵی ئەگەڕێتەوە.
- ئەگەر فەرماندەی یەکەم کوژرا، جێ دووەم جێگەی ئەگرێتەوە و، جێ دووەم کوژرا، جێ سێیەم جێگەی ئەگرێتەوە لە ئەنجامدانی ئەو کارەدا کە پێیان سپێردراوە.

سەعات .۱ ی شەو خواحافیزیم لە تاڵمی یەکەم، کە رێگاکەی لە هەموویان دوورتر بو، ئینجا تاڵمی دووەم و سێیەم تا هەشتەم کرد و، بە رێ کەوتن.

*

عەلی ئەبی خۆی ئاگاداری جوڵانی هێزەکە و، ئەرکەکانی خۆی بو، بە نامەیش ئاگاداری لەزڵی عەلی بچکۆلم کرد؛ کە گروپان لە تەقەی شەر بو، لە بەرزاییەکانی بیبە، ئەوانیش هێرشەکەیان دەس پێ بکەن و، هۆکی تۆکیەکانیان بکەنەوە.

سە عات ٤.۲. دەقیقەی بەیانی رۆژی ۱ ی ئەیلول، هێشتا تاریک و روون بو تەقە دامەزرا و، لە هەمو شوێنەکان وەکو داسان نابو شەر دەستی پێ کرد. دوای ۱۵ دەقیقە هۆکی تۆکیەکانی؛ سەید کەریم، رەحمان سەیدە، عەزیزی داوە، برایمی حاجی کریخا، قادر خەبات.. مژدەیان دا کە ئەرکی خۆیان بە جێ هێنا و، هێزەکانی پارتی دەستیان کرد بە هەڵاتن. عەلی ئەبی پش سەرکەوت، من و حەسەن کوێستانی و عەبدولرەحیمیش بە دوای دا.

*

یەکێ لەو دیمەنانەی هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە لە کاتی سەرکەوتن دا پێشمەرگەیەکی تیپی سەڵبین ناوی فاروق بو بە سەختی بریندار ببوو، لە بن بەردێک دا دانیشت بو خوێن لە برینەکەی سنگی ئەچۆڕا، دوای مردنی کە گیرفانی گەڕا بوون .۲۵ فلس لە گیرفانی دا بو. کە سەرکەوتم بۆ شەرگە و لاشەی کوژراوێکی پارتیمان پیشان دەم ۲.. تمەن لە گیرفانی دا بو، لە دڵی خۆم دا بە زەییم بە خۆم و بە گیانبازەکانی گەلەکەم دا هاتەوە. لەم شاخە بەرزە لە سەرچی شەر ئەکەن!

شەری سەرەکی تەواو بو. دنیا روناک بووە. هێزێکیان لە لوتکەی بۆلی دانا بو کشانەوەکەیان بپارێزێ. چاومان لێ بو بە کۆمەڵ بە قەندیل دا بە رێ کەوتن بەرەو ئێران. لەم سەفەرەدا بە زۆری عەبدولرەحیم بە هۆکی تۆکیەکەی من قسەی ئەکرد. وتم: دەزانە شەر

و پلنگەکانی بادینان ئادرۆیەوە هەندێ قسەیان لە گەڵ بکەم؛ عەبدولرەحیم چەندێ هاواری کرد کەسیان وەڵامی نەدایەوە. نازانم خەریکی راکردن بو، یا کوژرا بو.

*

## حەسۆ لە کونەکۆتر

پارتی، بە تایبەتی بارزانییەکان، زەرەرێکی زۆریان لێ کەوت. دو لە فەرماندە ناسراوەکانیان: حەسۆ میرخان ژاژۆکی و عەبدولرەحیم جەسیم کوژران. هەردوکیان لەوانە بون لە گەڵ مەلا مستەفا چو بون بۆ مەهاباد و، دوایی‌تر بۆ یەکیەتی سۆڤییەت. لە شۆڕشی ئەیلول دا حەسۆ فەرماندەی هێزی کاوە بو لە قەلادزە و، عەبدولرەحیم فەرماندەی هێزی حەمرین بو لە بادینان. حەسۆ میرخان دولەمەری بە سەختی برینداربو بەلام دەرباز بو. حەسۆ ژاژۆکی ساڵێک بو بە دواماندوە بو لە کوێلان نەئەبوەوە. بە زستان جاسوسانی لێ گرتبو و هێزی ئیرانی هێنابە سەرمان و، بە هاوین قەندیلی لێ گرت بوین. لە سەر کانیەکەی کونەکۆتر کوژرا بو، هەگبەیەکی لێ بە جێ مابو، یادداشتەکانی خۆی و هەندێ نامەی ئیدریس و مەسعود و، کەسانی تری تێ دا بو. چەند پاسدارێکی ئیرانیشی لە گەڵ کوژرا بو.

لە یەکیەتی پێش دو لە فەرماندە ئازاکانی کوژران: ئەحمەد مەولود، فەرماندەی تیپی کاروخ، بەهاتی زو لە پەلاماردانی بیبەدا. ئاظمی حەمەی سلیمان، فەرماندەی تیپی خاڵخالان. لە دوای ئیوەرۆدا لە راوناتی شکستەی هێزەکەدا لە نزیک بولی.

بە درێژایی رۆژ هالیکۆپتەری عێراقی چاودێری مەیدانی شەرەکانی ئەکرد و، جاروبار رێزێکی کویرانەی بە سەردا ئەتەقاندین.

*

من هێشتا لە بیبە بوم مەحمودی حەمە بور گەیشتە سەر شاخ. مەحمود زو زو ئەهات بۆ لام و نامەی ئەم و ئەوی بۆ ئەهێنام، بەلام ئەمجارە پیم سەیر بو لەم کاتەدا هات بو. دەمێ ئیوارە هەسو شت تەواو بو دابەزینەوە بۆ بنکەکەی زارگەلی. مەحمود کوڕێکی لە سلیمانیەوە لە گەڵ خۆی هێنا بو داوای پارەیان لێ کرد بو، ئەیویست بیبەخشن.

من کەوتە ئامادە کردنی چەند وتاری بۆ رادیو، کادرێکی راگەیاندنی مەلبەندیشم لە لا بو، بامەکانی هەموی تایپ کرد و، نامیلکەیەکی درێژی لێ دەرچو چاپ و بڵاو کرایەوە. ریپۆرتاجێکی درێژی لە سەر شەرەکان و، یادداشتەکانی حەسۆ و، نامەکانی ئیدریس و مەسعود و، ناوی کوژراوەکان تێ دابە.

*

عەرەب و ئیسرائیل چەند جاری تەرمی کوژراوەکانیان ئەگۆڕیەوە و، چەند جاری کوژراوی ئیسرائیلی کە ئەکەوتە لای عەرەب لە گەڵ گیراوی زیندوی عەرەب دا ئەیانگۆڕیەوە. منیش ویستم چاو لەوان بکەم. لە گەڵ پێشمەرگەکان قسەم کرد، وتم: چەند جار ئەوان لە هەورامان و لە هەکاری پێشمەرگەی ئیمەیان کوشتوە و، ئەیانهێشتوە کەسوکاریان تەرمەکانیان وەربگرنەوە. ئیوەش لاشەکانی ئەمان بشارنەوە بەلکو «جەنازە بەرامبەر بە جەنازە» پێیان بگۆڕینەوە. لەندیل پەنار پەسیری زۆرە. پێشمەرگەکان ئەوەندە رقیان لە حەسۆ و تاقمەکەی بو، زۆر زو تەرمەکانیان لە کون و پەنار پەسیری شاخەکە دا شاردەوە. حەسۆ ئەو زەمانەی کە فەرماندەی هێزی کاوە بو لە پشدەر ژنێکی لە خەلکی ئەو

ناوچەیە هێنا بوو. خەزوورەکەی و هەندێ لە کەسوکاریان هات بوون تەرمەکەی ببەنەوە. منیش پێم وتن: «خێزانەکانی، عەلی عەسکەری و خالید سەعید و شێخ حسێن چەند ساڵە بە تاواتەوەن شوێنی گۆڕەکانیان بزانن. کەس شوێنی گۆڕەکانی ئەوانتان بۆ دۆزینەوە ئێمەش شوێنی تەرمەکانتان پیشان نەدەین!»

•

## عەلی پچکۆل و چا

خواردنمان خراپ بوو، پارەمان کەم بوو، بەکورتی بوو چامان لێ بڕا بوو. عەلی پچکۆل چەند جاری داوای کرد: هێزەکان ئیزن بدەین، من جاری مانەوەیانم بە پێویست نەزانی تا دڵنیا نەبووم لە کشانەوەی یەکجاریی هێزەکانی جود. عەلی ڕۆژێک نامەیەکی بۆ نووسی بووم، ئەڵێ پێشمەرگەکان ٣ ڕۆژە چایان نەخواردۆتەوە، سەریان ژان ئەکا ناتوانن ئەرکەکانیان بە جێ بهێنن، ئەگەر چامان بۆ نەنێری، بڵاوەی لێ ئەکەین. منیش بۆم نووسی: من مەسئولی عەسکەری جەبهەکەم نەک مەسئولی چا. نابێ پێشمەرگەکان، لە بەر نەبوونی چایێ، ئیزن بدا. لە سەر ئەمە تووڕە ببوو، خۆی و مەفرەزەکەی لێیان دا بوو گەڕابوونەوە بۆ ناوچەی چەمی ڕێزان.

•

مەکتەبی سیاسی بە بۆنەی ئەم شەڕەوە بەیانێکی دەرکرد. لە بەیانەکەدا لایەنەکانی جودی بانگ کرد بوو بۆ چارەسەرکردنی سیاسی کێشەکان و بۆ ئاشتبوونەوە. ئاگاداری نووسەرەکانی ڕادیۆمان کرد بوو زنجیرەیەک وتار بەم مەعنایە بنووسن. ڕادیۆی پارتی بە جنێو وەڵامی ئەدایەوە و، هەڕەشەی ئەکرد. منیش بە بیعەقڵ قسەم لە گەڵ یەکێکیان کرد و داوام لێ کرد تەعلیقێکیان لە سەر بنووسێ بە ناونیشانی: «ڕێنگو تەفاهوم ناکا» ئەم هێنراتە لە هەموو وتارەکانی کە زیاتر وروژاندنی بۆ جنێودان.

•

هێزەکانی جود ئاوارە بوون بۆ ئێران و، تا چەند ساڵی تر وازیان لە گەڕانەوەی بە کۆمەڵ و لەشکرکێشی هێنا.

•

کە هێزەکانی جود لە کوردستانی عێراق دەرکران، دانیشتووانی دێهات لە یەکێتی زیاتریان پێ خۆش بوو، نەک لە بەر ئەوەی یەکێتییان لە هەموویان خۆشتر ئەویست، بەڵکو لە بەر ئەوەی ئەرکی ٤ حیزبیان لە کۆڵ بوویەوە، تەنها هی یەکێکیانی لە سەر مابوو.

•

## گیرانی بارزانییەکان

ئەو کاتەی ناوچەی حاجی هۆمەران بوو بوو بە مەیدانی گەرمی جەنگی عێراق - ئێران. بنەماڵەی بارزانی و سەرانی پدک بە ئاشکرا هاوکارییان لە گەڵ هێزەکانی ئێران ئەکرد دژی جەیشی عێراقی. کۆکردنەوەی دەنگوباسی عێراق و هێزەکانی و، چاوساغی و ڕێبەری هێزەکانی ئێران و، و هێنان و بردنی دیدەوانی تۆپخانەی ئێرانی ئەمە بەشێکی کەمی ئەو هاوکارییە ئاشکرایە بوو. لە هێرشەکانیش دا ئەوان وەکو هێزی یارمەتیدەر و خەریککەر و لێدانی پشتەوە بەشدار ئەبوون.

بوو لە هێرشەکانی ئێران بۆ حاجی هۆمەران، بەعس وەکو لە گەڵ یەکێتی دەستی

بە پەیوەندی و ئاڵوگۆڕی پەیدا کرد بوو، لە گەڵ بنەماڵەی بارزانی پێش دا هەمان کاری دەس
پێ کرد بوو. لە بەر ئەوەی ئەوان لە ناو تەهران دا دانیشت بوون و، ئاشکرا کردنی پەیوەندی لە
گەڵ عێراق، ئەوە بە هۆی هەزیمی تەهران، ئەمەیان شارد بووەوە. لەو کۆبوونەوەیەدا کە لە
ئاوزەنگ لە نێوان نوێنەرانی یەکێتی و نوێنەرانی حکومەت دا کرا، ئەوە ئەحمەد (عقید
رکن خلیل محمد شاکر) جێگری سەرۆکی ئەوسای دەزگای موخابەرات بارزان تکریتی، بە
ڕاشکاوی دانی پێدا نا کە لە گەڵ بنەماڵەی بارزانی هەمان پەیوەندی و ئاڵوگۆڕی پەیدایان
کردووە.

بەشدار بوونی بنەماڵەی بارزانی و هێزەکانیان لە هێرشەکانی ناوچەی حاجی هۆمەران
دا، لە لای سەددام جگە لەوەی بە خیانەتی نیشتمانیی دانرا، بۆ خۆیشی بە خیانەت و
دەسبڕین و فێڵ لێ کردن ئەژمارد. بارزانییەکانی لە عێراق مابوونەوە لە ئۆردوگای بەحرکە و
قوشتەپەدا کۆ کرا بوونەوە. زۆری پیاوەکانیان بۆ بوون بە چەکهەڵگری «جەیشی شەعبی» و
بە دڵسۆزی ئەرکەکانی خۆیان بە جێ ئەهێنا.

شێخ عوسمانی کوڕی شێخ ئەحمەد و عیماد و ئەدهەمی کوڕی بوون بە بەعسی.
عیماد سکرتێری مجلسی تشریعی بوو. عوبەید و لوقمان و صابیر لە بەغدا دانیشت بوون.
عوبەید بۆ شکاندنی باوکی ماوەیەک لە وەزارەتی بەعسییەکان دا بوو بە وەزیری دەوڵەت.
داوودەزگاکانی بەعس لە ڕاپۆرت و نووسینەکانیان دا بە بنەماڵەی بارزانییان ئەوت؛ «سلیلی
الخیانە».

سەددام بۆ ئەوەی تۆڵە لە بنەماڵەی بارزانی بکاتەوە، هێزێکی حەرەسی جمهوری لە
بەغداوە نارد دەوری ئۆردوگاکانی قوشتەپە و بەحرکەیان گرت. هەر پیاوێکی بارزانییان
بەردەس کەوت لە گەنج و پیر هەموویان گرتن. شێخ عوسمان و کوڕەکانی و، کوڕەکانی
مەلا مستەفا؛ عوبەید و لوقمان و صابیریان چنییەوە. سەر و سۆراخیان نەما. دوای گرتنیان
بە ماوەیەکی کورت سەددام لە یەکێ لە وتارەکانی دا لە تەلەفزیۆن دا وتی: ئەوانە
خیانەتیان کردووە لە بەر ئەوە؛ «ارسلناهم الیٰ الجحیم». وا باو بوو کە مەسعود و ئیدریس،
هاوزەمان لە گەڵ هێرشەکانی تەهران دا بۆ حاجی هۆمەران، هەواڵیان بۆ بارزانییەکان ناردووە
خۆیان ئامادە بکەن بۆ چەک هەڵگرتن و گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی سنوور.

لەو کاتەدا کە بەعس ئەم تاوانە گەورەیەی بەرامبەر بە بارزانییەکان کرد من لە خەتی
بووم. ڕۆژێکیان کوڕێکی بارزانییان هێنا بۆ لام ناوی عەبدولباقی بوو. باسی کارەساتەکەی
بۆ گێڕامەوە. لە یەکێتی دڵنیا نەبوو، چونکە تازە شەڕەکانی قەندیل بڕبوو وای ئەزانی ئێمە
ڕقمان لە هەموو بارزانییەکە. دوای ئەوەی لە گەڵ مامجەلال قسەم کرد عەبدولباقیم بینییەوە و
لە زمانی سەرکردایەتی یەکێتییەوە پێم ڕاگەیاند: «ئەگەر ئەیانەوێ بڕۆن بۆ تەهران ئێمە هەموو
کارئاسانییەکیان بۆ ئەکەین بۆ ڕەوانە کردنیان. ئەگەر لە کوردستان و لە شوێنەکانی خۆیان
ئەمێننەوە هەر یارمەتییەکیان لە ئێمە بوێ بە پێی توانا پێشکەشیان ئەکەین. هەر
کەسێکیشیان ئەیەوێ لە گەڵ یەکێتی بێ بە پێشمەرگە بەخێرهاتنی ئەکەین». عەبدولباقی
گەڕایەوە هەولێر و لە گەڵ هەندێ لەوانەی مابوون قسەی کرد، دەیان هاتنەوە لامان و بڕیاری
دابوو بێ بە پێشمەرگە. ناردم بۆ لای مامجەلال. مامجەلال دڵنەوایی زۆری کرد بوو.
عەبدولباقی بوو بە پێشمەرگە و کرا بە فەرماندەی کەرت. کوڕێکی دڵسۆز و وریا بوو.
جارێکیان یەکێ لە بارزانییەکان وتی کوشتنی ئەوانە بە تایبەتی شێخ عوسمان و

کوڕەکانی مەلا مستەفا وەکو بنەماڵە وابو بۆ مەسعود دەرچی. بەعسییەکان بەم کارە سەرۆکایەتی عەشیرەتی بارزانیان بە تەنها بۆ مەسعود هێشتەوە بە تایبەتی کە ئیدریس مرد. لە ناو کوڕەکانی مەلا مستەفادا کەس نەما بو موناقەسەی بکا و، وەکو عەشیرەتەکانی تر ئەمانیش پارچە پارچە بێن و، هەر کوڕێک چەند تیرە و تایەفەیەک بە لای خۆی دا رابکێشی. ئەوانەی مابون هەمویان لە دایکی خۆی و، لە خۆی منالتر بون.

*

## بەرەو ئاسۆس

هەلومەرجی کوردستان زۆر ئاڵۆزا بو. ئەسانسەتوانی هەمو ئەندامانی سەرکردایەتی، یاخود مەکتەبی سیاسی پێکەوە لە یەک شوێن کۆ ببینەوە، ئەبو دابەش بێن. لە لایەکەوە بۆ سەلامەتی خۆمان وا باش بو، لە لایەکی ترەوە بۆ ئەوەی لە نزیکەوە خۆمان سەرپەرشتی کارەکان بکەین. من لە میژ بو بریارم دابو بچم بۆ بەری مەرگە.

کە ناوەزەنگیان بە یەکجاری چۆڵ کرد، ملازم عومەر چو بو بۆ کانی کەنێر لە پشتی کانی تو لە بەری مەرگە، ماوەیەک بو هات بوە دولی بالیسان، بریارمان دا پێکەوە بگەرێینەوە. ئاوات قارەمانی پێش بانگ کرا بو بۆ لێپرسینەوە و ریگای درابو بگەرێتەوە شارباژێر، ئەویش تیکەڵاوی کاروانەکەی ئیمە بو.

هێزەکەمان بە ئوتومبیل بەرەو بناری هەوری بە ری خست.

چوینە سکتەسان. دێ یەکی گەورە بو بەڵام بە هۆی دوژمنایەتی ناوخۆییانەوە گوندەکەیان ویران بوبو، چەند کەسێکیان لە یەکتری کوشت بو، لە رقی یەکتری هەر لایەکیان چو بو لە لای یەکێکی دەسەلاتدار ببو بە جاش.

شەو بە لای مەعسکەری هیزوپ دا رەت ئەبوین ئوتومبیلیک لە سەر جادەکە لایتەکانی لە ئیمەی ئەدا ریچکەکەمان لەو شەوە تاریکەدا بەرچاو نەئەکەوت. هەمو خۆمان دا بە ئەرزدا بۆ ئەوەی نەیبینین. لە کابرای شوفێرمان خوری لایتەکەی بکوژێنیتەوە. شوفێرەکە پەشۆکا بو نەیئەزانی چی بکا. شتێکی چارەری نەکراو بو لەم شوینەدا تووشی پێشمەرگە بی. هەرچۆنی بو ئوتومبیلەکە رۆیشت. ئیمە هێشتا خۆمان دا بو بە ئەرزا لە ناو ئیمەوە بلێسەیەکی گەورە بەرز بوەوە و گرمەیەکی گەورە هات. لە ریزەکەدا عومەر لە پێش منەوە بو. بە دەم ریگاوە قسەمان ئەکرد. ماوەیەک بو تۆزا بو. زۆر ئەترسام شتێکی لی هات بی. لە ناو هەمویان دا خەمی ئەوم بو یەکسەر وتم: «کاک عومەر سەلامەتی؟» وتی: «سەلامەتم» ئەگەر شتێکی بە سەر بهاتایە تاحەز و دوژمن ئەیانوت: پیلانی خۆیان بوە. سەرەتا وامانزانی هاوەنی موعەسکەرەکەیە. کەوتینەوە رێ چوینە داری قەسەمران. تا ئەوسا کەس خۆی نەکرد بو بە خاوەنی. دەرکەوت پێشمەرگەیەکی دەستەکەی ئاوات ئارپیجیەکەی لە سەر پی بوە، لە شلەژاوی دا لە دەستی دەرچوە. گوللە سەری پێشمەرگەیەکی بریندار کرد بو.

ناوچەکە بە رەبیە و موعەسکەر تەنرا بو ئەسانسەتوانی بیبینەوە. شەو چوینە گوندی میرۆژە لە بناری گۆسرەت و، رۆژەکەیشی هەر لەوی ماینەوە، بۆ عەسرەکەی چوینە ئالیقە. پێشتر چەند بەلەمێکیان بۆ ئامادە کرد بوین. لە تاریکایی شەودا بە بەلەم لە ناوی ئەستیلی دوکان پەرینەوە بۆ بەری مەرگە. لە کەناری ئاوەکە و لە کەلکی مەرگە پێشمەرگە

چاوەڕێیان ئەکردین. هەر ئەو شەوە چووینە ئاوەژێ. جەیش بە پەرێشەوەی ئەمەی زانی بوو، ڕۆژی دوایی هاڵیکوتایەوە. پەلاماری پەلەمی ماسیگرەکانی دا زۆری سووتاند.

*

چیای ئاسۆس لەوەڕگایەکی دەوڵەمەندە بۆ بە خێوکردنی ئاژەڵ و. گیا و پوشی زۆری هەیە، بەڵام ئاوی کەمە، چونی بەردەکانی ئەستوورنییە. لە بەرزاییەکانی دا تەنیا چالەبەفری لی یە، هاوینان دەوری ئەچن و ئەیتوێننەوە. هەندی جێگا «مالزو» لی یە. لە لەوەڕخ بە مالزو ئەڵین «هەرکەو». مالزو ئەو ئاوەیە کە لە چالایی سەر بەردا ئەمێنێتەوە. کەو و کەوی لە هاوین دا لی ی ئەخوێننەوە. «گادەر» و «کوپەس» لە لوتکە بەرزەکانیەتی. بە مەڕی گوێ شۆڕ ئەڵێن: «کوپەس»، بەڵام ناوی «گادەر» لە چەند جێگای تریش هەیە: ئاوە بۆ شاخ و. ئاوە بۆ ئەو ڕووبارەی کە لە سەر سنووری عیراق – ئیران هەڵئەقوڵی و بەرەو شنۆ ئەکشێ. تاک و تەرا بزنە کێوی لی ما بوو. وەکو ئەیانوت سەردەمی زو پڵنگی لی بینراوە.

*

بەری مەرگە

بنگرد، ناوەندی ناوچەکە بوو، بنکەی ناحیەی لی بوو. ئۆردوگایەکی گەورەشی لی کرا بووەوە نزیکەی ٤ هەزار ماڵی تی دا بوو.

ناحیەی بنگرد پێک هات بوو:

گوندەکانی بناری ئاسۆس: وێسێ، بێخری، بێترخی، بیانە، دۆلە گزم، سەرتەنگ، نێزکی، خاتەلی، کانی هەڵەبوو، سەرچیا.. ڕاگوێزرا بوون و. گەرمکان، ناوەدەشت، کەلەکان، بناوێلی ئاوەدان بوون.

گوندەکانی بەری مەرگە: کانی تو، چنارنی، ئاوەژێ، هەوارەبەرزە، خورخورە، باخیان، گزەمەزەڵ ڕاگوێزرابوون. لزتەر، هەلزنە، ئزلچکە، سزلیان، مەرگە، پاشکێش، مەلا سفی، بیوەکە، بیکمی، شارستین، دۆلە بی، سیدەر ئاوەدان بوون.

هەردو دیوی ئاسۆس گوندە ئاوەدان و ڕاگوێزراوەکانی لە ژێر دەستی پێشمەرگە دا بوو، بەڵام گوندەکانی: کوێرەکانی، هەڵەبەرە، بنگرد، خزشاو، بیسوشە، بەردەشان، سیوکان، سیناجیان، قەرەتەپە، دیبێژە، مەسعوداوا، بەردەکوز، سەرسیان کە هەندێکیان لە سەر جادە و، هەندێکیان لە لیواری ئەستێلەکەی دوکان دا بوون، لە ژێر دەسەلاتی بەعس دا بوون.

هەندی لە خەڵکی شوێنە ڕاگوێزراوەکان لە ناوچەکە دوورخرابوونەوە بۆ ئۆردوگای تەکی لە سەر ڕێگای چەمچەماڵ.

لە ڕووی پێکهاتنی خێلەکییەوە ناوچەکە تێکەلاو بو لە: شیلانە، جاف و ترکە ڕەشە.

ترکە ڕەشە تیرەیەکی بچوک بون لە سەرسیان و بەردەکوز دائەنیشتن.

شیلانە، ٣ تیرە بون:

پیرە، کە لە گوندەکانی بیسوشە و هەلزنە و، هەندێکیشیان دوای ژێرئاوکەوتنی گوندەکانیان چوبونە چوارقوڕنە، ژاراوە، ڕانیە، ئەسکی کەلەک.

شرانە، لە گوندەکانی بنگرد، سزلیان، سەرچیا، هەندێکیشیان دوای ژێرئاوکەوتنی گوندەکانیان لە سولتانەدی و ژاراوە دائەنیشتن.

رەجەب، یا ئالی (ئالی کوڕی رەجەب بوە)، ئەمانیش لە بەردەشان و، هەندێکیشیان دوای ژێرئاوکەوتنی گوندەکانیان لە بازیان دانیشتن.

گوندەکانی: خورخورە، باخیان، گۆمەزەڵ، دۆڵەبی، شارستێن، سەیدەر، کوێرە کانی و هەڵەبورە بەشێ بون لە ناوچەی چالەتی.

*

ناوچەکە چەند گوندێکی تێ دایە ئەهێنێ لە ئاستی دا رابوەستێ، لەوانە: مەرگە، بەردەشان، کانی تو.

– مەرگە، کانی و ئاوی زۆر و، ئەرزی فراوانی چاندنی دانەوێڵە و، باخی هەڵەبەری هەیە. چوار مزگەوتی تێ دابو؛ مزگەوتی کانی چاوان، کانی سەردەشت، گەرمک و چالان. مزگەوتەکان بە ناوی کانیەکانەوە ناو نرا بون. چەند گۆڕستانێکی نزیکە. هەندێکیان گەورەن و، کێلی گۆڕەکانیان بەرز و ئەستور و، هەندێکیان نەگاری شمشێر و خەنجەر و مەلیان لە سەر بو. کێلە کۆنەکانی هیچ نوسینێکیان لە سەر نیە. پێ ئەچێ مەرگە لە کۆنەوە ئاوەدان بوبێ. ئەم گۆڕستانانە ئەهێنێ لێکۆڵینەوەی مێژوییان لە سەر بکرێ. دانیشتوانی ناوچەکە هەندێ رووداوی دەماودەم ئەگێڕنەوە کە لە سەردەمی هاتنی لەشکری ئیسلام دا مەرگە پایتەختی قەڵەمڕەوێکی گەورە بوە و، دوای شەڕی قورس و خوێناوی ئینجا ناوچەکە گیراوە و، بە شمشێر ئیسلامیان کردون. پشدەرییەکان بە مەرگەییەکان ئەڵێن: «مەرگەیی ئەسحابەکوژا». مەزاری «پیرۆزە سوری مەرگەیی» کە لە ناوچەکەدا بە شوێنێکی پیرۆز دائەنرێ کەوت بوە دامێنی گەورە قەڵا و پشتی مەرگەوە. ئەوسا «رەبیە» یەکێ گەورەی جێنشینی لێ بو. گوایە پیرۆزە سور لە گەڵ هاتنی ئیسلام دا موسوڵمان بوە و، لە شەڕێکی دینیی دا کوژراوە و لەوێ ناشتویانە. گێڕانەوەکان ئەفسانەن، پشت ئەستور نین بە هیچ بەڵگەیەکی مێژویی.

ئەوسا ناوەندی قەزاکەیان گواستەوە بۆ قەڵادزە. مەرگە سەردەمێک بنکەی ئەمارەتی بابان بوە. بە پێ ی «بەیتی کاکە شێخ و کاکە میر»، هەندێ لە میرەکانی بابان لەوانە ئەم دو میرەی بەیتەکەیان بە سەردا هەڵدراوە، لە ئەنجامی زۆرداری و بەدڕەوشتی دا، بە دەستی مەرگەییان بە کۆمەڵ کوژراون. تا ساڵی ١٨٩٣ مەرگە ناوەندی قەزای پشدەر بوە.

وەکو ئەیانوت: مەرگە و لێژەر و هەندێ گوندی تری ناوچەکە دەرێشکی کوشندەیان هەبو. تا من لەوێ بوم چەند جاری دەرێشک بە پێشمەرگە و خەڵکی کەوەی دا، بەڵام کەسی نەکوشت.

کانی خۆی مەرگە ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی ناوچەکە بوە، هەر بۆیە بە هەمو ناوچەکە ئەوترێ: «بەری مەرگە».

*

– بەردەشان گوندێکە کانی خۆی سەر بە مەرگە و دواییتر سەر بە بنگرد بوە. یەکێ لە بە ناوبانگترین بەیتبێژەکانی کورد: عەلی بەردەشانی، لەم دێ یەدا لە دایک بوە. حاجی قادری کۆیی لە باسی شاعیرەکانی کوردستان دا بەمجۆرە ستایشی کردوە:

دو عەلین وەکو حەسان
حەریر و بەردەشانە مەسکەنیان

لە دوو عەلی، مەبەستی: عەلی حەریری و عەلی بەردەشانی و، لە حەسسان مەبەستی: حەسان کوڕی ثابتە. حەسسان شاعیرێکی عەرەبی گەورەی سەردەمی جاهیلی بوو، دوای ئیسلام بە ستایشی پێغەمبەر ناوی دەرکردووە.

ژمارەیەکی زۆر بەیت، چیرۆک، گۆرانی، قسەی نەستەق.. بە سەر زمانی خەلکەوەیە. تەنیا پالی، کە هەموی نیشانەی بلیمەتی ئەون. کەچی سەرگوزشتەی ژیانی خۆی روون نیە و، بەیتەکانی کەسیکی نەبی، کە لەم سالانەی دوایی دا تۆمار کراون، ئەوی تری نەنووسراوەتەوە، بەلام بەوەدا کە یەکێ لە بەیتەکانی بۆ ئەورەحمان پاشای بابان وتوە، دیارە هاوچەرخی ئەو بووە.

بەردەشان مەرکەزی عەشیرەتی شیلانە بوو.

رەسول مامەند لە بەردەشان لە دایک بووە. کە من لە ناوچەی نیشتەجی بووم، کوێخا پیرۆتی برای رەسول، یەکێکی ناردە لامان بۆ بەخێرهێنان. بێگومان ئەمەی لە پیاوەتی خۆی بوو، چونکە هیچ نیشێکی بە ئێمە نەبوو، جگە لەوەش ئێمە لەو کاتەدا لە گەڵ حسک ناکۆک بووین.

●

- کانی تو کەوتۆتە بناری شاخەوە لە کۆتایی دۆلێک دایە لایەکی ناسۆس و، لایەکی شاخی چل بزنەیە. هەوای خۆش و دیمەنی جوان و، چەند کانیەکی سارد و سازگاری تی دایە، دوانیان لە بەرزایی هەلئەقولێن و ئەرژێنە قولایی دۆلەکەوە. زستان بەفرێکی زۆری لی ئەباری.

زەویوزاری کشتوکاڵ و دانیشتوانیان کەمە، ئەرزەکانیان بە دەس بەردەوێر و چاک کراوە. رەزی تری و باخی میوە و ترشیان زۆرە. بیار ئەبینی پشتاوپشتی خەلکی ئەم دێ بە چەندە رەلەیان لە گەڵ باخەکانیان داوە. میوەیەکی لی بوو، وەکو هەلوژە رەشە بەلام بچووکتر و تامیشی خۆشتر، پێیان ئەوت: «سیکەرۆ».

ئاژەلداری ئەکەن. هەوای ناوچەکە بۆ پەروەردە کردنی ئاژەل، بە تایبەتی بۆ راگرتنی بزنە مەرەز، لە بارە.

دانیشتوانی ناوچەکە لە کۆنەوە شارەزاییەکی زۆریان هەیە لە تەونگەری دا. ئافرەت لە تەشی رستن و بەرهەمهێنانی داوی باریک دا و، پیاو لە چنینی بەزو دا. شالی کانی تو و چنارنی بۆ تەنکی و سفتی و جوانی بە ناوبانگە.

کانی تو و کانی کورکور ئەشی بکرین بە شوێنێکی توریستی خۆش. بە هاوین بۆ سەیران و بە زستان بۆ یاری سەربەفر.

●

ئەم ناوچەیەش وەکو خۆشناوەتی و، زۆر ناوچەی تری کوردستان بزن راتەگرن. بزن لە مەر هەرزانترە، بە خێوکردنی ئاسانترە، زۆرتر بەرگەی ئەخۆشی و سەختیەکانی سروشت ئەگری.

لە کوردستان ۳ جۆر بزن هەیە: بزنی رەش، بزنی مەرەز، بزنی کێوی.

بێچکەی بزن: کار یا کارژۆلە (لە بوونەوە تا تەمەنی ئەبی بە ۳ مانگ)، گیسک (لە ۳ مانگیەوە تا ئەبی بە ۱ ساڵ)، چێپیر (لە ۱ ساڵیەوە تا ئەبی بە ۲ ساڵ)، ئینجا بە نێرەکانی ئەوتری: نێری، سابرێن، تەگە و بە مێ یەکانی: بزن.

کار تا لە خەم ئەرەخسی لە «کـزز» دا پەروەردە ئەکری. کزز بە «تەیمان» چوار دەوری ئەگیری، بزن لە زستان دا ئەکریتە «پشتیر» یا «هۆڵ» ەوە.

ئەو ساڵەی بزن نەزێ، شیریشی نابێ، بزنی بێ شیر پێ ی ئەڵێن: «قسر».

بزنی رەش و بزنی مەرەز لە گەڵ نێریی یەکتری جوت ئەگرن، بەچکەکەیان «دورە، یا دورەگ» دەرئەچێ.

مووی بزنی رەش، زبر و رەقـە بۆ دروسـتکردنی جلوبەرگ بە کـەڵک نایەت، بەلام گوریس، رەشماڵ، رەشکە، جەواڵ، تەڕ، خەرار..ی، لێ دروست ئەکری.

مووی بزنی مەرەز، رەنگی جۆراوجۆری جوانی رەش، سپی، خورمایی، شینکی.. هەیە و، نەرم و خاوە، بۆزو (کر، شاڵ)، بەرماڵ، پێپەشمین، جاجم، گـزوەی، پەزەوانە، دەسکێش، بلوز و، لە هەندێ شوێن پەتانی.. لێ دروست ئەکری.

بزنی رەش بەرگەی سەختی سروشت ئەگری و، لە شاخەوانی دا وریا و سەرکەڵەیە، بەلام زەرەری گەورە لە جەنگەڵ و باخ ئەدا، چونکە چڵی تازە پێگەیشتوی درەخت ئەخوا و، تویکلی قەدەکەی ئەکرێنێتەوە، دارەکە وشک ئەبێ. لە بەر ئەوە پێ ی ئەڵێن: «کوللەی رەش».

پەندی زۆر لە سەر بزن هەیە، وەکو: «بزن بۆ شـەوی جێ ی خۆش ئەکا»، هەروەها: «بزن ئەجـەلی بێ نانی شـوان ئەخـوا»، هەروەها: «خـوا عەقڵی بزنی کـوڵ بە سـەر بزنی شاخدارەوە ناهێڵی»، هەروەها: «گیا ئەوەیە بە دەمی بزن خۆش بێ»، هەروەها: «نەمخواردم و نەکردم، کیسکێ جرینگاندم».

بۆ یەکێ کە زو زو بکەوێتە خۆشیەوە ئەڵێن: «وەکو بزنی دیلیژە ساڵی دو بەهار ئەخوا». بۆ یەکێ بەڵێنەکانی بە جێ نەهێنێ ئەڵێن: «وەکو بزن وایە دەستوێژ هەڵناگری». بۆ یەکێ هەمـو جـاری لە دوای خـۆشـیـەک ناخـۆشـیـەکی بە سـەر بێ، ئەڵێن: «وەکـو کیسـکەکەی هەیاسی خاسی لێ هاتوە»

*

بارەگـای تیـپی ئاسـۆس لە ئاوەژێ و کـەرتەکـانی بە درێژایی بناری ئاسـۆس بلاو بوبونەوە.

بارەگای تیپی ٦٨ ی مامەندە لە لۆتەر و، کەرتەکانی لە بناری ئاسۆس بە دیوی پشدەردا دابەش بوبون.

بارەگای تیپی ٤٤ ی چەکوچ لە گەرمکان و، بارەگای تیپی ٤١ ی کورەکاژاو لە کەلەکان بو. ئەم دو تیپە لە چاو ئەوانی کەدا بە ژمارە کەمتر بون.

هەندێ لە کـەرتەکـانی تیـپی ٦١ ی جوتیـارانیش، بە هۆی شـەرەکـانی عـیـراق - ئیـرانەوە، پەڕی بونەوە بەری ئاسـۆس هەندێکیان لە کـاتی تر بارەگـایان دانا بو. ئەم هێـزانە هەمویان سەر بە مەڵبەندی دو بون کە بارەگاکەی لە سەرگەڵو بو.

کاکەمین قادر بەرپرسی کەرتی ڕێکخستنی قەلادزە لە چنارێ بو.

کە گەیشتینە ناوچەکە، تازە خەریکی ئاواکردنەوەی گوندە وێرانکراوەکانی بون، لە بەر ئەوە شوێنێکی ئەوتۆی ئامادەی لێ نەبو بیکەین بە بارەگا. ئەبو خۆمـان خانو دروسـت بکەین. پێشمەرگەکان لە ئاوەژێ و مەرگە جێگەی کاتیان پەیدا کرد و، منیش چەند ڕۆژێ لە ماڵی عەبدولرەحیم بوم لە ئاوەژێ.

ئاوەژێ گوندێکی بچووک بوو. پشتی دابوو بە ئاسۆسەوە ڕووی لە قەرمسرد بوو. چەند کانی و کارێزێکیان هەبوو، بەڵام زەویوزاری کشتوکاڵیان کەم و لێژ و، بەردەڵان بوو. نزیکەی ٢٠ ماڵێکیان لە تەکیەوە هات بوونەوە بنەیان دانا بوو. ڕەزی تری و ترش و باخەکانیان ڕشک بووبوو، تازە خەریکی ژیاندنەوەی بوون. ژمارەیەکی کەم بزنی سەرمەز و بزنی ڕەش و گاوگۆتاڵیان پەیدا کرد بوو. دانیشتوانی ئاوەژێ کەم دەرامەت و، ژیانێکی هەژارانەیان هەبوو، بەڵام تەبیعەتیان دەوڵەمەند و نەفسیان بەرز و، لە میوانداری دا دڵ و دەروون فراوان بوون. هەر لە ئاوەژێ ماڵی کامەرانی بەهجەتی عەونی، زیرەی عەبدوللا ڕەوی، ئەحمەدی حاجی محەممەدی قەرەتەپە، حەمەی حەمبالی.. لێ بوو.

خەڵکی ناوچەکە بە گشتی پێیان خۆش بوو، ئێمە لەوێ جێگیر ببین، لایان وابوو ئیتر هێزەکانی جەیش ناتوانێ بە ئاسانی بێتە سەریان و، جارێکی تر ڕایان بگوێزێ.

مام ئەحمەد

مام ئەحمەد لە سەرەتای دەس پێ کردنەوەی شۆڕشەوە بووبوو بە پێشمەرگە. زۆرجار کە لە قسەکردن دا ناوی یەکێکی لە بیر بچوایە «وانیک»ی بە کار ئەهێنا بە پاسەرمەتانی ئەوت: وانیک عەرەفات و، بە قاسملوی ئەوت: وانیکلو.. لە بەر ئەوە ناویان نا بوو مام ئەحمەد وانیک، ئەگەرچی لە بنەماڵەیەکی ناسراوی خەڵکی ناوچەکە بوو، بەڵام پێشمەرگە و خەڵک هەر بەم ناوەیەوە ئەیانناسی.

دوای ئەوەی ڕێگای مەرگە - بەرگەڵو کرایەوە تراکتور و ئوتومبیل هاتوچۆی پێ دا بکەن. ڕۆژێکیان دلێر بە ئوتومبیل هات بوو بۆ ئاوەژێ. مام ئەحمەد ئەیویست بڕوا بۆ بەرگەڵو. بە دلێری وت بوو: «کە ڕۆیشتی منیش لە گەڵ خۆت بەرە!» دلێر وت بووی: «باشە، بەڵام من زۆر زۆر شەرم لە بیر ئەچێ بۆ ئەوەی لە بیرم ئەچێ لە سەعات ئەوەندەوە لە سەر ڕێگاکە چاوەڕێ بکە کە هاتم سوارت ئەکەم» مام ئەحمەد وای زانی بوو ناپەوێ سواری بکا. وت بووی: «ئەگەر ئەوەندە زۆر زۆر شتت لە بیر ئەچێ ئەوە بۆچی ڕۆژێ لە بیرت ناچێ لە باتی بەرگەڵو بچی بۆ بنگرد؟!» بنگرد ئەوسا هێزەکانی حکومەتی لێ بوو.

خاڵە مین

خاڵەمین، یەکێ لە پیاوە ڕیش سپیەکانیان ئاوەژێ، ژوورێکی لە دوو ژوورەکەی ماڵی خۆیان بۆ من تەرخان کرد. بە درێژایی ٦ مانگی ڕابوردوو، بە هۆی گەڕان و سووڕان و شەڕوشۆڕەوە، لە هاوسەرەکەم دابڕا بووم. ناردم بە دوای دا ئەویش هات لەوێ نیشتەجێ بووین. تا خانوەکەی خۆم تەواو بوو، چەند حەفتەیەک میوانی ئەو بووین. ئەو ماوەیە تیکەڵاویمان زۆرتر و دۆستایەتیمان بە هێزتر بوو. خاڵەمین خۆی نموونەی پیاوی جوامێر و، هاوسەرەکەی نموونەی خانمی خانەدان و، منداڵەکانی نموونەی مرۆڤی بەرز بوون.

مام باپیر

مام باپیر، یەکێکی کە لە پیاوە ڕیش سپیەکانی ئاوەژێ، کانییەک و پارچەیەک عەرزی دامێ ماڵ و بارەگای لە سەر دروست بکەم. شوێنەکە ناوی «کوروان» بوو نزیکی ئاوەژێ بوو. مام باپیر پیاوێکی ژیر و بەڕێز، شارەزای کاروباری عەشایەر و قسە خۆش بوو. حەمەی کوڕیشی بە دڵسۆزیەکی بێ ئەندازەوە کاروباری هێنان و بردنی بەرید و پەیوەستیەکانی تری ئەنجام ئەدا.

خاڵە مین و مام باپیر خاڵ و خوارزا بوون و، هەردوکیان یارکیان لە شۆڕشی شێخ

محەممودا لە سەرەتای سییەکان دا کوژرا بوو، خزیشیان لە شۆڕشی ئەیلول دا پێشمەرگایەتییان کردبوو، بەڵام دانیان بە یەکەوە نەنەکولا.

•

خانوو دروست کردن لێرە کارێکی زەحمەت نەبوو. جادەی لێرە بۆ ناوچەکە ڕاکێشرا بوو، ئەمانتوانی کەرەستەی خانوو دروستکردن: بلۆک، چیمەنتۆ، گەچ، دەرگا و پەنجەرە.. لە شار بکڕین. دیسان کەوتینەوە خانوو دروست کردن. بناغەکەیمان دانا. خانوویەکی دە ژووری بۆ پێشمەرگەکان و، چەند خانوویەکی دوو ژووری بۆ خزم و ماڵەکانی تر. لە هەموویان دا تەوالێت، حەمام، چێشتخانەی تایبەتی مان دروست کرد. گەورێکیشمان بۆ ئاژەڵ و تەنوور دروستکرد و، لە دەوروپشتی خانووەکان چەندین چاڵمان بۆ خۆپاراستن لە هێرشی ئاسمانی و تۆپباران هەڵکەند. وەستا و کرێکاری هەموو خانووەکان پێشمەرگەکان خۆیان بوون.

خانووەکان تەواو بوون. کاتی خۆی کەلوپەلی بارەگا و ماڵەکەمان لە ناوزەنگەوە گوێزابووەوە هەرزنە و، دوای ئەویش هێنابوومانە ناوڕێ. پێشمەرگە بارەکانیان گورمرگ کرد بوو، ئەوی بە کەڵکیان هات بو بردبوویان، تەنیا شتی ئەمان برد بو کتێبەکانم بوو، وەکو خۆی مابوو. سەرلەنوێ مشووری کەلوپەلی بارەگا و ماڵمان خوارد.

•

بەڕوو

هەندێ شوێنی بناری ئاسۆس دارستان بوو. داری بەڕوو، قەزوان، گوێز، بەلاڵوک.. ی لێ بوو. پشتی چنارێ لە هەمووی چڕتر بوو. پاش دانانی بنکەکانی پێشمەرگە، کەوتنە داربڕین: بۆ سووتاندن و بۆ دارەڕای خانوو. چەند کەسێکی خەڵکی چنارێ هاتن بۆ دەربڕینی پەژارە و نارەزایی. شارەزاکانیان ئەیانوت: لێرەوارەکەی پشتی چنارێ دانیشتوانی ناوچەکەی چەند جاری لە قاتوقڕی و برسیەتی و، ئاژەڵەکانیانی لە مردن، ڕزگار کردوە: خەڵک بەری داربەڕووانیان خواردوە و، ئاژەڵەکەیش گەڵاکەی. لە پەژارەی ئەوەدا بوون ئەم سامانە بە نرخە لە ناو بچێ.

دارستان بەشێکە لە سامانی نەتەوەیی. لە زۆر جێگا دابەش کراوە و، هەر جوتیارێک «قەدەغە» ی خۆی هەیە، کەسی کە بۆی نیە بیبڕێ، گەڵاکەی ئەکەن بە «گەڵ» بۆ ئالیکی زستانی بزن و، لق و پۆپەکەی بۆ سووتاندنی خۆیان بە کار ئەهێنن، ئەم جۆرە بڕینە کاری تێ ناکا. بەڵام بڕینی بێ پلان و خەڵوز کردن، بەشێکی زۆری لەوتاندوە و، ژیاندنەوەی سەر لە نوێ ی کارێکی یەکجار دژوارە.

داری بەڕوو، چەند جۆرە و، چەند بەری جیاوازی هەیە:

١. بەڕوو، دانەی بەڕوو درێژکۆلە و ڕەنگی قاوەیی تیرە. هەندێکیان گەورەن پێ ی ئەڵێن: «وێلۆ». کلاوێکی پڕاوپڕی سەرەکەی لە سەردایە پێ ی ئەڵێن: «جەوت». پێشینان وتوویانە: «خوا کڵاوی بۆ بەڕوو کردوە». جەوت بۆ خۆشکردنی کورتە، مەشکە، هێزە.. بە کار ئەهێنرێ و، بەڕوویش بە زستان لە ناو ژیلەمۆدا برژاندوویانە، یا پێشاندوویانە و خواردوویانە. لە قاتوقڕی دا هاڕیویانە و بۆ خواردن «خەپلە» یان لێ دروست کردوە. بە زۆری تامەکەی تفت و تاڵە. بە زەحمەت، بە بێ ئاو، قووت ئەدرێ.

وەکو دەربڕینی بێزاری لە دووبارە بوونەوەی خواردنێکی ناخۆش ئەڵێن: «بەڕوو بە کاڵی، بەڕوو بە کوڵاوی، بەڕوو بە برژاوی..» و، یەکێ کە بە پەلە و بێ پسانەوە قسە بکا

پێ ی ئەڵێن: «ئەڵی ی بەروی لە دەم دا تەقیوە» و، وەکو نیشانەی یەک کەوتن و نەخۆشی گران، ئەڵێن: «بەلە پێ و، بەرووان نەخرا؟».

٢. مازو، بەرێکی خڕ و سەختە. لە پایزدا ئەیچنن و لە بازاردا بە کێشانە ئەیفرۆشن. بۆ دەباغی پێستە بە کار ئەهێنرێ. پێشینان وتویانە: «بە زۆر بەیبەی بۆ مازوچنین بە دۆڵەکەی دا ناڕواتێ».

کاروانچی و ئەوانەی زۆر بە ڕێگادا ئەڕۆن، کە پێیان «تلزق» ئەکات و، پێستی نێوان پەلپەکانیان ئەسوتێتەوە، مازو ئەهاڕن و لە گەڵ خەنە دا ئەیگرنەوە، لە پێیانی ئەدەن، پێستی پێیان «ڕێکر» ئەکاتەوە.

٣. گزگڵ.

٤. سیچکە، لە هەندێ ناوچە پێ ی ئەڵێن: «گلۆان»، بەرێکی تری بەروە خڕە لە شێوەی هەلوژە ڕەشەدا. توێکڵەکەی ڕەق و قاوەیی تیرە، ناوەکەی جۆرێ لە ئاردی زەردی تێ دایە. نرخێکی بازرگانی ئەوتۆی نیە. پێشینان وتویانە: «بە مازووان تێ شکاوە، ئەیەوێ بە سیچکان هەڵسێتەوە».

هەندێ ساڵ گەزۆ لە سەر گەڵای داربەرو ئەبارێ، گەڵاکەی کۆ ئەکەنەوە و ئەیکوتن لە بازاردا بە کێشانە ئەیفرۆشن، پاش کوڵاندنی «شۆکە»، و «گەزۆ» ی لێ دەر ئەهێنرێ. لێکۆڵینەوەی زانستی دەری خستوە گەزۆ نابارێ، بەڵکو جانەوەرێکی پچوکە بە چاو نابینرێ لە سەر گەڵای داری بەرو زیاد ئەکا و، لە ئەنجامی هەندێ «تفاعل» ی کیمیایی دا دروست ئەبێ.

داری بەرو سەخت و قورسە، بە کەڵکی داربڕای خانو نایەت چونکە ئەوەندە قورسە دیوار بەرگەی ناگرێ، بە زۆری بۆ سوتاندن بە کاری ئەهێنن، بەڵام لە ئەورووپا دیکۆری قەشەنگی لێ دروست ئەکەن، نەخشی جوان لە قەدی دارەکەدایە.

*

## مەڵبەندی یەک لە ناو شەڕی عیراق - ئێران دا

هێزەکانی ئێران تا ئەهات لە کوردستانی عیراق نزیک ئەبونەوە. زەمانەی شەڕ گەیشت بوە ناوچە سنورییەکانی حاجی ئۆمەران، قەڵادزێ، پێنجوێن. عیراق و ئێران، هیچ لایەکیان دەستیان لە ئێمە نەئەپاراست. هەندێ جار «ڕصد» ەکانی ئێران کە بە چاوساغی پێشمەرگەکانی پارتی و حسک ئەهاتنە پێشەوە، شوێنەکانی ئێمەیان بۆ ئەکردن بە نیشانە.

شەڕی حاجی ئۆمەران کاری لە مەڵبەندی سێ و، شەڕی قەڵادزە کاری لە بارەگاکانی سەرکردایەتی کرد بو. ناوچەی ناوزەنگ - شێنێ مان چۆڵ کرد بو، ناوچەی باوزێ پشتیان پێ چۆڵ کرد بوین. دەزگای ڕاگەیاندن و ڕادیۆ گواستبویانەوە دۆڵی جافەتی.

شەڕ بە گەرمی کەوتە ناوچەی پێنجوێن. مەڵبەندی یەک کوت بوە مەترسییەوە. هەمو ڕۆژێ بۆردومان ئەکرا. ئەوسا بەکری حاجی سەفەر، لە جێگەی مەلا بەختیار، کرا بو بە لێپرسراوی مەڵبەندی یەک. ئێمە ئاگاداری بەکری حاجی سەفەرمان کرد، فەرمان بە هێزەکانی یەکێتی بدا پەلاماری جەیشی عیراق نەدەن، بۆ ئەوەی بەرانی هێرشەکانی ئێران ڕابگرێ، چونکە هاتنی ئێران بۆ ناوچەکە ئەبو بە هۆی چۆڵکردنی ناوچەکە و وێرانبونی و، لە ئەنجامی ئەوەیش دا ئەبو بارەگاکانی مەڵبەندی یەک و تیپەکانی شارباژێر چۆڵ بکەن.

ماهیر عەبدولڕەشید تکریتی قائیدی فەیلەقی یەک بو. ماهیر بەعسییەکی

